رشید، عثمان محمد، ۱۳۳۰ -
بەهاری دلان / عوسمان محمد رەشید.-- تهران: احسان، ۱۳۸۴.
ج، ۴۳۵ ص.
ISBN: 964-356-474-6
کردی.
فهرستنویسی بر اساس اطلاعات فیپا.
۱. اسلام -- مسائل متفرقه. ۲. اخلاق اسلامی. الف. عنوان.
۹ب ۵۴ر/۸ BP ۲۹۷/۰۲
کتابخانه ملی ایران ۱۸۰۷۴ - ۸۴م

# بەهاری دڵان

✦ئامادە کردنی: ئەندازیار عوسمان محمد رەشید
✦بڵاوکار: نەشری ئیحسان - تاران
✦چاپی: یەکەم ـ ۲۰۰٦
✦چاپخانە: مەهارت ـ تاران
✦تیراژ: ۳۰۰۰ دانە
✦ژمارەی سپاردنی: (۳۵۳)ی ساڵی (۲۰۰۵)ی کتێبخانەی گشتی هەولێری دراوەتێ



➢ فروشگاه شمارهٔ ۱: تهران ـ خیابان انقلاب ـ روبروی دانشگاه ـ مجتمع فروزنده ـ شمارهٔ ۴۰۶ ـ تلفن: ۶۶۹۵۴۴۰۲
➢ فروشگاه شمارهٔ ۲: تهران ـ خیابان ناصر خسرو ـ کوچه حاج نایب ـ شمارهٔ ۱/۱۱ ـ تلفن: ۳۳۹۰۲۷۵۰
صندوق پستی: تهران ۳۸۵ ـ ۱۱۴۹۵




ISBN: 964-356-474-6
ژمارەی نیونە تە وایەتی: ۶-۴۷۴-۳۵۶-۹۶۴

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ناوەڕۆک

# بەهاری دڵان

بەهاری پڕ ئەفسوونی جوانی ملوانکەیەکە لە هاژەی شەماڵ و هەناسەی هەڵاڵە و هەنسکی هەورو هەنگوینی هەڵوژە و هەنار و هەرمێ و هەمیشە هوەیدای بارانی گەشت و سەیرانی دەشت و تریفەی گوڵ و جلوەی دڵ .

بەڵام ! ئەفسووس بەهارێك بەو فەرشی جوانی‌یە ، تەمەنی لە نێرگز ناسکترە و لە تەقینی دەنکە هەنارێك زووتر ئاوی یاقووتی ئەپڕژێ ، هەر لە بەرە بەیاندا خۆری ئەو ئاوا نەبێ .. جا مرۆڤ ئەگەر بیەوێ لە هەمیشە بەهارێکدا ژیان بگوزەرێنێ‌ئەوا وەك سەعدی شیرازی مەگەر لە سەیرانگای کتێبدا ( گوڵستان )ێك پێکبهێنێ ، مەگەر لەگەڵفوارەی ئایەتەکان وباخچەی سورەتەکان و سەرچاوەی جوزئەکاندا بەهاری دڵی ئاودێر بکات و لەژێر نەسیمی نزاکەی ڕەسوڵی نازداردا ( دروودی خوای لەسەر ) قورئان ببێتە بەهاری دڵی‌و روناکی ڕێ و چراوگی ژینی و شەفاعەتکاری ڕۆژی پەسڵانی ... کە زنجیرەی ( بەهاری دڵان )یش هەر لە ژێر سایەی ئەو نزایەوە ناوی خوای لێهێنراوە و هەر بەهیوای ئەو نزایەش دریژە بە چەند بەرگێکی تەمەنی ئەدات .

# پێشەکی چاپی دووەم

سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ خوای پەروەردگار و درووودو سەلامیش لەسەر گیانی پێغەمبەر و یارو یاوەر وشوین کەوتوان ....

بەهاری دڵان لەم چاپی دووەمەدا بە کۆکراوەیی دێتە خزمەت عاشقانی بەرنامەی خواو لەگەڵ هەندێ بژار کردن و زیادکردن دا کتێبخانەی ئیسلامی کوردی دەڕازێنێتەوە ، بەڵکو بەفەزڵی خوا دەرمانی دڵ و چارەسەری دوو دڵیو گومان و ڕووناکی ڕی بێت بۆ بڕواداران....

لە بەشی یەکەمدا باسی کارەساتەکەی ١١ ی سێبتەمبەری ئەمەریکا کراوە هەرچەندە کومەڵی(القاعدە) لە چەند شریتێکدا ئەیگرنە ئەستۆیخۆیان و، بە بۆچوونی ئەوان کارێکی مەزنیان کردووە ، بەڵام هەرچۆن بێت نهینی زۆر هەیە لەم کارەساتەی هەزارەی سێیەم دا کە ڕەنگە (٥٠) ساڵی تر کەشف بکرێت و وێنەکە بە تەواوەتی بکەوێتە بەرچاو .... لە دنیای (مخابرات) دا هەزاران شریت و بەڵگە نامە دروست دەکرێن و چاوو ڕاوی وا دەکرێت مرۆۃ سەرسام دەکات ...

هەروەك ئامارە شی پێ کراوە لەبەشی یەکەمدا ، کێشەکە زۆر لایەنی هەیە و پرسیاری زۆر دەخوڵقێنیکە بێ وەڵام دەمێننەوە ولێکۆڵەرەوانی ئەو بوارەش هەموو خەریکن ......

بۆ نموونە پسپۆڕێکی میسری ئەو بوارە دەڵێت سەیری فرۆکەکەی لۆکەربی بکەن کە کەوتۆتە خوارەوە زۆر بەشی فڕۆکەکە ماوەتەوە و دیراسەی لەسەر دەکرێت ، بەڵام فڕۆکەکەی ( کۆمپانیای عال ) ی ئیسرائیلیکە مەوادی کیمیاوی هەڵگرتبوو و هیچی لێ نەمایەوە کاتێك

کەوتە خوارەوە ، ئینجا پێدەچێت ئەو فڕۆکانەی ئەمریکاش موادی کیمیاییان تیا دانرابێ بۆ ئەوەی باشتر زیان بگەیەنن و هیچ ئاسەوارێکی ئەو تۆ بەجێ نەهێڵن .....

هەر چۆنێك بێت ئەگەر ئەو لایەنەش ئەنجامی دابێ، ئەوا بە تەنها نەکراوە وڕەنگە ئەمریکا و ئیسرائیل خەڵکێکیان لە ناویاندا دروست کرد بێ و کارەکەیان بۆ ئاسان کردبن و بەپێی بەرنامەیەکی ورد بووبێت ، ئەمانەی کە دەیڵێین هەمووی بۆچوونن و هەمووشی هەروا دەمێننەوە تا ئەو ڕۆژەی پەردە لەسەر ڕاستیەکان هەڵدەماڵرێت کە ئەوەش زۆری دەوێت ......

بەهەر حاڵ ئەوەی بەڵگەنەویستە و بە ئاشکراش دەیبینین ئەوەیە کە ئەم کارەساتە ئاواتی ئەمەریکا و جوولەکەی هێنایە دی و زۆر لێزانانە سوودیان لێوەرگرتو جارێکی تر جیهانی ئیسلامی هەڵدەوەشێنن و جەنگی جیهانی سێیەمیان بەرپا کرد، لە کاتێکدا کە ئەوان لە و پەڕی هێز وتوانادان و موسڵمانانیش لەو پەڕی بێدەسەڵاتی و سەرکردەکانیشیان لەوپەڕی خۆ فرۆشی و خۆ بەدەستەوە یانان.

ئەوانەی کە لەوبارەیەوە باسمان کردوە هەوڵێکە بۆ تیشك خستنە سەر ئەو کارەساتە گەورەیە کەدنیای سەرقاڵکردووە ..

گریمان کومەڵێ موسڵمان دەستیان هەبووە لەو کارەدا ، بەڵام ئایا لە ئەنجامی ستەمی ئەمریکاوە نیە بەرامبەر جیهانی ئیسلامی ؟؟؟

موسڵمانان ملیارێك و سێسەد ملیۆنن ئەگەر کۆمەڵێکی زۆرکەم توندو تیژبن بۆئەبێ هەموو موسڵمانان باجەکەی بدەن ؟؟ باشە لای خۆیان توندڕەو کەمە ؟؟

پیاوێکی فەلەستینی لە ئەمریکا گلەیی کردبوو لە قەتڵ وعامی صەبرا و شاتیلاو دێر یاسین ، دکتۆرێکی ئەمریکی پێی وتبوو گلەیی چی دەکەی ، ئەوەی تۆباسی دەکەی هەمـووی چەند سەد کەسێکی تــیا کوژراوە ، ئێمە تەنها لەئەمریکاکەی خۆماندا نزیکەی بیست ملیۆنمان لە هیندییە سوورەکان کوشتووە !!

ئەمە بێجگە لەو چەکە ئەتۆمیەی کەدایان بەسەر خەڵکی داماوی یاباندا ، لەم دواییانەشدا هەمووکەس دەزانێ چەند خەڵکی بێ تاوانیان کوشت لــە ئەفغانستاندا ..

بەڵێ بێنرخترین خوێن لــەلایان خوێـنی موسڵمانە ، بۆیــە کە لەبەر ئاوی ڕووی خۆیان ویستیان قەرەبووی زیـان بـۆچەند ئەفغانیەك بکەن یەکـی دووسەد دۆلاریان دانێ ، لەملاشەوە داوایان لە لیبیا کرد قەرەبووی زیان بدات بە خێزانی ئەوانەی کە لە فڕۆکەکەی لۆکەربیدا تیاچووبوون ، دەزانن چەند ؟؟ یەکی دە ملیۆن دۆلار !!! ئایا ئەمە بانێك نیەو دوو هەوا ؟؟ ئایا موسڵمانان ناهــەقیانە ڕقیان لەرەفتارو ستــەمی ستەمکاربـێت ؟؟ ئاخرکێ هەیە ستەمکاری خۆش بوێت ؟؟

ئەمریکا بـاش دەزانــێ کە لە چەند ساڵی داهاتوودا عەجـزی ئابـووری دەگاتە ( ٨و١) تریـلیۆن دۆلار بـۆیە تاقە شتێك کە رزگاری بکات داگیرکـردنی بیرە نەوتەکانەو هەرچیش دەکات بۆئەومەبەستەیە لە ژێر پەردەی نەهێشتنی ئیرهابدا ...

## پێشەکی

سوپاس وستایشی بێپایان بۆ خوای پەروەردگار و درودوسڵاویش لەسەرگیانی حەزرەت ویارویاوەران و شوێن کەوتوان .

حەزرەت ﷺ هەمیشە دوعای دەکرد ( اللهم يا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك ) ئەی ئەو خوایەی کە دڵەکان بەدەست تۆوەیە و هەر چۆنێکت بوێ دەیگۆڕی ، دڵ دامەزراوم بکە لەسەر ئاینەکەت ... هەروەها لەدوعایەکیتردا بەهەموو ناوە جوانەکانی پەروەردگار دەپاڕێتەوە کە قورئانی پیرۆز بکا بەبەهاری دڵی و ڕووناکی سنگی و لابەری خەمی ( ... أسألك بكل اسم هولك ... أن تجعل القران العظيم ربيع قلوبنا ، ونور صدورنا ... )

ئێمەش بەباسوخواسێکی قورئانی و ئیمانییەوە هاتینە خزمەتتان و لەدوعاکەی حەزرەتەوە ﷺ ناومان نا ( بەهاری دڵان) بەوهیوایەی کەدڵەکان بگەشێنەوە و زیاتر دامەزراوبن لەسەر دوا پەیامی خوایی بۆ بەرەی ئادەمی ...

لەتەوەرەی یەکەمدا ، لەخزمەت سوورەتی (محمد)دا دەبین و پاشان لەبەرئەوەی سورەتەکە باس لەهەوڵ و تێکۆشان و بەختکردنی سەروماڵ و شەهید بوون دەکات ، چەند نموونەی هەوڵ و خەبات و شەهیدی باس دەکەین .

لەتەوەرەی دووەم دا باس لەتێگەیشتن لەقودەرت و دەسەڵاتی خوادەکەین ، کە ئەویش بۆ هەموو موسڵمانێك پێویستە بەگشتی و بۆ بانگخوازان زۆر پێویسترە بەتایبەتی ...

لەتەوەرەی سێیەم دا باسی چەندنموونەیەك دەکەین لەپیلانی دوژمنان...

لەتەوەرەی چوارەم دا باسی بڵاوبوونەوەی پەیامی ئیسلام دەکەین ، بەفەزڵی خواو هەوڵ و دامەزراوی موسڵمانان لەسەرتاسەری جیهان دا .

لەتەوەرەی پێنجەم دا باسی ئوممەتی ئیسلام دەکەین وتیشك دەخەینە سەر هەستانەوەی موسڵمانانی ئاسیای ناوەڕاست ...

لەتەوەرەی شەشەم دا باسی گەرد نەگرتنی دڵ و دڵنیایی دەکەین بەرامبەر ئەو هەموو موعجیزانەی کەلەقورئان و سوننەتدان .

کە ئەمانەش هەمووی دڵۆپێکە لەدەریایەك و لەبوارێکی ئاواکەم دا هەرئەوەندە دەتوانرێت باسی لێوەبکرێت ..

**دیارە هەوڵ و تێکۆشان و جیهادکردن چڵەپۆپە و لوتکەی ئیمانە** ( وذروة سنامه الجهاد في سبيل الله) **هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ، بۆیە هەق وایە لەخۆمان بپرسین چەندە تێکۆشاوین وتێدەکۆشین لەرێی خوادا ، مەگەر داوامان لێنەکراوە کەبەچاکی جیهاد بکەین ؟!**﴿ وجاهدوا في الله حق جهاده هو اجتباكم وما جعل عليكم في الدين من حرج ، ملة أبيكم ابراهيم هو سماكم المسلمين من قبل ، وفي هذا ليكون الرسول شهيداً عليكم وتكونوا شهداء على الناس ، فاقيموا الصلاة واتوا الزكاة واعتصموا بالله هو مولاكم فنعم المولى ونعم النصير ﴾ الحج : ٧٨ .

**واتە : هەوڵ و کۆشش و خەبات بکەن لەپێناوی خوادا بەوشێوەیەی کە شایستەیەتی چونکە هەر ئەو هەڵیبژاردوون بۆ ئەو کارە لەناو خەڵکدا و ، لەئاین و بەرنامەکەیدا هیچ جۆرە شتێکی ناڕەوا و قورس و گرانی بۆ بڕیارنەداون ، ئەم بەرنامەیە ڕێوشوێن و بەرنامەی ئیبراهیمی باواتانە ، کەپێشتر هەر ئەو ناوی ناون موسڵمان و ، لەم قورئانەشدا بەموسڵمان ناسراون ، تا پێغەمبەر ببێتە شایەت بەسەرتانەوە کە پەیامی خوای پێڕاگەیاندوون و ، ئێوەش بەگەیاندنی ئەوپەیامە ، ببنە شایەت بەسەر خەڵکیەوە ، کەواتە نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن و، زەکاتیش بدەن و، پشت بەخوا ببەستن ، چونکە هەر ئەو زاتە یارو یاوەرتانە ، دڵنیابن کە یارمەتیدەرێکی چاك و، پشت و پەنایەکی مەزنە .**

**دوژمنان زانیویانە کە سەرچاوەی هێز و گەورەیی موسڵمانان قورئانە ، بۆیە هەر لەکۆنەوە هەوڵیان داوە گوێ لەقورئان نەگیرێ و خەڵکی لێدووربخەنەوە ، هەروەك قورئان دەفەرموێ** ﴿ وقال الذين كفروا لاتسمعوا لهذا القران والغوا فيه لعلكم تغلبون ﴾ فصلت — ٢٦- **واتە : کافرەکان دەڵێن گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرن و غەڵبەغەڵب بکەن بەڵکو کەس شوێنی نەکەوێ و سەربکەون .**

**لەسەردەمی نوێش دا پیاوێکی رۆژئاوایی فێڵباز بەناوی کاتلی دەڵێ ( پێویستە قورئان کە گرنگترین چەکی ئیسلامە بەکاری بهێنین دژی ئیسلام ، تا بەتەواوی لەناوی دەبەین ، هەروەك چۆن پێویستە موسڵمانان تێبگەیەنین کەراستیەکانی قورئان تازەنین ، وە تازەکانیشی راست نین )** ل١٦ / التغير على منهاج النبوة / جمعه أمين عبدالعزيز .

## هەڵوێستەیەک لەخزمەت سوورەتی (محمد)دا ﷺ :

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم الذين كفروا وصدوا عن سبيل الله أضل أعمالهم ، والذين امنوا وعملوا الصالحات وامنوا بما نُزّل على محمد وهو الحق من ربهم كَفّر عنهم سيئاتهم وأصلح بالهم ﴾ .

**واتە : بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ، ئەوانەی کافر و بیٚبڕوان و بەرهەڵستی ڕێبازی خوا دەکەن ، ئەوانە خوا کار و کردەوەیان پووچ دەکاتەوە و پاداشتی لەسەر وەرناگرن .**

**بەڵام ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە وکاروکردەوەی چاکیان ئەنجام داوە و باوەڕیان بەو قورئانە بووە کە بۆ (محمد) ﷺ رەوانەکراوە ، کە هەر ئەویش ڕاستە و لەلایەن پەروەردگارەوە هاتووە ، ئەوانە خوا لەگوناهیان خۆشدەبێت و دڵ و دەروون و بۆچوونیان ڕێك وپێك دەکات .**

﴿ ذلك بأن الذين كفروا اتبعوا الباطل وأن الذين امنوا اتبعوا الحق من ربهم ، كذلك يضرب الله للناس أمثالهم ﴾ **ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە چونکە ئەوانەی کەبیٚباوەڕن شوێنی ناڕاستی کەوتوون ، بەڵام ئەوانەی کەباوەڕیان هێناو موسڵمان بوون ، شوێنی ئەو ڕاستی‌یە کەوتون کەلەلایەن پەروەدگارەوە هاتووە ، ئابەوشێوەیە خوا نموونە دەهێنێتەوە بۆ خەڵکی (تا فریای خۆیان بکەون ) .**

﴿ فاذا لقيتم الذين كفروا فضرب الرقاب حتى اذا أثخنتموهم فشدوا الوثاق، فاما منا بعد واما فداء حتى تضع الحرب أوزارها ، ذلك ولويشاء الله لانتصر منهم ولكن ليبلو بعضكم ببعض ، والذين قُتِلوا في سبيل الله فلن يُضِل أعمالهم ، سيهديهم ويُصلِح بالهم ، ويدخلهم الجنة عرّفها لهم ، يا ايها الذين امنوا ان تنصروا الله ينصركم ويثبت أقدامكم ﴾

**واتە : کاتیٚ لەمەیدانی جەنگدا گەیشتن بەکافرەکان ، بێنە دەست لیٚیان و لەگەردنیان بدەن ، جا ئەگەر یەخسیرتان کردن ئەوکاتە پەیمانی توند و تۆڵیان لیٚوەرگرن و ، یان بەپیاوەتی و منەتنان ، یاخود دیل بەدیل ئازادیان بکەن ، تا شەڕ ئاسەواری نامێنێت ، خوا ئەگەر بیەویٚ خۆی دەتوانێت بەسەریاندا سەربکەوێت ، بەڵام دەیەوێت هەندێکتان بەهەندێکتان تاقیبکاتەوە ، بێگومان ئەوانەی لەپێناوی خوادا شەهیدبوون ، هەوڵ و کۆششیان بەزایە نادات . ئەوانە ڕێنموویی دەکات بۆ جێگە و ڕێگەی خۆش ، وە دڵ دەروون و بیروهۆشیان ئاسودە دەکات هەروەها دەیانخاتە ئەو بەهەشتەوە کە بەجۆرەها شێواز بۆی باسکردوون ، ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە**

**، ئەگەر ئێوە پشتیوانی لەئاینی خوا بکەن و هەوڵی سەرکەوتنی بدەن ، خواش پشتیوانی لەئێوە دەکات و سەرتان دەخات ، وە پایەدار و جێگیرتان دەکات .**

﴿ والذين كفروا فتعساً لهم وأضل أعمالهم ، ذلك بانهم كرهوا ما أنزل الله فاحبط أعمالهم ، أفلم يسيروا في الارض فينظروا كيف كان عاقبة الذين من قبلهم دمر الله عليهم وللكافرين أمثالها، ذلك بأن الله مولى الذين امنوا وأن الكافرين لا مولى لهم ﴾

**محمد - واتە : ئەوانەش کەکافر و بێبڕوابوون خەجاڵەتی و سەر شۆڕی و نەگبەتی یەخەیان پێدەگرێت و کاروکردەوەشیان لەدنیادا بێئاکامە و لەقیامەتیشدا مایە پووچن ، چونکە ئەوان ڕقیان لەقورئان دەبێتەوە و حەزیان لەبەرنامەی خوا نیە ، ئەویش کاروکردەوەیان پووچ دەکاتەوە .**

**ئایا ئەوە نەگەڕاون بەسەر زەویدا و سەرنجیان نەداوە ، سەرەنجامی ئەو خەڵکە نالەبارەی پێش ئەمان چۆن بوو ؟ خوای بەدەسەلاَت ماڵ و حاڵیانی بەسەردا رووخاندن ، جا بۆ هەموو بێباوەڕان سزای ئاوا شتێکی چاوەڕوانکراوە و درەنگ یان زوو دووچاریان دەبێت . ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە چونکە خواپشتگیر و پشتیوانی ئەوانەیە کە بڕوایان هێناوە ، لەکاتێکدا بێ باوەڕان هیچ جۆرە پشتیوانێکیان نیە ...**

**جا بەراستی زۆر پێویستە تێگەیشتن لەوەی خوا یەکی لەکەس نەکەوتووە و ئەگەربیەوێ دینی خۆی سەردەخات ، وەکاری ئێمە تەنها بۆ تاقیکردنەوەیە ، هەروەك فەرمووی :** ﴿ ولويشاء الله لانتصر منهم ولكن ليبلو بعضكم ببعض ﴾

**تێگەیشتن لەوەی کە تەنها خوا (ولی) و دۆست و پشتگیری موسڵمانانە زۆر جەختی کراوەتە سەر** ﴿ ذلك بأن الله <u>مولى</u> الذين امنوا وأن الكافرين <u>لا مولى</u> لهم ﴾ .
**هەروەها لەسەر زمانی حەزرەتی موساش دەفەرموێت** ﴿ وقال موسى ان تكفروا أنتم ومن في الارض جميعاً فان الله <u>لغني</u> حميد ﴾ ابراهيم : ٨ **وە دەفەرموێ :** ﴿ ان تكفروا فان الله <u>غني عنكم</u> ولا يرضى لعباده الكفر ، وان تشكروا يرضه لكم ولاتزر وازرة وزر اخرى ، ثم الى ربكم مرجعكم فينبئكم بما كنتم تعملون ، انه عليم بذات الصدور ﴾ الزمر : ٧

## نمونەیەك لە ژیاننامەی حەزرەتەوە :

**پاش غەزای ئوحود ئەبوسوفیان بانگی کرد لەموسڵمانان : ئایا (محمد) تان لەناودایە ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : وەلاَمی مەدەنەوە ، سیٚجار ئەمەی دوبارەکردەوە پاشان وتی : ئەبوبەکرتان لەناودایە ؟ حەزرەت ﷺ فەرمووی وەلاَمی مەدەنەوە ،**

سێ‌جار ئەمەشی دووبارە کردەوە .... ئنجا وتی : عومەرتان لەناودایە ؟ حەزرەت ﷺ فەرمووی وەڵام مەدەنەوە ، ئەبوسوفیانیش ئەمەشی سێ‌جار دووبارەکردەوە ... کەکەس وەڵامی نەدایەوە بەدەنگی بەرز بە قورەیشیەکانی وت : لەدەست ئەم سیانەیان رزگارتان بوو ... لێرەدا عومەر خۆی پێ‌نەگیراو وتی: بەخوا ئەی دوژمنی خوا ئەوانە هەموو زیندوون و خوا بەشی بەدبەخت کردنی تۆی هێشتۆتەوە ... ئەویش وتی : بەخوا (عمر) من باوەڕ بەتۆ ئەکەم .

پاشان ئەبوسوفیان هاواری‌کرد ، باش بوو ، جەنگ بەنۆرەیە ، ئەم رۆژە بەرۆژەکەی بەدر و ، وادەمان ساڵێکی تر و بەدربێ‌ ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : بڵێن باشە و وادەمان بێ‌و رۆژەکانمان وەك یەك نین ... کوژراوی ئێمە لەبەهەشتان و وکوژراوی ئێوە لەئاگری دۆزەخدان ...

ئنجا وتی : بڵندبە (هبل) ... پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بەعومەر وەڵامی بدەرەوە و بڵێ‌ : خوا گەورەتر و بڵندترە ... ئەبوسوفیان وتی : ئێمە ( عزی) مان هەیە وئێوە نیتانە ،پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : بڵێن : خوای گەورە پشتیوانی ئێمەیە و ئێوە پشتیوانتان نیە ( الله مولانا ولا مولی لکم ...) .

## هەوڵ و تێکۆشانی هاوەڵان

### ا ـ زەید و خوبەیب :

لەمانگی صەفەری ساڵی چوارەمی کۆچی‌دا ، دوا بەدوای شەهیدکردنی حەفتا موسڵمان بە ناڕەوا لە( بئر المعونة ) دا لەلایەن هۆزەکانی (سولەیم) ەوە ، نوێنەری (عضل) و (قارة) هاتنە مەدینە و بەسەرزاری موسڵمان بوونی خۆیان راگەیاند و داوایان لەحەزرەت کرد ﷺ کەچەند هاوەڵێکی موسڵمانی شارەزای قورئان بنێرێت لەگەڵیانا تافێری ئیسلامیان بکەن ...

پێغەمبەر ﷺ دەهاوەڵی شارەزای لەگەڵیانا نارد و ( مرثد کوڕی ابي مرثد ) ی کردە ئەمیریان.

پاش ئەوەی لەگەڵ موسڵمانەکان دا ئەوکەسانە گەڕانەوە بەرەو ناوچەکانی خۆیان ، لەرێگا لەسەر ئاوی (رجیع) لایاندا ، کاتێکیان زانی نزیکەی سێ‌صەد کەس بەچەکەوە هاتنە سەریان کە ئەمەش پیلانێك بوو داڕێژرابوو بۆ زیان گەیاندن بەبانگەوازی ئیسلامی ...

حەوت کەس لەهاوەڵان شەهیدبوون و سیانیشیان کەزەیدی کوڕی دثنةو خوبەیبی کوڕی عەدیی و عەبدوڵلای کوڕی تاریق بوون ، کەزانیان بەرگری کردن سوودی نیە ، ڕازی بوون بەبەڵێنی کافرەکان کە ئەگەر خۆیان بدەن بەدەستەوە نایانکوژن ، بەلاّم دیارە کافران بەڵێنیان نا بەنەسەر ، بۆیە هەر زوو قۆڵ بەستیان کردن و بردیانن بەرەو مەککە ، لەرێگا کە گەیشتنە ( مر الظهران) ، عەبدوڵلای کوڕی تاریق پەلاماری شمشێرێکی داو ویستی دەربازبێ ، بەلاّم کافران توانیان دەوری بدەن و ، بەبەرد بارانکردن شەهیدیانکرد.

هۆزی هوزەیل ، زەید و خوبەیبیان بەرەو مەککە برد و گۆڕیاننەوە بە دووکەسی هوزەیل کەلەلای خەڵکی مەککە دیل کرابوون.

ئنجا صەفوانی کوڕی ئومەییە ، زەیدی کڕی تا لە تۆڵەی ئومەییەی کوڕی خەلەفی باوکیا بیکوژێتەوە ، کە موسڵمانەکان لەجەنگی بەدردا کوشتبوویان وەحوجەیری کوڕی ئەبی ئیهابیش خوبەیبی کڕی بۆ عوقبەی کوری حارێثی کوری عامیری خوشکەزای تا لەتۆڵەی باوکی کوژراویدا لەبەدردا بیکوژێتەوە .

بەلاّم لەبەرئەوەی ئەم ڕووداوە لەمانگەکانی حەرامدا بوو ، هەردوودیلەکەیان خستە بەندیخانەوە و کوشتنەکەیان دواخستن تا ئەم مانگانە بەسەربچن .

خوبەیب لەماڵی (ماویە) ی کارەکەری حوجەیردا بەندکرابوو ، جا لەم کاتەدا زۆرشتی سەیری بەخوبەیبەوە بینی بۆیە دوایی موسڵمانیش بوو ، هەروەك خۆی دەیگێڕێتەوە و دەڵێ : (خوبەیب لەماڵەکەی مندا بەندکرابوو ، ڕۆژێکیان چووم بەسەرا، هێشووە ترێیەکی بەدەستەوەبوو لێی دەخوارد ، باوەڕناکەم لەوکاتەدا لەسەر زەوی خوادا ترێ بووبێ) .

کاتێ خوبەیب زانی شەهیدکردنی نزیك بۆتەوە ، داوای گوێزانێکی لە (ماویە) کرد تا خۆی پاك و ئامادەبکات بۆ شەهیدکردن .

ماویە ئەڵێ : ( گوێزانەکەم دا بەمناڵێکی دراوسێمان و پێم وت : بیبە بۆ ئەو پیاوەی وا لەژوورەوە ... جا هەر ئەوەندە مناڵەکە ڕۆیشت و بردی خێرا بەخۆمم وت : چیم کرد ؟ بەخوا کابرا ، بەکوشتنی مناڵەکە ، تۆڵەی خۆی کردەوە ، ئەوکاتە ئەبێتە پیاوێك بەپیاوێك) .خوبەیب گوێزانەکەی وەرگرت و سۆزی بۆی جولاّو وتی : دایکت لەناپاکیکردنی من نەترسا ، وا ئەمەی پیاناردی ؟ ئنجا کەوتە لاواندنی و یاریکردن

**لەگەڵیا ... ئا لەم کاتەدا ئافرەتەکە هات و خوبەیب سەیری کرد و پیّی وت : وادەزانی من دەیکوژم ؟ ئاینەکەم دوورە پەرێزی کردووم لەستەم و ناپاکی !**

**زەید و خوبەیبیان برد بۆ( التنعیم) کەسێ میل لەمەککەوە دوورە لەسەر رێگای مەدینە ، صەفوانی کوڕی ئومەیە ، زەیدی دایە دەست خزمەتکارێکی کەناوی(نە سطاس)بوو تا بیکوژێ ...**

**ئەبوسفیان بەزەیدی وت : سوێندت ئەدەم بەخوا ئەی زەید ، ئایا پێت خۆشە ئێستا (محمد) لەم شوێنەی تۆدابێت و ئێمە بدەین لەگەردنی و تۆش لەناوخێزانی خۆتابیت ؟ زەید وتی نەبەخوا ، پێم خۆش نیە لەوشوێنەدا کە ئێستا (محمد) تیا دانیشتووە درکێکی پیابچێ و منیش لەناو خاوو خێزانما دانیشم !**

**ئەبوسفیان وتی : کەسم نەدیوە وایەکێکی خۆش بوێ وەك هاوەڵانی محمد کە محمدیان خۆش ئەوێت .**

**نە سطاس بەفەرمانی صەفوانی ئاغای زەیدی شەهیدکردو ، بەبەهەشتی بەرین شادبوو ، شایانی باسە (نە سطاس) لەپاش چەندساڵێك موسڵمان بوو ...**

**کاتێك خوبەیبیان برد بیکوژن وتی : مۆڵەتم بدەن بادوورکات نوێژ بکەم کەنوێژەکەی کرد پیّی وتن : بەخوا لەبەرئەوە نەبوایە کە ئێوە واتیّبگەن لەترسی مەرگ درێژەم دا بەنوێژەکەم ، نوێژی زۆرم ئەکرد ! (واتە / حەزم دەکرد زیاتر لەخزمەت پەروەردگاردا رابوەستامایە و نوێژم بکردایە ، شایانی باسە خوبەیب یەکەم کەسە کە ئەم دوورکات نوێژەی داهێنا لەپێش شەهیدکردندا )**

**ئنجا خوبەیب ئەم هەڵبەستەی وت کە تیایدا دەری دەخات بەهیچ شێوەیەك باکی نیە لە شەهیدبوون و بەشادمانی بەرەو پیری مەرگ دەچێت :**

| ولست ابالي حين أقتل مسلماً | على أي شق كان في الله مصرعي |
|---|---|
| وذلك في ذات الاله وان يشأ | يبارك على أوصال شلو ممزق |

**وە لەدودێڕیتردا دەڵێ : بەهیچ شێوەیەك مل بۆ دوژمن کەچ ناکەم چونکە گەڕانەوە هەر بۆ لای خودایە ...**

ولست بمبدٍ للعدو تخشعاً
ولاجزعاً اني الى الله مرجعي

**ئنجا پێڕی خوانەناسان دەستیان دایە بڕینی گۆشتی ئەندامانی لاشەی هەر بە زیندوویی بۆ ئەوەی وازبێنێ لەئیسلام و هەڵگەڕێتەوە ، پاشان پیّیان وت : لەئیسلام**

پەشیمان بەرەوە وازت لێدێنین ، وتی : نا بەخوا پەشیمان نابمەوە ، ئەگەر هەموو دنیاشم بدەنێ ...

ئنجا لەگەڵ هەموو گۆشت برینێکیدا لێیان دەپرسی : ئایا پێت خۆشە محمد لەم شوێنەدا بوایە و تۆش رزگارت بوایە ؟ ئەویش لەوەلامدا دەیووت : نە بەخوا ، پێم خۆش نیە من ئێستا لەناومالْ و منالی خۆمابم و محمدیش دڕکێکی پیابچێ .

ئنجا کافران روویان لەکەعبە وەرگێڕاو ئەویش پی‌ی وتن : کە ئێوە رووم لەقیبلە وەردەگێڕن ، خوای گەورە بڕیاریداوە موسڵمان بۆ هەرکوێ رووبکا ، ئەگەر نیازی خوابێت ، ئەوە رووی لەخوا کردووە ﴿ فاينما تولوا فثم وجه الله ﴾ البقرة : ١١٥ /

ئنجا وتی : خوایە ، جگە لەدوژمنان هیچ کەس نابینم ، خوایە هیچ کەس نیە تاسەلامم بگەیەنێ بەپێغەمبەرەکەت ، خوایە خۆت سەلامی منی پێ بگەیەنە.

پاشان دوعای لەکافران کرد و وتی : ( اللهم احصهم عدداً ، واقتلهم بدداً ، ولاتغادر منهم أحداً ) ...

کە ئەم دوعایەی کرد ئەبوسوفیان خێرا معاویەی کوڕی پاڵخست لەترسی نزاکەی خوبەیب ، چونکە بڕوایان وابوو ، هەرکەسێ نزای لێبکرێ و پاڵ بکەوێ کاری لێناکات پاشان خوبەیب بەزۆر خۆی راستکردەوە بەرەوقیبلەو وتی ( سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەرووی کردمەوە ئەو قیبلەیەی کە بۆ خۆی و پێغەمبەرەکەی و بۆ موسڵمانەکانی بڕیارداوە ) ئنجا چل گەنج بەنێزەوە دایان گرتەوە ، خوبەیب لەدوا هەناسەکانیدا هاواریکرد و وتی ( لا اله الا الله محمد سول الله)و شەهیدبوو ..

ئوسامە دەڵێ لەو رۆژەدا کەقورەیش خوبەیبیان لەسێدارە دا، پێغەمبەر ﷺ لەنێو هاوەڵەکانیدا دانیشتبوو ، ئەو شێوەیەی بەسەردا هات کەلەکاتی هاتنی وەحیدا بەسەری دەهات ، ئنجا گوێمان لێ بوو ئەیفەرموو : ( وعليه السلام ورحمة الله وبركاته ) جا فەرمووی : ئەوە جبریلە سەلامی خوبەیبی بۆهێناوم و قورەیش کوشتوویانە.

لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ عەمری کوڕی ئومەییەی لەگەڵ سەلەمەی کوڕی ئەسلەمدا ناردبوو بۆ مەککە تا ئەبوسوفیانی کوری حەرب بکوژن لەتۆڵەی ئەوەدا کەپیاوێکی خوانەناسی ناردبووە مەدینە تا پێغەمبەر ﷺ بکوژێت ( بەڵام خواویستی وابوو پێغەمبەرەکەی ئاگاداربکا ، ئنجا کابراش راستی نیازەکەی و ئەوەی کە ناردبووی راستە وخۆ ئاشکرای کرد) .

عـەمرو هاوەڵەکـەی گەیشــتنە مەککـە و تـەوافی کەعبـەیان کـرد ، بـەڵام لەبـەر ئاشکرابونیان نەیانتوانی بەکارەکەیان هەڵسن ، بۆیە لەمەککە هەڵاتن و بەمەینەتێکی زۆر لەدەسـتی قورەیـش رزگاریـان بـوو تـا گەیشتنە (تـەنعیم) ، ئـەو ناوچەیـەی کـە خوبەیبی تیا شەهیدکرا ، سەیر دەکەن خوبەیب لەسێدارە دراوەو و پاسەوانی قورەیش بەدەوریدان ، بۆیە عەمر مایەوە تا پاسەوانەکان خەوتن ،ئنجا بەپەلە لەشەودا خوبەیبی کـردەوە و ویستی تەرمەکەی راکێشێ ، پاسـەوانەکان خەبـەریان بـۆوە ، ناچـار خـۆی لـەوناوەدا شـاردەوە ، دوایـی گەڕایـەوە سـەری نـەیبینی ، بەرەبـەیانی هاتـەوە هیچـی نـەبینی ، ناچـار گەڕایـەوە لای حـەزرەت ﷺ و بـۆی گێڕایـەوە ئـەویش فـەرمووی : ( خوبەیب مەلائیکەت ناشتوویانە بۆیە دیار نەماوە ) ( زنجیرەی هاوەڵان /حەبیب محمد سعید) و بەرنامەی نلقی الاحبة / قناة اقرأ .

خوبـەیب و زەیـد و شـەهیدانی دیکـەی ئیسـلام بـەخوێنی گەشـیان مەشـخەڵی ئیمانیان گەیاندە دەست نەوەی دوای خۆیان ، کاریگەری زۆریان هەبوو لەبـەرەو پێش بردنی ئیسلام دا و بلاوبوونەوەی زیاتریدا ...

هەڵوێستی مەردانەی خوبەیبی ئازا و نەبەرد بووە هـۆی موسـڵمان بوونـی (ماویـە) کەلـەماڵیاندا بـەندکرابوو ، هــەروەها لـەکاتی شـەهید بوونیشـدا بـووە هـۆی موسـڵمان بوونی (سەعیدی کوری عامیر) کەلەگەڵ کافرەکان دا وەستابوو ، زۆر جار سەعید دوای ئـەو رووداوە و موسـڵمان بوونـی ، کـەیادی شـەهید بوونەکـەی خوبـەیبی دەکـردەوە لەکاریگەری زۆری ئەو رووداوە لەسەر دڵ و دەروونی بۆ ماوەیەك لەهۆش خۆی دەچوو ... کاتێك پرسیاری لەوبارەیەوە لێکرا وتی : (بەخوا هەرچەند ئەو رۆژەم بیردەکەوێتەوە ، کەچۆن کۆمەکی ئەوم نەکرد ، وا ئەزانم هەرگیز خوا لێم خۆش نابێت ) ...

**(٢) تەڵحەی کوڕی عبیداللە :**

لاوێکی تەمەن (١٥) ساڵ بـوو ، وریـا و لێهاتوو زیـرەك بـوو ، لەگـەڵ قورەیشـدا بـۆ بازرگانی چوو بۆ شاری (بوصـرا) لەشام ... کـاتێك سـەرگەرمی کڕینـی شـتومەك بوو ، گوێی لەراهیبێك بوو جاڕی دەدا ، ئەی بازرگانەکان کامتان خەڵکی مەککەن ؟؟،تەڵحە چوو بۆلای و وتی : من خەڵکی مەککە م ، راهیبەکە وتـی : ئایـا ئـەحمـەد ناوێکتـان تیـا پەیدا نەبووە ؟، وتی : ئەحمەد کێیە ؟ وتی : ( کوڕی عبداللە کوڕی عەبدولموتەلیب) ە

... ئێستا کاتی هەڵبژاردنی ئەو پێغەمبەرەیە ، ئەگەر هەڵبژێردرا کەس پێشت نەکەوێ بۆ ئیمان هێنان پێی چونکە ئەو بەڕاستی پێغەمبەری خوایە .

تەڵحە کە ئەمەی بیست خێرا کارەکانی تەواوکرد و لەکاروانی قورەیشیەکان جیابوویەوە و بەخێرایی گەڕایەوە بۆ مەککە و ، لەدایکی پرسی هیچی تازە رووی نەداوە لەمەککەدا ؟ وتی : نازانم . ئنجاچوو بۆ لای ئەبوبەکری ئامۆزای و پرسیاری لەم بارەیەوە لێ کرد، ئەویش وتی : بەڵێ تازە محمدی کوڕی عەبدوڵلا هەڵبژێردراوە لەلایەن خواوە ...

پاشان بەیەکەوە چوونە لای حەزرەت ﷺ و ئەویش قورئانی بۆ خوێند و تەڵحە موسڵمان بوو ، پاشان تەڵحە بەسەرهاتەکەی شاری (بوصرا) ی بۆ حەزرەت ﷺ گێڕایەوە ، ئەویش رووی نورینی گەشایەوە و زۆری پێخۆش بوو کەلەشامەوە راهیبێك هەواڵ بدات بەهاتنی.

دایکی تەڵحە سێ ساڵ سزای دا بۆ ئەوەی پەشیمان ببێتەوە کەچیسوودی نەبوو ، لەگەڵ حەزرەتدا ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە و لەجەنگی بەدردا لەدەرەوەی مەدینە خەریکی بازرگانی بوو ، هەرچەند بەشداریشی نەکردبوو ، حەزرەت ﷺ بەشێکی لەغەنیمەت بۆ دانا ، تەڵحە وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئایا من هیچ پاداشتم دەست نەکەوتووە ، حەزرەت ﷺفەرمووی : بەڵێتۆ بەهێندەی پێنج کەس پاداشتت دەستکەوتووە ( ڕەنگە بەفەرمانی پێغەمبەر ﷺ چووبێ بۆ کاری بازرگانی ) .

لەجەنگی ئوحودا بەشداری کرد ، بەجۆرێك هەرکاتێك باسی ئەو ڕۆژە بکرایە ئەبوبەکر دەیووت : ئەو ڕۆژە ڕۆژی تەڵحە بوو .

لەورۆژەدا هاوەڵان تێشکان بەدابەزینیان لەکێوی ئوحود و ، شپرزەبون و ، جارڕدرا حەزرەت ﷺ کوژراوە و، ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵان شەهید بوون ، دوژمن شوێنی پێغەمبەری ﷺ دۆزیەوە و بەهەمووان هێرشیان بۆی دەکرد تا بیکوژن ... حەزرەتیش تەنها دە لاوی ئەنصاری و یەزیدی کوری سەکەن و تەڵحەی لەگەلا بوو ، حەزرەت دەیویست وردە وردە بکشێتەوە بۆ پاڵ کێوی ئوحود ، دوژمنانیش بەهوروژم دەهاتن ، حەزرەت ﷺ فەرموی : کێ دەیانگێڕێتەوە و ڕووبەڕوویان دەبێتەوە هاوەڵم دەبێت لەبەهەشتا ... تەڵحە وتی : من ! حەزرەت ﷺ فەرمووی جاری تۆ بوەستە ... لاوێکی

ئەنصاری چووە پێشەوە و شەهید بوو ،بەم جۆرە هەردەلاوەکە یەك بەدوای یەکدا لەگەڵ یەزیدیشدا شەهید بوون ...

ئنجا حەزرەت ﷺ فەرمووی : دەی تەڵحە تۆ بچۆ رووبەڕوویان بەرەوە ، تەڵحەش وەك شێر پەلاماری دان ، هەر ئەوەندە تۆزێ دوور دەکەوتنەوە خێرا دەهاتەوە بەلای حەزرەتەوە ﷺ ویارمەتی دەداو وپشتی بۆ دادەنا تاسەر کەوێتە سەرەوە ... بەم جۆرە لەخزمەتیا بوو ،وە لەبەردەمیا وەستابوو بۆی بوبوو بەقەڵغان و بەحەزرەتی دەووت : سەرم بەقوربانی سەرت بێت خۆت دەرمەخە باتیری دوژمنانت بەرنەکەوێ ! لەوکاتەدا تیرێك هات و تەڵحە دەستی دایەبەر ، بەوەش دەستی تووشی شەلەل بوو (حەزرەت ﷺ کە ئەم فیداکاری‌یەی بینی لێی فەرمووی : تەڵحە بەهەشتی بۆ خۆی مسۆگەر کرد ) .

تەڵحە لەزیاتر لەحەفتالاوە برینـدار بـوو خوێنـی لەبـەر دەڕۆیشــت و لـەناو شـەهیدەکان دا لـەهۆش خـۆی چـوو ، ئەبوبـەکر و ئەبوعوبـەیدەش هـاتن بـەلای پێغەمبـەرەوە تا خوێنی دەم وچاوی حەزرەت بگیرسێننەوە ، لەبەرئەوەی بەخەستی برینداربوو بوو بەهۆی چاڵێکەوە کە (ئەبو عامری فاسق هەڵی کەندبوو وەك داوێك بۆ موسڵمانان ) ..

حەزرەت ﷺ فەرمووی : واز لەمن بهێنن ، برۆن بەلای تەڵحەی براتانەوە ، کە تەڵحە هاتەوە هۆش خۆی وتی : پێغەمبەر ﷺ چی‌ی لێهات ؟ وتیان: سەلامەتە ، وتی پیشانم بدەن، کەپشانیاندا وتی : هەموو بەڵاو موسیبەتێك ئاسانە بەمەرجێ تۆ سەلامەت بیت .

وتیان : با تۆ بگێڕینەوە بۆ مەدینە ، رازی نەبوو وتی : چۆن حەزرەت ﷺ بەجێ دەهێڵم ؟! لەو رۆژەدا حەزرەت ﷺ ناوی نا ،(تەڵحەی خێر ) کە هەموو گیانی خێر و بەرەکەت و ئازایەتی‌یە ..

تەڵحە پیاوێکی بازرگان بوو ، پارەیەکی زۆری دەست دەکەوت ، رۆژێك هاتەوەماڵەوە بە (ئوم کلثوم) ی هاوسەری وت کە کچی ئەبوبەکر بوو ، من زۆر بێتاقەتم ، وتی : خۆ بێتاقەتی‌یەکەت بەهۆی ئێمەوە نیە ؟! وتی : نەخێر ، خوا پاداشتت باتەوە تۆ باشترین هاوسەریت ، بەڵام من خەممە خوا پرسیاری ئەم هەموو پارەیەم لێ بکات ، ئەویش وتی : ئاسانە ، ئەوە چەندەها توورەکە پارەیان تێبکە تا بیان بەخشینەوە بەسەر هەژاراندا ... بەو شێوەیە هەر بەو شەوە پارەیەکی زۆری بەخشیەوە...

لەجەنگی حونەین دا ئەوەندەی بەخشی حەزرەت ﷺ ناوی نا تەڵحەی سەخی ...

لەجەنگی( تەبوك) یشدا بیریکی بۆ موسڵمانان کڕییەوە ئاوی لێبخۆنەوە و هاوکارییەکی باشی سوپاکەی کرد ، حەزرەت ناوبانگی تەڵحەی ( الفیاض) ی دایە و فەرمووی : ( انك یا طلحة الفیاض ) واتە : ئەی تەڵحە تۆ خێر و چاکەت هەڵدەقوڵێ و سەردەکات !

هاوەڵان بە تەڵحە یان دەووت : شەهیدی زیندوو ... لەبەرئەوەی حەزرەت پاش جەنگی ئوحود وتاری دا و ، فەرمووی : ﴿من المؤمنین رجال صدقوا ما عاهدوا الله علیه فمنهم من قضی نَحْبَهُ ومنهم مَن ینتظر وما بدلوا تبدیلا ﴾ الاحزاب : ٢٤

واتە : لەنێوان بڕوادارانـدا کەسانێك هەن کە پابەندن بەوپەیمانەی بەپەروەردگاریان داوە و لێی لانادەن ، هەیانە شەهید بوون ، یاخود کۆچی دواییان کردوە ، هەشیانە چاوەڕوانن و بەهیچ شێوەیەك گۆڕان و لادان رووی تێ نەکردوون .. ﴿لیجزي الله الصادقین بصدقهم ویعذب المنافقین ان شاء أو یتوب علیهم ان الله كان غفوراً رحیماً ﴾ واتە : تا خوای گەورە بەهۆی راستگۆییانەوە پاداشتی راستگۆیان بداتەوە . هەروەها سزای دووڕووەکانیش بدات ، یان تەوبە و پەشیمانیان لێوەربگرێت ، بەڕاستی خوا هەمیشە میهرەبان و لێبووردەیە .

پیاوێك هەستاو وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە کێن ؟ لەوکاتەدا تەڵحە هات ، پێغەمبەر رووی کردەپرسیارکەر و ئامـاژەی بـۆ تەڵحـە کـرد و فـەرمووی ( کـاکی پرسیارکەر ، ئەمە یەکێکە لەو شەهیدە زیندووانە !)

دوای ئەو رۆژە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو : ( من سره أن ینظر الی رجل یمشي علی الارض ، قد قضی نحبه ، فلینظر الی طلحة بن عبیدالله) . واتە : هەرکەس پێی خۆشە سەیری پیاوێکی شەهید بکا کەلەسەر زەویدا ئەگەڕێ ، باسەیری تەڵحەی کوری عبیدالله بکات.

لەشەڕی (جمل)دا سوپای عائیشە و سوپای ئیمامی عەلی خەریك بوو بگەنە رێکەوتن و هەمووان بگەڕێنەوە ، لەوکاتە ناسکەدا جوولەکەیەکی بەڕووکەش موسڵمان ، تیرێکی گرتە تەڵحە و قاچی بریندار کرد و تووشی خوێن بەربوون بوو وە سەرەنجام شەهیدبوو ، بەوەش شەڕەکە هەڵگیرسا و خەڵکێکی زۆر کوژران کە لەخەیاڵی هیچ لایەکیان دانەبوو ، بەڵکو ئاژاوەگێڕەکان وبکوژەکانی ( عوسمانی کوری عەفان) ئاگرەکەیان خۆشکردو فیتنە و ئاشوبەکەیان نایەوە .

تەڵحە هەر لەوناوەدا لەشاری (بەصرە) نێژرا ... پاش بیست ساڵ چووە خەوی (عائیشە) ی کچی‌یەوە وتی : ئاو هاتۆتە ناو قەبرەکەم و بمگوێزنەوە ، کە قەبرەکەیان هەڵدایەوە ، ئاو چوبووە ناوی و لاشەکەی هیچ تێك نەچوو بوو وە گۆڕانی بەسەردا نەهاتبوو ، تەنها ریشی نەبێ چەند موویەکی سپی تێکەوتبوو !!

لەکاتی شەهید بوونەکەی‌دا ئیمامی عەلی سەری لەسەر رانی خۆی داناو زۆر گریا و فەرمووی : خۆزگە بیست ساڵ پێش ئێستا بمردمایە و ئەم رۆژەم نەبینیایە ، پاشان فەرمووی : (من شایەتم کە حەزرەت ﷺ فەرمووی : تەڵحە دراوسێمە لە بەهەشت دا ) ...

(تەڵحەی کوڕی عبید الله ـ حبیب محمد سعید ، بەرنامەی اقرأ ـ نلقی الاحبة ).

# چاو لەهیممەت بەرزان بکەن

## ۱) پیرێژنێکی بەنی ئیسرائیل :

رۆژێك پێغەمبەر ﷺ دەبێت بەمیوانی عەرەبێکی دەشتەکی ، زۆر رێز لەحەزرەت دەگرێ و خزمەتی دەکات ، ئەویش پێ‌ی دەفەرمووێ : چیت دەوێ داوابکە ، کابرا وتی : ئەی نێرراوی خوا ، حوشترێك بەپێداویستی‌یەکانیەوە و ، بزنێك کەخێزانم بیدۆشێ ، ئەمەی دووجار دووبارە کردەوە .

حەزرەت ﷺ پێ‌ی فەرموو : ( نەت توانی وەك پیرێژنەکەی بەنی ئیسرائیل بیت) هاوەڵان وتیان : ئەی نێردراوی خوا پیرێژنەکەی بەنی ئیسرائیل چی‌یە ؟ فەرمووی : (کاتێك موسی (سەلامی خوای لێبێت) ویستی لەگەڵ بەنی ئیسرائیلدا شەو دەرچێ ، رێ‌ی لێتێك چوو ، زانایانی بەنی ئیسرائیل وتیان : رەنگە حیکمەتی تیابێت ون بووین و رێمان لێتێك چووە ، بۆ ئەوەی کە هەرخۆمان نەرۆێن و، دەمانەوێ پێت بڵێین کە حەزرەتی یوسف پەیمانی لێوەرگرتووین کە ئەگەر لەمیسر دەرچووین لاشەی ئەویش لەگەڵ خۆمان ببەین...

موسی فەرمووی : کامتان دەزانێ قەبری یوسف لەکوێیە ؟ وتیان : تەنها پیرێژنێکی بەنی ئیسرائیل دەزانێ قەبری یوسف لەکوێیە ، ناردی بەدوای‌دا و کەهات پێ‌ی فەرموو : قەبری (یوسف) م پێ‌نیشان بدە ، وتی : بەخوا پیشانت نادەم هەتاوەکو نەبمە هاوەڵت لەبەهەشتا .

ئەویش پـیّی نـاخۆش بوو ، ( ڕەنگـە لەبەرئـەوە بیّکـە ئـەو داوایــەی بـۆ چوونـە بەهەشـت بەدەسـت ئـەو نیـە ، یـان لەبەرئـەوەی کـە ئـەو پرسـیارەی بـۆ پیشـان دانـی قەبرەکە،کەی ئەوە دیّنیّ و ئەوەندە گەورەیە بەرامبەر بەهەشت بیّ ؟ ) . خـوای گـەورە سرووشـی بـۆ نـارد ، کەپـەیمانی بەهەشـتی بدەریّ... کـە پـەیمانی چوونـە بەهەشـت و هاوەڵێتیدایـە ، ئـەویش شـوێنێکی پیشـاندان کـە ئـاوی تیاوەسـتابوو ، وتـی : ئاوەکـە لابـدەن ، کـەلایان بـرد ، وتـی : دەی ئێرە هەڵکەنن ، کەهەڵیان کـەند لاشـەی حـەزرەتی یوسف دەرکەوت ، لاشەکەی هیچ تێك نـەچوو بـوو ، کـەدەریان هێنـا دەدرەوشایەوە و رێگای بەوشەوە بۆ ڕووناك کردنەوە و ریّی خۆیان دۆزیەوە .( دەڵێن لاشەی حەزرەتی یوسف و حەزرەتی موساش سەلامی خوایان لەسەربیّ لەفەلستین نێژراون ) .

ئەمەش بەڵگەیە لە سەر ئەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام گرنگی زۆریداوە بەهیممەت بـەرزی و دوورکـەوتنـەوە لـەتەمـەڵی و سسـتی و کـەمتەرخـەمی ... تەنانـەت حـەزرەت دەفەرمویّ : ئەگەر داوای بەهەشتان کرد ، داوای (فیردەوسی ئەعلا) بکەن . [١]

## ٢) ڕەبیعەی کوڕی کەعب :

لاوێکـی تـازە پیّگەیشـتووی مەدینـەبوو ، حـەزی کـرد کـە هەمیشـە لەخزمـەت پێغەمبەردا بێت ﷺ ، بۆیە داوای لیّکرد کە بیێتە خزمـەتکاری و هـەرچی کارێکی هـەبیّ بۆی جیّبـەجیّ بکات ... جاری وا هـەبوو بێجگـە لـەڕۆژ بەشـەویش دەمایـەوە ولـەدڵی خۆیدا دەیووت نەك حەزرەت ﷺ بەشەو کارێکی هەبیّ ...

بەڵیّ بەشەو لەدەرەوەی ماڵی حەزرەت ﷺ لەمزگەوتەکەدا دەمایـەوە ، حـەزرەتیش زۆربەی شەوی بەشەونوێژ بەسەردەبرد و قورئـانی زۆری دەخوێنـد ، ڕەبیعـەش گـویّی دەگرت تاماندو دەبوو، وە خەوی لیّدەکەوت .

ڕۆژێك حەزرەت ﷺ پیّی فەرموو : ئەی ڕەبیعەی کوری کەعب !

وەڵامـی دایـەوە : ( لبیـك یارسـول الله وسـعدیك) واتــە : گـویّ ڕایــەڵ و فـەرمان بەردارتم ، خوای گەورە جار لەدوای جار بەختەوەرترت بکات .

فەرمووی : داوای شتێك بکە بۆت بکەم و پێت ببەخشم .

ڕەبیعە ماوەیەك بیّدەنگ بوو بیری کردەوە ، دوایی وتی :

ئەی پێغەمبەری خوا ! ماوەم بدە تا بیربکەمەوە . فەرمووی : قەیناکە بیربکەرەوە . ڕەبیعە هەژار و کەم دەست بوو لەگەڵ (ئەهل صوفە)دا دەمایەوە لەمزگەوتی پێغەمبەردا

ﷺ ، بەبیری دا هات داوای شتی دنیایی لەحەزرەت ﷺ بکات ، بەلاَم بەخۆی وت : دنیا هەرچی بێت تەواو دەبێت ، قیامەت چاکترە .

جا هاتەوە خزمەت حەزرەت ، لێی پرسیەوە : رەبیعە چیت دەوێ بت دەمێ ؟

وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! داوات لێدەکەم کەلەخوای گەورە بۆم بپاڕێیتەوە تا لەبەهەشتدا بم کاتە هاوڕێت .... حەزرەت ﷺ فەرمووی : کێ ئەمەی فێرکردیت ؟

وتی : بەخوا کەس فێری نەکردووم ، خۆم بیرم لێکردۆتەوە و قیامەتم پێباشترە لەدنیا .حەزرەت ﷺ ماوەیەك بێدەنگ بوو ئنجا فەرمووی: رەبیعە ئەی شتی تر نابێت ؟

رەبیعە وتی : نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەوەی داوام لێکردووی بەهیچی تری ناگۆڕمەوە،ئەویش فەرمووی : ( اذن أعنّي على نفسك بكثرة السجود) واتە کەواتە بەنوێژ و سوجدەی زۆر هاوکاری خۆت بکە کەشیاوبیت بۆ بەهەشت.

**٣ ) ئەبو مسلم الخولانی :**

یەکێبوو لەشوێن کەوتوان و خاوەن هیممەتێکی بەرز بوو ، لەگەڵ ئەوەدا کە خواپەرستی زۆری دەکرد ، قامچیەکی لەماڵەوە هەڵواسیبوو بەدیواری ئەوشوێنەوە کەنوێژی تیادەکرد ، ئەگەر سستی‌یەکی لەخۆیدا بەدی بکردایە ، ئەیووت : ئەی نەفس هەڵدەستی باشە ، هەڵناستی ئەوە قامچی‌یە سزات دەدەم ... چۆن دەبێ کەمتەرخەمی بکەیت و دوابکەویت ، چۆن دەبێ هاوەڵاَن پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆیان بەرن و تەنها لەگەڵ ئەوان بێت ، ئێمەش هەوڵی زۆر دەدەین بۆ گەیشتن پێی ، وە هەتا هاوەڵاَنیش بزانن کە پیاویان دوای خۆیان بەجێ هێشتووە .

## گرنگی هەوڵ و هیممەت لەئیسلامدا

قورئان دەفەرموێت ﴿ ولاتهنوا ولا تحزنوا وأنتم الاعلون ان كنتم مؤمنين ﴾ واتە لاواز مەبن و خەمبار مەبن ، ئێوە بەرزترن ئەگەر بڕوادارن .

هەست کردن بەگەورەیی و پایە بەرزی لای هاوەڵاَن روون بوو ، بۆیە دەیان وت ( كنا قوماً اذلاء فاعزنا الله بالاسلام ) ئێمە گەلێکی زەلیل و بێدەسەلاَت بوین خوای گەورە بەئیسلام پایەدار و پایەبەرزی کردوین .

هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی پلەوپایەی بەرزی دینی و دنیایی ، خوای گەورە پێی خۆشە هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ﴿ ان الله يحب معالي الاخلاق ، ويكره سفاسفها﴾ صحيح الجامع / ١٨٨٩ سفاسف . واتە خراپ و بێنرخ لەهەموو شتێكدا .

هەروەك بۆ بالاْ دەستیوبەخشینیش دەفەرموێت ( اليد العليا خير من اليد السفلى )

هەروەهاپێغەمبەر ﷺ دوعای دەكرد و دەیفەرموو ( وأسالك العزيمة على الرشد) وە دەیەفەرموو (اللهم اني أعوذ بك من الهم والحزن ، وأعوذ بك من العجز و الكسل) وە لەفەرموودەیەكیشدا هاتووە كە حەزرەت ﷺ دەفەرموێ:( ان الله عزوجل يلوم على العجز ، فأنِل من نفسك الجهد ، فان غلبت ، فقل : توكلت على الله ، أو حسبي الله ونعم الوكيل ) (واتە خوا لۆمە دەكات لەسەر دەستەوسانی ، چەند دەتوانی هەوڵ بدە ، ئەگەر ژێر كەوتی ، ئەوە بڵێ ، پشتم بەخوا بەستوە ، یان تەنها خوام بەسە و هەر ئەو چاكترین دۆست و پاڵپشتە) ابوداود وطبراني ریوایەتیان كردووە / ل ١٥٣ مناهج التربية الاسلامية/ جزء ٣.

موسڵمانانیش هەردەم بەهیممەتی بەرزیان توانیویانە رووبەرووی دوژمنان ببنەوە و سەركەوتن بەدەست بهێنن ، هەروەك (مونتغمری) لەپەڕاوی (الحرب عبر التاريخ) دا شایەتیان بۆ دەدات و دەڵێ : ( گرنگترین سیفاتی سوپای ئیسلامی كەجیای دەكاتەوە لەسوپاكانیتر ، چەك و تەقەمەنی و رێكخستن نە بوو ، بەڵكو ئەو گیان فیدایی و ورە بەرزەیان بوو كەبەهۆی ئیمانیانەوە بە بانگەوازی ئیسلامی دروست دەبوو ) ل٩١ جند المعالى .

موسڵمانان سەردار و پێشەوای جیهان بوون ، هەركاتێكیش دواكەوتون و تووشی پاشا گەردانی بوون، زانایان و خواناسان ، ئەو راستیەیان خستۆتەوە بەرچاویان و هانیان داون لەسەر ورە بەرزی و كۆڵ نەدان ، ئەوە (ابن الجوزی) یە بەموسڵمانان دەڵێت : ( پێویستە مرۆڤی ژیر تا دوا پلە هەوڵ بدات ، ئەگەر تصور بكرێت كە مرۆڤ بگاتە ئاسمانەكان ، من وادەبینم كە زۆر كەم كوری و ناشیرینە مرۆڤ بەسەر زەوی رازی بێت !! وە ئەگەر پێغەمبەرایەتی بەهەوڵ و كۆشش بەدەست بهاتایە ، من وادەبینم ئەوەی هەوڵی بۆ نەدایە لەزۆنگاوو نزمترین پلەدایە ) ل ٢٦٣ التغير على منهاج النبوه (جمعه امين )

هەروەها (وهیب كوڕی الورد) دەڵێ : ( ئەگەر دەتوانی هەوڵ بدە كەس پێشت نەكەوێ لەگەیشتن بەخواو بەدەستهێنانی رەزامەندییدا ) .

ئەبێ ئەوەشمان بیر نەچێت کە دایك رۆڵێکی گرنگی هەیە لەپەروەردەکردن و هیممەت بەرزی منداڵەکانیدا ، نموونەش بۆ ئەمە زۆرە ، ئیمامی شافعی و بوخاری و مالیك و هارونە رەشید هەموویان بەهۆی دایکیانەوە پایەبەرز بوون و رێی هیممەت بەرزیان گرتەبەر .

## چەند نموونەیەکیتری هیممەت بەرزی

١) (**عبدالرحمانی داخل**) لاوێك بوو ، لەساڵی ١٣٢ کۆچیدا ، رووخانی ئەمەوییەکانی بینی و لەترسی گرتن و کوشتن ، دەشت و دەر و بیابان وچیای بڕی و گەیشتە (اندلس) و زۆر بەچالاکی و ژیرانە و بەهیممەتی بەرزەوە لەتەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا توانی دەوڵەتێ بۆ ئەمەوییەکان دابمەزرێنێت وە لەئەندەلس نزیکەی سیوسێ ساڵ و چوار مانگ فەرمانڕەوایی بکات و نازناوی هەڵۆی قورەیشی پێدرا ...

٢) (**عزالدین القسام**) یش پاش ئەوەی ئەزهەری تەواوکرد بیری دەکردەوە کەوەك (سلیمان حلبی) جیهاد بکات و چۆن ناوبراو گیانی سەرۆکی فەرەنسییەکانی بەجەهەنەم شادکرد ئەمیش روو بەرووی داگیرکەران ببێتەوە . جاکاتێ لەمیسر بوو لەبەرئەوەی بژێوی خۆی پەیدا بکات بەدەم خوێندنەکەیەوە هەریسەی دەفرۆشت ..

کاتێ گەڕایەوە سوریا کەوتە دژایەتی کردنی فەرەنسییەکان و دەیووت :ئەمانە ئەگەر رێیان لێنەگیرێ گەرا دادەنێن و فەساد دەنێنەوە لەم وڵاتەدا ... بەڵام لەبەرئەوەی فەرەنسییەکان زۆر فشاریان بۆ دەهێنا و سەیری کرد ناتوانێ بەچاکی کاری خۆی بکات ، چووە فەلەستین و لەوێش کەوتە هەوڵ و تێکۆشان دژی ئینگلیزی داگیرکەر و جوولەکەی خوێن رێژ ... وە هەمیشە دەیووت : عەرەبێکی زەمانی نەفامی لەپێناوی حوشترێك دا خۆی ئەدا بەکوشت ، ئێمەی موسڵمان چۆن بۆ پاراستنی خاکی ئیسلام خۆمان بەخت نەکەین ..؟!

سەرەنجام لەساڵی ١٩٣٥دا شۆڕشی هەڵگیرساند دژی ئینگلیز و جوولەکە و زۆری لێکوشتن ، تا لەشەڕێکدا دەوریان گرت ، کەلەگەڵ (یانزە) موجاهیدا بوو ، پاش شەڕێکی مەردانە شەهیدکراو بەئاواتی خۆی گەیشت و لاپەڕەیەکی گەشتی لەمێژووی خواناسی و تێکۆشاندا بۆ خۆی تۆمارکرد .

٣) (**شێخ ئەحمەد یاسین**) یش لەچواردەساڵیدا تووشی ئیفلیجی بوو ، لەساڵی ١٩٥٢دا ، بەوحاڵەشەوە خوێندنی تەواوکردو بوو بەمامۆستا ، توانی پێشەوایەتی

لاوان بکـات و بـەچاکی پـەروەردەیان بکـات بـۆ شـارەزا بـوون لەئاینەکـەیان و ڕووبەڕووبوونەوەی پیلانەکانی زایۆنی ، لەگەڵ ئەوەشدا کەبەندکراو تووشی هەزارەها چەرمەسەریێ بوو کۆڵی نەداو تائێستاش رابەری رۆحی بزوتنەوەی (حماس)ە و بووە بە رەمزی خواویستی و تێکۆشان و دەسەلاتدارێکی وەك ئەمیر عبدالله ی سعودیە و زۆر لەسـەرکردەکانی جیـهانی ئیسـلامی کـەپێی دەگـەن ناچـاردەبن بچەمێنـەوە و ناوچەوانی ماچ بکەن! (جندالمعالي / خليل صقر) .

٤) (**كمال السنانيري**) لەدایك بووی ساڵی ١٩١٨ یەو و خەڵکی ولاتی میسرە و لەساڵی ١٩٣٤دا بڕانامـەی (دوانـاوەندی ) ی وەردەگـریێ و لـەوەزارەتی تەندروسـتی بەشی نەهێشتنی مەلاریا دادەمەزریێ .

لەساڵی ١٩٣٨ دا وازدێنـێ لەکارەکەی و دەیەوێ بچێـت لەزانکۆیـەکی ئـەمریکی بەشی (صیدلە) تەواو بکات و بچێتە سەر دەرمانخانەکەی باوکی بەلام یەکێ لەزانایانی ئیسلام ئامۆژگاری دەکات کە نەچێ و ئەویش بەقسەی دەکات.

لەسەرەتای چلەکاندا پەیوەندی کرد بەبرایانەوە و لە(١٩٥٤) داگیراو و پاش(٢٠) ساڵ حوکم ئازادکرا ، لەساڵی ١٩٧٣دا ، لـەپێش بەندکردنیدا ژنی هێنـابوو کچێکـی هەبوو ، پاش گرتنەکەی بەچەند مانگێك کچەکەی مردو ژنەکەشـی بـەزۆری کـەس و کاری ناچارکرا داوای تەلاق بکات و ئەویش تەلاقیدا...

لەبەندیخانەدا بەجۆرێك سزایان دا ، کە ژن براکەی چاوی پیێی کەوت عەقڵی تێك چوو، وە داخلی خەستەخانەی نەخۆشییە دەروونییەکانیان کرد !

هێشتا لەبەندیخانەدا بوو کە(ئەمینە قوتب) خوشکی (سید قوتب) ی مارەکرد دوایی کە بەربوو گواستیەوە و منالی لێی نەبوو ، کمال سنانیری لەبەرکاری بانگەوازو هاتوچۆ نەیتوانی ماڵێکی سەربەخۆ پێکەوەبنێ بۆیە خۆی و ژنەکەی لەماڵی خوشکە گەورەکەیدا دەژیان ...

کـاتێ لەبەندیخانـەدابوو ، دایکـی داوای لێکـرد کەنامەیـەك بنوسـێ و بپارێتـەوە لەحکومەت تارزگاری ببێ ، ئەویش رازی نەبوو ووتی: ئەگەر شتی وا بکەم سبەینێ کە مردم چی وەلامی خوا بدەمەوە ؟ کمال سنانیری توندوتۆڵ بوو لەئیمانداریيەکەیدا ، بۆیە ڕۆژناڕۆژێ بەرۆژو دەبوو وەك حەزرەتی داود(سەلامی خوای لێبێت) .

لەسەرەتای هەشتاکاندا گیرایەوە و لەژێر سزادا گیانی سپارد و شەهیدبوو لەتەمەنی (٦٣)ساڵیداو ، بەومەرجە تەرمەکەیان دانەوە کە تەعزێی بۆ دانەنرێ و تەنها خزمەنزیکەکانی لەگەڵیا بچن بۆ سەر قەبران ! ( مفاهیم تربویە بەشی چوارەم محمد عبدالله الخطيب).

مصطفی صادق الرافعي لە (وحی القلم) دا لەبارەی ئەم هیممەت بەرزییەوە دەڵێ : خوای گەورە بەندەی تایبەت بەخۆی دەنێرێ ، کەیەکەم سیمایان ئەوەیە کە زیللەت دەخەنە ژێر پێیانەوە ، ئەوانە دێنە ئەم دنیایەوە بۆ ئەوەی ئەوە بسەلمێنن کە مرۆڤ توانای هەیە زاڵ ببێ بەسەر هەواو ئارەزوویدا ، جا ئەوانە کەسانێکی ئازان کە قەدەری خوا دەیانهێنێ تا دەوری خۆیان ببینن ) ل ٩٠ سەرچاوەی پێشوو

### ٥) شێخ عەلی گرگاوی بۆ بانگەواز دەگاتە (یابان) :

د. یوسف القرضاوي لەوتاری هەینی ٢٣محرم ساڵی ١٤١٨دا وتی :

(( لەدوو جاری پێشوودا کەچووم بۆ یابان ، هەستم کرد کە بانگەواز لەوێ لاوازە ، بەلاّم ئەمجارە کەچووم ، بینیم گەرم و گوڕی یەك هەیە و لەهەموو بنکە ئیسلامییەکانەوە هاتنە لام و ئێستا مزگەوتیان هەیە و قوتابیان لەولاّتانی ئیسلامی دەخوێنن .

یەکێك لەو سەربازە نەناسراوانەی کەرۆڵێکی گرنگیان هەبوو لەبانگەوازی ئیسلامی یابان دا، شێخ عەلیە کە زانایەکی ئەزهەری میسرییە و خەڵکی (گرگا) ی باشووری میسرە و گۆڤاری (الارشاد) ی دەردەکرد .

نزیکەی سەد ساڵ لەمەوبەر دەنگ و باسێك بلاّوبۆوە کەئیمبراتۆری یابانی کۆنفرانسێك دەگرێت بۆ لێکۆڵینەوەی ئاینەکان ... شێخ عەلی داوای لەزانایانی ئەزهەر کرد کەبچن بۆ بەشداری کردن لەو کۆنفرانسەدا و کەس بەگوێی نەکرد ، بۆیە ناچار چەند دۆنمێك زەویوزار خۆی فرۆشت و بەکەشتی چوو بۆ یابان ، لەرێگەدا پیاوێکی (صینی) ناسی کەناوی سولەیمان بوو ، ئەویش بەپیاوێکی تری یابانی ناساند و پاشان دوانیتریان ناسی ، بەمەش کەبوون بەپێنج کەس کۆمەڵەیەکی ئیسلامییان دروست کرد بۆ بلاّوکردنەوەی ئیسلام لەیاباندا ، شێخ عەلی یادەوەرەیەکانی لەپەراوێکدا بەناوی (گەشتی یابان) تۆمار کردووە ...

یەکێ لەو یابانیانە خانووەکەی خۆی دایە کۆمەڵەکە و لەبەرئەوەی زمانی ئینگلیزیشی دەزانی ، قسەکانی شێخی دەگۆڕی بەسەر زمانی ئینگلیزی و یابانی ، بەمەش نزکەی دوانزە هەزار کەس موسڵمان بوون ...

هەندێ کەس لایان وایە کە یابانییەکان رۆژانە (١٥) سەعات کاردەکەن و بیر لەئایین ناکەنەوە و ئەوەی لەباوو باپیریانەوە بۆیان ماوەتەوە لێی لانادەن و زەحمەتە ئیسلامیان تیا سەوز بێت ...

دکتۆر یوسف دەڵێ : من ئەوە بەڕاست نازانم ، ئایینی پیرۆزی ئیسلام بۆ هەموو گەلانە ، چۆن صینیەکان هەر لەسەدەی یەکەمی کۆچییەوە موسڵمان بوون و پاشان ئاینی ئیسلام گەیشتە مالیزیا و ئیندونیسیا و فلیپن و ئەوانە بەسنگێکی فراوانەوە بەرەو پیری ئیسلام چوون ، ئاوەهاش یابانییەکان موسڵمان دەبن بەمەرجێ بانگخوازی بۆ خوا لێبڕاوو دڵسۆز و شارەزا بەبار و زرووفی یابانیەکان کاربکەن و رێیان نیشان بدەن .

## قودرەتی خوا

تێگەیشتن لەناوو سیفاتەکانی خوا بەگشتی و قودرەتی خوا بەتایبەتی ئەرکی سەرشانی موسڵمانە ، قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿فاعلم أنه لا الـه الا هو واستغفر لذنبك وللمؤمنين والمؤمنات و الله يعلم متقلبكم ومثواكم﴾ محمد١٩ .

قورئانی پیرۆز لەرێی چیرۆك و لەرێی دیاردە سروشتییەکانەوە ، قودرەتی خوا بۆ خەڵکی و بۆ موسڵمانان روون دەکاتەوە ، کە ئەمەش باشترین رێگایە و ئاسانترین شێوەیە ، تا مرۆڤ (اسماء) و(صفات) ی خوای بالاّ دەستی بۆ ئاشکرا ببێت و تێی بگات ، بەبێ ئەوەی تووشی چەن و چوون و دەمەقاڵێ ببێت و بەبێ ئەوەی تووشی (تعطيل وتشبيه) بێت ...

بۆ نموونە قورئان باسی ئەو کەسە دەکات کە سەد ساڵ خوای گەورە مراندی و دوایی زیندووی کردەوە :

﴿ أو كالذي مر على قرية وهي خاوية على عروشها قال انى يحـي هذه الله بعد موتها ، فأماته الله مائة عام ثم بعثه ، قال كم لبثت ، قال لبثت يوماً أو بعض يوم ، قال : بل لبثت مائة عام فانظر الى طعامك وشرابك لم يتسنه ، وانظر الى حمارك ولنجعلـك اية للناس وانظر الى العظام كيف ننشزها ثم نكسوها لحماً ، فلما تبين له قال أعلم أن الله على كل شيء قدير ﴾ البقرة : ٢٥٩

**واتـه : ئايـا نەتبيسـتووه ، يـان (نەتڕوانيوەتـه) ئەوكەسـەی تێپـەڕی بـەلای شارۆچكەيەكدا كە هەموو سەقفیخانووەكانی تـەپيبوون ، لەبەر خۆيـەوە وتـی : ئاخۆ خوای گەورە چۆن خەڵكی ئەم شارۆچكەيە دوای مردنيـان زيندوودەكاتـەوە ؟ يەكسـەر خوای گـەورە سـەد سـاڵ مراندی و پاشان زيندووی كـردەوە و پـێی فـەرموو : چـەند مايتەوە ؟ (دەڵێن ئەوكەسە (عوزەير) پێغەمبەربووە ) ، (عوزەير) فەرمووی : ڕۆژێك يـان كەمتر لەڕۆژێك ماومەتەوە ، (خوا) فەرمووی : ئەوە سەد ساڵت پێچووە ، جا تەماشای خواردن و خواردنەوەكەت بكە ، بۆيە ئەمەمانكرد تا بەم بەسەرهاتە بتكەينـە موعجيزە بۆ خەڵكی ، جا سەيری ئێسكەكانی گوێدرێژەكەت بكـە چۆن بـەرزيان دەكەينـەوە و بەيەكەوەيان دەبەستين و پاشان بەگۆشت دايدەپۆشين ، كاتێك بينـی و بۆی دەركـەوت وتی : چاك دەزانم ودڵنيام بەراستی خوا دەسەڵاتی بەسەرهەمووشتێكدا هەيە .**

**ئەو كەسە بـانگخواز ، يـان پێغەمبـەربووە ، خـوای گـەورەش لەبەرئـەوەی كـاری بانگخوازی پێسپاردووە ، ديارە دەبێ باشتر لەقودرەت و دەسـەڵاتی خوا تێبگـات ... بۆيە پاش ئەوەی وانەی كرداری فێربوو ، وتی : چاك دەزانم و دڵنيام بەراستی ، كەخوا دەسەڵاتی بەسەر هەمووشتێكدا هەيە ...**

**هـەروەها كاتێ خوای گـەورە ويسـتی حـەزرەتی موسـا بنـێرێ بـۆ لای فيرعـەون، دەسەڵات و قودرەتی خۆی پيشاندا بەوەی كە عەساكەی دەستی بۆ كرد بەمار و پاشان بۆی كردەوە بەعەساكە ، ئەمە بێجگـە لەوەی چەند بەڵگە و نيشـانەيەكی تريشـی دايە وەك درەوشانەوەی دەستی و ...هتد ، هەروەك دەفەرموێت :**

﴿ الله لا اله الا هو له الاسماء الحسنى ، وهل أتاك حديث موسى ، اذ راء نـاراً فقال لأهله امكثوا اني انست ناراً لعلي اتيكم منها بقبس أو **أجد على النار** هـدى ، فلمـا أتاها نودي يا موسى ، اني أنا ربك فاخلع نعليك انك بالوادي **المقدس طوى** .
وأنا اخترتك فاستمع لما يوحى ، انني أنا الله لا اله الا أنـا فـاعبدني وأقم الصـلاة لذكري، ان الساعة اتية أكاد أخفيها لتجزى كل نفس بما تسعى ، فلا يصدنك عنها مـن لايؤمن بها واتبع هواه فتردى ﴾ طه : ١٦

**واتـه : خـوا زاتێكـە كـە جگـە لەوخوايەكیتر نيـە ، هـەرچی نـاوە پـيرۆز و سـيفاتە جوانەكان هەيە هەر شايستەی ئەوە .**

**ئەی پێغەمبەر ﷺ ئايا هەواڵی بەسەرهاتی موسات پێگەيشتووە ؟!**

**کاتێك ئاگرێکی بینـی ، لەگەڕانـەوەیدا بۆ میسر ، لەشەوێکی ساردا ، لـەبیابانی سینادا ، بەخێزانەکەی وت : ئێوە لێرەبن ، بەراستی من ئاگرێکم بەدی کردووە ، بابڕۆم بەڵکو سەلکە بزوتێکتـان بـۆ بـهێنم ، یـان کەسـێکم دەسـت بکـەوێت ڕێنمونیـم بکـات ،جاکاتێك نزیکی ئاگرەکە بۆوە ، بانگی لێکرا ، ئەی موسا دڵنیابە من پەروەردگاری تۆم ، کەواتە پێڵاوەکانت دابکەنە ، چونکە بێگومان تۆ لەدۆڵی پیرۆزی ـ طـوى — دایت . منیش هەڵم بژاردوویت بۆ رابەرایەتی و پێغەمبەرایـەتی جا گـوێ بگرە بـۆ ئەوشـتانەی لەرێگەی وەحی و نیگاوە پێت رادەگەیـەنرێت .بەڕاستی هـەر من خوام ، هیـچ خوایەك نیـە جگە لەمن ، کەواتـە هـەر من بپەرستە و نوێژەکانیشت بەچاکی ئـەنجام بـدە ، تـا هەمیشـە منـت لـەیاد بێـت .بێگومـان رۆژی قیامـەت بەڕێوەیـە و هـەردێت ، نزیکـە بیشارمەوە ، بـۆ ئـەوەی هـەموو کەسـێك بـەگوێرەی کـاروکردەوە و هـەوڵ و کۆششـی پاداشت بدرێتەوە .**

**ئەی موسا نەیەڵیت ئەو کەسانەی کەباوەڕیان بەقیامەت نیە و شوێنی ئارەزووی خۆیان کەوتوون لەم ڕاستیە وێڵت بکەن ، چونکە ئەو سا تیادەچیت و زیانت لێدەکەوێ**

﴿ وما تلك بيمينك ياموسى ، قال : هي عصاي أتوكؤا عليها وأهش بها على غنمي ولي فيها مارب اخرى ، قال : ألقها يا موسى ، فالقاها فاذا هي حية تسعى ، قال خذها ولا تخف سنعيدها سيرتها الاولى , واضمم يدك الى جناحك تخرج بيضاء من غير سوء اية اخرى لنريك من اياتنا الكبرى ﴾

**ئنجا خوای گەورە پرسی ئەی موسا: ئەی ئەوە چیە بەدەستی راستەوە ؟**

**موسا وتی : ئەوە گۆچانەکەمـە ، خۆمـی بەسـەردا دەدەم و دەیمـاڵم بـەدرەختدا تـا گەڵا بوەرێنم بۆ مەڕەکانم و ، چەند مەبەستێکی تریشم پێی هەیە.**

**خوا فەرمووی : دەفڕێی بدە ئەی موسا .**

**جا هەر کەفڕێیدا ، یەکسەر بوو بەمارێکی زینـدوو ، بەخێرایی دەجووڵایـەوە ، خوا فەرمووی : بیگرە و مەترسە ،وەك ئەوسای خۆی لێدەکەینەوە .**

**دەستیشت بخەرە ژێر باڵتەوە ، ئەوکاتە بەرەنگی سپی و درەوشـایی دێتە دەرەوە ، بێئەوەی عەیبدار بێت ، ئەوەش نیشانەو بەڵگەیەکیترە .**

**ئەم شتانە بۆ ئەوەیە تا هـەندێك لەموعجیزە گـەورەکانی خۆمـانت نیشان بدەین**

﴿اذهب الى فرعون انه طغى ، قال رب اشرح لي صدري ويسر لـي أمـري ، واحلـل عقدة من لساني يفقهوا قولي ، واجعل لي وزيراً من أهلي هارون أخي أشدد به أزري

وأشركه في أمري كي نسبحك كثيراً ونذكرك كثيراً انك كنت بنا بصيرا ، قال قد اوتيت سؤلك ياموسى﴾ طه٣٦واته : دەبچۆ بۆ لای فیرعەون (پاش ئەوەی لەدەسەلآت و قودرەتی خوا تێگەیشتیت و بەشێوەی (عملی) کرداری بینیت ، پاش ئەوەی زانیت ئەگەر خوابیەوێ دار عەسای دەستت دەکات بەمار و کەویستیشی دەیکاتەوە بەدار عەسا، کەواتە قازانج وزیان هەر لەخواوەیە و هەر ئەوە کە (االضار والنافع) ە ، هیچ شتێك و هیچ کەس ناتوانێت لەفەرمانی ئەو دەربچێ ) .وە هەر ئەوە کە ( المعطي المانع ، المعز المذل ، الخافض الرافع ، القابض الباسط)...

**بچۆ بۆلای فیرعەونی سەرکەش و یاخی کە لەسنووری بەندایەتی دەرچووە ...موسا دەیزانی کارەکەی گران و سەختە ، چونکە چاك فیرعەونی ستەمکاری دەناسی و چەند ساڵ لەماڵی ئەودا بوو ... بۆیە کەوتە نزاکردن و فەرمووی : پەروەردگارا سینە و دڵ و دەروونم ئاسوودە و گوشاد بکە . ئیش و کار و هەوڵ و کۆششم بۆ ئاسان بکە وگرێی زمانم بکەرەوە و زمانم گۆیا و پاراو بکە ، تا لەقسە و گوفتار و مەرامم تێبگەن و،لەکەس و کاریشم هاوکار و یارمەتیدەرێکم بۆ بڕیاربدە .**

**حەزیش دەکەم هارونی برام بێت ، خوایە پشتمی پێ قایم بکە و ، بیکە بەهاوبەش و یاریدەدەرم، لەگەیاندنی پەیامەکەتدا ، تا تەسبیحات و ستایشی تۆ زۆر بکەین و ، زۆر یادی تۆ بکەین . چونکە بەراستی تۆ هەمیشە بینای بەحاڵی ئێمە ، بەهەڵس و کەوتی ئێمە و ، بەهەموو شتێکی ئێمە ، خوای گەورەش فەرمووی : ئەی موسا هەموو داخوازیەکانت بەجێیە و پەسەندە و هەموویانت پێدرا ....**

**حەزرەتی ئیبراهیم یش داوای کرد کە خوا پیشانی بدات چۆن مردوان زیندوو دەکاتەوە ، تا زیاتر لەقودرەتی خوا تێبگات ، خوای گەورەش فەرمانی پێدا کە چوار باڵندە سەر ببڕێ و تێکەڵ بەیەکیان بکا و لەسەر چەند شاخێك دایان بنێ و پاشان بانگیان بکات ، زیندوو دەبنەوە بەفەرمانی خوا و دێن بەدەنگیەوە ، ئەم وانەکرداری‌یە بۆ حەزرەتی ئیبراهیمی(اولوا العزم) زۆر گرنگ بوو ، تا لەداهاتوودا بێباکانە بچێتە ئاگرەوە و تەحەدای کافر و ستەمکاران بکات ...**

**هەروەك دەفەرموێت :** ﴿ واذ قال ابراهيم رب أرني كيف تحي الموتى ، قال: أو لم تؤمن ، قال بلى ، ولكن ليطمئن قلبي ، قال : فخذ أربعة من الطير فصرهن اليك ثم اجعل على كل جبل منهن جزءاً ثم ادعهن ياتينك سعياً ، واعلم أن الله عزيز حكيم ﴾ البقرة ٢٦٠

واتە : بەیادبهێنە کاتێك ئیبراهیم فەرمووی : پەروەردگارا نیشانم بدە چۆن مردوو زیندوو دەکەیتەوە ؟ خوا فەرمووی : ئایا باوەڕت نەهێناوە ؟ ئیبراهیم وتی : بەڵێ (باوەڕم) هەیە بەڵام حەزدەکەم (بەچاوی خۆم ببینم) ، تا دڵم ئارام بگرێت .

خوا فەرمووی : جا کەواتە چوار باڵندە بهێنە و جوان سەرنجیان بدە و دوایی هەر چواریان سەربڕە و گۆشت و پەڕوخوێنیان تێکەڵ بکە ، ئەوسالەسەر لوتکەی هەر شاخێك هەندێك لەوتێکەڵەیە دابنێ ، پاشان بانگیان بکە ، بەگورجی و بەپەلە هەموویان دێنەوە بۆلات و چاك بزانە و دڵنیابە بەراستی خوا بالأدەست و کار بەجێیە .

هەروەها خوای گەورە قودرەت و دەسەڵاتی خۆی پیشانی هاوسەری ئیبراهیم ، سارە خاتوون دا کاتێ هاتنە میسر ، ئەمیش ئافرەتێکی جوان بووە و مەلیکی میسریش کەپێدەزانێ لەئیبراهیم دەپرسێ ئەوەچی تۆیە ، دەفەرموێ خوشکمە بۆ ئەوەی رزگاری ببێ لەدەستی ، پاشان کە دەیهێننە لای ، چی دەیەوێ دەستی بۆ بەرێ ، دەستی تووشی شەلەل دەبێ بەفەرمانی خوا ، ئنجا پەیمان دەدات بە(سارە) کەهیچی لێناکات بەمەرجێ چاك ببێتەوە ئەویش دوعا دەکا و چاك دەبێتەوە ، پاشان پاشای میسر ، خزمەتکارێکی دەداتێ کە ناوی (هاجەرە) بوو ، ئەم وانە کرداری‌یەش بۆ سارە خاتوون پێویست بوو ، هەروەها (هاجەرە) خاتوونیش لەم وانەیە سوودی چاکی وەرگرت ، بۆیە کاتێ لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕیدا لەناوبیابان و چۆڵەوانی مەککەدا حەزرەتی ئیبراهیم بەجێی هێشتن ، فەرمووی : خوا فەرمانی پێداوی ؟ ئیبراهیم فەرمووی : بەڵێ ، وتی : دەکەواتە خوامان بەسە و ئەو ئاگادارمانە و دێبەهانامانەوە !

طەبەری لەئیمامی عەلیەوە دەگێڕێتەوە : ﴿ کاتێ هاجەرە خاتوون بۆ دواجار چووە سەرکێوی (مروە) سەیری لای منداڵەکەی کرد ، جوبرائیلی بینی ... جوبرائیل لێی پرسی : تۆ کێیت ؟ ئەویش وتی : من دایکی کوڕی ئیبراهیمم . ( رەنگە هەستی کردبێ کە ئەوە مرۆڤ نیە و لەئاسمانەوە هاتووە ئەهلی ئاسمانەکانیش ئیبراهیم دەناسن ، بۆیە وتی : من دایکی کوڕی ئیبراهیمم ) ...

جوبرائیل فەرمووی : ئێوەی لای کێبەجێ هێشتووە و ئێوەی داوەتە دەست کێ ؟ هاجەرە خاتوون وتی : ئێمەی داوەتە دەست خوا ... جوبرائیل فەرمووی : (دەی بەراستی ) ئێوەی داوەتە دەست کەسێك کەکافی‌یە و بەستانە...﴾ ....

**قورئان دەفەرموێ :** ﴿ اليس الله بكاف عبده ، ويخوفونك بالذين من دونه ومن يضلل الله فما له من هاد ومن يهد الله فما له من مضل أليس الله بعزيز ذي الانتقام ﴾ الزمر : **واتە ئایا خوا بەس نیە بۆ بەندەکانی ؟ جا تۆ دەترسێنن بەغەیری خوا ، جاکێ خوا سەری لێتێك بدات و سەرگەردانی بکات ( لەبەرچەوتی ئەوکەسە خۆی) ئەوا کەس نیە هیدایەتی بدات ، هەرکەسیش خوا هیدایەتی بدات کەس ناتوانێت سەری لێ بشێوێنێ ، ئایا خوا تۆڵە سێنی بەهێز نیە ؟**

## قودرەت و دەسەلاتی خوا لە چەند ئایەتێکی تردا

* ﴿ والله خلق كل دابة من ماء فمنهم من يمشي على بطنه ومنهم من يمشي على رجلين ومنهم من يمشي على أربع يخلق الله مايشاء ان الله على كل شيء قدير ﴾
**واتە : خوا هەموو زیندەوەرێکی لەئاو دروست کردووە ، هەیانە لەسەر سکی دەڕوات ، هەیشە لەسەر دووقاچ دەڕوات ، هەیشە لەسەر چوارپێ دەڕوات ، خوا هەرچی بوێت دروستی دەکات ، بەراستی خوا دەسەلاتی بەسەر هەمووشتێکدا هەیە .** ( النور ٤٥)

* ﴿ وهو الذي خلق من الماء بشراً فجعله نسباً وصهراً وكان ربك قديرا ﴾ فرقان ٥٣ **واتە : هەر خوایە کە لەئاو مرۆڤی دروست کرد و بەهۆی ژن و ژن خوازییەوە خزمایەتی دروست دەکات ، بێگومان پەروەردگاری تۆ هەمیشە دەسەلاتدار و بەتوانایە**

* ﴿ لله ملك السماوات والارض ، يخلق مايشاء يهب لمن يشاء اناثاً ويهب لمن يشاء الذكور ، أو يزوجهم ذكراناً واناثاً ويجعل من يشاء عقيما انه عليم قدير ﴾ **واتە : هەر بۆ خوایە خاوەندارێتی ئاسمانەکان و زەوی ، هەرچی بوێت دروستی دەکات ، بەهەرکەس بیەوێت کچ دەبەخشێت و بەهەر کەس کەبیەوێت کوڕ دەبەخشێت ، یاخود لەهەردوو جۆر ؛ بەهەندێك خێزان دەبەخشێت لەکوڕ و لەکچ ؛ هەیشە ویستی خوا وایە هیچی ناداتێ و نەزۆك دەبێت ، بەراستی ئەو زاتە زاناو بەدەسەلاتە .** ( الشورى : ٥٠ )

**مەسەلەی منداڵ بوون موعجیزەیەکی زۆر گەورەیە ، گەورەترین بەڵگەیە لەسەر مردن وزیندووبوونەوە و دەسەلاتی بێپایانی خوا ، کەچی لەئەنجامی زۆر روودان و دووبارە بوونەوەیەوە لای مرۆڤ ئاسایی بووە و زۆر سەرنجی نادات ، بۆیە قورئان ئاوا جەخت دەکاتە سەری و سەرنجمان رادەکێشێ بۆی ، تا چاکتر لە قودرەت و دەسەلاتی خوا تێ بگەین .**

**نموونەیەك لەكوردستانەوە**

سالێكیان كوللەیەكی زۆر هێرش دەهێنن و دائەبارێن بەسەر كشتوكاڵی زۆر ناوچەی كوردستاندا ، بەتایبەت دێهاتەكانی قەرەداغ...

لەدێی (بەردێ) ی قەرەداغ ، خەڵكەكە تەواو شپرزە دەبن ودێنە لای سەعید ناوێك و دەڵێن : كوللەدای بەسەر كشتوكاڵی دێهاتی دەورووبەرداو هیچی نەهێشت و وا بەرەو ناوچەكانی ئێمەش دێن ، ئەویش بەفیترەتێكی پاكی موسڵمانانەوە وتی : هیچ كوللەكان خوایان خوارد ؟ وتیان نەخێر . وتی : خۆ خوا ماوە ؟! وتیان : بەڵێ ، وتی : دەخوا كەریمە ..ئەوانەی كە ئاگایان لەم مەسەلەیەیە دەڵێن : خوا ئاگادارە كوللە نەگەیشتە كشتوكاڵی ئەمان و بەبەرەكەتی ئەو (حسن الظن) ە بەخوا ، رزگاریان بوو تەنانەت بەروو بوومیان لەسالآنیش زیاتر بوو ..

## هەر خوا پشت و پەنا و دۆستی بڕوادارانە

حەزرەتی لوط سەلامی خوای لێبێ وەك هەموو پێغەمبەرانیتر چاك لەقودرەت و دەسەلآتی خوا تێگەیشتبوو ، گەلەكەشی هەتا بڵێی خراپ و سەرسەخت و تاوان باربوون ، كاتێ میوانەكان هاتن بۆ لای كەمەلائیكەت بوون ، لەشێوەی چەند لاوێكی جوان و پێكەوتوودا زۆر بێتاقەت بوو ... قورئان لەم بارەیەوە دەفەرموێت :

﴿ولما جاءت رسلنا لوطاً سيء بهم وضاق بهم ذرعاً وقال هذا يوم عصيب، وجاءه قومه يهرعون اليه ، ومن قبل كانوا يعملون السيئات ، قال يا قوم هؤلاء بناتي هن أطهر لكم ، فاتقوا الله ولا تخزون في ضيفي أليس منكم رجل رشيد ، قالوا لقد علمت مالنا في بناتك من حق وانك لتعلم ما نريد ، قال لو أن لي بكم قوة أو اوي الى ركن شديد ، قالوا : يا لوط انا رسل ربك لن يصلوا اليك ، فاسر باهلك بقطع من الليل ولايلتفت منكم أحد الا امرأتك انه مصيبها ما أصابهم ، ان موعدهم الصبح أليس الصبح بقريب﴾ هود : ٨١

واتە : كاتێك وەفدی فریشتەكانی ئێمە هاتنە لای لوط ، نارەحەت بوو پێیان و زۆر دڵتەنگ بوو ( چونكە لەشێوەی چەند لاوێكی جوان دا هاتبوون ) لەدڵی خۆیدا وتی : ئەمە رۆژێكی سەختە (منی تێكەوتووم) .

هۆزەكەشی بەبیستنی هاتنی ئەم میوانانە ، بەپەلەو بێ شەرمانە كشان بۆ لای و پێشتریش كردارە خراپەكانیان دەكرد ، كاتێك لوط ئەم دیمەنەی دی فەرمووی : ئەی

خزمەکانم ئائەوانە کچەکانمن و ئەوان پاك و خاوێنن بۆ ئێوە ( وەرن لەناو هۆزدا کێتان بەدڵە بەشێوەیەکی شەرعیلێتان مارەبکەم ، جا لەخوا بترسن و شەرمەزارم مەکەن لەناو میوانەکاندا ، ئایا پیاوێکی ژیر و مەردتان تیا نیە کە گویٚ لەهەق بگریٚ و جڵەوگیری بکات لەخراپە ؟

ئەوانیش بیٚشەرمانە وتیان : سوێند بەخوا بەراستی تۆ دەزانی ئێمە هیچ هەقێکمان نیە بەکچەکانی تۆوە ، بێگومان تۆش دەزانیت ئێمە چیمان دەوێت !

لوط فەرمووی : خۆزگە هێزێکم دەبوو لەخۆتان بۆ بەرامبەری ناپاکەکانتان ! یان پشت و پەنایەکی بەهێزم دەست دەکەوت و دەڕۆیشتم بۆی تا تۆڵەتان لیٚبکەمەوە و تەمێتان بکەم ...

بەڵیٚ ... حەزرەتی لوط بۆ تاقە ساتێك فەرموی : خۆزگە هێزێك یان پشت و پەنایەکم دەبوو ، لەساتەوەختێکی زۆر ناهەموار و دژوار دا ، حەزرەتی (محمد) ﷺ لە بارەی ئەم ئایەتەوە دەفەرموێت : ﴿ يرحم الله لوطاً لقد كان يأوي الى ركن شديد ﴾

واتە : خوا ڕەحم بە( لوط) بکات ، بەڕاستی ئەو لەپەنای زاتێکی بەتواناو بەهێزدا بوو کەخوای گەورەیە !مسلم گێڕاویەتیەوە/ ل ٢٤٣ التاج الجامع للاصول / بەرگی شەشەم / نوری فارس / ئەم ساتە وەختە زۆری نەخایاند کە مەلائیکەتەکان پیٚیان فەرموو : ئەی لوط بەڕاستی ئێمە فریشتەی نێرراوی پەروەردگاری تۆین ، ئەوتاوانبارانە هەرگیز ناگەنەلات ، تابتوانن دەستدرێژی بکەنە سەر ئێمە ، جا تۆخاووخێزانت لەبەشێکی شەودا دەربکە و کەس لەئێوە لانەکاتەوە و ئاوڕنەداتەوە ، جگە هاوسەرەکەت کەلاسارە و بەگوێت ناکات ، چونکە بەڕاستی ئەو سزایەی کەتاوانبارانی گرتۆتەوە ئەویش دەگرێتەوە ، بەڕاستی کاتی سزا کەشیان لەبەرەبەیانداية ، ئایا بەرەبەیانی ئەمشەو نزیك نییە ؟! ( دیارە نزیکە و خوای گەورەش لەناوی بردن و کردنی بەپەندی زەمانە ! ) .

ئالێرەدا بانگخواز هەقە هەڵوێستەیەك بکات ، ئاخۆ غافڵ بوونی لەدەسەڵات و قودرەتی خوا ساتێکەو تەواو دەبێت کە بەخۆیدا دەچێتەوە ، یان بەردەوامە و زۆربەی کاتەکانی دەترسیٚ و خوای گەورە ودەسەڵاتی لەیادا نیە ؟! بانگخواز ئەگەر هەمیشە دەسەڵات و قودرەتی خوای لەیاد نەبێت ناتوانیٚ بەکاری بانگەواز هەستیٚ ، چونکە دژمنان هەمیشە و هەردەم دژایەتی دەکەن و ڕیٚی لیٚ دەگرن ...

## دوژمنانی هەق و ڕاستی

خوای گەورە یەکێ (لەسوننەکانی) و لەیاساکانی ئەم دنیایەی ، دانانی دوژمن و ناحەزە کە هەردەم دژایەتی بەرنامەکەی دەکەن ، چونکە (اختیار)ی داوە بە مرۆڤ و سەرپشکی کردووە و ڕێی پێداوە ئیمان بهێنێ یان نەیهێنێ ، ماوەیەك لەدنیادا لغاویان بۆ شل دەکات ، ستەمکاران شوێنی لێهەڵدەکێشن ، بەڵام پاش تاقی کردنەوەی بڕواداران و ، پاش ئەوکێشمە کێشەی لەنێوان هەق و ناهەقدا ڕوودەدات خوای گەورە بەفەزڵی خۆی عاقیبەتی بۆ هەق و ڕاستی داناوە و هەر خۆی سەرخەر و پاڵپشت و دۆستی بڕوادارانە هەروەك دەفەرموێت :

﴿ وكذلك جعلنا لكل نبي عدواً شياطين الانس والجن يوحي بعضهم الى بعض زخرف القول غروراً ، ولوشاء ربك مافعلوه ، فذرهم ومايفترون ، ولتصغى اليه أفئدة الذين لايؤمنون بالاخرة وليرضوه وليقترفوا ما هم مقترفون﴾ الانعام : ١١٣

واتە : هەر بەوشێوەیە کێشمە کێشی ئیمانداران و خوانەناسان بەردەوامە ، جا بۆ هەموو پێغەمبەرێك و بۆ ئیماندارانیش دوژمنمان داناوە لەشەیتانەکانی ئادەمیزاد وپەری ، کەبەردەوام قسەی زل و ڕازاوە دەدەن بەگوێی یەکدا و خۆیان و خەڵکی پێسەر گەردان دەکەن ، خۆ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە ڕێی نەدەدان شتی وابکەن ، دەوازیان لێبهێنە لەگەڵ ئەو درۆ و دەلەسەیەی کەهەڵی دەبەستن ، بۆ کوێ دەچن ، لەدەست سزای خوایی ڕزگاریان نابێت ...

هەروەها بەو قسە جوان و بریقەدارانە ئەیاندا بەگوێی یەکدا ، با ئەوانەی باوەڕیان بەقیامەت نیە دڵی بدەنێ و پێی ڕازی بن ، بۆئەوەی ئەوتاوانە بکەن کە ئەوان بەردەوام دەیکەن .

هەروەها دەفەرموێت : ﴿ وكذلك جعلنا لكل نبي عدواً من المجرمين وكفى بربك هادياً ونصيراً ﴾ الفرقان : ٣١ واتە : هەر بەوشێوەیەی کە تۆ ئەی محمد ﷺ دژایەتی دەکرێیت ، بۆ هەر پێغەمبەرێك دوژمن وملۆزممان لەتاوان باران فەراهەم هێناوە ، بەڵام دڵنیا بە کەپەروەدگارت بەسە ڕێنموونیت بکات و پشتیوانیت لێبکات .

## مشتێك لەخەرواری دوژمنایەتی كردنی هەق و راستی

ئەگەر لەكۆنەوە باسی پیلانی دوژمنان بكەین بەچەندەها موجەلەد تەواو نابێت و جاربەجاریش ئامارژەمان پێكردووە لەنامیلكە و نوسراوەكانی پێشتردا ، بۆیە تەنها چەند لایەنێكی ئەو مەسەلە گرنگە و چەند نموونەیەك باس دەكەین.

### یەكەم/ دەوڵەتی عوسمانی وتێڕوانینێك :

دەوڵەتی عوسمانی بۆچەند سەدەیەك ئالاَ بەدەستی موسڵمانان بوون ، لەگەڵ خراپەی هەندێك سوڵتانیاندا ، چاكە و كاری مەزنیشیان هەیە كە هەق وایە بە ئینصافەوە و بەویژدانەوە باسی لێ بكرێت ...

كاتێك جوولەكە ویستی لەفەستین دا ڕەگ داكوتێ و ببێتە خەنجەرێك و جەرگی عالەمی ئیسلامی ببڕێت ، عوسمانیەكان بەتایبەت سوڵتان عبدالحمید رێگر بوو لەرێیاندا وشل نەبوو بۆ (اغراءات) و هەڕەشەكانیان .... بۆیە جوولەكەیەكی زۆریان ناردە شاری سالونیك و بەسەرزارەكی موسڵمان بوون و پێیان دەوترا (جولەكەی دونمە) و كەوتنە ئاژاوەنانەوە و پیلان دانان .

لەلایەكی‌تریشەوە هانی كابرایەكیاندا بەناوی (ئەحمەد رەزا)ەوە كەدایكی نەمساوی بوو ، وەباوكیشی بەناوبانگ بوو بە (عەلی بەگی ئینگلیز) ، ئەمەش لەبەرئەوەی زۆر خۆشەویستی هەبوو بۆ ئینگلیز و پیاویان بوو ، جا ئەحمەد رەزای (ناموبارەك !) كەبە شیری ئیلحاد گۆشكرابوو ، كۆمەڵەی (تركیا الفتاة) ی دامەزراند و لەپاریس رۆژنامەیەكیان بەناوی (مشورت) وە دەركرد لەساڵی ( ١٨٩٥) زاینیداو ، ئیستعماری رۆژئاوا و جوولەكە هەموو ئاسانكاری‌یەكیان بۆ دەكرد و یارمەتیان دەدا ، تەنانەت بەهۆی پۆستە و گەیاندنی بیانی‌یەكانەوە لەسەفارەتەكان كە نەئەپشكنران ئەو رۆژنامەیەیان بەهەموو لایەكی دەوڵەتی عوسمانی‌دا بلاَودەكردەوە...

ئەوانیش لەسەرەتادا لەبەیاننامەیەك دا وتیان ( ئێمە كار ناكەین بۆ لابردنی بنەماڵەی سوڵتان ، كەبە پێویستیان دەزانین بۆ پاراستنی نیزام ، بەڵكو كاردەكەین بۆ بلاَوكردنەوەی بیروبۆچوونی پێشكەوتنخوازی ...)

جوولەكە هەر زوو لەپرۆتۆكۆلاتەكانیاندا ، بەرنامەیان دانابوو دەوڵەتی عوسمانی لاببەن و خەلافەتی ئیسلامی هەرەس پێ بهێنن ، ئەم كۆمەڵەی (تركیا الفتاة) ەش كە دوایی بوو بە (جمعیة الاتحاد و الترقي) بەوكارە هەستان و كاری دوژمنانیان

جیٚبەجیٚکرد ، هەرچەند زۆر کەسیان پیٚخەڵەتانو، لەدوایشدا هەندیٚکیان لەمەرامی گلاٚوی دوژمن تیٚگەیشتن، بەلاٚم پاش چی ؟ پاش ئەوەی کە کار لەکارترازا و شیرازەی موسڵمانان بچرا . لەراستیدا پیلانەکانی جوولەکە دژی دەوڵەتی عوسمانی ئەوەی کە ئاشکرابوویێ دەگەریٚتەوە بۆ سەدەی پانزەهەمی زایینی ئەوەش بەوەی کەجوولەکەتوانی ئافرەتیٚکی جوانی خۆیان بنیٚرنە قەسری سوڵتانی عوسمانی‌یەوە و توانی ببیٚتە هاوسەری سوڵتان سولەیمانی قانونی ، وەلەبەرئەوەی دەسەلاٚتی ئەم ئافرەتە زۆر بوو لەکۆشکی سوڵتاندا توانی کچەکەی کەناوی (مهرماه) بوو مارەی بکات لە (رستم پاشا) ، وە توانی (صدر الاعظم - رئيس وزراء - ابراهيم پاشا) بکوژیێ و (رستم پاشا) بخاتە جیٚگای ، ئنجا بەپیلانیٚکی‌تر وەلی عەهد (مصطفى) ی کوڕی (سليمان القانون) ی خنکاند بەبیانووی ئەوەی گوایە نیازی ئینقلابیٚتی بەسەر باوکیا..

ئنجا (سليم )ی کوڕی خستە جیٚگای و کردی بەوەلی عەهد ، ئەم ژنە جوولەکەیە توانی وا لەسوڵتان سولەیمان بکات کەفەرمان دەرکات بۆ ریٚدان بە کۆچی جوولەکە بۆ فەلەستین ، ئەم کۆچکردنەش بەردەوام بوو تاسوڵتان عبدالحميد قەدەغەی کرد و ریٚگای لیٚبەستن ، بۆیە ئەوانیش سوڵتانیان بەو دەردە برد و خەلافەتی عوسمانیان رووخاند ! ( ل ١٨١) احذروا الاساليب الحديثة في مواجهة الاسلام .

سوڵتان عبدالحميد بەجوولەکەکانی وت ( ئەگەر پڕ بەهەموو دنیا ئاڵتونم بدەنیێ ، نەك هەر سەد و پەنجا ملیۆن لیرەی ئاڵتونی ئینگلیزی ، رازی نابم بەداواکاری‌یەکانتان ، من زیاتر لەسی ساڵ خزمەتی ئوممەتی ئیسلام و ئومەتی محمدم کردووە ، لاپەڕەی سوڵتانە موسڵمانەکانی باوو باپیرم رەش ناکەم و هەرگیز رازی نابم بەداواکاریەکانتان ) ل ١٨٣ هەمان سەرچاوە.

## دووەم/ تەونی دوژمن و بیٚئاگایی ئیٚمە :

دوژمنان هەمیشە پشتی بیدعەچی و ئەو مەزهەبانەیان گرتووە کە دژی ئەهلی سوننەت و جەماعەتن ، بۆ نموونە (نصيري)یەکان کە کۆمەڵیٚکی خاوەن بیرو بۆچوونی چەوتن و هەندیٚکیان (ئیمامی عەلی بەخوا دەزانن ! ) لەکاتیٚکدا کەشا ئیسماعیلی سەفەوی دژی عوسمانی‌یەکان جەنگاو ویستی قەڵەمڕەوی خۆی فراوان بکات ، (نصيري)یەکان پشتیان گرتن لەشام ، بۆیە کەسوڵتان سەلیمی یەکەم رووبەڕوویان بووەوە و سەرکەوت بەسەریاندا ،(نصيري)یەکان رایان کردە شاخ ...پاشان

فەرەنسی‌یەکان پشتیان گرتن و لەشاخ هێنایاننە خوارەوە و لەسالی (١٩٢٠ هەتا ١٩٣٦) دەولەتیان بۆ دروست کردن و ناویان نا دەولەتی عەلەوی‌یەکان .پاشان کە بەدەستی دوژمن لەناوەراستی ئەم سەدەیەدا حیزبی بەعسیان دروست کرد (نصیری)یەکان بالا دەستکران تیایدا ، هەر بەهەمان شێوەش دوژمنان دەستیان وا بەپشتی چەندەها کۆمەلەی دروستکراوی وەك (بابی) و(بەهائیەکان) و (قادیانیەکان) و (ئەحباش ) ەکانەوە ، کە هەندێکیان دەلێن : نوێژو رۆژومان لەسەر هەلگیراوە و بەئارەزووی خۆیان حەلاڵ حەرام دەکەن و حەرامیش حەلاڵ دەکەن .. وەیان بەرێنمایی و یارمەتی ئینگلیز قادیانیەکان فەرزیەتیی جیهادیان دایە دواوە و حەرامیان کرد کەکەس دژ بەئینگلیز راپەرێت.

ئەمە بێجگە لەوەی کە هەزارەها پیلانیان هەیە و نایەلن زانایانی ئەم ئوممەتە کۆببنەوە لەژێر چەترێکدا و لەناو کۆمەلەیەکدا ... ئەوا چەند سالە دکتۆر (قرضاوی) خەریکی کۆکردنەوەی زانایانە کەچی هیچ ولاتێك رێی نادات لەخاکەکەیدا کۆبونەوەکە سازبکرێ و مەرجەعیەتێك بۆ موسلمانانی ئەهلی سوننە بێتە کایەوە .

## سێیەم / جوولەکە و دروستکردنی دوژمنایەتی :

جوولەکە بێجگە لەوەی ئایینی مەسیحیان شێواند و هەرچی خراپ بوو کردیان بەرامبەر بەگاورەکان ، هەمیشە لەهەولی ئەوەشدان کە ئاگری رق و کینەیان خۆش بکەن دژی موسلمانان ، بۆ ئەوەی گاورو موسلمان سەرقالی یەکتری ببن و خۆشیان چیان بوێ بیکەن ...

لەسالی ١٩٤٥ دا کۆمەلێ دەستنووسی زۆر گرنگ و بەنرخ لەلای دەریای مردوو لەئەشکەوتەکانی (قمران) دۆزرانەوە ، پاشان کەوتنە لای جوولەکە ، کاتێك ئەمریکا داوای کردن ، بەومەرجە دایان پێیان کەبلاونەکرێتەوە ...

لەو دەستخەتانەدا هەموو ( سفر اشعیاء) هەیە بەتەواوی ، لەکاتێکدا کەبەشێکی کەمی لەتەورات دا هەیە ئەم دۆزراوانە شۆرشێکی مەزن بوو لەبیری مەسیحیەکاندا و کە پاپا پۆلسی شەشەم بینی زۆرکاری تێکرد ... لەو (سفر أشعیاء) ەدا هاتووە کە :

(( دوای مەسیح پێغەمبەرێکی عەرەب دێت لەولاتی فاران - فاران بەزمانی ئارامی واتە حیجاز - وە ئەبێ جوولەکە شوێنی بکەون .... نیشانەی ئەو پێغەمبەرە ئەوەیە کە لەکوشتن رزگاری دەبێت ، ئەوە پێغەمبەری چاوە روان کراوە ، چونکە لەوشمشێرە

رزگاری دەبێت کە ئەخرێتە سەرگەردنی ، وە پاشان بەدەهەزار (قدیس ) خواناسەوە دەگەڕێتەوە بۆی ) .

پاپا لەساڵی ١٩٦٥ دا بەیاننامەیکی گرنگی دەرکرد ، وەکو داننانێکی رەسمیوا بوو بەئاییینی ئیسلام دا ... بە بانگهێشتێکی رەسمی وەفدێکی ئیسلامی چوو بۆ فاتیکان ، لەوێ کۆبووەوە لەگەڵ (کردینال بیمونللی) کەوەزیری دەوڵەت بوو لەحکومەتی فاتیکان ، لەکۆبونەوەکەدا باس لەپەیوەندی نێوان موسڵمان و گاورەکان کرا و پاش دانوستانێکی گەرم و گوڕ ، (کردینال بیمونللی) بەموسڵمانەکانی وت : لەم ڕۆدا مژدەدان دەوەستێنم لەجیهانی ئیسلامیدا ، چونکە پێویست ناکات بانگ بکرێن بۆ سەر ئاینی مەسیحی و موڵمانانیش خاوەنی پەیامێکی ئاسمانین و دەچنە بەهەشتەوە ... ئنجا مژدەکەی (سفر أشعياء) ی بۆ خوێندنەوە ...

بەڵام بەداخەوە نوێنەری ئیسرائیل لەفاتیکان ، پاپای ئاگادارکردەوە کەنابێ ئەو دەستخەتانە بڵاوبکرێنەوە و پاش ماوەیەك پاپا پۆلسی شەشەم لەبارو زروفێکی تەم و مژاویدا لەسەر جێگاکەی خۆی مرد ، هەروەها پاش ماوەیەکی کەمیش لەمردنی پاپا ، (کردینال بیمونللی) یش بەهەمان شێوە مرد ... بەمەش گفت و گۆ و نزیك بوونەوەی موسڵمانان ومسیحیەکان نشووستی هێنا ... وە ئەو بەیاننامەیەش کەبڵاوکرابۆوە ، زۆربەی کۆکرایەوە ، هەرچەند لەچەند شوێنێك و لای چەند کەسایەتیەکی موسڵمان ماوە و پارێزراوە ، ( ئەم ڕووداوە دکتۆر معروف الدواليبي دەیگێڕێتەوە کە ئەندامێکی لیژنەی دانوستانی موسڵمانان و مەسیحیەکان )بوو ل ٤١٣ پەڕاوی البحث عن الحقيقة الكبرى المهندس عصام قصاب ) .

## چوارەم / مژدەدەران و ڕۆژهەڵاتناسان :

پاش ئەوەی موسڵمانان فەتحی (بيت المقدس) و (انطاكية ) و (ڕەها) یان کرد و لەدەرگای قەڵاکانی (قسطنطنية) یەیان دەدا کە پایتەختی دەوڵەتی بێزەنتی بوو ... گاورەکان کەوتنە خۆیان بۆ هێرش کردنە سەر جیهانی ئیسلامی ...

ئیمپراتۆر(قسطنطين) ی حەوتەم لەکەنیسەی (ئورثوذكيە) ی بێزەنتی ڕۆژهەڵاتەوە هەوڵیدا بۆ دەست گرتن بەسەر هەندێ ناوچەدا و ، لەساڵی ٩٧٢زاینیدا دەستیان گرت بەسەر شاری (نصيبين) و هەندێ سەرکەوتنیان بەدەست هێنا ، پاشان موسڵمانان هێز و تواناکانیان کۆکردەوە و بەسەر ( بێزە نتیەکان) دا سەر کەوتنەوە ،

بەم جۆرە هێرش و دژە هێرش بەردەوام بوو ... تا هێرشی خاچپەرستەکانی رۆژئاوای (کاثولیکی) دەستی پێکرد بەهۆی پاپا ( اریان الثاني) یەوە لەسالی ١٠٩٥زدا ... لەیەکەم هێرشیاندا نزیکەی سێسەد هەزاریان لێکوژرا ...ئنجا هێرشی دووەمیان هات و (بیت المقدس) یان گرت و حەفتا هەزاریان لەخەڵکی بێتاوان قەتڵ و عام کرد ، هۆی سەرکەوتنیشیان پەرتەوازەیی موسڵمانان و لاوازی دەوڵەتی عەباسی بوو ...

(عمادالدین زنکی) لەساڵی ١١٢٨زدا فەتحی حەڵەبی کرد و لەساڵی ١١٤٢دا فەتحی رەهای کردەوە .

دوای ئەویش (نورالدین محمود) هەوڵی فەتحی (بیت المقدس) ی دا بەلأم کۆچی دوایی مۆڵەتی نەدا کارەکەی تەواو بکات ، تا خوای گەورە (صلاح الدین) ی نارد و لەجەنگی (حطين) دا دوژمنانی شکاند و فەتحی (قدس) ی کرد ...

خاچپەرستان چی هەوڵی ترياندا تێك شکان ، تا لويسی حەوتەم پاشای فەرەنسا هێرشی کردە سەر میسر و لەناوچەی ( دمياط) ەوە پەلاماریدا ... ئنجا نامەیەکی نووسی بۆ پاشای دادپەروەر (نجم الدين ئەيوب) وتيايا دەيوت ( ئێمە خەڵکی دەکوژین و پێدەنێین بەولأتا و زەوی پاك دەکەینەوە لەفەساد ، ئەگەر رووبەرووومان بیتەوە بەجەنگ خۆت تووشی نارەحەتی و گەلەکەت تووشی کۆت و پێوەندی نەگبەتی و تووشی لاوانەوە و قورپێوانی زۆریان دەکەیت ... ئێمە بەزەییمان نایەتەوە نەبەدەسەلأتدار و نەبەبێ دەسەلأتدا ) .

(نجم الدين ئەيوب) يش وەلأمی دایەوە بەنامەیەك کەتیایا وتی : ( بەسوپاکەت و پاڵەوانەکانت و سوار و پیادەکانت هەڕەشەمان لێدەکەن ، ئایا تۆ نازانیت ئێمە پیاوی جەنگ و خاوەنی شمشێرین و ، چوبینە سەر هەر قەلأیەك رووخاندومانە و ، هەر کەسێ لەسنور لایدابێ و زیادە ڕەوی کردبێ لەناومان بردووە ... وە ئەگەر نامەکەمت پێگەیشت ، ئەوا چاوەڕێی سەرەتای سوورەتی نەحل و کۆتایی سورەتی (ص) بە کە دەفەرمووێ : ﴿ اتى امر الله فلا تستعجلوه﴾ ﴿ ولتعلمن نبأه بعد حين ﴾ ...

ئنجا نجم الدين ئەيوب سوپای کۆکردەوە بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەیان ، بەلأم مەرگ بردی و ژنەکەی ( شجرة الدر ) مردنەکەی شاردەوە و (توران شا) ی کوڕی رووبەرووی خاچ پەرستان بووەوە و لويسی نۆیەمی بەدیلی گرت و سوپاکەی تێك شکاند و دوایی بەپارەیەکی زۆر ئازادی کرد ...

بەم شێوەیە دووسەد ساڵ جیهانی ئیسلامی سەرقاڵ بوون پێیانەوە ، کە دوای ئەمەش (تەتەرەکانیان) هانداو (هۆلاکۆ) بەغدادی گرت لە ساڵی (٦٥٦)ی کۆچی‌دا و نزیکەی دوو ملیۆن موسڵمان کوژران ...

پاشان تەتەرەکان تێك شکان لەسەر دەستی هەردوو سەرکردە ( قطز ) و (ظاهر بیبرس) دا ، وە لە جەنگی (عین جالوت) دا خۆیان پێنەگیرا لەبەردەم موسڵماناندا و شەوکەتیان نەما ...

تەتەرەکان زۆریان موسڵمان بوون و پاشان دەوڵەتی عوسمانی دامەزرا ، ئنجا جارێکی‌تر خاچ پەرستەکان وەك ( ئیستعمار)ێکی نوێ روویان کردەوە عالەمی ئیسلامی و لەساڵی (١٨٧٥ن) دا ئینگلیز هندستانی داگیرکرد و دەوڵەتی مەغۆلی رووخاند ، وە لەساڵی ١٨٨٢زدا میصریان داگیرکرد و لەساڵی ١٩١٤زدا دەستیان گرت بەسەر عێراقدا و لەساڵی ١٩١٧ زدا فەلەستینیان خستە ژێر رکێفی‌خۆیانەوە.

لەم لاشەوە (فەرەنسا) (سوریا و لوبنان و جەزائیر و تونس) ی داگیرکردو ، روسیای قەیصەریش (قرم و قوقاز و اذربیجان و ترکستان و سیبریا و بخاری) ی داگیرکرد ...

هەرچەند دەیان ویست وا دەرخەن کە جەنگێکی ئاینی‌نیە ، بەلاّم هەرچی یان دەکرد رق وقینیان بۆ نەئەشاردرایەوە و شەڕیان بەکۆنەقین دەکرد و ، داخی شکاندنەکانی زەمانی خاچپەرستانیان هەر لەدڵدابوو ، بۆیە (اللورد اللنبی) سەرکردەی ئەو سوپایەی کەلەجەنگی یەکەمدا چووە فەلەستینەوە وتی ( الیوم انتهت الحروب الصلیبیة) ئەمڕۆ جەنگی خاچپەرستەکان تەواو بوو .

بەڵێ پاش نزیکەی شەش سەدە ، هەروان لەیادی شکستەکانیاندا ...

هەر لەبەرئەوەش بوو کە (لوید جورج) وەزیری دەرەوەی بەریتانی جەنگی جیهانی یەکەمی ناونا ( جەنگی دووەمی خاچپەرستان ) ...

کاتێك جەنراڵ غورو چووە (دیمەشق) ەوە یەکسەر چووە سەرقەبری (صلاح الدین) و شەقێکی تێهەڵداو وتی ( ئەوا هاتینەوە صلاح الدین ). هەر ئەمەشە کەوای لەجورج بوش کرد ئەم جەنگی جیهانی سێیەمەش ناوبنێ جەنگی خاچپەرستان ...

باول شمتز دەڵێ ( لەناو پاشماوە و وێرانەی جەنگی جیهانی یەکەمەوە ، لەناوچەکانی عالەمی ئیسلامی‌دا ، خێوێك هەستایەوە وەك ئەفسانەکە دەڵێت :

باڵندەیەك مرد و سوتا ، پاشان لەو گڵکۆیەی باڵندەیەکی خێراتر هەستایەوە و باڵی گرت ، کە تۆوی شۆڕش دەچێنیّ لەهەموو جیّیەك لەدژی تەماعی ئیستعمار ، بەپشتی عەقیدە و کۆکردنەوەی موسڵمانان لەسەر بیروبۆچوونی ئیسلامی نویّ ، بۆ بەرەنگاری مەترسی هاتوو لەرۆژئاواوە ) .

هەروەك دەزانین کەلەزۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکانەوە ، شۆڕشگێران راپەڕین و داگیرکەرانیان دەرپەڕاند ... بەڵام ئەوانیش زۆر زان بوون ، کاتیّ رۆیشتن کە مسۆگەریان کردبوو دوای خۆشیان ، ئەوانەی دێنە سەر حوکم هەر لەسەر رێبازی ئەمان دەڕۆن بەرێوە.

بەڵیّ ... توانرا شۆڕش و رەنج و خەباتی موسڵمانان بدزریّ و کەسانێکی تر غەیری گەلی موسڵمان سوودی لیّ ببینیّ ...

لویسی نۆیەم وانەی لەتێکشکاندنی وەرگرت و بیری لەجەنگی دەروونی و رۆشنبیری کردەوە ، بۆیە بەپاپا (ئەنوسنتی چوارەمی) وت : کەیەکەم کۆمەڵەی مژدەدەران دروست بکات لەساڵی ١٢٥٣زدا .

لەساڵی (١٢١٤ـ ١٢٩٤ز) (روجر بیکون) داوای دەکرد کەفێری زمانی عەرەبی بن بۆ ئەوەی موسڵمانەکان راکێشن بەرەو گاورێتی . ئیتر لەوساوە هەر خەریکن و ناوبەناو کۆبوونەوە دەکەن و پەیمانگای پێگەیاندنی مژدەدەرانیان دروست کرد و بەملیارەها دۆلاریان بەخت کرد ... بۆ نموونە لەساڵی ١٩٧٧ دا کۆبونەوە لەسویسرا و باسی بەگاورکردنی جیهانیان دەکرد ، پاشان لەساڵی ١٩٧٨دا لە ئەمریکا کۆبونەوە بۆ بەگاورکردنی موسڵمانان و لەو کۆبوونەوەیەدا یەك ملیار دۆلاریان کۆکردەوە لەدەوڵەمەندەکان ..لەگەڵ (تبشیر) مژدەدانیش دا ، رۆژهەڵات ناسەکان لێکۆڵینەوەیان دەکرد لەسەر جیهانی ئیسلامی و پیلانیان دادەنا و ئاوی گویّی ئەوکەسانەیان ئەدا کە گویّ لەمستیان بوون ...

هەندیّ لەوانەی پیّیان خەڵەتابوون قسەکانیان دووبارە دەکردنەوە ، وەك علی عبدالرزاق کەپەڕاوی (الاسلام وأصول الحکم ) ی دانا و کۆمەڵیّ گومان و هەڵەی ئەدا بەگویّی خوێنەرانیدا ... ئەو قسانەی دەیکات کت و مت قسەی رۆژهەڵات ناسەکانە و ناوی پەڕاوەکە هی خۆیەتی .

لەو کەسایەتیانەی تریش کەلەسەر هەمان ڕێباز دەڕۆیشتن ( طە حسین ، سلامة موسى ، امين الخولي ، زكي نجيب محمود ، توفيق الحكيم ) و ... هتد .

دیارە ئەمانیش زۆر زیاتر لەبێگانەکان زیانیان گەیاند بەموسڵمانان چونکە ئاشکرایە دار پوازی لەخۆی نەبێ ناقڵێشێ .( احذروا الاساليب الحديثة في مواجهة الاسلام).

## پێنجەم : طە حسین

دکتۆر طە حسین فەرەنسا دەستی پێوەی بوو ، بۆ بەکارهێنانی دژی ئیسلام ، بەتایبەت لەرێی ژنەکەیەوە کە ئافرەتێکی جوانی خانەدانی فەرەنسی بوو ، ئەم ئافرەتە رازی بو بەپیاوێکی کوێری عەرەبی هەژاری میسری، بۆ ئەوەی مێشکی داشۆرن و کارێك بۆ رۆژئاوا بکات ...

بەڵێ ئەو ژنە بەپێی بەرنامەیەکی حساب بۆکراو شووی کرد بە دکتۆر طە حسین و ئەویش پیاوانە هەرچی یان پێووت بەچاکی بەئەنجامی گەیاند و کاتێك مرد ، ژنەکەی وتی ( طە حسین ئەو رۆڵەی بینی کەداوای لێکرابوو ! ) .

دکتۆر لەبواری رۆشنبیری و ئەدەب دا لەپەنجاکاندا ، هەوڵی زۆری دا و بیروبۆچوونی نوێی هێنایە کایەوە و زۆر بەگەرمی داوای لەموسڵمانان بەتایبەت میسریەکان دەکرد کە رۆژئاوا بکەنە رووگە و قیبلەی خۆیان و هەرچی شتێ لەرۆژئاواوە بێت وەری گرن ، ئنجا ئەوشتە چاك بێت یان خراپ !

بیرو بۆچوونەکانی طە حسین و رۆژئاوا پەرستیەکی خەڵکانێکی زۆری لەخشتە برد و موسڵمانانی سەرقاڵکرد کەوەڵامی بدەنەوە و قسەکانی پووچ بکەنەوە ! ( المجتمع ١٤٧٢/١٣/١٠/٢٠٠١ ) .

قسەکانی دکتۆر هەمان ئەوقسانەن کە رۆژهەڵات ناسەکان دەیانکرد ، بۆیە رۆژهەڵات ناس (ماسنیون) دەڵێ ( لو قرأنا كتب طه حسين لقلنا هذه بضاعتنا ردت الينا ) واتە : ئەگەر نوسینەکانی طە حسین بخوێنینەوە بەدڵنیاییەوە دەڵێین ئەوە هەر قسەکانی خۆمانە و بۆمان گەڕاوەتەوە ... واتە هەرقسەکانی ئێمەیە کردویەتیەوە . ( احذروا الاسايب الحديثة في مواجهة الاسلام) ا .د. سعد الدين السيد صالح ل ١٢٧

طە حسین کتێبێکی نووسی بەناوی ( (فى الشعر الجاهلى) کە هۆی نوسینەکەی و فیکرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ رۆژهەڵات ناسی جوولەکە ( مرجليوث) ، وەنوسینەکەی (طە حسین) وەك حاشیەیەکە بۆ نووسینێکی (مرجليوث) کەلە گۆڤاری ( الاسيويه)دا بلاوی

کردبۆوه بەزمانی ئینگلیزی لەساڵی ١٩٢٥دا بەناونیشانی (نشأة الشعر الجاهلي) ... لێکۆڵەرەوان دەڵێن کە (مرجليوث) داوای کردووە لە (طه حسين) کە ئەو بابەتە بنوسێ . (ل٦٣ مشكلات في طريق التربية الاسلامية د. السيد احمد فرج) .

هەروەها بیری نەتەوایەتی عەرەبیش هەر رۆژئاوا چاندی لەوڵاتە ئیسلامیەکاندا و هەر ئەوانیش وڵاتە ئیسلامیەکانیان پێ پارچە پارچە کرد ، ئەوەتا مایلزکوبلاند بەرپرسی (مخابراتی ئەمریکی) لەرۆژهەڵاتی ناوەراست لەشەستەکاندا دەڵێ : ( لەزانکۆی ئەمریکی لەلوبنان ، بیری نەتەوایەتی عەرەبی لەدایك بوو ، وە بانگخوازانی ئەوبیرەش لەو زانکۆیە دا گەورەبوون ، تەنانەت لەسەدا نەوەدی بانگخوازانی بیری نەتەوایەتی عەرەبی دەرچووی زانکۆی ئەمریکین لە لوبنان ) لعبة الامم ل ٢١٩

شێخ متولی شەعراوی دەڵێت : طه حسين لەکۆتایی ژیانیدا تەنها گوێی لەقورئان دەگرت و لە زۆر بیرو بۆچوونەکانی زووی پەشیمان بووەوە ...

## شەشەم / لۆردکرومر :

کرومر حاکمی ئینگلیز بوو لە میسر ، قەشە (دانلوب) ی کرد بە راوێژکاری وەزارەتی معاریفی میسری ، ئەم دووانە بیریان کردەوە کە بۆ ئەوەی عالەمی ئیسلامی بەگشتی و میسر بەتایبەتی لەئیسلام دووربخەنەوە دەبێ کاربکەن لەسەر پەرەپێدانی ئەزهەر بەجۆرێك کە بەرنامەی خوێندنی رۆژئاوا قبوڵ بکات و زانستە ئاینیەکان بخاتە لاوە ... دیارە ئەمەش کاریان بۆ کرد بەڵام هەر بەوەوە نەوەستان چونکە کاریگەری یەکەی کەم بوو ...

لەلایەکیترەوە کەوتنە کردنەوەی قوتابخانە و زانکۆی مەدەنی و خۆیان پرۆگرامیان بۆ دارشتن وزمانی ئینگلیزی کرا بەزمانی خوێندن و گرنگی زۆری پێدرا و ، وانەی ئاین کرا بەوانەیەکی وەك وانەی وەرزش و وێنە کێشان و کەنارکرا و شتانێکی تیادەخوێنرا کە رووکەشی ئاین بوون ...ئنجا مامۆستایەکی دەرچووی ئەزهەر بە(سێ جونەیە) دادەمەزرا کەچی ئەوەی لەقوتابخانە مەدەنیەکان دە ردەچوون مووچەی چەوریان دەدانێ بۆ ئەوەی پلەوپایەی ئەزهەر لەدڵی خەڵکیدا نەهێڵن .

تا ئێستاش ئەمریکا و رۆژئاوا وازناهێنن ، ئەوەتا ئەمەریکا (٧٥) ملیۆن دۆلاری بەخشی بەبنکەی بەرەوپێش بردنی خوێندن (مركز تطوير المنهج) لە میسر ، بۆ گۆرینی بەرنامەی خوێندن ، لەکاتێکدا لەو بنکەیەدا چەندەها شارەزای ئەمریکی

کاردەکەن وەك ( جیرالدفیرس ، بیتر تریمـان ، وجـوان کـبرود ، لیزالمـبرت ، کارولینـا ) بەسەرۆکایەتی دکتۆر کوثـر کوجـك ، دیـارە مەبەسـت لەبـەرەوپێش بـردن و گۆڕینـی بەرنامەی خوێنـدن ئەوەیە کە بابەتە ئیسلامی‌یەکان زیـاتر کـەم بکرێنـەوە ، بۆیـە ئـەو بابەتانـەی کـەباس لەسەرکەوتنی پێغەمبـەر ﷺ دەکـات لەغـەزاکاندا بەسـەر جوولەکـەدا لابران لەقۆناغەکانی خوێندندا ( ل ۲۰۰ / احذروا الاساليب الحديثة في مواجهة الاسلام ) .لەگەڵ هەموو ئەو گۆڕینانەشـدا هێشتا ئـەمریکا هەرگلەیی لەمیسر دەکات و زیـاتر هانی دەدات کە ئیسلامی‌یەکان لەژیان و کۆمەڵ دابڕێ و نەیـەڵێ هەناسەبدەن و بەهیچ جۆرێك سەر زیاد بکەن ...

ئـەمریکا هـەر بـەوەوە نەوەسـتاوە بـەڵکو دەنووکـی لەسـەر وڵاتـی پاکسـتان و سعودیەشە و دەیـەوێت ئـەوانیش هـەروەك میسـر ، بـەخێرایی شـوێن ڕێنمایی‌یـەکانی ئەمریکا بکەون و بەرنامەی خوێندنی خۆیان بگۆڕن !

## حەوتەم / میسرو وازهێنان لە شەریعەت :

میسر یەکەم وڵاتـی ئیسـلامی‌یە کـەوازی لەئـەحکامی شـەریعەتی ئیسـلام هێنـا، ئەوەش لەکاتێکدا کە ( محمد علی) هاتە سەر حوکم و (بعـثـات) ی نـارد بـۆ دەرەوە ، تا لەفەرەنسا دیراسەی قانونی وضعی بکەن لەساڵی ۱۸۲۸ز، وەکاتێ ئەوانەگەڕانـەوە و گوێیـان ئاودرابوو بەبەرنامـەی ڕۆژئاوا و یاسـاکانی ، بوونـە سـەرەتایەك بـۆ ڕۆیشـتن بەرەو ( القـانون الوضـعي) و (مدرەسەی حقوق) یـش بـۆ ئەومەبەسـتە دامـەزرا ، ئنجا داگیرکردنی میسر لەلایەن ئینگلیزەوە زیاتر هـانی دان بـۆ ئـەم کـارە و بەردەوام هـێرش دەکرایە سەر شـەریعەتی ئیسلامی ، تا لەساڵی ۱۸۸۵ زدا ( قـانونی فەرە نسی) خرایـە جێی شەریعەتی ئیسلامی و ، ئەوا زیاتر لەسەد ساڵە میسـر وازی لە پـەیڕەوی‌کردنی شەریعەت هێناوە .

کاتێك میسریەکان لەساڵی ۱۹۳۷دا لەکۆنگرەی (جنێف)دا داوایان کرد شەریعەتی ئیسـلامی سـەرچاوەی یاسـادانان بێـت ، دوژمنـان ڕازی نـەبوون و وتیـان بەمـەرجێك (ئیمتیازاتی بیانی) لەمیسردا لادەبەین کە کار بەیاساکانی شەریعەتی ئیسـلام نەکـەن و (قوانین وضـعی) بەرقـەراربێ ... تـا ئێسـتا چـی گـەل داوای (تطبیـق) ی شـەریعەتی ئیسلامی دەکـات ، حکومـەتی میسـری دەسـتی دەسـتی یـان پێ‌دەکـات ، بـەبیانووی ئەوەی گوایە کەمایەتی گاورەکان (قبطیەکان) ناڕازین...!

دوای میسریش تورکیا لەساڵانی دوای جەنگی جیهانی یەکەمدا ملکەچ بوو بۆ مەرجەکانی دوژمنان کەوتیان : بەمەرجێك سەربەخۆیی دەدەین بەتورکیا کەدەستبەرداری یاساکانی شەریعەتی ئیسلام بێت .

پاشان (مصطفی کمال اتاتورك) یان هێنا ، کردیان بە پەرستراوی جەماوەری بیٚئاگای دوور لەخوا ، ئەویش هەرچی پێکرا کردی لەبردنی تورکیا بەرەو رۆژئاوا و یاساکانی رۆژئاوا...ل٢٢٤(احذروا الاساليب الحديثة في مواجهة الاسلام ) .

کاتی خۆی (گلادستون) ی ئینگلیز وتی : بۆ ئەوەی هێزی ئیسلام نەهێڵین، پێویستە لەچکی سەری ئافرەتان لابەین و قورئانی پیٚداپۆشین و سەرقاڵی ماددە بێهۆشکەرەکان و سەرخۆشکەرەکانیان بکەین ..) ل ٢٦٦ ( احذروا ... )

هەر لەبە ئەوەش بوو کەهێرشێکی زۆر دەکرایە سەر خۆداپۆشین و لەچك و بەنیشانەی دواکەوتوویی ئەیاندایە قەڵەم ، وە بە ئافەرین و هاندانی ئینگلیز هەندیٚ لەو کەسانەی کە کوێرانە دوای رۆژئاوا کەوتبوون گۆڤاری (السفور) یان دەردەکرد لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا لەمیسر .

وە لەساڵی ١٩٢٣دا بروسکەیەك هات بەدوای (هدی شعراوی) و (سیزا نبراوی) دا کە بەشداری کۆنگرەی ژنانی نێودەوڵەتی بکەن کەلەرۆما بەسترا ، پاش ئەوەی ئەو دوو ئافرەتە میسرییە بەشداریان کرد و گەڕانەوە ، لەچکەکانیان فڕیٚدا و خستیانە ژێر پێوە ... ئیتر لەو رۆژەوە کاردەکریٚ بەگەرمی بۆ تێکەڵاوی ژن و پیاو و نەمانی هیچ بەربەستێك بەناوی ئازادی و مافی ئافرەتانەوە ، کەلەراستیشدا مەبەست هەر دژایەتی ئایین و تێکدانی کۆمەڵگایە بۆ هێنانەدی ئاواتەکانی داگیرکەران و دوژمنانی خواو بەرنامەکەی . ل ٢٧٦ هەمان سەرچاوەی پێشوو .

باسکردنی پیلان و دوژمنایەتی رۆژئاوا و ئیستعماری کۆن و نویٚ ، ئەوانەی کەتا ئێستا ئاشکرابووە ، چەندەها موجەلەدی دەوێت و ئاسان نییە تیشك بخرێتە سەر هەمووی ، بۆیە بەوەندە دەست هەڵدەگرین و دەچینە سەر نویٚ ترین جەنگی ئەمەریکا و خۆرئاوا دژی ئیسلام کە هەندیٚ زانای وەك ( د. یوسف القرضاوي) دای دەنیٚ بەجەنگی جیهانی سیٚیەم دژ بەئیسلام بەگشتی و دژ بە بزافە ئیسلامییەکان بەتایبەتی ...

# ئەمریکا و جەنگی جیهانی سێیەم

بەراستی یاری و گەمەیەکی گەورەیە لەسەدەی بیست و یەکدا ، گەمەیەك کەدەستی شاراوەی بەهێز پیێی هەستاوە و ئەنجامیداوە لەپشت پەردەوە ...

ئەم یاری و گەمە یە هەزاران جار گەورەترە لەتیرۆر کردنی سەرۆکی ئەمریکی (جون کیندی) ، کە ئەمەش هەر ئەو دەستە رەشە شاراوەیەی ناو ئەمەریکا ئەنجامی داو توانیشی چاك پەردە پۆشی بکات .

ئەم رووداوە گەورەیە ، واتە تەقینەوەکانی ئەم دواییەی ئەمریکا بۆ چەندەها سالی تریش رەنگ ئەداتەوە و کاریگەری دەبێ لەسەر سیاسەتی نێو دەولەتی و رەنگە سەرەتایەکیش بێت بۆ ئەوکێشمە کێشەی کە ( هانتنگتون) باسی لێدەکرد و نوقلانەی بۆ لێ ئەدا .ئەم کارەساتە ئەوەندە گەورەیە کە پێویستی بەهاوکاری و رێکخستن و سازدانی زۆر هەیە لەنێوان بەرپرسانی پنتاگۆن و دەزگا گەورە بەرپرسەکانی ئەمەریکادا ... ئەگینا چۆن دەتوانرێ تەفسیری ئەوەبکرێ ، کە بۆماوەی نزیکەی یەك سەعات جیهازی ئینزاری سەرتاسەری ولات لەکاربکەوێ !

لەکاتێکدا ئەو ئامێرانە چەند سال لەوەوبەردانراوە ، لەکاتی جەنگی ساردا، تا ئەمەریکا بپارێزێ لەهەر پێشهاتێکی لەپری لەوجۆرە ...

چۆن ئامێرەکانی ئاگادارکردنەوەی پنتاگۆن کاریان نەکرد ، کەناسراوە بە پتەوترین و پارێزراوترین بینا لەجیهاندا !

کێ هەیە دەستی گەیشتبێتە ئەو ئامێرانە ، کەکەس ناتوانی بیگاتێ تا بەچەند خالێکی پشکنینی وردا تێنەپەرێت ؟

کێ هەیە ئاگاداری هێماو شفرەی نهێنی ئەو ئامێرانە بێت ؟ دیارە کەسانێك لەبەرزترین و بالا ترین پلەی لێپرسراوێتیدا دەیزانن!

لەزانستی تاواندا دەوترێ ( هیچ تاوانێك نیە جێ دەستێك بەجێ نەهێلێ و لەسەدا سەد تەواوبێت ) ، بۆیە لەم کارە ساتەشدا دەکرێت بپرسین ؟

١ ـ دەلێن ئەوانەی بەم کارە هەستاون عەرەب و موسلمان بوون و مەشقیان کردووە لەسەر فرۆکەوانی ، ئاشکرایە ئەم کارە ترسناکە مەزنە ، کە تا ئێستا کاری تیرۆری ئاوا گەورە ئەنجام نەدراوە ، بەکەسانی شارەزایی کەم ئەنجام نادرێ لەئاسمانی

ئەمریکایەکدا کە ئەو هەموو بالاْخانانە سەریان لەئاسمان توندبووە و گەورەترین و بەدەسەلاْتترین ولاْتی جیهانە .

٢ - چۆن چوار فڕۆکە لەڕێڕەوی خۆیان لابدەن و هیچ کارەساتێکی بەیەکدا مالْین روونەدات؟ چۆن ئەو فڕۆکانە بورجی چاودێریان ئاگادارنەکردەوە ، کە ئاگادارکردنەوە تەنها چەند چرکەیەکی کەمی دەوێت ؟ لەکاتێکدا فڕۆکەکان نزیکەی سەعاتێك ماوە هەبوو لەنێوان یەکەم و دواهەمینیاندا و زیاتر لەنیو سەعات فڕۆکەکان لەهێلْی ئاسمانی خۆیان لایاندابوو ، بەئاسمانەوە بوون .

٣- بۆچی ئەو فڕۆکانە داوای یارمەتی یان نەکرد و نەیانووت فڕێنراوین ؟ لەکاتێکدا کەلە مێژووی فڕۆکەوانیدا ، هیچ فڕۆکەیەك نەبووە کەفڕێندرابیّ و پەیوەندی نەکردبیّ بەبورجی چاودێرییەوە ! کوا سندوقە رەشەکان و چییان تیا تۆمار کراوە ، دیارە هەمووی پەردە پۆش دەکریّ ...

٤ - پاش رووداوەکە ، هێلْی ئاسمانی ئەمریکی یەکەم لیستەی ناوی راگەیاند کەلە فڕۆکەکاندا بوون و هیچیان عەرەب نەبوون ، دوایی لیستەکە گۆڕدرا بەجۆرێك کەناوی (١٩) کەسی عەرەبی تیابێت ، کەلەناویاندا کەسانێك هەبوون پێش دوو سالْ مردوون و هەشیانە لەولاْتەکانی خۆیاندا زیندوون و خەریکی کاری خۆیانن .

٥ - بۆچی چوار هەزار جوولەکە کەلەودوو بالْەخانەدا کاردەکەن ئەو رۆژە نەچوون بۆ سەرکارەکانی خۆیان ، لەکاتێکدا رۆژی پشوودانیش نەبوو ...

هەروەها بۆچی شارۆن کەنیازبوو لەورۆژەدا سەردانی شاری نیویورك بکات پێشتر سەردانەکەی گۆڕی و هەلْی وەشاندەوە ؟

هەروەها چەند جوولەکەیەك دەستگیرکران کە بەتەمای تەقاندنەوەی پردێکی گەورەبوون و کەس باسیان ناکات .

٦ - بۆچی دوو رۆژ پێش رووداوەکە (بۆرصە) ی نیویورك جوولْەیەکی نائاسایی پێوە دیاربوو ؟ ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنیّ کەکەسانیّ هەبوون ئاگایان لەم کەین و بەینە بووە ؟

٧ - بۆچی پێش چەند مانگێك ئەو دووبالاْخانەیەی بازرگانی جیهانی کە بەدەست جوولەکەکانەوە بوو دابوویانەوە بەکریّ ، لْی دەرچوون و فرۆشتیانەوە ؟

٨ ـ چۆن وێنەگران ئامادەبوون لەیەکەم سات دا وێنەی زیندووی ڕووداوەکە بگرن تەنانەت پێش ئەوەی فڕۆکەکەش خۆی بماڵێ بەباڵاخانەکاندا !

## نیزامی ( JPLS )

لەسـالّی ١٩٨٤وەوە لەئەمـەریکا تاقیکردنـەوە دەکرێـت لەسـەر دەسـتگرتن بەسەرفڕۆکەدا لەدوورەوە ، ونزیکەی هەشت ساڵە سەرکەوتون لەم بوارەدا ، وەیەکەم تاقیکردنەوەی سەرکەوتوو بەسەر فڕۆکەیەکی مدنی جۆری (بۆینگ) دا ئەنجام درا ، کەکەسـیتیانەبوو ، وە ئـەم فڕۆکەیـە بـەهۆی ئـەم تەکنۆلۆجیایـەوە هەڵسـێنراوە و بەسەلامەتی نیشێنراوەتەوە لەیەکێك لەقاعیدەکاندا .

فڕۆکـەی مدنـی و جـەنگی لـەدوورەوە و لەمانگـە دەسـتکردەکانەوە دەتوانرێـت رێنمایی بکرێت کەپێی دەوترێت ( JPLS) کە ئەمەریکا بۆ ئەم بەرنامەیە (٣،٢) ملیار دۆلاری سەرف کـردووە ، وەزارەتـی بـەرگری ئـەمریکی لەگـەڵ کۆمـەڵێ کۆمپانیـادا هاوکاریان کرد کەناویان (رایثۆن) ە ونزیکەی (بیست) کۆمپانیان ...

بەهۆی ئـەم نیزامـەوە دەتوانرێـت هـەر فڕۆکەیـەکیان بوێـت ، هێمـاو شـفرەکانی بکەنـەوە و هـەموو ئامێرەکـانی ئاگادارکردنەوەشـی لـەکار بخـەن و بـەبێ ئـەوەی فڕۆکەوانەکەی هیچ دەسەڵاتێکی بمێنێ ، بیبەن بەرەو ئەو ئامانجەی کەدەیانەوێت بۆیە گومـان دەبرێ و گومانەکەش زۆر بەهێزە کە ئەو فڕۆکانە نەفرێنراون بـەڵکو لەمانگـە دەستکردەکانەوە دەستیان بەسەردا گیراوە ، بۆیە نوسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵـی لێپێچینـەوەی دەسـت پێکـردووە لەگـەڵ سـەرۆکی ئـەو کۆمەڵـە کۆمپانیایـەدا کـەناوی (دانیـال بورنـهام) ەو هـەروەها لەگـەڵ سـەرۆکی ئـەندازیارانی موشـریف بەسـەر ئـەو نیزامەدا کەناوی (بروس سولومون) ە کەبەناوەکەیدا دیارەجوولەکەیە !

## بۆچوونی سیاسە تمەدارێکی گەورەی ئەمریکی

(لینـدون لاروش) کەیەکێکـە لـە هـەڵبژێردراوەکانی حـیزبی دیموکراتـی بـۆ سەرۆکایەتی ئـەمریکا لەهەڵبژاردنـەکانی (٢٠٠٤) دا ، لـەوتارێکیدا لەواشـنتۆن لـە ٢٠٠١/٧/٢٤ دا ، واتە پێش (٤٨) ڕۆژ لەڕووداوەکە دەڵێت :

( ئێمە لەئەزمەیەکی ئابووری داین ، ولاّتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا خراپ دەبرێ بـەرێوە ،لـەزەمانی کارتـەرەوە نیزامەکـەمان لەسـەر لێـواری ئیفلاس بوونـە . نـیزامی هـاتووچۆ و وزە و فـێرکردن و تەندروسـتی و ، ژێرخـانی ئابووریمـان لەحاڵـەتی

داڕووخانداية ، لەسەدا هەشتای گەل خاوەن داهاتێكی كەمن ، وەئێستا حاڵیان زۆر خراپترە لەپێشتر و لەچاوساڵەكانی ١٩٧٧دا ، وە هەتا سندوقی دراوی نێو دەوڵەتی و سیاسەتی ئێستامان و (وڵ ستریت) ونیزامی ئیحتیاتی فیدراڵی بەسەرمانا زاڵ بێ ، كەس بەتەمای چاكردن و چاك بوون نەبێت .

وە ئەگەر حاڵ وابڕوات ، ئەوا سەرۆك بۆش ناچار دەبێت واز لە پۆستەكەی بهێنێ پێش ئەوەی ماوەی سەرۆكایەتی یەكەی تەواوببێت ، داڕووخان یەكسەر دەرناكەوێت بەڵكو سیاساتی هەڵە بەردەوام دەبێت هەتا لەپڕ كارەساتێك دەقەومێت .ئنجا نەك هەر وڵاتە یەككرتووەكانی ئەمریكا ، بەڵكو ئینگلتەرە و ئەڵمانیا و فەرەنسا و ئیتالیا ، واتە وڵاتەكانی ئەورووپای رۆژئاواش ، لەسەر لێواری ئیفلاسن .

لەلایەكیترەوە گۆڕانی زۆری تازە روویانداوە لەئاسیادا ، لەرووسیا و چین و هیند وتەنانەت یابانیش ، ( یەكێتی شنغهای) دامەزراوە و هەوڵیش لەئارادایە بۆ دامەزراندنی هێڵی هاتووچۆ كەلەچینەوە دەست پێدەكات و بەئاسیادا تێدەپەڕێ و دەگاتە ئەورووپا...

ئێمە دەتوانین دەستی یارمەتی بۆ ئەو وڵاتانە درێژ بكەین كەلەسەر ئەوهێڵەن و یارمەتی وڵاتانی تریش بدەین بەبێ (سوو) بەمەش بازاڕی نوێ بۆخۆمان فەراهەم دێنین . بەڵام لەم جۆرە وەزعانەدا و لەم كاتانەدا عادەتەن ، جەنگی جیهانی بەرپادەكرێ ، كاتی خۆی ئینگلیز جەنگی جیهانی یەكەمی بەرپاكرد بۆ ئەوەی گۆڕانكاری لەئاسیادا روونەدات ، لەپێشدا ئاگری جەنگیان لەبەلقان هەڵگیرساند و دوایی هەموو جیهانی گرتەوە .

هەروەها ئەڵمانیەكانیش جەنگی دووەمی جیهانیان هەڵگیرساند بۆ هەمان مەبەست ، ئێستاش دەسەلأتدارانی وڵاتە یەككرتووەكانی ئەمریكا و ئینگلیز ( لەناویاندا بریجنسكی) دەیانەوێ جەنگێكی جیهانیتر هەڵگیرسێنن ، تا ئەو گۆڕانكاریانە لەئاسیادا نەیەنەدی ، كەمانگی (ئاب) یش چاكترین كاتە بۆ ئەو جۆرە جەنگە ، وە ئەوسا رایدەگەیەنن كە جەنگە لەنێوان رۆژئاوا و ئیسلام دا...

دەبێ ئێمە رێ بگرین لەم جۆرە جەنگە ، وەدەبێت شارون رابگرین لەشەڕكردن كەتاقە هیوایەتیەتی ، دەبێ رێی لێ بگرین و ئاشتی لەرۆژهەلأتی ناوەڕاستدا بەدی

بهێنین و ، دەبێ نیزاممان ببوژێنینەوە و بەرەو هەستانەوە بچین لەسەر ڕێبازی (روزفلت) ..

پاش ڕووداوی تەقینەوەکانی نیویورکیش بەهەفتەیەك ، لەبەرنامەیەکی ڕادیۆیدا ناوبراو وتی : ڕووداوی ١١ی سبتمبر ، کارێکی مکیاجە ، دروستکراوە لەماوەیەکدا کە ئەزمەی ماڵی و نەقدی ڕوویداوە لە زۆربەی ولاٌتەکاندا ، هەرگیز هیچ هێزێك لەدەرەوەی ولاٌتە یەکگرتووەکان ئەمەی نەکردووە ، هەرچەندە ڕەنگە هەندێ کەس لەولاٌتانی ترەوە بەکارهاتبن لەم کارەدا ...

ئەوەی بەم کارە هەستاوە ، ئەو هێزانەی ناو ولاٌتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە ، کە ئامانجیش تیای دا ئەوەیە ئینقلابێکی ئیداری بکەن و ولاٌت بەرەو جەنگ بەرن ، وە ئەوانە ئامادەن کاری تریش بکەن بۆ ئەوەی بگەنە ئامانجەکانیان .

وە هەوڵ دەدەن جەماوەر تاوبدەن ، تا حکومەت بەرن بەرەو جەنگ ، ئەبێ ئەمە ڕابگرین ... هەرگیز بڕوا بەهەواڵەکانی کەناڵی CNN و FOXTV و هاوشێوەکانیان مەکەن.چونکە بڕواکردن بەو هەواڵانەی ئەو کەناڵانە بلاٌوی دەکەنەوە ، ولاٌت دەبەن بەرەو جەنگ ، کە ئەوەش دەبێتە ئالەتێك بۆ هاتنەدی ئامانجی ئەوانەی بەوکارە هەستاون ...هەق وایە بیر لەچوونە ناو ئەفغانستان نەکەینەوە ، هەقە لەسەرمان کە ئیسرائیل ڕابگرین لەحەددی خۆیدا ، چونکە مەترسی هەیە بۆ سەر ئەمەریکا و ولاٌتانی تریش .

هەروەها دەبێت ئاشتی لەڕۆژهەلاٌتی ناوەڕاستدا بەرقەرار بکەین ، چونکە ئەو پشێویەی کە ئێستا لەناوچەکەدایە بەشێکە لەو جەنگەی کەنەخشەی بۆ کێشراوە لەئاسیادا ) .

وە لەچاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەگەریدا (لاروش) لە ٢٠٠١/٩/١٨ دا وتی ( لەپێش هەموو شتێکدا ، بەڕاستی ئەوەی لەولاٌتە یەکگرتووەکاندا ڕوویدا ، هێرشێکە کە هێزێکی شاراوە ڕێکی خستووە و ئەم کردارە جۆرێکە لەخەڵەتاندن و پەردە پۆشی هێزی ئاسایشی ئەمریکا . ئەوانەی ئەمەیان کردووە لەڕۆژهەلاٌتی ناوەڕاستەوە نەهاتوون و لەئەوروپاو ئەمەریکای خوارووە وە نەهاتوون ، هەرچەند لەوانەیە خەڵکانێکی تری لەولاٌتانی ترەوە تێوەگلابن ، ئەم ڕووداوە کردارێکی ئاڵۆز و زۆر گەورەیە ، ناکرێ یەکێ لەدەرەوەی ئەمەریکا بێت و بتوانێ شتی وابکات).

ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە ئەمەریکا و بەریتانیا نەیانهێشت فلیمێکی ئەمریکی پیشان بدرێ لەوڵاتەکانیاندا ، لەبەرئەوەی لەفلیمەکەدا سیناتۆرێك لە لەکۆنگریسی ئەمریکی کەنیشانەیە بۆ هێزی شاراوەی پشت پەردە بەسیخوڕێکی نهێنی ( کە دەیەوێ هەندێ کاری نایاسایی بۆ بکات) دەڵێ : بەڵێ هەڵدەستین بە خستنە خوارەوەی فڕۆکەمان ، وە هەڵدەستین بەلێدانی بیناکانمان ... وە ڕووی ناشیرینی ئیرهاب دەخەینە بەرچاو ، بەوەش پشتگیری رای گشتیمان دەست دەکەوێت و ئنجا جەنگ دەکەین لەگەڵ وڵاتە ئیرهابییەکاندا ) ... گۆڤاری المجتمع /١٤٧٥/٣/١١/٢٠٠١

## ئەوەی جوولەکە ئاواتی بوو !

(بنیامین نتنیاهو) سەرۆك وەزیرانی پێشووی جوولەکە لەپەڕاوێکی دا کەلەساڵی ١٩٩٦دا دەری کردوە دەڵێ : ( ئیسلام بەردەوام هەڕەشەیە بۆ جوولەکە ، وە بۆ نەهێشتنی ئیرهابی نێودەوڵەتی ئیسلامی ، هەر ئەبێ رۆژئاوا بەشدار بکرێت لەروو بەڕووبوونەوە و جەنگیدا ، وە رۆژئاواش بەشداری ناکات مەگەر ئەمەریکا وەکو سەرکردەی ئەو جەنگە بەشداری بکات ، کە ئەمیش دیارە بەشداری ناکات مەگەر راستەوخۆ بەرژەوەندییەکانی بکەونەبەر هێرشی ئیرهابیەکان ) .

زیاتر لە(٢٠) ساڵە (نتنیاهو) خەریکی گەڵاڵەکردنی بیردۆزی (ئیرهابی دەولی ئیسلامی) یە و هەوڵی زۆریشیداوە کە رای گشتی ئەمریکا و ئەوروپا بۆ خۆی مسۆگەر بکات ، وە لە (قدس) پەیمانگایەکی بۆ لێکۆڵینەوەی ئیرهاب دامەزراند بەناوی براکەیەوە (جوناثان) کە گوایە لەکردارێکی ئیرهابیدا کوژراوە ! ....(نتنیاهو) لەم بوارەدا پەڕاوێکی دەرکرد لەساڵی ١٩٨٦دا بەناوی (الارهاب : کیف یمکن للغرب أن ینتصر)و هەروەها لەساڵی ١٩٩٦دا پەڕاوێکی تری دەرکرد بەناوی( محاربة الارهاب).

ئەوەی کەنتنیاهو بڕوای پێیەتی و بانگەشەی بۆ دەکات ئەوەیەکە (ئەمریکا قەناعەت ناکات بەدژایەتی ئیرهاب و پێویستی رووبەڕووبوونەوەی ، مەگەر بەرهێرشی راستەوخۆ بکەوێ ) جا ئەم جۆرە بیروبۆچوونە زیاتر جوولەکە دەخاتە ژێر پرسیارەوە ، کە هەروەك چۆن هەمیشە کێشەیان بۆ گەلان ناوەتەوە ، ئەم ڕووداوەش لەوانەیە دەستی ئەوان بێت و خۆئاشکراشە باشترین سوودیان لێوەرگرت و عالەمیان سەرقاڵ کرد بەکێشەیەکی واوە کە فەلەستینیان بیرچێتەوە و ئەویش بەئارەزووی خۆی چیدەوێت بیکات ( گۆڤاری الفتوی : (١٠٦)) ساڵی٢٠٠٢ ) .

## تیری میسان وپەڕاوەکەی

تیری‌میسان نوسەرێکی فەرەنسی یەو لەدوای رووداوەکانی ئەمریکا پەڕاوێکی دانا بەناوی ( ١١ ی‌ئەیلولی ٢٠٠١ فێڵێکی ترسناك ) ، کەتیایا گەلێك خاڵی گرنگ دەخاتە بەر باسو لێکۆڵینەوە ، بۆ نموونە دەڵێ :

١-هەر کەسێك کەباش سەرنج بدات دەتوانێ فرت و فێڵ بەدی بکات ( لە راگەیاندنەکانی ئەمریکادا ) وە ئەوەی کەدای بە پنتاگۆندا بە بۆچوونی من مووشەکێکی‌ئەمریکی بوو نەك فڕۆکە ...کەئەمەش تەنها بەسووپای ئەمریکی دەکرێ..

٢- بەپشت بەستن بە قسەکانی ڤارن ریمیرۆ کەپسپۆرێکی نێودەوڵەتی بەناوبانگە لە پەیمانگای مەکسیکی نوێ بۆ مین وتەکنولوجیا بۆمان دەردەکەوێ کە دوو تاوەرەکە تەنها بەهۆی فڕۆکەکانەوە نەڕووخان بەڵکو بەبۆمب ڕێژ کردنی نهۆمەکانی ژێرەوە تاوەرەکان رووخان ..

٣-ئەوەی روویداوە کودەتایەکی سەربازی‌یە لەبەرزترین دەسەلاتی ئەمریکیدا کرا ، مەرجەکانی خۆی بەسەر سەرۆك بۆشدا سەپاند ، کودەتایەك پیاوانی ریزی سەربازی لە ئیدارەی ئەمریکیدا پێی هەستان ..پیاوانێك توانایەکی گەورەیان هەیە و دامەزراوەکان بەرێوەدەبەن و هەموو دەزگایەکی بڕیاری ستراتیجی ئەمریکی دەبەزێنن

شایانی باسە پاش بلاوکردنەوەی ئەم پەڕاوە لە ئەمریکاوە چەند جار هەڕەشەی کوشتن لە نووسەر کراوە ( نهێنیەکانی پشت ١١ی سێپتەمبەر/ وەرگێڕانی-ئەرکان حەمە رەشید )

## دەست وەردان لەبەلگەکان

دەزگاکانی لێکۆڵینەوەی ئەمریکی بەهۆی دەست وەردانە بەڵگەکانەوە جێی متمانە نین وبەجۆرێك دەیگۆڕن کەلەبەرژەوەندی خۆیاندا بێت ، نموونەش لەم بارەیەوە زۆرن :

١-زانایەکی بەرەگەز چینی زۆر چالاك و دڵسۆز بەناوی (وان هو لی ) لەتاقیگەی (لوس المرسی ) ئەمریکی بۆ ماوەی بیست ساڵ کاری دەکرد بە بیانوی ئەوەی کە ولاتی چین زانیاری ئەتۆمی لە ئەمریکاوە دەست کەوتووە ناوبراویان دەستگیر کردو بەناهەق پەنجاو نۆ تۆمەتی مل شکاندنیان بۆ دروست کرد وپاش نۆ مانگ بەندکردن و ئازاردان بەهۆی پارێزەرەکانیەوە بەهەزارحاڵ رزگاری بوو ..

٢-لەرۆژی ١٩٩٩/١٠/٣١ فڕۆکەیەکی میسری بۆینگ ٧٦٧ لە نزیك نیویۆرك کەوتە خوارەوە کە ٣٣ ئەفسەری میسری تیابوو کە لە ئەمریکا مەشقیان کردبوو ،ئەمریکا لێکۆڵینەوەی لە ڕووداوەکەدا کردوو ڕاستیەکانی پەردەپۆش کردو تاوانەکەی خستە گەردنی فڕۆکەوانە میسرییەکە ، گوایە خۆی ئینتحار کردووە .. بەمەرجێك زۆر ئاشکرایە کە ئەو فڕۆکەیە خراوەتە خوارەوە بە مووشەك ودوورنیە دەستی جوولەکەو ئەمریکای تیابێت ..گۆڤاری الایمان /١١-١٢/٢٠٠٢ -لاپەرە/ ١٥٣

٣-کاتێك سەرۆکی پێشووی ئەمریکا جون کینیدی ویستی توانای ئەتۆمی جوولەکە سنووردار بکات و لە ولاتە عەرەبییەکان نزیك بێتەوە ،مۆسادی ئیسرائیلی تیرۆریان کردو ئەو پەنجا شایەتەی هەبوون لەسەر ڕووداوەکە چل وحەوتیان لە بارووزروفێکی تەماویو گومانلێکراودا مردن و ( ئەنجلتون ) سەرۆکی دەزگای سیخوڕی ئەمریکی کەباوکی مەعنەوی (مخابراتی ئیسرائیلی ) بوو، هەموو تواناکانی خستە کار بۆدوورخستنەوەی تاوانەکە لە جوولەکە ،بەوجۆرە ئەو تاوانە گەورەیە پەردە پۆش کرا جابۆیە ئەوەی ئەمریکا دەیڵێ مەرج نیە زۆربەی ڕاست بن !!!

( المجتمع/١٥١٣/٢٠٠٢ ) ...

## موعجیزەیەکی هەمیشە و بەردەوام

خوای گەورە بەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ﴿وما أرسلناك الا رحمة للعالمين﴾ یان دەفەرموێت ﴿وما أرسلناك الا كافة للناس بشيراً ونذيراً ﴾ وە داواشی لێدەکات کەبەخەڵکی ڕابگەیەنێ : ﴿قل يا ايها الناس اني رسول الله اليكم جميعاً ﴾ ، ئەم ئاینەش کە بۆ هەموو جیهانەو بیانووی بۆ کەس نەهێشتۆتەوە لەقیامەتدا ، خوای گەورە وەعدی پاراستنیداوە ، بۆیە پەیامەکەشی دواپەیامە و پێغەمبەرەکەش ﷺ خاتەم و دوا پێغەمبەرە.

خوای گەورە خۆی زانایە بەهەمووشتێك ، جاران کەپەیوەندی و هۆکاری بەیەکگەیشتن کەمتر بوو ، هەر گەلەو پێغەمبەرێکی بۆ دەنارد ، بەلام لەزەمانی حەزرەتەوە پەیوەندییەکان بەرەوچاکتر دەڕۆن و پێویست نەبووە کە خوا پێغەمبەریتر بنێرێ ... ئەمڕۆش هۆکاری ڕاگەیاندن و هاتووچۆکردن و لەیەکترگەیشتن کە زۆر پێشکەوتووە و دنیابووە بەلادێیەکی بچووك ، گەورەترین بەڵگەی ڕاستێتی پێغەمبەرە ﷺ ، کە بەڕاستی وایە دەبێ دوا پێغەمبەربێ ، ئەوەتا ئیسلام بە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا

بلاْودەبێتەوە و قوتابیان و شاگردانی ئەو پێغەمبەرە هەنگ ئاسا کاردەکەن و مژدە ئەدەن کەپاشە ڕۆژ بۆ ئیسلامە هەروەك حەزرەت هەواڵی پێداوین ( لاتزال طائفة من أمتي ظاهرين على الحق لا يضرهم من خذلهم حتى يأتي أمر الله وهم كذلك ) مسلم ( ان الله زوى لي الارض مشارقها ومغاربها، وسيبلغ ملك أمتي مازوي لي منها )

هەروەها ئیمام ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردووە کە حەزرەت دەفەرموێ : (أنه ستفتح لكم مشارق الارض ومغاربها ، وأن عمالها في النار الا من اتقى الله وأدى الامانة ) .

واتە خوای گەورە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای پیشاندام و موڵکی ئومەتم باڵ دەکێشێ بەسەر ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا ... وە لە فەرموودەکەی تردا باسی فەتحی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەکات و دەفەرموێت ، کار بەدەستەکانیش هەموویان لەئاگردان مەگەر ئەوانەیان کە پارێزکارن و پارێزەری ئەمانەتن ...

لەفەرموودەیەکی تریشدا زیاتر جەخت دەکاتەوە سەر بلاْوبوونەوەی ئیسلام و دەفەرموێت : ( ليبلغن هذا الامر مابلغ الليل والنهار ، ولا يتركُ الله بيتَ مَدَر ولا وَبَر الا أدخله الله في هذا الدين بعز عزيز وبذل ذليل ، عزاً يعز الله به الاسلام وذلا يذل الله به الكفر ) مسلم

واتە : ئیسلامەتی بەهەموو دنیادا بلاْودەبێتەوە ( هەموو ئەو شوێنانەی کە شەوو ڕۆژ دەیانگرێتەوە ) ، هیچ ماڵێکی لادێ و شار نامێنی ئەم ئاینەی نەگاتێ ، بەعیزەتی عەزیز ، یان زەلیلی زەلیلەکان ، عیزەتێك کە خوا ئیسلامی پێ‌پایەدار و عەزیز دەکات ، وە زەلیلیەك کە خوا کافرانی پێ ڕیسوا و سەر شۆڕ و زەلیل دەکات .

## تریفەی مانگ لەجوانی ناکەوێ

لەلێکۆڵینەوەیەکی زانکۆی ئەزهەردا ، دەرکەوت کە نزیکەی (٤٥) ئیستگە بە (٢٨) زمان و لەهجەی جیاواز بەرنامەکانیان بۆ ناشرین کردنی ئیسلام بلاْودەکەنەوەلەجیهاندا ..بۆ نموونە دەنگی ئەمریکا و بەریتانیا و مۆسکۆ لەسەدا حەفتا و سێی دەنگ و باسەکانیان ئەو بابەتانەن کەباس لەئیرهاب و ناشیرین کردنی وێنەی موسڵمانەکان دەکەن...

ڕێکخراوەکانی مژدە دەرانیش کە بەملیارەها دۆلار ساڵانە سەرف دەکەن بۆ بەگاورکردنی موسڵمانان بەتایبەتی و خەڵکی تریش بەگشتی ، ژمارەیان زیاترە لە (٢٤٥٨٠) ڕێکخراو... کەلەم ژمارەیەدا نزیکەی (٢٠٧٠٠) ڕێکخراویسان لەبواری

تەندروستی و فریاکەوتندا ئێش دەکەن و لەژێر ئەو پەردەیەدا کارەکانیان ئەنجام دەدەن ... وە نزیکەی ( ٣٨٨٠) ڕێکخراویشیان ئەو مژدەدەرانەی کەلە پەیمانگەکانی لاهوت دەردەچن دەیانێرن بەملاو ئەولادا بۆکاری بەگاورکردن...

ژمارەی پەیمانگاکانی مژدەدان نزیکەی ( ٩٨٧٢٠) پەیمانگایە لەجیهاندا !

ژمارەی مژدەدەرانیش لەدەرەوەی ( ئەمەریکا و ئەوروپادا ) کەبەتەواوی دەست بەتاڵکراون بۆ کاری بەگاور کردن و مژدەدەرێتی نزیکەی ( ٣٧٣٧٧٠) کەسە .

ژمارەی ئەو پەڕاوانەی کەدانراون بەزمانە جیاجیاکانی دنیا تا ساڵی ١٩٨٩نزیکەی (٢٢١٠٠) پەڕاوە . ئەمە بێجگە لە ( ٢٢٧٠) بلاوکراوە و گۆڤاری تر کە بۆ هەمان مەبەست بەکاردێن ، کەهەفتانە و مانگانە دەردەچن .

هەروەهالە ئامارەکاندا هاتووە کە ژمارەی ئێستگەی تەلەفزیۆن و رادیۆ کە بۆ مەبەستی بەگاور کردن ومژدەدان کاردەکەن نزیکەی (١٩٠٠) ئیستگەن ...( دیارە ئەم ئامارانە هی دەساڵ زیاتر لەمەوبەرە و ئێستا ئەو ژمارانە زۆر زیاترن) .

بەڵێ جولەکەکان ئاینەکەیان هەر بۆ خۆیانە و ئەوانیش لەگەڵ ئەوەدا کە هەر خەریکی خراپەنانەوە و ئاژاوەن ، کەس بانگ ناکەن بۆ ئاینەکەیان و تەنها ئەوانە بەجوولەکە دەزانن کەدایکیان جوولەکەیە و لەدنیادا تەنها (١٥) ملیۆن کەس دەبن .

گاورەکانیش ئاینیەکەیان کە هەر بۆ ( بنی اسرائیل) ە کەچی بەپێچەوانەی داوای ئاینەکەیانەوە ، لەهەوڵی بەردەوامدان بۆ بلاوکردنەوەی گاورێتی، هەر چەندە لەجیهاندا نزیکەی (٢) ملیارن ، بەلام ژمارەیەکی کەمیان پابەندی گاورین و تەنها ئایندارییەکی رووکەشیان بۆخۆیان هێشتۆتەوە ...موسوڵمانانیش کە ئاینەکەیان نەسخی هەموو ئایین و بەرنامەکانی کردوە و بۆ هەموو خەڵکی سەر زەمینە ، ئێستا ژمارەیان ( ٢٥و١) ملیار کەسە ، ئەگەرسستی و خاوی خۆیان نەبووایە ، ئێستا دنیا بەجۆرێکی تردەبوو ...

هەرچەندە وەك باسمانکرد پیلانی دوژمنان و هەوڵی بێوچانیان ڕێگرە بۆ بلاوبوونەوەی ئیسلام ، بەلام هۆکاری سەرەکی موسڵمانەکان خۆیانن کە نەشارەزان و بێئاگان لەو دیارییە بە نرخەی کەخوا بۆی ناردون و قەدری نازان ، هەروەك چۆن منالێك گەوهەرێکی گران بەهای بەدەستەوەبێت و لەناو قوڕوخۆڵدا یاری پێ بکات !...

بەراستی هەڵس و کەوت و رەفتاری هەندێ بەناو موسڵمان بوونەتە رێگر و ، وریاکردنەوەی بەردەوام پێویستە بۆیان ...

جارێك زانایەك موسڵمان دەبێت و بەتەلەفۆن هەواڵ دەدات بەباڵوێزی وڵاتێکی موسڵمان ، ئەویش لەجیاتی ئەوەی هانی بدات و پیرۆزبایی لێ بکات ، بەداخەوە تەلەفۆنەکە دادەخاتەوە بەروویدا !

جارێکیتر یەکێکی بیانی موسڵمان دەبێت ، رێی دەکەوێت لەدوو موسڵمانی عەرەب کەسەرخۆش بوون ، ئەویش خزمەتیان دەکات تا دێنەوە هۆش خۆیان ، ئنجا سەرزەنشتیان دەکات ودەڵێت : من هاتمە ئاینەکەتانەوە و ئێوەش لێی دەرچوون ! ئەم قسەیە وایان لێدەکات پەشیمان ببنەوە و بەچاکی پەیڕەوی ئیسلام بکەن .

بەڵێ ... موسڵمانان زۆریان بێئاگان و کافرانیش لەوپەڕی هەوڵدان و بەلێشاو پارە بەخت دەکەن ، بەڵام پەیمانی خوایە کە ئەگەر بۆ ماوەیەك چرای ئەم ئاینە کزیش بێت ، نایەڵێ بکوژێتەوە ! ئەم ئاینە هەردەمێنێ و پاشە رۆژیش بۆ ئیسلامە و دوژمنانیش رەنج بەخەسار دەبن ، قورئان دەفەرموێت : ﴿ ان الذين كفروا ينفقون أموالهم ليَصُدوا عن سبيل الله ، فسينفقونها ثم تكون عليهم حسرة ثم يُغلبون ، والذين كفروا الى جهنم يُحشرون ﴾ الانفال : ٣٦ واتە: بەراستی کافران ماڵی خۆیان بەخت دەکەن بۆ دوورخستنەوەی خەڵکی لەرێی خوا ، بەختی دەکەن بەڵام بۆیان دەبێ بەداخ و خەم و پاشان ژێریش دەکەون ، وەکافرانیش بەرەو دۆزەخ حەشر دەکرێن و راپێچ دەکرێن ...

## نمونەیەك لەیەمەنەوە

کۆمەڵێك مژدەدەر لەکۆتایی پەنجاکاندا روودەکەنە یەمەن و لەگوندێکدا دەیانەوێت هەندێ کەس راکێشن بەلای خۆیاندا ، لەناو هەموو دانیشتواندا ، پیاوێك زۆر خزمەتیان دەکا و بەدەور خولیاندا دێت ، ئەوانیش وادەزانن بڕوای هێناوە بەبیروباوەڕەکەیان ، رۆژێك پێی دەڵێن ئێمە دەمانەوێ پاداشتت بدەینەوە لەسەر ئەو هەموو هەوڵ و ماندووبونەی کێشاوتە لەگەڵماندا ، جا بۆ کوێ حەزدەکەی بتنێرین و چیت ئەوێت بۆت بکەین ، ئەویش دەڵێت : ماڵتان ئاوابێت ، تەنها داوای من ئەوەیە ئەمەوێ یارمەتیم بدەن بچم بۆ مەککە بۆ حەجی ماڵی خوا !!

خوای گەورە مرۆڤی سەرپشك كردووە و، حەز دەكات مرۆڤ بەئازادی تەواوەوە بەرنامەی ژیانی هەڵبژێرێ ... پیاوێكی ئەنصار لە(بنی سالم كوڕی عوف) كەناوی (الحصنی) بوو ، خۆی موسڵمان بوو بوو ، دوو كوڕیشی هەبو هێشتا هەرگاوربوون ، حەزی كردووە فشار بخاتە سەریان بۆ موسڵمان بوونیان ، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی لەسەری ناردە خوارەوە ﴿ لا اكراه في الدين قد تبين الرشد من الغي ﴾ واتە : زۆركردن نیە لەئایین دا ، هەق و ناهەق ڕوون كراوەتەوە و خەڵكی ئازادن دوای چی دەكەون ...

(عتاب كوری شمیر) دەڵێ : وتم بەپێغەمبەری خوا ﷺ : ئەی نێرراوی خوا باوكێكی پیر و برام هەیە بابیانهێنم بەڵكو لەسەر دەستا موسڵمان ببن ، ئەویش فەرمووی : ئەگەر موسڵمان بن چاكترە بۆیان ، خۆ ئەگەر لەسەر ئایینی خۆشیان بمێننەوە و موسڵمان نەبن، ئەوا ئیسلام سنگی فراوانە ! ..

لەمێژووی ئیسلامیشدا ئەم سنگ فراوانی و زۆر نەكردنە هەر بەردەوام بووە و رێز لەشوێنی پەرستن و مەراسیمی ئەهلی كیتاب گیراوە ، بۆیە دەبینین لەهەموو جیهانی ئیسلامدا كەنیسە و پەرستگاكان ماون و ئەهلی ئەو ئاینانە بەئازادی و سەربەستی مەراسیمی ئاینی خۆیان جێبەجێ دەكەن .

( ابن العطار الاندلسي ) لەسەدەی چواری كۆچیدا دەڵێ : بۆ موسڵمان بوونی هەر گاورێك یان جوولەكەیەك دەبێت بەڵگەنامەیەك بهێنێ لەلای قازیەوە كەشایەتی چەند كەسێكی لەسەر بێت ، كەكەس زۆری لێنەكردوەو بەئازادی و هەموو حەز و ئارەزووی خۆیەوە ئیسلامی هەڵبژاردووە ... )

بەڵێ ئەم بێ منەتیەی ئیسلام و ئەم دابینكردنی ئازادی و سەربەستی فیكرییەی وای دەكرد كەخەڵكانی غەیری موسڵمان ئیسلامیان زیاتر لا شیرین ببێ ، هەروەها رەفتاری جوان و مامەڵەی بەرزی موسڵمانانیش هاندەرێكی چاك بوون بۆ ئەم مەسەلەیە ، حەزرەت دەفەرموێت ( انكم لاتَسَعُونَ الناسَ باموالكم ، ولكن لِيَسَعَهم منكم بَسْطُ الوجه وحُسن الخُلُق ) واتە : ئێوە بەپارەو ماڵ دەستتان ناگات بەخەڵكیدا تا بیانهێنن بەرەو ئیسلام ، دەی ئەگەر وایە با ڕووخۆشی و رەفتار جوانیتان خەڵكی بگرێتەوە و بیانهێنێ بەرەو هەق و راستی .

بەعەقڵ و باڵغ بوون مرۆڤ بەرپرسیارێتی دەکەوێتە سەری ، جادیارە مرۆڤی عاقڵیش بیردەکاتەوە و سەیری دەوروبەری خۆی دەکات و بیروبۆچوونەکان هەڵدەسەنگێنێ بۆیە دامەزراوی موسڵمان و پابەندێتی زۆر کاریگەری هەیە لەکاری بانگەوازدا ، خوای گەورە بەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ﴿ فاستقم كما أمِرتَ ومَن تاب معك ولا تَطغَوا ، انه بما تعملون بصير ، ولا تركنوا الى الذين ظلموا فتمسكم النار ومالكم من دون الله من أولياء ثم لاتُنصَرون ، وأقم الصلاة طرَفَي النهار وزُلَفاً من الليل ، ان الحسنات يُذهبن السيئات ذلك ذكرى للذاكرين ، واصبر فان الله لايُضيع أجر المحسنين﴾هود:١١٥

واتە : وەکو چۆن فەرمانت پێدراوە (ئەی محمد) ﷺ هەروا بەراست و بەرێکی فەرمانەکان بەجێبهێنە ، هەروەها ئەوکەسانەش لەگەڵ تۆدان و گەڕاونەتەوە بۆ لای خواو تەوبەیان کردووە ، نەکەن لەسنووری فەرمانی خوا دەربچن ، چونکە بەڕاستی بینایە بەو کردەوانەی دەیکەن .

نەکەن لادەن و مەیلتان ببێت لەگەڵ ئەوانەدا کەستەمیان کردووە و لەخوا یاخی بوون، چونکە ئەوکاتە ئاگردەتانسوتێنێت و ، جگە لەخواش کەس پشتیوانتان نابێت ، لەوەودواش یارمەتی نادرێن .

نوێژیش بەچاکی ئەنجام بدە لەهەردوو سەری رۆژەوە کەنیوە ڕۆو عەسرە و لە سێکاتەکەی شەویشدا کە مەغریب و عیشاو بەیانی‌یە ونزیکن لەئەمسەر و ئەوسەری رۆژەوە ، بەراستی کردەوە چاکەکان کردەوە خراپەکان لادەبەن و گوناهەکان دەشۆرنەوە ،ئەوە ئامۆژگاری و بیرخەرەوەیە بۆ ئەوانەی یادی خوا دەکەن .خۆت بگرە و بەئارامبە ، چونکە بێگومان خوای گەورە پاداشتی چاکە خوازان بەزایە نادات .

هاوەڵێك داوای لەحەزرەت کرد ﷺ کە شتێکی پێبڵێ لەئیسلامدا ، کە پێویست نەکات پرسیار لەکەسی‌تر بکات ئەویش فەرموی : ( قل امنت بالله ثم استقم ) مسلم .

## بەرەکەتی دامەزراوی لەبەریتانیا

بانگخواز (عبدالله الحکیمی) کەسەرۆکی جالیەی‌عەرەبی یەمەن بوو لەبەریتانیا بانگکرا بۆ سفرە و خوانی شاهانە لەگەڵ گەورە پیاوانی وڵات و باڵوێزی و وڵاتاندا ، لەکاتی نوێژدا ، (عبدالله ) عەباکەی شانی داخست و لەهۆڵەکەدا زۆر بەئاسایی نوێژەکەی کرد . زۆربەی ئامادەبووان هەرچەند موسڵمانیش بوون ئەمەیان پێناخۆش بوو ، ترسان کاریگەری خراپی بێ لەسەر ئامادەبوان ، کەچی بەپێچەوانەوە ، شاژنی

بەریتانیا دوای نوێژەکەی رووی تێکردو وتی: ئێمە بەرێزەوە سەیری ئازایەتی و شانازیەکەت دەکەین بەئاینەکەتەوە لەبۆنەیەکی وەك ئەمڕۆدا ، بۆیە بەڕاستی حەزدەکەین دیارییەکی بەنرخت پێشکەش بکەین !

(عبدالله) وتی : دیارییەك کە پێشکەش بەمن و بەئامادەبوان و خەڵکی (مەملەکەتی متحدە)ی بکەی ئەوەیە کە موسڵمان بوونی خۆت راگەیەنی !

ئەویش پێکەنی و وتی : من سوورم لەسەر ئەوەی دیارییەکی بەنرخت بدەمێ ، رێم بدە پارچە زەوییەکی گەورە و چەند خانوویەکت بدەینێ ! ( عبدالله) ش فرسەتەکەی قۆستەوە و وتی: دیارییەکەتم وەرگرت بەڵام رێمان بدەن مزگەوتێکی لەسەر دروست بکەین ... ئەویش ڕازی بوو ، بەمەش مزگەوتی (کاردف) ی یەکەم دروست کرا کە تا ئێستا موسڵمانان رووی تێدەکەن و خواپەرستی تیا ئەنجام دەدەن .

## بەرەکەتی دامەزراوی لەئەمەریکا

دکتۆر (اکویا) کەمامۆستایە لەزانکۆیەکی ئەمریکی و پاش موسڵمان بوونی ناوی خۆی گۆڕیوە بۆ (محمد اکویا) باسی سەرگوزشتەی خۆی دەکات و دەڵێت : (( کچێکی موسڵمانی داپۆشراو ، لەزانکۆ لەلایەن یەکێ لەمامۆستاکانەوە کە زۆر قینی لەمرۆڤی ئیندار بوو دژایەتی دەکرا ، بەجۆرێك کە ئەیویست هەقی بخواو بێزاری بکات و واز لەزانکۆ ، یان واز لەخۆداپۆشین بێنێت ...

ئەویش ئازاو بەجەرگ و دینداربوو ، سووربوو لەسەر ئاینەکەی و ئامادەنەبوو تۆزقاڵێك دابەزێ لەپابەند بوونی بەئیسلامەوە .

کچەکە ئەوەندە زۆری بۆ هات ، ناچار لای سەرۆکی زانکۆ شکاتی کرد ، ئەویش هەردووکیانی داناو گوێی لەقسەکانیان گرت ، بەئامادەبوونی زۆربەی مامۆستاکان و کۆمەڵێ قوتابی ، کە ئەمەش یەکەمجار بوو کۆڕی وابگیرێ بۆ مەسەلەی ئاوا ... کچەکە وتی : مامۆستا کەم لەبەر ئاینەکەم دژایەتیم دەکات ، چەند قوتابیەکیش شایەتیان بۆ دا ... مامۆستاکەش بەرگری لەهەڵوێستی خۆی کرد و لە تورەییدا خۆی پێنەگیرا و جنێوی بەئاینەکەیدا !

لەگەڵ ئەم لەسنوور دەرچوونەی مامۆستاکەشدا کچەکە هیچ هاوسەنگی خۆی لەدەست نەدا و زۆر بەسەلار سەنگینی بەرگری لەخۆی و ئاینەکەی کردو زانیاری بەپێزی پێشکەش کرد ، قسەکانی ئەوەندە کاریگەری هەبوو لەسەرمان ، جار جار

رامـانده گـرت و پرسـیارمان لیٚدەکـرد ... مامۆسـتا قـین لەدڵەکـەش لـەداخا کوڕەکـەی بەجێهێشت .

پاشان کچەکە دوو پەڕەی داینێ کـەتیایا باسـی ئیسـلام و خۆداپۆشینی تیابوو ، هەرچەندە کوڕەکە ئەنجامێکی نەبوو ، بەلاّم سووربوون و دامـەزراوی کچەکـە وانەیـەکی بەرزیدا بەمن و چەند مامۆستایەکیتر .

پاش چـەند مانگێك لەخوێندنـەوە و گـەڕان بـەدوای راسـتیدا ، موسڵمان بـووم و ، بەدوای منیشدا سێ دکتۆری تریش موسڵمان بوون و پاشان چوار قوتابیش موسڵمان بـوون ، لەماوەیـەکی کـەم دا بویـن بەکۆمـەڵێکی وا کـە بەشـانازی‌یەوە بـانگ بکـەین بـۆ ئیسـلام و لەداهاتوویـەکی نزیـك دا بەرهــەمی ئـەوکارەمان دردەکـەوێت ، لــەوەدا کەخەڵکانێکی زۆر بەنیازن موسڵمان بن . ( جريدة الاتحاد الاماراتية ١٤٢٠/ کۆچی )

## ئوممەتی ئیسلام

خوای گـەورە لەبارەی هـاتنی ئـەم ئوممەتـەوە دەفـەرموێت : ﴿كنتـم خـير امـة أُخْرِجَت للناس ، تامرون بالمعروف وتنهون عن المنكر وتؤمنون بالله﴾ال عمران ١١٠

واتـە : بەراسـتی ئێـوە چاکترین ئوممـەتێکن کـە بـۆ سـوودی خـەڵکی هێنراونەتـە مەیدانـەوە ، فەرمان دەدەن بەچاکـە و جڵـەوگیری دەکـەن لەخراپـە و باوەڕتـان بـەخودا دامەزراوە ...ئنجا دەفەرموێت : ﴿ولو آمن أهل الكتاب لكان خيراً لهم ، منهم المؤمنون وأكثرهم الفاسقون﴾ ال عمـران : ١١٠ واتـە : ئەگـەر ئـەهلی کیتـاب باوەڕیـان بهێنایـە بەئاینی ئیسلام ئەوە چاکتربوو بۆیـان ، هەیانـە بڕواداران ، بـەلاّم زۆربـەیان گوناهبـار و تاوانکار و فاسقن .

ئنجا دەفـەرموێ : ﴿ لـن يضروكـم الا اذى وان يقـاتلوكم يولوكـم الادبـار ثـم لاتنصرون﴾ ال عمران : ١١١ واتە : دیارە ئەهلی کیتاب دژایەتیتان دەکەن و رازی نابن ئێوە پێشەوایەتی مرۆڤایەتی بکـەن و هـەرچیان بـۆ بکـرێ لـەرێگری دەیکـەن ، بـەلاّم هەرگیز ناتوانن زیان لەبیرو باوەڕتان بدەن مەگەر ئازارێکی کەم و، ئەگەر بجەنگن دژتان ، پشت هەڵدەکەن و هەڵدێن ، لەوەدواش سەرکەوتوو نابن.

خـوای گــەورە پـەیمانی (تمکـین) و سـەرکەوتنی ئـەم ئاینـەی داوە بەمــەرجێك موسـڵمانان شـایانی ئـەو سـەرکەوتنە بـن و پـەیمانێك کەداویانـە بـەخوا نەیشـکێنن ،

هەروەك دەفەرمويّت: ﴿ وعد الله الذين امنوا وعملوا الصالحات ليستخلفنهم في الارض كما استخلف الذين من قبلهم وليمكنن لهم دينهم الذي ارتضى لهم ، وليبدلنـهم مـن بعـد خوفهم أمناً ، يعبدونني لايشركون بي شيئاً ، ومن كفر بعد ذلك فاولئك هم الفاسـقون ، واقيموا الصلاة واتوا الزكاة واطيعوا الرسول لعلكم ترحمون ﴾ **النور : ٥٦ واته : خوا بەلّيّنیداوە بەوانـەی بڕوایان هیّنـاوە لەئیّوە و کاروکردەوە چاکـەکانیان ئـەنجامداوە ، بەڕاستی لەئایندەیـەکی نزیکدا جیّنشین و پایـەداریان دەکات لـەوڵاتدا هـەروەك چـۆن بڕواداراني پیّش ئـەمانی جیّنشین کردووە و ئـەو ئاینەیان بۆ دەچەسپیّنیّت کـە خـوا خۆی پیّی رازیە و بۆی هەڵبژاردوون ، هەروەها ترس و بیمیان بۆ دەگۆڕیّت بـەئارامی و هیّمنـی ئەوکاتـە ئیتر بەتـەواوی هەر مـن دەپەرسـتن و هـەرگیز هیـچ جـۆرە هـاوەڵ و هاوبەشیّکم بۆ بڕیار نادەن ، ئەوسا ئەوەی دوای ئـەو پایەداریـە بیّباوەڕبیّت ، ئا ئـەو جۆرەکەسانە هەر تاوانبارو لەسنوور دەرچوون .ئـەی بـڕواداران ، نویّژەکانتـان لەکاتی خۆیـدا بـەچاکی بکـەن و، زەکـات بـدەن و فەرمانبـەرداری پیّغەمبـەریش بکـەن بـەڵکو رەحمتان پیّ بکریّت .**

**حەزرەتی عومـەر لـەبارەی ئایـەتی** ﴿ كنتـم خـير امــة ﴾ **ەوە دەڵیّـت : ( کـیّ حـەز دەکات لەم ئوممەتە بیّت با ئەو مەرجە بهیّنیّتەدی کە خوا بۆی داناوە )** طبري .

**هەروەها** (ثوري)**دەڵیّ : ( ئەگەر فەرمانتدا بەچاکە ئەوا پشتی موسڵمانت گرتـووە ، وە ئەگەر جڵەوگیریت کرد لەخراپە لوتی دووڕووت شکاندووە ) ل ٤٧٨ فقه التمكين .**

**بەڵیّ ... کەباس لەم ئوممەتە دەکریّ و بـاس لەپیلانی دوژمنـان دەکریّت ، رەنگـە هەندیّك بیّهیوابن و هەندیّکیش بپرسن جاچی بەئیّمە دەکریّت ، ئیّمـەش دەڵیّین ، ئـەو بڕوادارەی لەقودرەت و دەسەڵاتی خـوا تیّبگـات بیّهیـوا نـابیّت ، هـەروەها هـەرچیت پیّدەکریّت بیکە لـەو مەرجانـەی دانـراوە بۆ بـوون بەئـەندام لەئوممـەتی ئیسلامدا ، کـە ئەویش ئیمان و کردەوەی چاك و فەرماندان بەچاکە و جڵەوگیریی‌یە لەخراپە .**

**ئەوەی لەسەر شانتە بەجیّی بگەینە و باش بزانـە ، کەکاری ئـەم بوونـەوەرە خـوا دەیگیّڕیّ و بەفـەرمانی ئـەوە ، خـوای گـەورە دنیـای بەرەڵانـەکردووە بـۆ خراپـەکاران ، تەنها ئەوەندە هەیە ، هەمووان تاقی دەکاتـەوە ... هـەروەك دەفـەرمووێ :** ﴿ والله غـالب على امره ولكن أكثر الناس لايعلمون ﴾ ...

پاش چەند ساڵێك ڕەنج و خەباتی حەزرەت ﷺ و یارانی لەمەككەدا ژمارەیان بوو بە نزیكەی (١٥٠) كەسێك و (٨٠) یان چوون بەرەو حەبەشە ... لەحەبەشە وازیان لێ نەهێنان ، عەمری كوڕی عاصیان نارد كە زۆرزان و (داهیە) ی عەرەب بوو ، دیاری گران بەهای ئەو سەردەمەی برد بۆ پاشا و دەستەودایەرەكەی ... لەلای نەجاشی وتی : ئەمانە لەڕێی باوباپیریان لایان داوە ، بەڵكو داڵدەیان نەدەیت و بیان دەیتەوە دەستمان ... ئەویش بانگی كردن وگوێی لەقسەیان گرت و پاشان لەبەرئەوەی قەناعەتی تەواوی بەراستێتی (محمد) ﷺ و یارانی پەیداكرد ، ڕازی نەبوو لانەیان لێبشێوێنێ و دەست بەرداریان ببێ ... كە عەمر زانی هیچی بەدەستەوە نەماوە وتی : قوربان ئەمانە حاڵ و ئاسایشی ئێوەش دەشێوێنن ... بەهەر حاڵ ئەمەشی بۆ نەچووە سەر و هەروا بەدەستی خاڵی گەڕایەوە ...

پاش ماوەیەك شۆڕشێك دژی نەجاشی بەرپا بوو ، ئەویش خۆی بۆ بەرەنگاربونەوەیان ئامادەكرد و ئامۆژگاری موسڵمانەكانیكرد ، ئەگەر خوا نەخواستە شكام ، ئەوا ئامادەبن و خۆتان دەرباز بكەن ...

موسڵمانانی بێكەس و بێدەر لەخاكی غەریبی و دوورە ولاّتیدا زۆر دەترسان ، بۆیە بەردەوام لەخوا دەپاڕانەوە ، كەنائومێدیان نەكات و ئەو پەناگەیەیان لێنەشێوێنێ لەنێوان موسڵمانان و شەڕەكەی نەجاشیدا ئاوێك هەبوو ، بۆیە (زبیری كوری عەوام) كوندەیەكی فووتێكرد و قایمی كرد بەخۆیەوە و بەمەلەچووە ئەوبەر ئاوەكە تازوو دەنگ و باس بزانێ ، پاش ماوەیەك گەڕایەوە و هەواڵی خۆش و مزدەی هێنایەوە بۆ موسڵمانان ، كە نەجاشی سەركەوتووە و دوژمنانی شكاون و بەوشێوەیەش تا فەتحی خەیبەر ئەو كۆمەڵە لەحەبەشە مانەوە ...

پاشان موسڵمانان لەمەككەوە كۆچیان كرد بۆ مەدینە و دەوڵەتیان دامەزراند و لە جەنگی بەدرا سەركەوتنێكی گەورەیان بەدەست هێنا ...

لەجەنگی ئوحودیشدا سەرەتا سەركەوتن و دوایی شكان بەهۆی دەرچوونی تیرهاوێژەكانی سەرشاخی ئوحود لەفەرمانی حەزرەت ﷺ و چۆڵكردنی سەنگەرەكەیان لەسەر شاخەكە ... ئالێرەدا دەپرسین بۆچی خوا چاو پۆشی لێنەكردن و لەبەر هەڵەوكەم و كوڕی هەندێكیان سەری نەخستن ؟!

زانایان دەڵێن : ئەگەر خوای گەورە سەری بخستنایە ، ئەوا راست نەئەبوونەوە و بەچەوتی پەروەردە دەبوون ، دیارە خوای گەورە کاری مەزنی داناوە بۆ ئەو ئوممەتە تا رۆژی قیامەت ، بۆیە پەندێکی وای دادان کە بوو بە خێر بۆیان و بوو بە ئامۆژگاری بۆ نەوەکانی دوای خۆشیان...

هەروەك قورئان دەفەرموێ : ﴿ أو لما أصابتكم مصيبة قد أصبتم مثليها قلتم أنى هذا ، قل هو من عند أنفسكم ان الله على كل شيء قدير ، وما أصابكم يوم التقى الجمعان فبأذن الله وليعلم المؤمنين ، وليعلم الذين نافقوا ﴾ ال عمران: ١٦٦

واتە : کاتێك بەڵاو ناخۆشیەکتان تووشهات لەجەنگی ئوحودا ووتان : ئەمە چیبوو ؟ بۆ واما بەسەرهات ؟ ( ئەی لەیادتان چوو لەجەنگی بەدرا ئێوە دوو ئەوەندەتان بە کافرەکان کرد ) ، ئنجا پێیان بڵێ : ئەو بەڵایە لەلایەن خۆتانەوە توشتان هات ، کاتێك نافەرمانی پێغەمبەرتان کرد و تەماعی دنیا لەدەروونتاندا جووڵا ، بەراستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەمووشتێکدا هەیە ... ئەوەش کە تووشتان هات لەرۆژی بەیەك گەیشتنی دوو ئۆردووەکەدا لەجەنگی ئوحودا ئەوە بەفەرمان و ویستی خوا بوو تا ئیمانی باوەڕداران دەربخات ، وە دووڕوویی و نالەباری دووڕووەکانیش دەربخات ...

لەجەنگی خەندەقیشدا موسڵمانان تەواو ماندووشەکەت بوون ، بەڵام بەهۆی خۆڕاگریانەوە وبەهۆی سەرپێچی نەکردنیان لەفەرمانی پێغەمبەر ﷺ خوای گەورە بەسەربازانی نەبینراوی خۆی لەمەلائیکەت و رەشەبا ، سەری خستن و کافرانی سوك و ریسواکرد ، پاشان رێکەوتنی حودەیبیە فەتحێکی گەورەبوو ، قورئان هاتە خوارەوە لەسەری و فەرمووی : ﴿ انا فتحنا لك فتحاً مبيناً ﴾ الفتح

حەزرەتی عومەر رەزای خوای لێبێت پرسیاری کرد : بۆ ئەوە فەتحە ؟! حەزرەت ﷺ فەرمووی : بەڵێ ... بەخوا ئەوە فەتحە ...

## هەستانەوەی ئوممەتی ئیسلام

موسڵمانانی ئەم ئوممەتە هەر لەسەرەتاوە رووبەڕووی نارەحەتی و زەحمەت دەبوونەوە ، خوای گەورەش وردە وردە پەروەردەی دەکردن بەو رووداوو کارەساتانە ... موسڵمانان چۆن لەبەرەی دەرەوەدا رووبەرووی کافران دەبوونەوە ، ئاوەهاش

لەناوەوە روبەڕووی گێچەڵ و ئاژاوەی دووڕووەکان دەبوونەوە ... کە هەندێ جار ئەم رووبەڕووبونەوەیەی ناوخۆ زۆرگرانتر و کاریگەرتربوو لەسەریان ... بۆ نموونە :

دووڕووەکان لەگەڕانەوەدا لەغەزایەکدا بوختانیان بۆ خاتوو عائشە کرد ، کە بەرووداوی (افك) بەناوبانگە ... ئەم رووداوە یەکەمجار بوو روویدات ، راستەوخۆ کاریگەریەکەی لەسەر ماڵ و ژیانی حەزرەت بوو ، لەکاتێکدا کە عائشەی لەهەمووان خۆشتر دەویست ... یەك مانگی خایاند (وەحی) دانەبەزی هەواڵ بدات و راستیمەسەلەکە بخاتە روو ، کە ئەمەش گەورەترین بەڵگەیە کە حەزرەت ﷺ غەیب نازانێ و هاتنی وەحی بەدەست ئەونیە !

حەزرەت ﷺ راوێژی بە (اسامە و ئیمامی عەلی ) و کەسانیتر دەکردو لەبارەی عائشەوە پرسیاری لێدەکردن ، تا دوا هەمین رۆژ کە عائشە لەماڵی باوکی بوو ، حەزرەت ﷺ چوو بۆ ماڵیان و پیێ فەرموو : ( ئەی عائشە ئەگەر گوناهێکت کردووە ئەوا تەوبە بکە و داوای لێخۆش بوون بکە لەخوا )

عائیشەش بەباوکی وت : بابە وەڵامی بدەرەوە ، ئەویش وتی : بەخوا نازانم بڵێم چی ، وتی : دایکە وەڵامی بدەرەوە ، ئەویش وتی : بەخوا منیش نازانم بڵێم چی ! ئالەم کاتەدا کەس لەجیێ خۆی نەجولا بوو، حەزرەت ﷺ سروشی بۆهات و پاشان بەڕوویەکی گەشەوە فەرمووی : مژدەت لێبێ عائشە ، خوا بەرائەتی بۆ ناردیت و ئایەتەکەی خوێند...

ئەم باسەمان بۆ ئەوە هێنا کە بزانین خوای گەورە چەندە گرنگی داوە بەپەروەردەی ئەم ئوممەتە ، چونکە تاقیامەت گەورەترین ئەرك وا لەئەستۆیدا ، ئەرکی پێشەوایەتی و رێنمایی خەڵکی ... ئەرکێك کەدنیا و قیامەتی خۆیان و خەڵکی وەستاوەتە سەری .. ئەم رووداوە ناخۆش بوو هەمووانی نارەحەت کرد ، بەڵام خێربوو لەلایەنەکەی تریەوە کە گەورەترین پەند و ئامۆژگاری بوو ، هەروەك قورئان دەفەرموێت : ﴿ ان الذين جاؤا بالافك عصبة منكم لاتحسبوه شراً لكم بل هو خير لكم ، لكل امريء منهم ما اكتسب من الاثم ، والذي تولى كبره منهم له عذاب عظيم﴾ النور :

کەواتە بەشەڕی مەزانن ، بەڵکو خێرە بۆتان ... جا بەهەمان شێوە ئەم ئوممەتە تووشی نوشست و ناهەمواری زۆر دەبێت ، بەڵام هەموو کەوتنێکیان هەستانەوەیەکی نوێی لەدوایە، بەئەزموونێکی نوێوە زۆر لە رابردو چاکتر ئەکەونەوە کار ..

پاش ئەوەش کە حەزرەت ﷺ وەفاتی کرد عەرەب هەڵگەڕانەوە و موسڵمانان تووشی کارەساتێکی قورس بوون ، خوای گەورە دڵی ئەبوبەکری قایم کرد و بەفەزڵی خوا ئەوکێشەیەش نەماو ئیسلام زیاتر پەرەی سەند ...

تا ساڵی (٤١) ی کۆچی کەناونرا ساڵی ( الجماعة ) و ئیمامی حەسەن وازی لەفەرمانڕەوایی هێنا بۆ (معاویة) ، ئیسلام بووە گەورەترین دەوڵەت و دەسەڵات لەناوچەکەدا ...

ڕۆم و فارس ئەو دوودەوڵەتە زلهێزەی کەبەهەزار ساڵ دامەزرابوون و ، پەلیان هاویشتبوو لەبەرامبەر هێرشی ئیسلام دا پاشەکشەیان دەکرد ...

لە (ئەندەلوس) یش لەساڵی ٩٢ بۆ ٩٥ کۆچی ، موسڵمانان فەتحیان کرد و ئاڵای ئیسلام بەسەریا شەکایەوە .

ئەگەر پرسیار بکرێ چۆن لەماوەیەکی ئاوا کەم دا ئەو دەوڵەتە گەورانە ئاوایان بەسەرهات ، کە هەریەکەیان سوپای (٢٥٠) هەزار کەسیان بە ئاسانی بۆ کۆدەکرایەوە و دەکرانە خۆراکی جەنگ و بەرەنگاربوونەوە ، لەوەڵام دەڵێین : زوڵم و ستەم و نادادی و دەردە کۆمەڵایەتی‌یەکان وەك خۆرە لەناوەوە خواردبوونی و تەنها قاوغیان مابۆوە ، بۆ رووخانیان دەبوایە هێزێکی دەرەکی پاڵی پێوەبنێت ، جا ئەو هێزەش ئیسلام بوو کەلەوپەڕی گوڕوتین دا بوو ، لەماوەیەکی کەم دا بەپێی سوننەتی ﴿وتلك الايام نداولها بين الناس﴾ واتە دنیا دەگیێڕین لەناوخەڵکی‌دا و هەر ڕۆژەی بەدەست کۆمەڵێکەوەیە ، وە هەروەها ئایەتی ﴿ولولا دفع الله الناس بعضهم ببعض لفسدت الارض ...﴾ واتە : ئەگەر خوا کۆمەڵێك بەکۆمەڵێکی‌تر لەناو نەبات ئەوا فەساد و ئاژاوە و خراپە سەر زەوی دەتەنێت .

بەڵێ ئەمە قەدەری خوایە ، یاسا و باوی خوایە لەم دنیایەدا ، سەرکردەی فارسەکان بەنوێنەری موسڵمانەکانی وت : بۆچی هاتوون ؟ ئەگەر برسێن نانتان بدەینێ ، ئەگەر ڕووت و رەجاڵی پاڵی پێوە ناون ، ئەوە جل و بەرگتان دەدەینێ و پۆشتەتان دەکەینەوە و بگەڕێنەوە وشەڕمان لێ‌لادەن ، نوێنەری موسڵمانەکانیش پێی وت : ئێمە قەدەری خواین ، ئێمەی بەئێوە تاقی کردۆتەوە و ئێوەشی بەئێمە تاقی‌کردۆتەوە ، ئەگەر لەهەوریشدابن ، یان سەر دەکەوین بۆتان ، یان دەبێ دابەزن بۆمان .

دەوڵەتی ئەمەوی و عەباسی نزیکەی ( ٦٠٠) ساڵێك حوکمیان کرد ، لەگەڵ ئەوەدا کاری مەزنیان بۆ ئیسلام ئەنجامداوە و خەلیفەی خواناس و چاکیان بووە ، خەلیفەی خراپ و کاری نابەجێشیان بووە ...

تەتەر و مەغۆلەکان هێرشێکی گەورەی بەرفراوانیان کردە سەرخاکی ئیسلام و قەتڵ و عامی موسڵمانیان کرد و پەڕاوو دەست خەتی زۆریان سوتاند و بۆماوەی (٤٠) رۆژ لەمزگەوتەکانی بەغدادا نوێژ نەکرا ...

تا ئەوەبوو وردە وردە موسڵمانان هەستانەوە و لەگەڵ ئەوەی کەلەمەیدانی جەنگدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا ، لەمەیدانی دڵ و دەرونیش دا بەهەمان شێوە سەرکەوتن وتوانرا تەتەر و مەغۆلەکان موسڵمان بکرێن و دڵیان کەمەندکێش بکرێ بۆ خێر و چاکە و پارێزگاری لەئیسلام ...

هێرشی خاچپەرستانیش بۆ دووسەد ساڵێك جیهانی ئیسلامی سەرقاڵ کرد ، (٩١) ساڵ نەیانهێشت لە ( مسجد الاقصى) دا نوێژ بکرێت ، تا خوای گەورە بەرەکەتی خستە رەنجی (عمادالدین زەنکی) و (نورالدین )ی کوڕی و(صلاح الدین) ی ئەیوبی، وە سەرەنجام بنکە و پێگەی خاچپەرستان لەق کراو هەڵکەندران ...

جەنگی جیهانی یەکەم و دووەمیش بوونە مایەی پارچە پارچە بوونی ئیمبراتۆریەتی عوسمانی و رووخاندنی خەلافەت .

ئیسلامیان لەسیاسەت و حوکمداری جیاکردەوە و پەیڕەوی کردنی ئایین بوو بەنیشانەی دواکەوتوویی و حاڵی نەبوون ... بەقەدەری خوا لەجێی ئەو خزان و خلیسکانە ، رابوونی ئیسلامی چەکەرەی کرد ، ئیمام بەننا لەمیسر و مەودودی لەهیندستان و نوورسیش لەتورکیا ، چاکی مەردایەتیان لێ کرد بەلاداو گڕوتینێکی نوێیان کردەوە بەگیانی موسڵماناندا .

لەو رۆژەدا داوای پەیڕەوی شەریعەت ئەستەم بوو ، بەلام ئەمڕۆ داوایەکی جەماوەرییە لەسەر تاسەری جیهانی ئیسلامیدا ، هەرچەند سیاسەتمەداران و فەرمانڕەوایان و پادشایان بەربەستن لەرێیدا ...

هەروەها خۆداپۆشین دیاردەیەکی سەیر بوو ، کەچی ئەمڕۆ خۆداپۆشین شانازییە و ئەوەی خۆی داناپۆشێ و لاسایی رۆژئاوا دەکاتەوە دەبێ بەخۆیدا بچێتەوە ، لەساڵی ١٩٧٣دا لەزانکۆی کوەیت تەنها سێ ئافرەت خۆیان داپۆشی بوو ، کەچی پاش (٢٥)

ساڵێك هەوڵ و خەباتی رابوونی ئیسلامی لەسەدا نەوەدی کیژانی زانکۆی کوەیت خۆیان داپۆشیوە ( محاضرة المنحنى التاريخي للاسلام / د . طارق السويدان ) .

رۆژنامەیەکی ئەورووپی دەڵێ ( ئەمجارە لەئەورووپاوە خۆری ئیسلام هەڵدێتەوە ، وا خەریکە منارەی مزگەوتەکان جێ بە کەنیسەکان لێژ دەکەن و، بانگی منارەی مزگەوتەکان چاکترین شایەتن کە ئیسلام هەر رۆژەی لەزەوی‌یەکی نوێدا بلاّودەبێتەوە ) .

لەئەمەریکادا مانگانە نزیکەی دوو هەزار کەس موسڵمان دەبوون ، پاش رووداوەکانی نیویورك لەدوومانگدا (٢٤) هەزار کەس موسڵمان بوون ، واتە شەش ئەوەندەی جاران ... ئەمە بێجگە لەوەی چاپەکانی قورئانی وەرگێڕدراوی ئینگلیزی و فەرەنسی لەبازاڕدا نەماون و پەڕاوی ( ماهو الاسلام ) بەفەرەنسی نەماوە و داوای زۆری لەسەرە ( لەتۆڕی ئینتەرنێت ) .

هەروەها لەسەری ساڵی نوێی ( ٢٠٠٢)دا ئیتاڵی‌یەکان قورئانی وەرگێڕدراو بۆ زمانی ئیتاڵییان بەدیاری دەنارد بۆ یەکتری ، ئاماری کتێبخانەکان دەڵێن کە لەیەك هەفتەدا بیست هەزار قورئانیان فرۆشتووە ، کە ئەمەش ئارەزوویان دەردەخات بۆ شارەزابوون لەو دینەی ئەو هەموو قسە و باسەی لەسەر دەکرێت...( رۆژنامەی یەکگرتوو ژمارە ٣٧٣) .

## دیکتاتۆرەکانی‌وڵاتە ئیسلامیەکان

دیکتاتۆریەت و پێشێلٚ کردنی مافەکانی مرۆڤ ، وا دەکات کە خەڵکی هەق و راستیان لێ بشێوێ ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بێت ، بۆیە رۆژئاوا هەرچەند لای خۆیان جۆرێك دیموکراتی و سەروەری یاسا و پاراستنی مافی مرۆڤ هەیە ، بەلاّم بۆ وڵاتانی ئیسلامی بە رەوای نابینن ، بۆ ئەوەی هەمیشە لەکاروان دوابکەون و مل ملانێ نەکەن لەگەڵ رۆژئاوا ، بەڕێوەبەری (تایم) ی ئەمریکی لە پەڕاوەکەی‌دا ( سفر اسيا) دەڵێ ( دەبێت نیزامی دیکتاتۆری سەربازی لەوڵاتە ئیسلامی‌یەکاندا دروست بکرێت ، بۆ ئەوەی ئیسلام دەست نەگرێتەوە بەسەر ئوممەتی ئیسلامدا و نەتوانن رووبەڕووی رۆژئاوا و شارستانی‌یەکەی و ئیستعمارکردنەکەی ببنەوە ، هەرچەندە ئەبێ ئەوە لەبیر نەکرێ کەجاروبار مۆڵەتێکیان بدرێ هەناسەیەك بدەن تاوەکو لەژێر فشاری زۆردا نەتەقنەوە !)

( ل ٣٢٥ المعجزة المتجددة )

ئەمە بێجگە لەوەی چەندیان بۆ کرابێ وڵاتە ئیسلامیەکانیان لاواز کردووە بۆنموونە ئەندەنوسیا توانی ببێ بەیەکێك لەو شەش دەوڵەتەی جیهان کە فڕۆکەی بازرگانی

لەجیهاندا بەرهەم بهێنێ ، بەشێوەیەکی زۆرچاك و بەنرخێکی هەرزان ، کە ئەمەش بووە هۆی ئیفلاس کردنی کۆمپانیا مونافیسەکانی بۆیە بەپیلانێکی ژەهراوی کەوتنە دابەشکردنی ئەندەنوسیا و تەیموری رۆژهەلأتیان لێدابڕی و ئاژاوەی زۆری تریان بۆ ناوەیەوە ، لەلایەکیتریشەوە تووشی داڕووخانی ئابوریان کردو مالیزیاشیان بەهەمان دەرد برد . (ل۹۳ سەرچاوەی پێشوو) .

## موسڵمانانی ئاسیای ناوەڕاست

ڕێژەی موسڵمانان لەئاسیای ناوەڕاستدا ، پێش شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ۱۹۱۷ نزیکەی ( ۹۸٪) بوو ، کاتێك شۆڕش هەڵگیرسا ، (لینین) سەرکردەی شۆڕشەکە لە ۲۲ ی نوفمبری ۱۹۱۷دا یەکەم بەیاننامەی ئاڕاستەی موسڵمانەکان کرد ، کەتیایا دەڵێت :

( ئەی موسڵمانانی روسیا ، ئەی تەتەری فۆڵگاوقرم ، ئەی ( قرقیز) و دانیشتوانی سیبریا و تورکستان ، ئەی دانیشتوانی قەوقازی پاڵەوان و هۆزەکانی شیشانی شاخە گەردن کەشەکان ، ئەی ئەوانەی کە مزگەوتەکانتان روخێنرا و پەرستگاکانتان کاول کرا و ، قەیسەرەکان قورئانەکانیان دڕاندن و دژایەتی ئاینەکەتانیان کرد و زمان و کەلتور و رۆشنبیریتانیان لەناوبرد ، شۆڕش بکەن و ڕاپەڕن لەپێناوی ئاین و قورئان و ئازادی خواپەرستیتاندا ، ئێمە لێرەوە رای دەگەیەنین ڕێزمان بۆ ئاین و مزگەوتەکانتان ... عادەت و تەقالیدتان ئازادە و کەس ناتوانێ دەستی بۆ بەرێت ، ژیانی ئازادی سەربەخۆتان بنیات بنێن ، بەبێ هیچ بەربەستێك کە ئەوەش هەقی خۆتانە ! ... داواتان لێدەکەین پشتگیری شۆڕش بکەن ، چونکە بۆ ئێوەیە و لەپێناوی ئێوەدایە ) ( ل ۳۲۰ سەرچاوەی پێشوو ) .

پاش ئەوەی شۆڕشەکە سەرکەوت ، پەیمانەکانی خۆیان نەبردە سەر بەرامبەر موسڵمانەکان ، لەبەرئەوەی لەبنەڕەتدا شۆڕشەکە دەستی جوولەکەی تێدابوو ، ئەندامانی سەرکردایەتی شۆڕش حەڤدەکەس بوون ، چواردەیان جوولەکەبوو ، سیانەکەیتریان ژنیان جوولەکە بوو ، سەرەنجام رووی ناشیرینی خۆیان دەرخست و بەئاگر و ئاسن رووبەڕووی موسڵمانان بونەوە ، نزیکەی سی و دووهەزار مزگەوتیان داخست و ، بیست و دووهەزار قوتابخانەی ئیسلامییان قەدەغەکرد و بەملیۆنەها کەسیان کوشت و دەربەدەرکرد ...

لەساڵی ١٩٢٢زدا بەهۆی ئابڵوقەی ئابوری‌یەوە دوومليۆن موسڵمانی تەتەری (قرم) برسێتی رووی تێكردن و سەد هەزاریان مردن .

دانیشتوانی قرم لە(پێنج مليۆن) ەوە لەساڵی ١٩٢٢ دا بوون بەیەك مليۆن لەساڵی ١٩٤٠زدا، بەردەوام ستالینیش دەربەدەری كردن تا موسڵمانی لەناوچەكەدا نەهێشت .

تركستانیش بەهەمان شێوە لەساڵی (١٩٢٢ ـ ١٩٣٢ )زیاتر لە ٣ مليۆن موسڵمانی تركستان مردن بەهۆی برسێتی و رەشە كوژی‌یەوە ، تەنانەت لەبرساندا گۆشتی مردوویان دەخوارد ، ئەمەش كەبەچیرۆكێك باسكراوە بەكوردی بەناوی مردوو خۆرەكانەوە .

دیارە موسڵمانانیش بێ‌دەنگ دانەنیشتن و نزیكەی (٢٥) شۆڕشیان بەرپاكرد لەساڵی (١٩٢٠) ەوە تا ساڵی ( ١٩٨٠) ( ل ٢٢ شمس الاسلام ) .

زانایان و پیاوانی ئایینی زیندە بەچاڵ دەكران ، یان لەسیبریا و ناوچە دووردەستەكاندا بۆ دەیان ساڵ بەند دەكران ، دەڵێن نزیكەی پەنجا هەزار زانای ئاینی كوژران و لەگۆڕی بەكۆمەڵدا ناشتویانن ...

تا ساڵی ١٩٣٥ بزوتنەوەی جیهاد (الباشمس) یان لەناوبرد لەئاسیای ناوەڕاستدا و تەفر و تونایان كردن ...

شێخ (عبدالغفور ) لەشاری بخاری دەڵێ : ( یەك لەسەر پێنجی دانیشتوانی بخاری كوژران ، هەرچی زانای ناوچەكە هەیە شەهیدكران ، تاوای لێ‌هات خەڵكەكەی زیاتر لەهەموو ناوچەكانی‌تر بێ‌ئاگابن لەدین ) ( ل ٣٢٢ المعجزة المتجددة ) .

## رووخانی شیوعیەت

پاش زیاتر لەحەفتا ساڵ زوڵم و ستەم ، بیری شیوعیەتی نەگونجاو لەگەڵ فیترەتدا ، هەرەسی هێنا و خۆیان و بیروبۆچوونی چەوتیان چوونە زبڵدانی مێژووەوە ، رۆژنامەی (نیوزویك) بەگەورەیی لەسەر لاپەڕەی یەكەمی وتەیەكی پاپای بلاْوكردەوە كە دەڵێ : ( ماركس و لینین ، ئێستا پاش رووخانی ئیشتراكیەتی جیهانی بۆشایی‌یەكی گەورەیان بەجێهێشتووە بۆ (محمد) ، بۆیە كەنیسە بەهەموو توانایەوە دەیەوێ رێی لێ بگرێ چ لەرووسیا وچ لەوڵاتە ئیسلامی‌یەكاندا ) ل ٢٢١ سەرچاوەی پێشوو .

مژدەدەران بەفەرمانی فاتیكان كەوتنە بلاْوكردنەوەی ئینجیل و هەموو هەوڵێكیان خستە گەڕ بۆ ئەوەی ئیسلامەتی سەركوتكراو لەرووسیا و وڵاتەكانی تری ژێر چەپۆكی‌دا

جارێکیتر سەرهەڵئەداتەوە ، تەنها لە ( اذربيجان) دا ، بیست رێکخراوی مژدەدەرەکان خەریکن بۆ راکێشانی خەڵکی بەرەو گاورێتی ، وە بۆ ئەم کارەشیان ئینجیلیان وەرگێڕا بۆ ( ١٦١) لەهجە و زمانی ناوچەکە ... (ل ٢٢٤ سەرچاوەی پێشوو ) .

## خەباتی ژێر زەمینی موسڵمانان

لەروسیا و ناوچەکانی ژێر دەستیدا بۆماوەی حەفتا ساڵ زانایان و خواناسان ، باوکان و دایکان ، ژێر بەژێر و بەدزییەوە ، لەناو سرداب و شوێنی شاراوە و نەزانراودا ، قوتابیان پێدەگەیاند و دەست بەدەست ئاڵای ئیمان و ئیسلامەتیان بەیەکتری دەگەیاند...چیرۆك و بەسەرهات و مێژووی ئەو گەلە چەوساوە و ستەم لێکراوە ، بەدەیان هەزار لاپەڕە تەواو نابێ وتەنها دوونموونە باس دەکەم :

**نموونەی یەکەم :**

دووکەسی خەڵکی یەمەن بۆ مەشقی سەربازی و خوێندن دەچنە روسیا و لەوێ لەبەرئەوەی لەوڵاتی غەریبین و کەس نایان ناسێت و بڕواکەشیان لاواز بوو ، بڕیار دەدەن بێدڵی خۆیان نەکەن و سڵ نەکەنەوە لەکاری بەدڕەوشتی ... بۆیە هەرچاودەگێڕن و لەفرسەت دەگەڕێن ... رۆژێك کچێکی جوان دەبینن لەدوورەوە ئاماژەیان بۆ دەکات و ئەمانیش بەخۆشییەوە ئەم جادە و ئەو جادە شوێنی دەکەون ، تا دەگەنە ماڵێك ، کچە دەچێتە ژوورەوە و یەکێکیشیان لەپێشدا دەچێتە ژوورەوە و گوایە ئەگەر وەزعەکەی بەدڵ بوو ، هیچ مەترسییەك نەبوو ئەوی تریش بەدوایدا بچێت ... کە یەك بەدوای یەکدا چوون لەناو حەوشە و باخێکدا پیرێژنێك دانیشتبوو ، کەلای پرێژنەکە دانیشتن ، کچەکەی ئاماژەی بۆ کردبوون و ئیغرای کردبوون بە جلێکی سەرتا پۆشەوە و بەدوو پەرداخ شەربەتەوە زۆر بەشەرمەوە هات و شەربەتەکەی پێشکەش کردن و بەجێی هێشتن ، پیرێژنەکە لێی پرسین : ئێوە خەڵکی کوێن ؟ وتیان : خەڵکی یەمەنین ... وتی : یەمەن ... یەمەن ... زۆر چاکە ، ئنجا بەچاوی پڕ ئەسرینەوە وتی : کوڕەکانم ئێمە لەم وڵاتەدا مەحرومین لەفێربوونی ئیسلامەتی و چاومان گێڕاوە کەسێکمان دەست بکەوێ عەرەبی بزانێ و لێی ئەمین بین و خەبەرمان لێنەدات ، بۆیە کە کچەزاکەم هەستی بەزمانی عەرەبی ئێوە کردبوو لەو رێگاوبانەدا کەهاتووچۆتان دەکرد ، بەوفێڵە بانگمان کردن ، تاخۆم و ئەو کچە زایەم و ئەو منالانە ، فێری قورئان خوێندن و نوێژکردن بکەن ...

چونکه بەڕاستی کاتی خۆی باووباپیرانی ئێوە ئیسلامەتیان بۆ ئێمە هێناو لەپێناوی‌دا شەهید بوون ...

ئەو دووبرادەرە هەروەك لەبانێك بەرپاندەیتەوە ، لەجیێ خۆیان سڕ بوون ، ئەمان بۆچی هاتن و ئەویش داوای چیان لێدەکات ... سەرەنجام ئەم رووداوە وای لێکردن تەوبەبکەن و پابەندبن بەفەرمانەکانی خواوە ( ل ٢٢٨ المعجزة المتجددة ) .

**نموونەی دووەم :**

ئەفسەرێکی رووسی لەسەر کەشتیەکی سەربازی رووسی لەعەدەن ، بەدزی‌یەوە داوا لەکرێکارێکی یەمەنی دەکات ، کە ئەگەر قورئانێکی هەیە بۆی بهێنێ ، ئەویش لای سەیر دەبێت و بۆبەیانی قورئانێکی بچوك دەبات بۆی ، ئەفسەرەکە قورئانەکەی لێوەردەگرێ و چەند جار ماچی دەکات و دەیخاتە سەر سەری و دوایی دەیداتەوە ... ئەویش دەڵێ قوربان هەڵی گرە بۆ خۆت ، ئەفسەرەکە بەچاوی پڕ فرمێسکەوە دەڵێ : ئەگەر پێم بزانن و ئەو قورئانەم پێ بگرن هەڵم دەواسن... ( هەمان سەرچاوە ) .

## هەستانەوەی موسڵمانانی روسیا

لەدوای ساڵی (١٩٩٠) ەوە کە فشار لەسەر موسڵمانان کەم بۆوە ، وتارخوێنی یەکەم نوێژی هەینی مۆسکۆ لەبارەی هەستانەوەی موسڵمانان و رابوونی ئیسلامیەوە دەڵێت : لەسەدا پەنجای خەڵکی کە شیوعیەکان دەیانوویست مێشکیان داشۆرن ، بەهۆی رابوونی ئیسلامی‌یەوە روویان کردەوە مزگەوتەکان و دوای حەفتا ساڵ ئیلحاد و دوور لەخوایی لەیاریگەیەکی گەورەدا گەنجەکان بانگیاندا و نوێژی تەراویحیان کرد ...

لەتەتەرستان (٧٠٠) مزگەوت دروستکراوە و چاککراوەتەوە ، لەداغستان زیاتر لە (٣٠٠)مزگەوت و (٨٢٠)قوتابخانەی ئایینی و (٤٠٠) ئەڵقەی قورئان لەبەرکردن کراونەتەوە .

لەتورکمانستان (٢٤٠) مزگەوت کراونەتەوە کە هەریەکەشیان قوتابخانەیەکی قورئان لەبەرکردنی لەگەڵدایە .

لەکازاخستان (٥٠٠٠) مزگەوت و (٢٠٠) قوتابخانەی ئایینی کراونەتەوە ... لە خۆشی سەرفرازی و رزگاربوون لەچەپۆکی خوانەناسان و هەڵمژینی هەوای ئازادی ، کۆمەڵێك موسڵمان لەشیشان و روسیاوە بڕیاریاندا ، بەپێ بچن بۆ حەج ، وەك لاسایی کردنەوەیەك بۆ هەوڵ و رەنجی باوباپیرانی موسڵمانیان .

ئەم گەرم و گوڕی‌یەی موسڵمانان و پەیڕەوی کردنەیان بۆ ئاینی خوا وای لەسەرۆکی حیزبی شیوعی طاجیکستان کرد کە بڵێ (بەراستی سەیرە ! چۆن ئەمە روودەدات ، پاش ئەو هەمووەی کەفێرمان کردن لەقوتابخانە حیزبی‌یەکاندا و ، پاش ئەو هەمووەی کە کوشتمان ، وەپاش ئەو هەموو پارەیەی کە خەرجمان کرد بۆ دووور خستنەوەیان لەئاینەکەیان ) ل ٣٣١ ( المعجزة ) .

## تۆڵە و سزای خودا

ماوە بڵێیین خوای گەورە لەناووسیفاتە پیرۆز و بەرزەکانی (الجبار) و (المنتقم) ە ،خوا بەدەسەلآتە و تۆڵەسێنە ، خوی دەفەرمووێ : { ولا تحسبن الله غافلاً عما يعمل الظالمون ، انما يؤخرهم ليوم تشخص فيه الابصار ، مهطعين مقنعي رؤوسهم لايرتد اليهم طرفهم ، وأفئدتهم هواء} ابراهيم : ٤٢.

واتە : واگومان مەبەن کە خوا بێ ئاگایە لەوکارو کردەوەیەی ستەمکاران دەیکەن ، بەراستی خوا سزاکەیان دوا دەخات بۆ رۆژێك کەچاوەکانیان تیایدا ئەبڵەق دەبن ( هەرچەند جاری واش هەیە لەدنیاداسزاکەیان بۆ پێش دەخات ) ، بەپەلەو شپرزەیی‌یەوە دێن ، سەریان بەرزکردۆتەوە و لەترس دا چاو ناتروکێنن ، دڵەڕاوکێیانە و دڵ و دەروونیان بەتاڵە و هیچ حاڵی نین ...

بەڵێ خوای گەورە مرۆڤی سەرپشك کردووە و مۆڵەتێکی داوەتێ ، بۆیە سزاکەی بۆ دەخاتە قیامەت ، ئەمەش هەر میهرەبانی‌یە ، بەڵکو پەشیمانببێتەوە ... جاری واش هەیە خوای گەورە بەشێك لەسزاکەی بۆ دەنێرێ بەڵکو بگەڕێتەوە ...

رووسیا خوا رووسیای کرد و تووشی داڕووخانی ئابووری و پچڕاندنی شیرازەی کۆمەڵ و هەزارەها کێشەی تربوو ، دەڵێن چل ملیۆن کەسیان هەژارونەدارن ، ئەمە بێجگە لەوەی کە هەر جارەی لەلایەکەوە کونی تێدەبێت ، ژێر دەریایی‌یە ئەتۆمی‌یەکەی نقوم بوو بەسەرنشینەکانیەوە و ئەم دەستەوسان بوو هیچی بۆ نەکراو ، وێستگەی ئەتۆمی ( تشرنوبل) ی هەناسەیەکی‌دا و لەچەند چرکەیەکدا سەدوبیست هەزار کەسی کوشت و تائێستاش زیانی بەردەوامی هەیە بۆ رووسیا و وڵآتانی دەوروبەریشی ...

ئەمەریکاش زریان و تۆفان ساڵانە بەملیارەها دۆلار زیان دەدەن و ئەم تەقینەوانەی دوایش بەدەیەها ملیار زیانی دا لەئابووری ئەمەریکا ئیتر هەرکەس پێی

هەستابێ‌وهەرچۆن بێت ، تۆڵەیەکی خواییە بەرامبەر ستەم و زۆرداری ئەمەریکا بەرامبەر گەلانی جیهان ئەگەر بەخۆیان بزانن ...

تورکیاش بەهەمان شێوە ، وازی لەئیسلام هێنا و ڕووی کردە ڕۆژئاوا بەڵکو پێش بکەوێت ، کەچی یەکێتی ئەوروپا هەر ڕۆژەی بیانوویەکی پێ‌دەگرێ و هەرچی دەکات ، لەیەکێتیەکەیان وەری ناگرن ! باری ئابووریشیان ڕۆژ بەڕۆژ ڕوو لەداڕووخانی زیاترە و هەرچەندە پارەش قەرز دەکەن لەسندوقی نێودەوڵەتی، لەباری شڵۆق و خراپیان قوتار نابن ..

لەقاعیدەی بەحرییەکەدا ، ئاهەنگێك گێڕدرا کە نزیکەی سی جەنراڵی تورکی و سی جەنراڵی ئەمەریکی وسی جەنراڵی ئیسرائیلی تیایا بەشداریان کردو ، ئافرەتانی سەماکەر و گۆرانی بێژیش لەگەڵ مەی خواردنەوەدا ئاهەنگەکەیان گەرم کردبوو ...

ئالەم کاتەدا جەنراڵێکی تورکی داوای لە (نقیب) ێکی تورکی بەردەستی کرد کە قورئانێك بهێنێ ، کەهێنای وتی : بخوێنە ، ئەویش هەندێکی خوێند و پاشان وتی : تەفسری بکە ، وتی : نازانم .. جەنراڵەکە قورئانەکەی لێ‌وەرگرت و دڕاندی وفڕێ‌ی‌دایە بەر پێ‌ی سەماکەرەکان و وتی : کوا خوا دەڵێ قورئان دەپارێزم ، دەبابێت بیپارێزێ ... ( نەقیبەکە) ڕای کردە دەرەوە ، لەوە دەچوو ئیمان لەدڵیا بووبێ و بەدەم خۆیەوە دەیووت خوا غەزەبمان لێ دەگرێ ... ئەوەندەی نەخایاند (قاعیدەکە) هەر هەمووی بەجەنراڵەکان و پاسەوانەکان و میوانەکانەوە ، کەنزیکەی سێ‌هەزار کەس دەبوون نغرۆی زەوی بوون و بوومەلەرزەیەی کورتی چەند چرکەییان بەس بوو کە پەندی ئەوانیش و هەموو ئەو ملهوڕانەش دابدات کەلەخوا یاخی دەبن ...

ئەم ڕووداوەش ڕۆژنامە تورکییەکان باسیان کرد و ، ئەو (نقیب) ەش ، خوا ڕزگاری کرد ، بەهۆی ئەوەی کەپێش ڕووداوەکە بەپەلە هۆڵەکە و ناوچەکەی بەجێهێشت و دوایی ئەم هەواڵ و باسانەی گێڕایەوە .

ئەم بومەلەرزەیە (٥٠) چرکەی خایاند و (٤٥) هەزار کەسی کوشت و بریندارکرد ، وە (٢٠٠) هەزار کەسی ئاوارەکرد ، وەنزیکەی (٢٥) ملیار دۆلار زیان کەوت لەتورکیا و گەورەترین شاری پیشەسازی وێران بوو کەلەسەدا حەفتای کەل و پەلی ناردنە دەرەوەی لێ‌بەرهەم دەهات . ( مجلة الاسرة عدد ٧٦/ ١٤٢٢هـ ) .

**قورئان دەفەرموێت :** ﴿ولا يزال الذين كفروا تصيبهم بماصنعوا قارعة أو تحل قريباً من دارهم حتى يأتي وعد الله ، ان الله لايخلف الميعاد ، ولقد استهزيء برسل من قبلك ، فامليت للذين كفروا ثم اخذتهم فكيف كان عقاب﴾ الرعد : ٣٢

**واتە : بەردەوام ئەوانەی کافر و بێباوەڕن ، بەهۆی خراپەیانەوە تووشی بەڵا و موسیبەت و تێسرەواندن دەبن ، خۆیان یان دەروردراوسێیان هەتا بەڵێنی خوا دێتە دی ، بەڕاستی خوا پەیمانی ناشکێنێت و دەیهێنێتە دی .**

**ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر خوانەناسان گاڵتە دەکەن بە تۆ و بەئاینەکەت ، خەفەت مەخۆ ، چونکە سوێند بەخوا بەڕاستی گاڵتەکراوە بەپێغەمبەرانی پێش تۆش ، جا ماوەیەك مۆڵەتم دانێ و پاشان خەشم و قینم لێگرتن ، جا چۆن تۆڵەیەك بوو تۆڵەکەم (ئەوە مێژووکێ دەیەوێ باسەیری ئاسەواریان بکات ! ) .**

**تێبینی :**

**باری ئابووری داڕووخاوی تورکیا لەئامارەکاندا دەردەکەوێت کە دەڵێن : قەرزی دەرەکی تورکیا لەساڵی ١٩٨٠دا( ٧و١٥) ملیار دۆلاربوو ، کەساڵی یەك ملیار دۆلار سووی ئەدا لەگەڵ دانەوەی قەرزەکەدا ، لەساڵی ( ١٩٩٩) دا ئەو قەرزە دەرەکیە بوو بە ( ١٠٠) ملیار و ساڵانەش (٥) ملیار دۆلار سووی ئەدا لەگەڵ دانەوەی قەرزەکەدا ...**

**قەرزی ناوخۆی تورکیاش لەساڵی ١٩٨٠دا (٩و٧)ملیار دۆلاربوو ، لەساڵی ١٩٩٩دا بو بە (٢و٦٣) ملیار ...**

**لەبیست ساڵی رابردوودا تورکیا (٤٢٧) ملیار دۆلاری داوەتەوە بەقەرزدا کەبڕێکی باشی سووە زیادەکەیە کە ئەبێ بیدات و هەرچی دەکات رزگاری نابێت لێی ، تائێستاش قەرزی ناوخۆی و سووەکەی لەسەدا نەوەد و پێنجی وارداتی باجی میری دەبات کە کۆدەکرێتەوە .**

**زیادە رۆیی و خراپی حکومەت بووەتە مایەی بەفیڕۆدانی ( ٣و١٩٥) ملیار دۆلار لەدەساڵدا واتە ، لە ( ١٩٩٠ ــ ٢٠٠٠) ...**

**نزیکەی سەد ملیار دۆلاریش دزراوە لەبانقەکاندا بەناوی قەرزدان بە بازرگان و کۆمپانیا وەهمیەکان ، کە ئەوانەی قەرزیان دەکرد خۆیان و پارەکانیان رایان دەکرد بۆ دەرەوە ... ( وەرگیراوە لەوتاری الازمة الاقتصادية التركية / اورخان محمد علي / ئینتەرنێت ) .**

## وریابە دڵت گەرد نەگرێت!

دوژمنانی هەق و راستی هەر لەدێر زەمانەوە خەریکن کە گومان بخەنە دڵی بڕوادارانەوە بۆ ئەوەی ساردیان بکەنەوە وبڕواکەیان لەق بکەن ... بۆ نموونە :

زەیدی کوڕی حاریثە ی خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ لەماڵی حەزرەتدا گەورەبوو ، کاتێك جەنگی (مۆتە) هاتە پێشەوە ، حەزرەت ﷺ سێ سەرکردەی دیاری کرد و فەرمووی : با زەید سەکردایەتی سوپاکە بکات ، ئەگەر ئەو شەهید بوو با جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب ببێتە سەرکردە ، ئەگەر ئەویش شەهید بوو با عەبدوللای کوڕی رەواحە ببێتە سەرکردە و پێشەوا ...

کە ئەم دەنگ و باسە بڵاوبۆوە ، جوولەکەیەك هاتە خزمەت حەزرەت ﷺ وتی: ئەی (ابا القاسم) ئێمە لەپەڕاوەکانماندا هاتووە ئەگەر پێغەمبەرێك چەند سەرکردەیەك دابنێ بۆ جەنگێك مانایوایە دەزانێ کە دەکوژرێن ...

حەزرەت ﷺ خوا خستبویە دڵیەوە کەچی دەبێت ، بەلام هەرچی بەجوولەکەکە بووتایە کێشە دروست دەبوو ، بۆیە هیچی وەلام نەدایەوە ... پاشان جوولەکەکە چووە لای زەید و وتی : ئەزانی ئەگەر پێغەمبەرێك چەند سەرکردەیەك دیاری بکات بۆ جەنگێك ئەوا مانای وایە ئەو سەکردانە شەهید دەبن ، ئنجا یان ئەوەتا پێغەمبەرەکەتان راستە پێغەمبەرە و ئێوە دەکوژرێن ، جاکەوابوو بچۆرەوە لای ماڵ و منالت و دوا خواحافیزی بکە ، ئیتر نایان بینیتەوە ، ئەگەر ئەوەش نەهاتە دی مانای وایە محمد پێغەمبەر نیە !

زەید لەمەبەستی گلاوی جوولەکەکە تێگەیشت و زانی دەیەوێ دڵی ساردبکاتەوە و بیخاتە گومانەوە ، بۆیە بەباوەڕی پتەوەوە وتی : من شایەتی ئەدەم کە ئەو پێغەمبەری خوایە و ناگەڕێمەوە و سەر لەماڵ و منالم نادەم و پشت بەخوا دەبەستم ، چی دەبێت بابێت !

بەراستی دڵ دامەزراوی ودڵنیایی مەسەلەیەکی گەورەیە بۆیە حەزرەت ﷺ هەمیشە دەیفەرموو: ( اللهم یا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك ) .

مرۆڤی بڕوادار ئەبێ بەردەوام لەهەوڵ دابێت بۆ پتەوکردنی بڕواکەی و ، ئەبێ شارەزابێ لەئاینەکەی بۆ ئەوەی دوژمنان زەفەری پێنەبەن و لەخشتەی نەبەن ، بۆ زیاتر بەرچاو رۆشنی و دڵنیایی باسی هەندێ لایەنی ئیعجازی قورئانی دەکەین ، کەتەواوکەرە بۆ ئەو باسانەی کەلەپەڕاوەکانی تردا ئاماژەمان پێکردووە .

ئاشکرایە ئەم قورئانە موعجیزاتی و عەجایباتی تەواو نابن ، هەروەك پێغەمبەر ﷺ لەبارەی قورئانەوە دەفەرموێت : ( ولاتنقضي عجائبه ) ...

جا ئەو باس و ئاماژە زانستیانەی قورئان هەقمانە بیخەینە روو وەك هۆکارێکی چاکی بانگەواز بۆ دینی خوا و هەقە لێی بێدەنگ نەبین ... هەروەك دکتۆر مارشال جونسون وتی لەکۆنگرەی پزیشکی جیهانی هەشتەمدا ( ئەگەر ئەم راستیانەی لەلایەن زانایانی موسڵمانەوە پێشکەشکران لای ئێمە بوونایە ، دنیامان هەڵدەستانە سەرپێ و نەمان دەهێشت دانیشن ، چۆن ئەم هەموو بەڵگە و نیشانانەتان لەلایە لەبارەی راستی پێغەمبەرەکەتانەوە و بێدەنگ دەبن ؟ ) شایانی باسە دکتۆر مارشال راوێژکاری هەشتا کۆمپانیای دەرمانە لەجیهاندا... ( ل ١٩٣ المعجزة المتجددة) .

**١/ بەردە رەشەکەی کەعبە :**

کاتێك حەزرەتی ئیبراهیم ( سەلامی خوای لێبێ ) کەعبەی دروستکردەوە ، بەحەزرەتی (ئیسماعیل) ی فەرموو بگەرێ ، بەڵکو بەردێکم بۆ پەیدا بکەی کەلەبەردەکانیتر جیاوازتر بێت وبیکەم و بەنیشانە بۆ سەرەتای تەواف کردن بەدەوری کەعبەدا ، حەزرەتی ئیسماعیل چەند گەرا بەردێکی وای دەست نەکەوت ، کە گەرایەوە لای باوکی بینی بەردێکی رەنگ جیاواز لەبەردەکانی تر هەیە پرسیاری کرد کە ئەو بەردەی لەکوێ بوو ، حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی : ئەو بەردە خوا لەبەهەشتەوە بۆی ناردووم ...پێغەمبەرمان (محمد) یش ﷺ ئاماژە بەوە دەکات لەفەرموودەیەکدا کە ئەو بەردە خوای گەورە لەئاسمانەوە و لەبەهەشتەوە ناردوویەتی‌یە خوارەوە ، هەروەك ئیمام ئەحمەد ریوایەتی کردووە...

ئینگلیزەکان بیریان لەوەکردەوە کە ئەفسەرێکی لێهاتوو بنێرنە وڵاتی (مغرب) تا فێری زمان و لەهجەی مغربی ببێت ... ئەو ئەفسەرەش ناوی ( ریتشارد) بوو کە ناردیانە مغرب بەچەند ساڵێك فێری زمانیان بوو ... پاشان هێنایان بۆ میسر و بەکەشتی وەك حاجی‌یەکی مەغریبی ناردیان بۆ حەج ...

ئەو کاتە حەج وەکو ئێستا قەرەباڵغ نەبوو ، لەفرسەتێك و لەکاتێکی شەووچۆڵیدا ، بەئالەتێکی تایبەتی پارچەیەکی بچووکی لەبەردە رەشەکە کردەوە و لای خۆی شاردیەوە پاشان چوو بۆ سەفارەتی ئینگلیزی لە (جدە) و ئەوانیش ئاهەنگێکی گەورەیان گێراو باڵوێزی وڵاتەکانی تریشیان بانگ کرد ... ئنجا لەرێی خۆیانەوە ئەفسەرەکەیان

ناردەوە بۆ بەریتانیا و لەوێ لە ( متحف) لەلایەن شارەزای جیۆلۆجی دکتۆر (رید) ەوە لێکۆڵینەوەی لەسەرکرا ، کاتێك ئەنجامەکەیان بە (ریتشارد) وت کە ئەم بەردە بەردی سەرزەوی‌نیە و بەردێکی تایبەتە ، لەهۆش خۆی چوو ...

پاشان (ریتشارد) پەڕاوێکی نووسی لەدووبەرگدا بەناونیشانی ( رحلة الى المكة المكرمة ) کەتیایا باسی یادەوەری خۆی دەکات لەم مەسەلەیەدا ، کە چۆن پیلانێکی ئالەو جۆرەیان داناوە بۆ بەدرۆخستنەوەی فەرموودەی پێغەمبەر و سەرنەکەوتنیان لەوکارەدا ، هەروەها لەبەرگی دووەمیشدا باسی خشوع و ترسی خۆی دەکات لەخوا لەپاش دەرکەوتنی ئەو راستی‌یە بۆی . (دکتۆر زەغلول النجار باسی کرد ) .

لەدیاردە سەیرەکانی تری کەعبە ، ئەوەیە کەتێبینی‌کراوە لەو ناوەدا تەنها جۆرێك کۆتر هەیە و جۆری تری کۆتر نایەنە ئەو دەوروبەرە ، پاشان ئەو کۆترانە بەهیچ جۆرێك لەسەر کەعبە و دیوارەکانی نانیشنەوە ، هەروەك ئەوەی لەپیرۆزی کەعبە ئاگادارکرابن ، یەك ساڵی دووروودرێژ ئەو بەرگەی کەلەئاوریشم دروستکراوە و رەنگی رەشە و بەدەست ئایەتەکانی دەچنرێ ، بەچوار دیورای کەعبەدا هەڵدەواسرێ هیچ جۆرە ریقنەیەکی کۆتر و باڵندەی تری پێوە نیە !

ئاوی زەمزەمیش کە بەهەر نیەتێك بخورێتەوە خوا بەفەزڵی خۆی دەیهێنێتەدی و نەك هەر تینوێتی دەشکێنێ بەڵکو مرۆڤیش تێردەکات ... ئەو ئاوە نزیکەی سێ هەزار ساڵە هەڵدەقوڵێ و بەردەوامە لەکاتێکدا رەنگە بیرێك یان کانی‌یەك دەساڵ ، بیست ساڵ یان سەد ساڵ بڕبکات ...

### ٢ / شوێنەواری گەلی عاد :

شوێنەواری هەندێ لەو گەلانەی کە قورئان باسی کردوون ،هەر لەوکاتەوە زانراون و بینراون، وەك شوێنەواری گەلی (ثمود) ، کەلەرێی تبوك دا بوو ، کاتێ موسڵمانان چوون بەرەو شام بۆ روو بەڕووبونەوەی رۆمەکان و حەزرەت فەرمووی : بەگریانەوە بەلای دابڕۆن و لەئاوی ناوچەکەیان مەخۆنەوە و ئەوەش کەهەویری پێ‌شێلاوە بیدات بەوڵاخەکەی ، ئەمەش بۆ ئەوەی دڵ و دەروونیان وشیاربێ و بترسن لەو غەزەبەی کە خوا لەوگەلەی گرتبوو ، ئێستاش ئەو ناوچەیە ماوە و لەئاسەوار و شوێنەدێرینەکانی وڵاتی سعودیەیە و خەڵکی‌وەك شوێنێکی دێرین سەردانی دەکەن .

بەڵام شوێنەواری گەلی عاد کە قورئان لەچەند جێگایەکدا باسی کردووە ، تا دەساڵ لەمەوبەر کەس جێ وڕێیانی نەدەزانی ، قورئان دەفەرموێ : ﴿ الم تر کیف فعل ربك بعاد ارم ذات العماد التي لم یخلق مثلها في البلاد ﴾ واتە : ئایا نەتزانیوە پەروەردگاری تۆ چی کرد بەهۆزی عاد ، کە ئەویش هۆزی ( ارم) ە و خاوەنی پایەی بەرز و کۆڵەکە و نێرگەی درێژبوون ، لەسەردەمی ئەواندا لەهیچ شارو شوێنێکدا کۆشك و تەلاری وەك ئەوەی ئەوان دروست نەکراوە ...

دەساڵ لەمەوبەر مانگی دەستکردی ئەمریکی کەلەئاسمانەوە بەسەر ناوچەی (ربع الخالی) دا دەسوڕایەوە و لەقووڵی ( ١٠) م لەژێر خاکدا لێکۆڵینەوەی دەکرد ، شێنەواری دوو جۆگەی ئاوی دۆزیەوە ، پاشان مانگێکی دەستکردی تریان بۆ هەڵدا کە تاقولایی ( ٢٥) م لەژێر خاکدا لێکۆڵینەوەی دەکرد ، سەرەنجام دۆزیانەوە ئەو دوو جۆگەی ئاوە دەڕژێنە ناو شوێنێکی گەورەوە کە بەدەوریا خانوو ئاوەدانی هەبووە ، کە ئەویش پاشماوە و ئاسەواری گەلی عاد بووە ... وە بەهۆی ڕەشەبای (لم) ەوە داپۆشران و لەچەند ڕۆژێکدا لەناوچوون هەروەك قورئان هەواڵی داوە ... بەم شێوەیە کە هیچ کەس لەپێش زەمانی حەزرەتیشەوە ئەو هەواڵانەی نەزانیوە و، تا دەساڵ لەمەوبەر ئەو زانیاریانە شاراوە بوون .. ئێستاش کەلەسەر دەستی ڕۆژئاوادا دەدۆزرێتەوە بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرەو کەس قسەی نامێنێ کە ئەم قورئانە لەخواوەیە و هەر ئەوە کە ئاگاداری نهێنی ئاسمانەکان و زەوییە ... ( پرۆفیسۆر زەغلول النجار باسی کرد ) .

کەشتیەکەی نوحیش لەسەر زنجیرە چیای ئارارات شوێنەواریان دۆزیوەتەوە و ، ئەمەریکا لەم ساڵدا (٢٠٠١)مانگی دەستکردی بۆ ناردووە کەلەدووری پەنجا مەترەوە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکات ، دیارە شوێنەکە سەختە و کەس نایگاتێ ، ئەمەش لەداهاتوودا ئەگەر بڵاوبکرێتەوە هەر دەبێتە بەڵگەیەکی تر لەسەر ڕاستیەکانی قورئان .

## ٣/ لەبارچوونی شاراوە و هەست پێنەکراو :

لەقورئاندا وشەی (غیض الماء) بەکارهاتووە لەسوورەتی (هود) دا ، بۆ ڕۆچوون و نەمانی ئاوی لافاوو تۆفانەکەی زەمانی حەزرەتی نوح سەلامی خوای لێ بێ، هەروەك دەفەرموێ : { وقیل یا ارض ابلعي ماءك ویا سماء اقلعي وغیض الماء وقضي الامر واستوت على الجودي وقیل بعداً للقوم الظالمین } هود : ٤٤ . واتە : فەرمان درا بەزەوی ئاوەکەت بارۆبچێت بەناختدا ، ئەی ئاسمان تۆش بابەس بێت و باران مەبارێنە ، ئیتر

ئاوەکە مژرایەوە و ڕۆچوو ، فەرمانیش بەڕێکی و تەواوی ئەنجامدرا ، کەشتیەکەش لەسەر کێوی جودی وەستاو لەنگەری گرت و وترا : دەك دووری لە بەزەیی خوا و تیاچوون بۆ بەرەی ستەمکاران .

هەمان وشە خوای گەورە لەقورئاندا بەکاری هێناوە لەبوارێکی‌تردا کە زۆر جیاوازە لەم بوارە و هەر لەزانینی خوادایە ئاوەها وشەیەك بەکاربهێنرێ بۆ مەسەلەیەکی شاراوە و نهێنی کەلەساڵی ۱۹۷۷ دا زانایان دۆزیانەوە ... قورئان دەفەرموێت ﴿ الله يعلم ما تحمـل كل انثى وما تغيض الارحام وماتزداد وكل شيء عنـده بمقدار ، عـالم الغيـب والشـهادة الكبير المتعال ، سواء منكم من أسر القول ومن جهر به ومن هو مستخف بالليل وسارب بالنهار ﴾ الرعد : ۱۰ واتە : خوا چاك دەزانێت بەوەی هەر مێینەیەك چی هەڵگرتووە لەسکیدا ، هەروەها دەزانێت بەوەش کەدەپوکێتەوە و لەبار دەچێت و بەوەش کە زیاد دەکات و گەورە دەبێت ، هەمووشتێك لای ئەو زاتە بەئەندازە و پێوانەیە ، ئەو زاتە زانای نهێنی و شاراوەکانە ، هەروەها زانای ئاشکرا و بینراوەکانیشە ، زاتێکی زۆر گەورە و بەشکۆ و بڵند و پایەدارە . چونیەکە لای ئەوزاتە ، ئەگەر کەسێکتان قسە بشارێتەوە ، یان بیڵێت و ئاشکرای بکات ، هەروەها ئاگاداری ئەوکەسەیە کە لە تاریکی شەودا خۆی دەشارێتەوە ، ئەوەش کەبەرۆژدا دەڕوا و ئاشکرا و دیارە ...

لەساڵی (۱۹۷۷) دا دووزانا بەناوی ( روبنسون) و (جانیس) سۆناریان کرد بۆ سی ئافرەتی دووگیان کەلەسەرەتای مانگی سێیەمدا بوون و سکەکانیان دوانەبوون ، پاش تەواوکردنی نۆمانگ و منداڵ بوونیان ، چواردەیان دوانەیان بوو ، یانزەیان یەکی‌یەك منداڵیان بوو ، یەکێکیان کیسی کۆرپەلەکە هاتەدەرەوە و هیچی تیانەبوو ، چواریشیان هیچیان نەبوو ، کۆرپەلەکانیان پووکابوونەوە و لەلایەن رەحمیانەوە مژرا بوونەوە و هیچ ئاسەوارێکیان بەجێ نەهێشتبوو ) .

لەساڵی (۱۹۷۹)دا زانایەك بەناوی (فارما) هەمان ئەنجامی دەست کەوت ، وەئەمەشیان ناو نا ( الاجهاض الخفي) واتە لەبارچوونی نهێنی و شاراوە ... لێرەوە تێدەگەین کە قورئان بۆچی وشەی ( وما تغيض الارحام ) بەکار دەهێنێ، بەمەرجێ عەرەب بەهیچ جۆرێ ئەم وشەیەی بۆ مەسەلەی (رەحم) بەکارنەهێناوە ..

بەڵێ زمانی عەرەبی ئەوەندە دەوڵەمەندە ، کە هەندێ زانا وەك دکتۆر عبدالصبور شاهین ، وشەکان و رەگەکانی زمانی عەرەبی لە (لسان العرب) و پەڕاوەکانی زماندا ژمارد

و پاشان لەگەڵ وشە بەکارهاتووەکانی قورئاندا بەراوردی کردن بۆی دەرکەوت کە قورئان یەك لەسەرچلی زمانی عەرەبی بەکارهێناوە ...

جا بەڕاستی لەزمانێکی ئاوا دەوڵەمەندا هەڵبژاردنی وشەیەك کەلەلایەك بۆ نەمانی ئاوی تۆفان و لافاو بەکارهاتبیّ و دوایی لەبواری کۆرپەلەناسی و ڕەحم دا بەکارهێنرابیّ و تەواوو لەسەدا سەدیش لەلایەنی زانستییەوە وشەکە ماناکەی بۆی بەکارهاتووە بیپێکێت ، موعجیزەیە و هەر لە عیلمی خوادا هەیە کە هەر خۆی ( عالم الغیب والشهادە) یە .. ( گۆڤاری الاعجاز العلمی فی القران والسنه ژمارە (٥) ) .

## ٤/ کوڕ یان کچ :

مامۆستا (عبدالمجید الزندانی) دەڵێت : دەگەڕاین بەدوای مانای ئەم فەرموودەیەی حەزرەتدا ﷺ کە ( ابن کثیر) گێڕاویەتیەوە و دەفەرمویّ : ( اذا علا ماء الرجل ماء المرأة أذکرا باذن الله ، واذا علا ماء المرأة ماء الرجل انثا باذن الله ) ...

( واتە : ئەگەر ئاوی پیاو سەرکەوت بەسەر ئاوی ژندا ، نێرینە ئەخوڵقیّ بەئیزنی خوا ، وە ئەگەر بەپێچەوانەشەوەبوو مێیینە دەخوڵقیّ بەئیزنی خوا ..).

دووسیّ ساڵ لەمەوبەر لەزانکۆکانی فەرەنسا و بەریتانیا و ئەلمانیا و ئەمەریکا و یابان پرسیارمان دەکرد وەلاّمان چنگ نەدەکەوت...

پاشان بیستمان کە شتێك هەیە لەجیهانی گیانلەبەراندا ، گوایە زانایان بۆیان دەرکەوتووە کە ئیفرازاتی نێرینە تفتە و هی مێیینەش ترشە ، وەکاتیّ بەیەك دەگەن (واتە تۆوی نێرینە و هێلکەی مێیینە ) ئەگەر ترشییەکە زاڵ بوو ئەوا ئەو (حیوان منوی) یە دەچیّ بۆ هێلکەکە مێیینەی پیّ دەخوڵقیّ ، وە ئەگەر تفتی زاڵ بوو ئەوا ئەو (حیوان منوی) یە دەچیّ بۆ هێلکەکە و دەیگاتیّ کەنێرینەی پیّ دەخوڵقیّ ... ئەمەشیان لە فەرەنسا تاقی کردەوە لەسەر مانگا ...

لەکۆنگرەی پزیشکی زانکۆی (مەلیك فەیسەڵ) لە (دمام) کە زانا ناودارەکانی جیهان ژمارەیەکی زۆریان ئامادەبوو بوون ، پیّیان وتین ، یەك کەس دەتوانیّ وەلاّمی ئەو پرسیارەتان بداتەوە کە ئەویش ( پرۆفسۆر سعد حافظ مسلم ) ی مصرییە کەلەئەمەریکا دادەنیشیّ ...

لەکۆنگرەکەدا بەخزمەتی ناوبراو گەیشتین و زانیمان کە بەرێزیان دامەزرێنەری زانستێکی نوێیە لەجیهاندا بەناوی ( زانستی نەزۆکی‌لای پیاوان) وەزانیمان کە بەرێوەبەری دوو گۆڤاری زانستی‌یە لەئەمەریکا و (٣٤) پەڕاوی هەیە و نزیکەی دەساڵە خەریکە و لێکۆڵینەوە دەکات لەسەر پەیوەندی نێوان ئاوی پیاوو ئافرەت بەمیکرۆسکۆبی ئەلکترۆنی و کۆمپیوتەر ... وە بەقەدەری خوا رێ کەوتووە لەو مەسەلەیەی کە ئێمە بەدوای‌دا دەگەڕێین و لەفەرموودەکەدا باسکراوە ... کە ئەوەش راستی‌یە کەو سەد لەسەد تەواوە ...وەپێ‌ی وتین ئەوەنهێنی‌یەکی زانستی‌یە و تا ئێستا بلأونەکراوەتەوە ، تا زانکۆ رێمان نەدات ناتوانین رای بگەیەنین بەجیهاندا ... بەلأم لەبەر ئەوەی ئێوە هەوڵتانداوە و بەدوای ئەم راستیەدا گەڕاون بۆیە ئەم نهێنیەم لا درکاندن . (پەڕاوی انت تسأل الشيخ الزنداني يجيب ) لەئینتەرنێتەوە .

**٥/ سوێندێکی گەورە بەئاسمان و ئەستێرە :**

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت ﴿ والسماء والطارق ، وما أدراك ما الطارق ، النجم الثاقب ان كل نفس لما عليها حافظ ﴾ الطارق : ٤ . واتە : سوێند بەئاسمان و ئەو ئەستێرانەی بەشەودا دەردەکەون و ( طارق) ن ... جا تۆ چووزانیت ( طارق) چی‌یە ؟ ئەستێرەیەکە بەرووناکی‌یەکەی تاریکی دەبڕێت ... سوێند بەوانە هیچ کەس نیە چاودێری نەبێت (خوای گەورە چاودێری هەمووانە و ، فریشتەشی کردووە بەچاودێر و پارێزەر بۆ مرۆڤ)...

پرۆفیسۆر (زەغلول النجار) دەڵێت : نزیکەی دەساڵێکە زانایان جۆرە ئەستێرەیەکیان دۆزیوەتەوە ، کەچڕ دەبێتەوە و تیرەکەی دەبێتە نزیکەی (١٦)کم و(٣٠) جار دەخولێتەوە لەچرکەیەکدا بەدەوری خۆی‌دا و لەئەنجامی ئەوەوە دەنگێك دروست دەبێت هەر دەڵێ‌ی لەدەرگادانە ، وە ئەو دەنگەش تۆمارکراوە و کاتێك لەبەرنامەی (نور على نور) دا لێمان داو باسمان کرد لەمیسرەوە ، بینیم هەموو ئەوانەی لەستۆدیۆکەدا کاریان لەگەڵ دەکردین فرمێسك هۆن هۆن بەچاویاندا دێتە خوارێ ، لەگەورەیی دەسەلأتی خوا و موعجیزەی ئەم قورئانە ، کە ئاوا پاش زیاتر لە( ١٤) سەدە راستیەکانی دەردەکەوێ ، جا وشەی (طارق) عەرەب زانیویەتی و بەرکاری هێناوە ، بۆ ئەوەی کە بەشەو دێت و لەدەرگای دەدات و، حەزرەتیش ﷺ لەدوعایەکدا پەنا دەگرێ بەخوا لەهەموو (طارق)ێکی شەو مەگەر (طارق) ێك کە بۆ خێر بێت ...

### ٦/ رۆژو و مانگی زۆر :

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت : ﴿ومن اياته الليل والنهار والشمس والقمر ، لاتسجدوا للشمس ولا للقمر ، واسجدوا لله الذي خلقهن ان كنتم اياه تعبدون﴾٣٧ : فصلت .

واتە : لەنیشانە و بەڵگەكانی دەسەڵاتی پەروەردگار شەوو رۆژ و خۆر و مانگە ، هەرگیز نەكەن سوژدە بۆ خۆر ، یان مانگ ببەن ، بەڵكو سوژدە بۆ ئەو خوایە ببەن كە دروستی كردوون ، ئەگەر ئێوە خۆتان بەبەندەی راستەقینەی ئەو دەزانن و هەر ئەو دەپەرستن ...

ئەم ئایەتە لەگەڵ ئەوەدا كە ئازادكردنی عەقڵی مرۆڤە لەوەی كەببێ بەبەندەی دار و بەرد و دروستكراوەكانی خوا ، موعجیزەیەكیشی تیایە ، چونكە وشەی (خلقهن) بەلای ئێمەوە كە تەنها یەك خۆر و یەك مانگ دەبینین دەبوو بوترایە ( خلقهما) ، كەچی بەكۆ باسی كردووە ، كە ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە تەنها ئەو مانگ و خۆرە نیە و، چەندەها مانگ و خۆری تر هەن ، كەلەم سەدەیەی دواییدا زانایان دۆزیویانەتەوە ...

### ٧/ شوێنی ئەستێرەكان :

قورئان دەفەرەموێت ﴿فلا أقسم بمواقع النجوم وانه لقسم لو تعلمون عظيم ، انه لقران كريم في كتاب مكنون لا يمسه الا المطهرون ، تنزيل من رب العالمين﴾الواقعة ، ٨

واتە : سوێندم بەشوێنی ئەستێرەكان ، بێگومان ئەو سوێندە ئەگەر بزانن سوێنێدكی زۆر گەورەیە ، بەراستی ئەوەی كە محمد ﷺ دەیخوێنێتەوە قورئانێكە زۆر پیرۆز و بەرێزە ، لەكتێبێكی شاراوەدا كە (لوح المحفوظ) ە ، پارێزراوە و تەنها پاكان نەبێت كەس دەستی لێنادات ، ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە نێردراوەتە خوارەوە .

خوای گەورە ئەم سوێندە گەورەیە دەخوات ، ئەمرۆ زیاتر دەردەكەوێت ، ئەوەی ئێمە لەسەر زەوییەوە دەیبینین شوێنی ئەستێرەكانە ، نەك ئەستێرەكان خۆیان ، چونكە رووناكی ئەو ئەستێرانە تا دەگەنە ئێمە ، ئەستێرەكان لەشوێنی خۆیان نەماون و بەردەوام لەجوولان دان ... ئەمەش رەحمەت و میهرەبانی خوایە ، چونكە ئەگەر ئەستێرەكان خۆیان ببینین و نزیك بوونایە و بەم جۆرەی ئێستا نەبوونایە ، زیانیان لەچاودەدا و مەترسی دەبوو لەسەر بینین.

بۆ نموونە خۆر گەرمی ناوەکەی نزیکەی (١٥) ملیۆن پلەیە و گەرمی رووەکەشی نزیکەی شەش هەزار پلەیە ، نزیکەی (١٥٠) ملیۆن کم لێمانەوە دوورە و رووناکیەکەی بەنزیکەی هەشت خولەك و یەك لەسەر سیّ ی خولەکێك دەمان گاتیّ ، تا رووناکی‌یەکەی دەگاتە ئێمە خۆر جوولاوە و لەشوێنێکی تازەدایە ، ئێمە شوێنی پێش (٨ر٣٣) خولەکی دەبینین ، هەروەها رووناکی‌یەکەش بەهێڵی راست نایەت و دەشکێتەوە ، کەواتە شوێنی ئەستێرەکان مەسەلەیەکی گرنگە و پەیوەندی بەبینین و چاوی مرۆڤەوە هەیە ، ئەمەش مەگەر هەر لەعیلمی خوادابێت ، بەتایبەت پێش هەزار و چوار سەد ساڵ زیاتر لەمەوبەر کە مرۆڤ بەچاکی راست و چەپی خۆشی نەدەزانی ! ( دکتۆر زغلول النجار ) ...

### ٨/ موعجیزەی نوێژ و رۆژوو :

ئەمرۆ زانایان گەیشتونەتە ئەو راستیەی کە مرۆڤ پێویستی بەخاوبوونەوە (استرخاء) و پشوو هەیە ، ئەگەر بۆماوەیەکی کەمیش بێت ، دوای هەستان لەخەو ، لەئێوارەدا و پێش خەوتن، هەروەها لەنیوەڕۆدا ، پشوویەك کە کێشە و خەم و خەفەتەکانی وەلابنێت و (ترکیز) بکاتە سەر یەك شت...ئێمەش دەڵێین زۆر باشە تا ئێستا قەناعەتیان بەسیّ کات کردووە ، هەرچەند لای ئێمە پێنج کاتە ، بەڵیّ ... پێنج کات موسڵمان دەست لەهەموو شتێك هەڵدەگریّ و دەست نوێژێك دەشوات و بەوەستان لەخزمەت خوادا پشووی تەواو دەدات و هەموو دەمارە گرژەکانی خاو دەبنەوە ... حەزرەت ﷺ ئاماژە بەمە دەکات و دەفەرموێت (ارحنا بها یا بلال) ئەی بیلال بانگەکەت بدە و بەنوێژەکە پشوومان پیّ بدە ...

رۆژوویش خێرە و چاکە بۆ مرۆڤ ، قورئان دەفەرموێت ﴿وان تصوموا خیر لكم ﴾ البقرة: دکتۆر ئەحمەد قازی لەپەیمانگای پزیشکی ئیسلامی بۆ فێر بوون و لێکۆڵینەوە لە فلۆریدا هەشت ئافرەت و دوانزە پیاوی خستە ژێر تاقی کردنەوەوە کەتەمەنیان لە ( ١٢ ساڵەوە تا ٥٢ ساڵبوو)...

دکتۆر هەمو پشکنینێکی بۆ کردن پێش بەرۆژو بوون و دوای بەرۆژو بوون سەرەنجام بۆی دەرکەوت کە رۆژوو لەهەموو لایەنێکەوە سوود بەخشە بۆ مرۆڤ ... دەستنوێژیش (بەئاو بێت یان بەتەیەموم) مایەی پاك بوونەوەیە ، هەروەك قورئان پاش باسی دەستنوێژ و تەیەموم دەفەرموێت ﴿ مايريد الله ليجعل عليكم من حرج ولكن يريد ليطهركم وليتم نعمته عليكم لعلكم تشكرون ﴾ المائدة : ٦

واتە : خوانایەوێت لەئایندا تووشی سەغڵەتی و نارەحەتیتان بکات بەڵکو دەیەوێت پاك و خاوێنتان بکات و ناز و نیعمەتی خۆیتان بەسەردا تەواو بکات بۆ ئەوەی سوپاسگوزاربن ، (عبدالمجید الزندانی ) دەڵێ / دەستنوێژم گرت لەبەرچاوی (پرۆفیسۆر لارسن) ی دانیمارکی زۆرلای سەیر بوو ، وتی : چۆن ئێوە پێنج جار ئاوا خۆتان پاك دەکەنەوە وتم : بەڵێ ...

ئینجا پێم وت : باشە لەسەفەردا ئەگەر ئاو دەست نەکەوێت ، ئاوا دەستنوێژ بشۆری بە تۆز و خۆڵ و گەردی رێگا و بان ، ئاخۆ تەیەموم کردن بەخۆڵ دەبێتە مایەی کوشتنی بەکتریا ( جراثیم) وتی : بەڵێ بەمەرجێ پاك بێت وشك بێت ... منیش وتم : قورئانیش ئەو دوو مەرجەی بۆ تەیەموم داناوە کە دیارە ئەمەش موعجیزەیەکی ئاشکرایە ، ئەگینا هەزار و چوار سەد ساڵ لەمەوبەر کێ دەیزانی کە خۆڵی پاك مایەی پاك کردنەوەیە و ئەو بەکتریا و میکرۆبە و (جراثیم) انەی کەلەدەم وچاوو ڕوو دەنیشن بەو خۆڵ و تۆزە لەناو دەچن ؟! ، هەروەك قورئان دەفەرموێت: ﴿ ... فلم تجدوا ماءً فتيمموا صعيداً طيباً فامسحوا بوجوهكم وايديكم منه ... ﴾ المائدة : ٦ واتە : ئەگەر ئاوتان دەست نەکەوت بەخاکێکی پاك و وشك تەیەموم بکەن ( لەپی دەستان بەئاستەم بماڵن بەخاکدا ) و بیهێنن بەڕووخسار و دەستاندا تا ئانیشکتان ) ...

**تێبینی** :

دکتۆر جۆن هونفر لارسن مامۆستایە و بەڕێوەبەری بەشی بەکتریا یە لەخەستەخانەی (نخیس) کە گەورەترین خەستەخانەی ( کوبنهاگن ) ە ، پاش ئەوەی باسی سەربڕینی ئاژەڵی زانی لەئیسلامدا و هەروەها نەخواردنی گۆشتی ئەوگیاندارانەی کەپیس خۆرن تاوەکو شیر و گۆشتەکەیان پاش ماوەیەك پاك دەبێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لەفەرمووەدا باسی کردووە و وە خۆپاراستن لەونەخۆشیانەی کەلەسەگەوە دەبێت وتی ( هیچ رێنماییەکی حەکیمم نەبینیوە رێنمایی بکەن بەوردی بۆ خۆ پاراستن و چارەسەری ئەو نەخۆشیانەی کەلەسەگەوە دەگوێزرێنەوە وەك ئەوەی کە (محمد) ﷺ هێناویەتی ) ل ٢٠٣ المعجزة المتجددة

### ٩/ ڕاستییەکانی فەرموودەی حەزرەت ﷺ :

لەبەرئەوەی حەزرەت ﷺ ئەوەی دەیفەرموو (وحی) بوو ، وەهیچی لەخۆیەوەیان لەهەواو ئارەزووەوە نەبوو ، بۆیە ئەگەر لێی بکۆڵینەوە دەبینین لەگەڵ تازەترین

زانستەكانی ئەم سەردەمەدا جیاوازی و دژایەتیان تێدانییە ... بۆ نموونە دەفەرموێ : ( یحرم من الرضاع ما یحرم من النسب ) بخاري ومسلم . ئەم فەرموودەیە زانست دەیسەلمێنێ بەوەی كەلە شیری دایكدا پاش سێ تا پێنج جار خواردنی لەلایەن منداڵەوە شتێك هەیە كە دەبێتە مایەی وەرگرتنی هەندێ سیفاتی بۆماوەیی تایبەت بەبەرگری لەشەوە (المناعة) ، بەمەش لەیەك چوون و هاوشێوە بوونێكی بۆ دروست دەبێت لەگەڵ خوشك و براكانی‌دا كە هەمان شیریان خواردووە ... ڕەنگە ئەمەش یەكێ بێ لەحیكمەتەكانی خوشك و برایی شیری كە ئیسلام بەگرنگ گرتویەتی و قەدەغەی كردووە و حەرامی كردووە كە خوشك و برای شیری ببنە هاوسەری یەكتری ( الاعجاز العلمي في الاسلام و السنة النبویة ـ محمد كامل عبدالصمد ) .

**موسڵمان بوونی زانایان**

ئەم ئاماژە زانستیانەی قورئان بوونە هۆی موسڵمان بوونی زیاتر لە ( ٣٧) زانای رووسی لەموسكۆ پاش (كۆنگرەی ئیعجازی زانستی قورئان) كەلەوێ گیرا بۆ یەكەم جار ، لەوشوێنەدا كە (٧٢) ساڵ پایتەختی ئیلحاد و بێ‌دینی بوو ...

هەروەها هەر لەوێدا چوار وەرگێڕ (مترجم) موسڵمان بوون تەنها بەهۆی وەرگێڕانەكەیانەوە ، بەبێ ئەوەی كەس باسی ئیسلامی بۆ كردبن و هانی دابن ، تەنها وتار و باسەكانی كۆنگرەكە كاری تێكردن...

## دوا وتە

دڵ نەخۆش دەكەوێت ، دڵ ڕەق دەبێت ، دڵ دەمرێت !!

دڵیش گەورەترین سەرمایەی مرۆڤە ، كە ئەوی لەدەستدا ئیتر چی بۆ دەمێنێتەوە ؟!

ئیتر دەبێ دڵ بەچی خۆش بكا؟! و ژیانی چ مانایەك ببەخشێ !

لەقیامەتدا نەماڵ و نەمناڵ فریای مرۆڤ ناكەون ، ئەوەی كە مایەی سەرفرازی‌یە دڵی پاك و چاك و ساغە ، هەروەك قورئان دەفەرموێ : ﴿یوم لاینفع مال ولابنون الا من اتى الله بقلب سلیم﴾ ...

هەر لەبەرئەوەشە كە حەزرەت دەستنوێژی دەشت ڕووەو قیبلە و ماڵی خوا دوعای دەكرد و دەیفەرموو : ( اللهم اجعلني من التوابین واجعلني من المتطهرین ) ... خوایە وائێمە دەم و چاوو دەست و قاچمان شت و پاكمان كردەوە ، دەخوایە بمانكە بە یەكێ

**لەپاكان و بەتەوبەو پەشیمانیشمان بمانگێڕە بەیەكێ لەتەوبەكاران و هەروەك بە ڕووكەش پاك بووینەتەوە دڵیشمان پاك بكەرەوە ، جا ئەم نزاوپاڕانەوەیەیی پاش دەستنوێژ پێویستە بۆمان ، هەڵكو خوای گەورە قبوڵی بفەرموێ و دەرگای بەهەشتمان بۆ بكرێتەوە هەروەك لەفەرموودەدا هاتووە .**

**خەم خواردنمان بۆ پاكردنەوەی دڵمان و یادكردنی زۆری خوای بالآدەستی میهرەبان بۆ دامەزراوی و دڵنیاییمان مەسەلەیەكی گرنگە و قورئان دەفەرموێ :** ( ألا بذكـر الله تطمئن القلوب)...

**خوا دەیەوێ بەفەزڵی خوایەتی خۆی لێمان خۆش بێ** ( يريـد الله أن يتـوب عليكم ) **بۆیە ئێمەی گوناهكار ، بەتەوبەكردن ، بەدەست نوێژ گرتن بەنوێژ كردن، بەچاكەكردن ، بەجومعەكردن ، بەعومرە كردن ، بەحەجی ماڵی خوا ، بەهەموو ئەمانە و زۆری تریش لەگوناە پاك دەبینەوە ، خوا دەیەوێ پاكمانكاتەوە و بەهەشتی بەرین جێمان بێت كەچی هیواهەیە هەر سەرسەختە و نایەوێ بەوپلەوپایە بەرزە شادبێ ... زۆر سەیرە نایەوێ خوا لێی خۆش بێ.**!( ويريد الذين يتبعون الشهوات أن تميلوا ميلاً عظيماً ، يريد الله أن يخفف عنكم وخلق الانسان ضعيفـاً ) **ئەوانەی دوای هەواو ئارەزوو كەوتوون دەیانەوێ زیاتر لەهەق و ڕاستی لابدەن و زیاتر سەرگەردان ببن ، لەكاتێكدا خوا دەیەوێ باری شانی ئەم مرۆڤە لاواز و كەمدەستە سووك بكات ، كەچی ئەم مرۆڤە شەیتان فوودەكا بەلوتیا و باری شانی خۆی قورس دەكات ...**

**لەقیامەتدا گوناهی خۆی وا بە كۆڵیەوە و گوناهی ئەوانەش كەسەرگەردانی كردوون** ﴿ ويحملون أثقالاً مع أثقالهم ﴾ ...

**بەڵێ ! مەسەلەكە گرنگە ، یا سەرفرازی هەتا هەتایی و بەختەوەرییە .. یان تیاچوون و لەناوچوونی هەتا هەتاییە ؛ هەمووشی لەسەر دڵ وەستاوە...**

**زنجیرەی بەهاری دڵان ... هەوڵێكە بۆ گەشانەوە و بوژانەوەی دڵەكان ، ئەگەر هەر هیچ نەكات ، گوڵێكە و لەدەشت و دەروچیاو بانێكدا گەشاوەتەوە و چاوەڕێیە هەر هیچ نەبێ شوانێك بەلایا بگوزەرێ چاودڵی پێی ڕوون ببێتەوە.**

**ئاشكرایە هەموو شوانین ، هەركەس بەپێی خۆی و بەجۆرێك** ( كلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته ) .

**جا باشوانێكی وریابین ، ئەگەر لەدووری شارەوە مەڕو ماڵآتەكەمان لەوەڕان و تابۆی دوژمن دەركەوت با زوو فریاكەوین و بەگورجی خەریكی وریا كردنەوەی مەست وخومار**

و بیٚئاگایان بین و ، هەروەك حەزرەت ببینە ( النذیر العریان) و، كراسەكەمان دابكەنین و هەڵی بسوڕێنین و بەپەلەو دەنگی بەرز هاواربكەین بەڵكو فریاكەوین و دوژمنان زەفەرمان پیٚنەبەن !

رۆژێك حەزرەت لەمەككە خزمانی هەموو كۆكردەوە و فەرمووی ئەگەر هەواڵتان بدەمیٚ كە دوژمنان لەودیو شاخەوەن و دەیانەویٚ بدەن بەسەرتانا بڕوام پیٚدەكەن وتیان بەڵیٚ ، درۆمان لیٚنەدیویت .

فەرمووی: دەمن ئاگادارتان دەكەمەوە لەسزای دۆزەخ و پەیامی خوام پیٚیە بۆتان .

ئەبولەهەبی مامی وتی : ( تباً لك ألهذا جمعتنا ) ...

قورئانیش هاتە خوارەوە فەرمووی : ﴿تبت يدا أبي لهب و تب ما أغنى عنه ماله وما كسب سيصلى ناراً ذات لهب ... ﴾ جا ئەگەر هەزارەهای وەك ئەبو لەهەب پیامانا هەڵشاخیٚ ، هیدایەت بەدەست خوایە و ئێمە هەوڵدانمان لەسەرە... دڵەكان بەدەست خواوەن و هەركەس خێری تیابیٚ ، ئەو خۆی باشتر دەزانیٚ و بیٚگومان هیدایەتی دەدات...

پیاوێكی پزیشكی بەعسی ئەوەندەی ڕق لەئاینی ئیسلام بوو كوڕەكەی ناونا (لهب) بۆ ئەوەی پیٚی بڵێن ( ابو لهب) !!

كوڕە گەورەبوو ، لەقۆناغی ناوەندیدا ، بەهۆی هاوەڵانیەوە كەوتە نوێژكردن و بووە لاوێكی جوانخاس و ڕەوشت بەرز !!

بۆیە لەداخا باوكی دەست ڕۆیشتووی دەسەڵاتداری ناردی بۆ (بەریتانیا) بۆ تەواوكردنی خوێندن ، بەڵكو واز لەنوێژ و ڕۆژو بهێنیٚ و ناوی خوای بیربچێتەوە ... بەقەدەری خوا لەوێش هاوەڵی چاكی دۆزیەوە و لەسەر خواناسی بەردەوام بوو زۆر لەجاران چاكتر و بووە پزیشك ...

ئنجا ناوبەناو پەیوەندی بەباوكیەوە دەكرد و توانی ببێتە مایەی ڕزگاركردنی باوكی بەرەو ئیمان و ئیسلامەتی و سەرەنجام باوكیشی عێراقی بەجیٚهێشت و هەردووكیان مافی پەنابەرێتیان لەوڵاتێكی عەرەبی وەرگرت وبوونە پەپولەی باڵ سووتاوی دەوری شەمعی ئەو چرایەی كە خوا تا ئەبەد هەڵی كردووە وناكوژێتەوە ...

**سەرچاوەکان** :


١ـ التغير على منهاج النبوة ـ جمعة أمين عبدالعزيز .

٢ – **زنجیرەی هاوەڵان . حبیب محمد سعید .**

٣ـ **بەرنامەی** نلقى الاحبة . قناة اقرأ الفضائية .

٤ ـ صحيح القصص النبوي ـ د. عمر الاشقر .

٥ـ صحيح الجامع ـ الالباني .

٦ـ جند المعالي ـ خليل صقر .

٧ ـ مناهج التربية الاسلامية ـ جزء ٣/ د. ماجد الكيلاني .

٨ ـ مفاهيم تربوية ـ جزء ٤ ـ محمد عبدالله الخطيب .

٩ – **وتاری هەینی شێخ** يوسف القرضاوي - **ئینتەرنێت ٢٣محرم ١٤١٨** .

١٠ . الاساليب الحديثة في مواجهة الاسلام ـ م .ا د. سعدالدين السيد صالح.

١١ ـ البحث عن الحقيقة الكبرى ـ المهندس عصام قصاب .

١٢ ـ مجلة المجتمع - **چەند ژمارەیەك** . .

١٣ـ مشكلات في طريق التربية الاسلامية ـ د. السيد أحمد فرج

١٤ ـ لعبة الامم ـ مايلز كوبلاند .

١٥ ـ مجلة الفتوى ـ عدد ١٠٦ **ساڵی** ٢٠٠٢ .

١٦ ـ جريدة الاتحاد الاماراتية /١٤٢٠ هـ ـ الانترنيت

١٧ـ محاضرة المنحنى التاريخي للأسلام ـ د. طارق السويدان .

١٨ – **ڕۆژنامەی یەکگرتوو** /٣٧٣.

١٩ ـ المعجزة المتجددة ـ أبي عبدالرحمان اليافي .

٢٠ ـ شمس الاسلام تشرق من جديد / محمد عثمان عثمان

٢١ – **وتاری** . الازمة الاقتصادية التركية ـ اورخان محمد علي / على الانترنيت .

٢٢ ـ مجلة الاعجاز العلمي في القران والسنة ـ العدد (٥)

٢٣ ـ محاضرات زغلول النجار .

٢٤ – **پەراوی** ( أنت تسأل والشيخ الزنداني يجيب ) **لەئینتەرنێتەوە** .

٢٥ ـ الاعجاز العلمي في الاسلام والسنة النبوية ـ محمد كامل عبدالصمد .

# ناوەرۆك

**پێشەکی**

سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ پەروەدگاری جیهان و درودو سەلاواتیش لەسەرگیانی حەزرەت و یارو یاوەران و شوێن کەوتووان ...

ئیبن تەیمیە بەرەحمەت بێ بەنەیارەکانی دەووت: دەتوانن چیم لێ بکەن ؟ من باخ و بەهەشتەکەم وا لەناو دڵ و سینەمدا ، بەندم بکەن خەڵوەتە و ، دوورم بخەنەوە گەشت و گوزارە و ، بمکوژن شەهادەتە ...

حەزرەت ﷺ دەفەرموێ: زستان بەهاری بڕواداره ، ڕۆژەکەی کورتە بۆ ڕۆژوو ، شەوەکەی درێژە بۆ شەونوێژ ..

کەواتە بادەرەوە هەر سەرما و کرێوەبێت ، با زوقم و شەختە بێت ، گرنگ ئەوەیە لەدڵا بەهاربێت ...

زانایەك دەڵێت : لەدنیادا باخ و بەهەشتی یادی خوا و خۆشەویستی خوا هەیە ئەوەی نەچێتە ناوی ، لەئاخیرەتدا ناچێتە بەهەشتەوە .

زنجیرەی (بەهاری دلان) بەشی دووەم دێتەوە خزمەت خوێنەرانی بەو هیوایەی کە ئەمیش لەگەڵ بەشەکەی پێش خۆیدا بتوانن ڕۆڵێك ببینن ، ئەگەر کەمیش بێت لەبووژاندنەوەی دڵەکان و بەسەربردنی چەند ساتێکدا لەخزمەت کۆمەڵێ ماناو مەبەستی ئیمانی ، کە لەم دنیا ماددی‌یەی ئەمڕۆ لەهەموو کات زیاتر ئاتاجمان پێ‌یەتی ...

ئەمڕۆ لەهەمووکات زیاتر ئیمان و بڕوا و لایەنی ڕۆحی پێویستن تامرۆڤایەتی ڕزگار بکەن لەوباروودۆخە ناهەموارەی کەتیایەتی و ئەمەش بەتەنها قسەی موسڵمانان نیە بەڵکو یەکێکی وەك (الفن توفلر) کە ڕۆشنبیرێکی گەورەی ڕۆژئاوایە لەپەڕاوەکەی‌دا کەناوی (صدمة المستقبل) ەو لەساڵێکدا نۆ جار لەچاپدراوەتەوە و نزیکەی(٢٧) ملیۆن نوسخەی لێخراوەتە بازاڕەوە ، باس لەوەدەکات کە مرۆڤایەتی لەسای سێبەری شارستانی ڕۆژئاوادا هەر چەند لە زۆر بواری ماددی‌دا پێشکەوتووە بەلام لە زۆر لایەنی ترەوە دێتەوە دواوە و بەرەو( بداوة )و دەوارنشینی دەگەڕێتەوەو، بەداخەوە هەوڵ دەدەن بەهەموو جۆرێك شەرعیەت بدەن بە ( شذوذ ) ی جنسی و منال لەباربردن و ماددە بێهۆشکەرەکان کە مایەی تیاچوون و قڕبوونی بەرەی ئادەمی‌یە ...

بەڵێ ... ئەمڕۆ قورئان لەرابردوو چاکتر دەتوانێ کێشەکانی مرۆڤایەتی چارەسەربکات ، بەوەی کە دەتوانێ وەلامی هەموو پرسیارەکانی دڵی مرۆڤ بداتەوە و هەموو بنەمایەکی

پێشکەوتن و بەختیاربوونی مرۆڤ دەستەبەر بکات ، رۆژهەلاتناسێك لەفەرەنسا بەشێخ(محمد عبده) ی وت: ئێوە دەلێن : قورئان بەکەلکی هەموو کات و شوێنێك دێت و هەمووشتێکی تیایە ، باشە پێم نالێی فەردەیە ئارد چەند نانی تیادەبێ و ئایا لەقورئاندا هەیە ؟ ئەویش وتی : بەلێ هەیە، سبەینێ وەلامت دەدەمەوە !

ئەو رۆژە (شێخ محمد عبده) لەنانەوایەکی پرسی، فەردەیە ئارد چەند نانی تیادەبێت ، ئەویش وەلامی دایەوە ... بۆ بەیانی (شێخ) بەرۆژهەلات ناسەکەی وت: پرسیارم کرد فەردەیەك ئارد ئەوەندە نانی تیادەبێت ... کابرا وتی : جا ئەوە چۆن دەبێ و کوا لەقورئاندایە ؟ شێخ وتی: ئاخر قورئان دەفەرموێ:﴿ فسألوا أهل الذكر ان كنتم لاتعلمون ﴾ ... منیش کە نای زانم بەپێی رێنمایی قورئان چووم پرسیارم کرد لە شارەزای ئەو بوارە و وەلامەکەم بۆ هێنای !

## ئەمانەت

**ئاسمانەکان و زەوی و ئەمانەت :**

قورئان دەفەرموێت : ﴿ انا عرضنا الامانة على السموات والارض والجبال ، فابين أن يحملنها ، واشفقن منها ، وحملها الانسان ، انه كان ظلوماً جهولا ﴾ الاحزاب: ٧٢

واتە : ئەمانەتمان رانواند بەسەر ئاسمانەکان و زەوی و کێوەکاندا ، بۆ ئەوەی هەلی بگرن و بیگرنە ئەستۆ ، کەچی هەلیان نەگرت و ترسان لێی کە نەتوانن ئەو ئەمانەتە بەباشی چاودێری بکەن ، (پێیان چاك بوو هەر فەرمانبەرداربن و سەرپشك نەبن ) ، کەچی ئادەمیزاد شانی دایە بەر و گرتیە ئەستۆی خۆی ، بەراستی ئادەمیزاد ستەمکار و نەفام بوو ( ئەگەر زۆرینە رەچاو بکەین )...

ئنجا مرۆڤ کە بۆ هەلگرتنی ئەم ئەمانەتە دروستکراوە و توانای تایبەتی پێدراوە ، خوای گەورە یارمەتی دەدا و کار ئاسانی بۆ دەکات ، ئەگەر ئەم ئەمانەتەی بەچاکی گەیاند و گرتیە ئەستۆی خۆی ، ئەگەر گوناهیش بکات کەم تا زۆر ، بەلام پەشیمان بێتەوە ، خوا لێی خۆش دەبێت و چاوپۆشی لێدەکات و پاداشتی دەداتەوە ، بەپێچەوانەشەوە دووڕووەکان و خوانەناسانیش بەسزای دۆزەخ شاد دەکرێن و ئازار دەدرێن ، قورئان دەفەرموێت ﴿ ليعذب الله المنافقين والمنافقات والمشركين والمشركات ، ويتوب الله على المؤمنين والمؤمنات وكان الله غفوراً رحيماً ﴾ الاحزاب ٥٣ .

**لەبارەی ڕانواندنی ئەمانەتەوە زانایان دوو ڕایان هەیە :**

یەکــەم/ دەڵێــن حەقیقەتــە و خــوای گــەورە فــام وژیــری لەئاسمانــەکان و زەوی و کێوەکاندا دروست کردووە و قسەی لەگەڵداکردوون ... ئیمامی ترمـذی دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ( خـودا فـەرمووی بـەئادەم : مـن ئەمانـەتم بەسـەر ئاسمانـەکان و زەویدا ڕانواند بۆ ئەوەی هەڵی بگرن ، بەڵام نەیانتوانی ، ئایا تۆ ئەو ئەمانەتە هەڵدەگریت بەهەرچییەکەوە کەتیایەتی ؟! ئادەم وتی: پەروەردگارا چی تێدایە ؟ خواوەند فەرمووی : ئەگەر هەڵتگرت و پاراستت پاداشت دەدرێیتـەوە ، وە ئەگـەر لـەناوتدا سـزا دەدرێیـت ، دەی شانی بدەرە بەر و بیگرە ئەستۆت بەهەرچییەکەوە کەتیایدایە ...

دووەم/ هـەندێ لـەزانایان دەڵێـن کـە ئـەوە هێمایـە بـۆ ئـەوە ئەگـەر زەوی و ئاسمانـەکان خاوەن فام بن و ئەم ئەرکە بخەینە سەریان ، بۆیان هەڵناگیرێت ، لەبەر گـەورەیی و گرانـی ئەمانەت .

**ئەمانەت لەقووڵایی دڵدا دانرا :**

کـاتێك مـرۆڤ ڕازی بـوو بـە هـەڵگرتنی ئەمانـەت ، پـەروەردگار لـەناو قووڵایـی دڵـی مرۆڤدا ئەمانەتی دانا ، تاوەکو بەدڵ حەزی پێبکات و ببێتـە سروشت و فیترەت بـۆی ... پێغەمبەر ﷺ لەم بارەیەوە دەفەرموێت : ( ان الامانة نزلت في جذر قلوب الرجال ، ثم نزل القران فعلموا من القران وعلموا من السنة) .

واتە : ئەمانەت لەقووڵایی دڵی مرۆڤدا دانـرا ، ئنجـا قورئـان هاتـە خـوارەوە و خەڵكی بەهۆی قورئـان و سوننەتەوە شـارەزای ئەمانـەت بوون و هـەموو بـوار و لایەنـەکانیان بـۆ ڕوون بووەوە ... ( ئاشکرایە قورئان و سوننەت بەردەوام هانی مرۆڤ دەدات بۆ پاراستنی ئەمانەت و دوورە پەرێزی لەخیانەت ...) .

لـەم لایشـەوە شەیتانەکانی ئـادەمی و پـەری ، مـرۆڤ سـەرقاڵی هـەواو ئـارەزوو ، وە بەرژەوەندی تایبەتی و فێری خیانەت و دەست پیسی دەکەن ، بەمانەش مرۆڤەکە خـەوی غەفڵەت دایدەگرێ و ئەمانەت لەدڵی هەڵدەگیرێتەوە و شوێنەوارێکی کـەم بـەجێ دەهێڵـێ ( ينام الرجل النومة فتقبض الامانة من قلبه ، فيظل أثرها مثل الوكت ) .

ئنجـا ئـەو کەسـە زیـاتر غـافڵ دەبێـت و خەوەکـەی قورسـتر دەبێـت و بەیـەکجاری ئەمانەتەکە لەدڵیدا نامێنێت و شوێنەوارێکی وەك تلۆق بـەجێ دەهێڵێت ، هـەروەك چۆن کەسێك پشکۆیەك بهێنێت بەقاچی داو تلۆق بکـات ، دەبینێـت هـەڵتۆقیوە و بەرزبۆتەوە ، بەڵام بێجگە لەئاوێکی بێسوود هیچی تری تیانیە ، جا بـۆ زیـاتر ڕوونکردنـەوە حـەزرەت

ﷺ بەردێكی بچووكی هەڵگرت و هێنای بەقاچیدا ، ﴿ثم ينام النومة ، فتقبض الامانة من قلبه ، فيظل أثرها مثل المجل ، كجمر دحرجته على رجلك فنفط ، فتراه منتبراً ، وليس فيه شيء ثم أخذ الرسول ﷺ حصى ، فدحرجه على رجله ﴾.

ئنجا حەزرەت ﷺ فەرمووی : وورد وورده كۆمەڵ دەشێوێت و خیانەت بلاْودەبێتەوە ، بەجۆرێك خەڵكی مامەڵە لەگەڵ یەك دەكەن و كەسیان ئەمین نیە ، تاوای لێدێت دەوترێت : لەفلاْن عەشرەتدا پیاوێكی ئەمین هەیە ، تاوەكو دەوترێت بەپیاوێك : ئای چەندە بەهێزە ! چەندە زۆرزان و لێزانە ! چەندە وریا و ژیرە ! كەلەراستیشدا هێندەی دەنكە خەرتەلەیەك بڕوا لەدڵیدا نیە ...

( فيصبح الناس يتبايعون ، فلا يكاد أحد يؤدي الامانة ، حتى يقال : ان في بني فلان رجلاً أميناً ، حتى يقال للرجل : ما أجلده ! ما أظرفه ! ما أعقله ! وما في قلبه مثقال حبة من خردل من ايمان ) (بخاري ومسلم) .

## پێغەمبەران ئەمینی ئاسمان و زەوین :

خوای پەروەردگار لەناو بەرەی ئادەمیدا نێرراوی تایبەتی ئەمینی هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی پەیامی هەق و راستی خوایی بگەیەنن بەئادەمیزاد و بەمەش مرۆڤ بیانووی نەمێنێ و لەپاشە رۆژدا نەڵێ : ئاگادار نەكراومەتەوە و كەسمان بۆ نەهاتووە !

پێغەمبەرانیش هەردەم جەختیان كردۆتەوە لەسەر ئەمینی خۆیان . بۆ نموونە : نوح سەلامی خوای لێبێ بەگەلەكەی دەفەرموێ : ﴿ اذ قال لهم أخوهم نوح الا تتقون، اني لكم رسول أمين ﴾ ...

بەهەمان شێوەش پێغەمبەرانیتر هەمان فەرمایشتیان گەیاندووە بەگەلەكانیان هەروەك قورئان لەزمانی ئەوانەوە تۆماری كردووە ...

پێغەمبەری خۆشمان ﷺ بەهەمان شێوە ، خوای گەورە بەجوبرەئیلی ئەمیندا دوا پەیامی بۆ نارد ، تا لەدڵە ئەمینەكەیدا جێگیر ببێ و پاشان بە ئەمانەتەوە بێزیاد و كەم بیگەیەنێ ... قورئان دەفەرموێت : ﴿ وانه لتنزيل رب العالمين نزل به الروح الامين على قلبك لتكون من المنذرين ﴾الشعراء ١٩٤ واتە : بەراستی ئەم قورئانە پەروەردگاری جیهانیان ناردویەتی بەهۆی جوبرائیلی ئەمینەوە بۆ سەر دڵی تۆ ، تاببی بەیەكێ لە ترسێنەران لەسزای خوا ...

پێغەمبەر ﷺ تا دوا پلە ئەمین بوو ، تەنانەت لەناو گەلەكەیدا بە(صادق الامين) ناوی دەركردبوو ... رۆژێك نەفامێك لەكاتی شت دابەشكردندا پێی وت : (داد پەروەر بە ئەی

محمد) ، ئەویش فەرمووی ( ئەگەر مـن داد پەروەرنـەبم کـێ داد پـەروەرە ؟! بـەخوا مـن ئەمینم لەئاسماندا و ئەمینم لەزەویدا ) ...

لەگەڵ ئەوەشدا حەزرەت ﷺ هەمووکات دوعای دەکرد و دەیفەرموو : ( اعوذ بـك مـن الخيانة فانها بئس البطانة ) ...واتە : پەروەردگارا پەنا بەتۆ دەگرم لەخیانەت کەبەڕاستی خراپترین رەوشت و هاودەمە ...

کاتێك پێغەمبەر ﷺ فەتحی مەککەی کرد ، کلیلی دەرگای کەعبەی لـە( عثمـانی کـوڕی تەڵحە ) وەرگرت کەلەلای ئەو بوو ، لەوکاتەدا کە(عوسمان) دەستی هێنا کلیلەکانی بداتێ ، عەبباسی کوری عەبدول موتەلیب وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ، دایك و باوکم بەفیدات بێت ، بەڵکو کلیلـەکان دوایی بدەیت بەمن و لەگـەڵ ئـەوەدا کـە (سـقایە) م لایە ، واتـە ( ئاودان بەحاجیان ) ئەمەش لای من بێت ...

( عوسمان ) کە ئەمەی بیست خەریك بوو دەست بگێڕێتەوە ، حـەزرەت ﷺ فەرمووی : (عوسمان ) کلیلەکانم بدەرێ ، ئەویش دایە و وتی: دەبگرە ئەوە ئەمانەتەکەی خوا ...

پاشـان حـەزرەت ﷺ چـووە نـاو کەعبـەوە و پـاکی کـردەوە و ، ئنجـا کەهاتـە دەرەوە تەوافی کرد و کلیلەکانی دایەوە دەست(عوسمان) و فەرمووی : ﴿ ان الله يامركم أن تؤدوا الامانـات الـى اهلـها ﴾ النسـاء : ٥٨ تـا ئێستـاش ئـەو کلیلـەی کەعبـە هـەر لای ئـەو بنەماڵەیەیە و کەس لێیان ناسەنێت ...

## جوولەکە و خیانەت کردن لەئەمانەت :

قورئان باسی جوولەکەکان دەکات ، کەپیاوی وەك (عبدالله ی کوری سەلامیان) تیابوو ، کەبڕێکی زۆر ئاڵتونیـان بەئەمانەت لادانـاو ، وەك خـۆی دایەوە بەخاوەنەکەی ، وە ئـەم ئەمانەت و دەست و دڵ پاکیەشی وای لێکرد موسڵمان ببێ...

کەسـی تـری واش هەبوو کە بڕێکـی زۆر کەمی پـارە و ئەمانـەتی ئـەو زەمانـەی لـەلا دابنرایـە دەیخـوارد و خیانـەتی لێ دەکـرد ، بـەبیانووی ئـەوەی گوایـە مـاڵی غـەیری جوولەکەیان بۆ حەلاڵە ... ﴿ ومن أهل الكتاب من ان تأمنه بقنطار يؤديه اليك ، ومنهم من ان تأمنه بدينار لايؤديه اليك الا ما دمت عليه قائماً ، ذلك بأنهم قالوا ليس علينا في الاميين سبيل ، ويقولون على الله الكذب وهم يعلمون ﴾ ال عمران : ٧٥ واتە: لەخاوەن نامەکاندا هی وا هەیە ئەگەر خەزنەیەك بەسپاردە دابنێیت لای دەتداتەوە ، وەهی واش هەیە ئەگەر دینارێکی لادابنێیت ناتداتەوە مەگەر بە سەر سەریەوە بوەستیت ، ئەم ناپاکی یە بەهۆی

ئەوەویە کەدەیان ووت: گوناهمان ناگات لەخواردنی ماڵی ئەم نەخوێندەوار و نەفامانە (کەعەرەبن ) ، وە درۆ بەدەم خواوە دەکەن ، وە دەزانن کە تەورات فەرمانی وای تیا نیە وهەڵی دەبەستن .

**پەروەردەکردن لەسەر دەست پاکی و ئەمینی :**

بێجگە لەچەندەها ئایەت و فەرموودە کە موسڵمانانی هان دەدا و پەروەردەی دەکردن لەسەر دەست پاکی و پاراستنی ئەمانەت ، حەزرەت ﷺ چیرۆکی دەست پاکی بۆ هاوەڵان دەگێرایەوە ، لەبەر ئەوەی کە چیرۆك و بەسەرهات کاریگەرییەکی زۆریان هەیە لەسەر دڵ و دەروون .

حەزرەت ﷺ رۆژێك نموونەی ئەو سێکەسەی بۆ گێرانەوە کە دەچنە ئەشکەوتێك و تاشەبەردێکی گەورە دەکەوێتە خوارەوە و دەمی ئەشکەوتەکە دەگرێت ، هەریەکەیان دەکەوێتە پاڕانەوە بەکردارێکی باش کە کردوویەتی ... یەکەمیان باسی چاکەی خۆی دەکات لەگەڵ دایك و باوکی و داوادەکات کە خوا لەبەر ئەو چاکەیە رزگاریان بکات بەوەش تۆزێك دەمی دەرگاکە دەکرێتەوە ... دووەمیان باس لەداوێن پاکی‌یەکەی دەکات ، کە چۆن خۆی گێڕاوەتەوە لەترسی خوا لەداوێن پیسی لەگەڵ ئامۆزاکەی‌دا و لەخوا دەپاڕێتەوە کەلەبەر ئەو خۆگری و لەخواترسانە رزگاریان بکات ، دەرگاکە تۆزێکی‌تر دەکرێتەوە ... پاشان سێ‌یەمیان باس لەئەمانەت و دەستپاکی دەکات و دەڵێت : خوای گەورە من کرێکارێك کاری کرد لەلام و پارەکەی وەرنەگرت و رۆی ، منیش بۆم دا بەمەڕ و ماڵات و بۆم بەخێوکرد ، کە پاش چەند ساڵێك هاتەوە داوای هەقەکەی کردەوە ، هەموو ئەو مەڕ و ماڵاتەم پێ‌دا کەزیادیان کردبوو ، تەنانەت کابرا بڕوای نەدەکرد ... خوایە لەبەر ئەوکارە چاکە رزگارمان بکە، خوای گەورەش رزگاری کردن و، بەردەکە لەدەمی ئەشکەوتەکە ترازا و لاچوو ...

**بوارەکانی ئەمانەت :**

قورئان و سوننەت بەم جۆرەی خوارەوە بوارەکانی ئەمانەتیان دیاری کردووە و جەخت دەکەنە سەری :

**یەکەم :** هەریەك لەئەندامەکانی لەش ئەمانەتن ، بۆیە دەبێت مافی هەریەکەیان بدرێت و لەکاری خێروچاکەشدا بەکاربهێنرێت ...قورئان دەفەرموێ :﴿ان السمع و البصر و الفؤاد

كل اولئك كان عنه مسؤولا ﴾ ..هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ( ان لجسدك عليك حقا ...) .

جا ئەگەر ئەو ئەندامانە بەپێچەوانەوە لەکاری نابەجێ و بێ فەرمانی خوادا بەکارهاتن ، ئەوا خیانەتە لەئەمانەت و خوای گەورەش ئاگای لێیەتی و لێی دەپرسێتەوە ، قورئان دەفەرموێت : ﴿ يعلم خائنة الاعين وماتخفي الصدور ﴾ غافر : ١٦ واتە:خوا ئاگاداری خیانەتی چاوە و ئەزانێت چی لەدڵ و دەروون و سینەدا شاراوەتەوە ...

دووەم: ئەنەس ( رەزای خوای لێبێت )دەڵێت کەمجار بووە پێغەمبەر ﷺ وتارمان بۆ بدات و نەفەرموێت (لا ايمان لمن لا أمانة له ، ولا دين لمن لاعهد له ) ئیمام ئەحمەد/ واتە بڕوای نیە ئەوکەسەی ئەمین نەبێت ، وە ئاینی نییە ئەو کەسەی عەهد و پەیمان نەپارێزێ ...

ئەوانەش کە ئەمانەت و عەهد و پەیمان دەپارێزن لەبڕواداره سەرفرازەکانن ﴿ قد أفلح المؤمنون ، الذين هم في صلاتهم خاشعون ... تا دەگاتە ... والذين هم لاماناتهم وعهدهم راعون ﴾ المؤمنون .

سێیەم : ئافرەتان ئەمانەتێکی خوایین لای پیاوان ، پێغەمبەر ﷺ لەوتاری ماڵئاواییدا ئامۆژگاری پیاوانی کرد کەباش بن لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا و فەرمووی ( فاتقوا الله في النساء ، فانكم أخذتموهم بامانة الله ، واستحللتم فروجهن بكلمة الله ) مسلم / واتە : لەخوابترسن لەمەسەلەی ژنەکانتانا ، ئێوە وەك ئەمانەتێك خواستوتانن ، وە بەفەرمانی خوا بۆتان حەڵاڵ بوون .

چوارەم: پێغەمبەر ﷺ خیانەت کردن لە ئەمانەتی داناوە بەیەکێك لەنیشانەکانی دووڕوویی ( اية المنافق ثلاث اذا حدث كذب ، واذا وعد أخلف واذا اؤتمن خان ، وان صام وصلى وزعم أنه مسلم ) مسلم گێڕاویەتیەوە .

پێنجەم : پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە خیانەت بکرێ بەرامبەر کەسێك کە خیانەتی کردووە ( ادّ الامانة الى من ائتمنك ولا تخن من خانك ) ترمذي واتە : راسپاردە بدەنەوە بەوەی کەلای داناون و ناپاکی مەکەن لەگەڵ ئەو کەسەدا کە ناپاکیتان لەگەڵدا دەکات .

قورئانیش دەفەرموێت ﴿ ان الله يامركم أن تؤدوا الامانات الى أهلها ، واذا حكمتم بين الناس أن تحكموا بالعدل ، ان الله نعما يعظكم به ان الله كان سميعاً بصيراً ﴾ النساء : ٥٨ / واتە : خوا فەرمانتان پێئەدات کە ئەمانەت بدەنەوە بەخاوەنەکانی وە ئەگەر بوونە

دادوەر لەنێوان خەڵکیدا بەعەدالەت دادوەری بکەن ، بەڕاستی پەروەردگار ئامۆژگاری چاکتان دەکات و بەڕاستی پەروەردگار بیسەر و زانایە .

پێغەمبەر ﷺ کاتێ کۆچیکرد بۆ مەدینە حەزرەتی عەلی دانا لەجێگای خۆیدا بۆ ئەوەی ئەو راسپاردانەی لەلای بوون بیداتەوە بەخاوەنەکانی ، ئاشکراشە کەخەڵکی مەککە چی خراپ بوو کردیان بەرامبەر بەحەزرەت ﷺ و موسڵمانان ، بەڵام ئەم ناپاکی و خراپانە وای لەحەزرەت ﷺ نەکرد دەست بگرێ بەسەر ئەو شتانەدا کەبەئەمانەت لەلای دانرابوون ...

**شەشەم:** کاربەدەستێتی ئەمانەتە ، بۆیە کاتێك (ئەبوذر) داوای کاربەدەستێتی کرد ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو : ( ئەبوذر تۆ لاوازیت ، ئەمەش ئەمانەتە ، وە لەقیامەتیشدا سەر شۆڕی و پەشیمانییە ، مەگەر کەسێك بەهەق وەری بگرێت و هەقی خۆیشی بداتێ بە چاکی) مسلم .

ئەمە لەکاتێکدا کە ئەبوذر بەشایەتی حەزرەت ﷺ زۆر پارێزکار و راستگۆ بووە ، بەڵام دیارە کاربەدەستێتی لێهاتوویی و توانای تایبەتی دەوێت ، بۆیە شیاوترین کەس بۆ پۆستێك ئەوەیە کە لەگەڵ پارێزکارییەکەیدا پسپۆڕ و شارەزابێت لەوکارەدا کە پێی دەسپێردرێت تا کارەکە بەدەستیەوە نەمرێت و موسڵمانان تووشی زیان نەبن .

**حەوتەم:** هەڵبژاردن (دەنگدان) ئەمانەتە ، ئەگەر کەسێك یەکێك هەڵبژێرێت بۆ فەرمانداری و لەوباشتر هەبێت و شیاوتربێت بۆ ئەوکارە ، ئەوەخیانەتی کردووە ، حەزرەت ﷺ دەفەرموێت ﴿من استعمل رجلاً على عصابة وفيهم من هو ارضى لله منه فقد خان الله ورسوله والمؤمنين﴾ حاكم .

ڕۆژێك عومەری کوڕی خەتتاب بەهاوەڵەکانی وت( هەرکەس ئاواتی چی‌یە با بیلێ) ، یەکێکیان وتی : خۆزگە پڕ بەم ژوورە ئاڵتوونم هەبوایە و لەڕێی خوادا بم بەخشیایە ، ئەوانی تریش هەریەکە و شتێکیان وت ...

عومەریش وتی : منیش ئاواتەخوازم کەپڕ بەم ژوورە پیاوی وەك ئەبو عوبەیدەم هەبوایە و کارم پێ بسپاردایە ...

لەوتەیەکی تردا عومەر دەڵێ ( من ولي من أمر المسلمين شيئاً ، فولى رجلاً لمودة أو قرابة بينهما ، فقد خان الله ورسوله والمسلمين ) واتە : کێ ببێتە کار بەدەستی

موسڵمانان و پاشان کەسێك دابمەزرێنێ لەبەر خۆشەویستی یان خزمایەتی، ئەوە خیانەتی لەخواو پێغەمبەر و موسڵمانان کردووە ...

جاری وا هەبوو حەزرەتی عومەر کەسێکی بۆماوەی ساڵێك دەخستە ژێر چاودێرییەوە ، ئنجا ئەگەر دڵنیابوایە لەباشی‌یەکەی ، کاری پی‌دەسپارد ...

حوزەیفەی کوری یەمان تاقەکەس بوو کەحەزرەت ﷺ ناوی دووڕووەکانی پی‌وتبوو ، بۆیە عومەر دەوروخولی‌دەدا و تکای لی‌دەکرد کە ئاگاداری بکات لەوەی کە دووڕوو لەناو کاربەدەستەکانی‌دا هەبێ ... ئەویش دەیووت خۆت بگەرێ و لی‌یان بکۆڵەرەوە ... عومەریش زۆر دەگەڕاو چاودێری دەکردن ئەگەر هەر ئەوەندە گومانی بکردایە لەکەسێك زوو لای دەبرد و لەکاری دەخست .

ئاشکرایە کار بەدەستی خراپ بەڵایەکی گەورەیە بۆ موسڵمانان ، بۆیە حەزرەت ﷺ دەفەرموێت : (اذا ضُيعت الامانة فانتظر الساعة ) ، ئەگەر ئەمانەت زایەکرا چاوەڕی‌ی هاتنی قیامەت بن ، وترا : چۆن ئەمانەت نامێنێ وزایە دەکرێت ؟ فەرمووی : ( اذا اسند الامر الى غير اهله فانتظر الساعة ) واتە : ئەگەر کاروبار درایە دەست کەسانی لی‌نەهاتوو ، وەهیچ لەبارا نەبوو ، ئەوا چاوەڕێ هاتنی قیامەت بن ...

**هەشتەم :** درکاندنی نهێنی خەڵکی ناپاکی‌یە ، حەزرەت ﷺ دەفەرموێت :

(اذا حدث الرجل ثم التفت فهي أمانة) ترمذي ، واتە : ئەگەر کەسێك قسەیەکی لاکردیت و حەزی نەکرد بەکەس بڵێی ئەوە ئەمانەتە لەلات . مەگەر لەچەند حاڵەتێکدا نەبێت ، حەزرەت ﷺ دەفەرموێت : ( المجالس بالامانة الا ثلاثة مجالس: سفك دم حرام ، أو فرج حرام ، أو اقتطاع مال بغير حق ) ئەبوداود ، واتە : قسەی مەجلیس ئەمانەتە مەگەر سی‌مەجلیس نەبێت ، کۆڕو مەجلیسێك کەخوێنێکی ناهەقی تیا ڕێژرابێت ، یان زینای تیاکرابێت ، یان ماڵێکی بەناهەق تیا خورابێت...واتە لەوشوێنانەدا ئەگەر کەسێك ئامادەبوو وەداوای شایەتی لی‌کرا ، پێویستە هەق بڵێ وهیچ نەشاریتەوە .

**نۆیەم:** حەزرەت ﷺ لەکاتی بەڕێکردنی کەسێك یان سووپایەکدا دەیفەرموو : (استودع الله دينك ، وامانتك وخواتيم عملك) ترمذي ، واتە : ئاین و ئەمانەت و خاتیمەی کردەوەتان ئەدەمە دەست ئەو خوایەی کەسپاردەزایەناکات ...

**دەیەم:** دەست پاکی و پاراستنی ئەمانەت پاداشتی گەورەی هەیە ، حەزرەت ﷺ دەفەرموێت (ان الخازن المسلم الامين الذي يعطي ما أُمِرَ به فيعطيه كاملاً موفراً ، طيبة

به نفسه فهو أحد المتصدقين) بوخاری و مسلم . واته : ئەو موسڵمانەی سەرپەرشتیاری خەزێنەی کەسێك بێت و دەست پاك بێت و ، وە ئەوەی پێی دەوترێت کەبیبەخشێت ، بەبێزیاد و کەم و بەدڵخۆشی‌یەوە بیبەخشێت و بیداتە دەست ئەوانەی کە بۆی دیاری‌کراون ، ئەوا ئەویش وەك خاوەن ماڵەکە پاداشتی بۆ دەنووسرێت ...

واته ئەوەی هۆکارێکی باش بێت و ئەمین بێت لەگەیاندنی خێرێکدا بەکەسێك وەك خاوەن خێرەکە پاداشت وەردەگرێت...

# پارێزکاری

(عومەری کوڕی خەتتاب) ڕەزای خوای لەسەربێت پرسیاری لە(ئوبەی کوڕی کەعب)کرد، تەقواچی‌یە ؟ ئەویش وتی: ئایا بەڕێگایەکی دڕکاویدا نەڕۆیشتوویت ؟ عومەر وتی: بەڵێ ، وتی : چیت کرد ؟ عومەر وتی: خۆم گورج کردەوە و ورد ورد بەوریای ڕۆیشتم ، کەعب وتی : دە ئەوە تەقوایە ...

قورئانی پیرۆز باسێکی زۆری پارێزکاری دەکات بۆ ئەوەی موسڵمانان پەروەردە بکات لەسەر پارێزکاری لەگوناهو هەموو ئەوشتانەی کەخوا پێی ناخۆشە...

**پلەوپایە و گرنگی تەقوا :**

(١) خوای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿ولقد وصينا الذين اوتوا الكتاب من قبلكم واياكم أن اتقوا الله﴾ النساء : ١٣١ / واته : بەڕاستی ئێمە ئامۆژگاری ئەوانەمان کردووە کە پەیامیان بۆ هاتبوو لەپێش ئێوەدا ، وە ئامۆژگاری ئێوەشمان کردووە کە لەخوابترسن و پارێزکاربن ...کەواتە پارێزکاری لەهەموو گەلانی پێشین داوا کراوە هەروەك قورئان لەچەندەها ئایەتدا ئاماژەی بۆ دەکات :

- ﴿واذ نادى ربك موسى أن ائت القوم الظالمين قوم فرعون ألا يتقون﴾ الشعراء١٠
- ﴿اذ قال لهذ قال لهم أخوهم نوح الا تتقون﴾ الشعراء : ١٠٥
- ﴿اذ قال لهذ قال لهم أخوهم هود الا تتقون﴾ الشعراء : ١٢٣
- ﴿ اذ قال لهم أخوهم لوط ألا تتقون﴾ الشعراء : ١٦٠
- ﴿ اذ قال لهم أخوهم شعيب الا تتقون﴾ الشعراء : ١٧٦
- ﴿وان الياس لمن المرسلين ، اذ قال لقومه الا تتقون﴾ **الصافات** : ١٢٣
- ﴿كذبت ثمود المرسلين اذ قال لهم أخوهم صالح الا تتقون﴾ الشعراء : ١٤٢

٭ حەزرەتی عیساش فەرموویەتی﴿ وجئتكم باية من ربكم فاتقوا الله واطيعون ﴾ ال عمران : ٥٠

٭ قورئان لەسەر زمانی حەزرەتیش ٭ دەفەرموێت ﴿ يا ايها الذين امنوا اتقوا الله حق تقاته ولا تموتن الا وأنتم مسلمون﴾ ال عمران : ١٠٣ .

(٢) خوای پەروەردگار پارێزکاری کردۆتە پێوەری دوور و نزیکی بەندەکانی لەخۆیەوە ﴿ان اكرمكم عند الله أتقاكم ﴾ الحجرات : ١٣ واتە چاکترینتان و بەرێزترینتان لای خوا ئەوکەسەیە کە پارێزکاری زیاترە ..

(٣) باشترین توێشوو لەدنیادا کەهەوڵی بۆ بدرێت و بەدەست بهێنرێت بۆ قیامەت پارێزکاری‌یە ﴿ وتزودوا فان خير الزاد التقوى﴾ البقره : ١٩٧ .

واتە : توێشوو بخەن ، چاکترین توێشوو تەقوایە ..

(٤) چاکترین بەرگ پارێزکاری‌یە ، کە مرۆڤی پیٚجوان بێت و داپپۆشێت ﴿ يا بني ادم قد انزلنا اليكم لباسا يواري سواتكم وريشا ولباس التقوى ذلك خير ﴾ الاعراف : ٢٦ واتە : ئەی نەوەی ئادەم لەئاسمانەوە بەرگێکمان بۆ ناردوون کە بیپۆشن و عەورەتتانی پیٚداپۆشن و جوانتان بکات ، وە بەرگی پارێزکاریش چاکترە..

(٥) کردەوەی پارێزکاران وەردەگیرێت ﴿ انما يتقبل الله من المتقين﴾المائده:٢٧

(٦) خۆشەویستانی خوا ئەوانەن کە پارێزکارن ﴿ ان الله يحب المتقين ﴾ التوبه : ٧ .

﴿ الا ان اولياء الله لاخوف عليهم ولاهم يحزنون ، الذين امنوا وكانوا يتقون ﴾ التوبە : ٦٣ / واتە : خۆشەویستان و دۆستانی خوا ناترسن و دڵتەنگ نابن لەدنیاو ئاخیرەتدا ، ئەوکەسانەی کە بڕوادار و پارێزکارن.

(٧) قورئان بیرخەرەوە و ڕێنمایی‌یە بۆ پارێزکاران ﴿ وانه لتذكرة للمتقين ﴾ الحاقة ٤٨ ، ﴿ ذلك الكتاب لاريب فيه هدى للمتقين ﴾ البقرة : ٢

(٨) پارێزکاران لەفێڵی شەیتان ڕزگاریان دەبێت ﴿ ان الذين اتقوا اذا مسهم طائف من الشيطان تذكروا فاذا هم مبصرون﴾ الاعراف : ٢٠١ ، بەراستی ئەوانەی کەپارێزکارن ، هەرکاتێك خەیاڵێك لەلایەنی شەیتانەوە بۆیان بێت و پاڵیان پێوەبنیٚ بەرە و هەواو ئارەزوو ، گورج خوای پەروەردگاریان بیر دەکەوێتەوە و پەنای پیٚدەگرن و خواش بەرچاو ڕوونیان دەکات و هۆشیاریان دەکاتەوە و نایەڵیٚ شەیتان لەخشتەیان بەرێت .

(٩) هەموو بیناکردنێك لەسەر غەیری پارێزکاری دەڕوخێت و خاوەنەکەشی دەخرێتە دۆزەخەوە و سزای سەخت ئەدرێت ﴿ افمن أسس بنيانه على تقوى من الله ورضوان خير ام من اسس بنيانه على شفا جرف هـار فانـهار بـه فـي نـار جـهنم ؟ والله لايـهدي القـوم الظالمين ﴾ التوبة : ١٠٩ ، واتە : ئایا کەسێك ئاینی خۆی دامەزراندبێت لەسەر تەقوا و ترس لەخوا ، وەکو یەکێك وایە کەبینای خۆی دانابێت لەسەر کەنارێکی وا ئاوی لافاو دڕیبیتیٚ ونزیك بێت ها ئێستا یا تاوێکیتر بڕوخێت بەوکەسەوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ ؟!

(١٠) سەرکەوتن و یارمەتی خوا و پاشە ڕۆژ بۆ پارێزکارانە ، ﴿ واعلمـوا ان الله مـع المتقين ﴾ التوبة / ٣٦ ﴿ والعاقبة للمتقين ﴾ الاعراف : ٢٨ .

(١١) ڕۆزی چاك و دەرچوون لەهەموو تەنگ و چەڵەمەیەك بەستراوە بەپارێزکاریەوە ، ﴿ومن يتقي الله يجعـل لـه مخرجـا ويرزقـه من حيـث لايحتسـب ﴾ الطـلاق : ٢ واتە : هەرکەسێك لەخوا بترسێت و پارێزکاربێت ، خوا سەرفرازی دەکات و ڕۆزی بۆ دەنێرێت لەلایەکەوە کە گومانی بۆی نەچێت و بەتەمای نەبووبێت ...

ئەمـەش بـۆ ئـەوەی کـەباش بزانـیٚ خـوای گـەورە بەفـەزڵی خـۆی لەپاداشـتی پارێزکاری‌یەکەی‌دا بۆی ناردووە و زیاتر گەرمبیٚ لەسـەر پارێزکاری‌یەکەی و سوپاسی خوای لەسەر بکات .

(١٢) پارێزکاران هەق و ناهەق لەیەك جیادەکەنەوە و بەرچاویان ڕوونە : ﴿ يـا ايـها الذين امنوا ان تتقوا الله يجعل لكم فرقاناً ويكفر عنكم سيئاتكم ويغفر لكم والله ذو الفضـل العظيم ﴾ الانفال : ٢٩ / واتە : ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە ئەگەر خۆتان بپارێزن لەگوناهو لەخوا بترسن ، خوا ڕووناکی‌یەکی وا دەخاتە دڵتانەوە کە هـەق و ناهـەق لەیـەك جیابکەنەوە و گوناهەکانیشتان دادەپۆشیٚ ولێتان خۆش ئەبێت، وە خوا خاوەن فەزلٚ و چاکەیەکی گەورەیە .

(١٣) چاك بوونی ئیش بۆ پارێزکارانە ﴿ يا ايها الذين امنوا اتقوا الله وقولوا قولاً سديداً ، يُصلح لكم أعمالكم ويغفر لكم ذنوبكم ، ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فـوزاً عظيمـاً ﴾ الاحزاب : ٧١ / واتە : ئەی ئەوکەسانەی بڕواتان هێناوە لەخوابترسن و قسـەیەك بکـەن کەڕاست و تەواوبێت ، خوا کردەوەکانتان بۆ باش دەکات و لەگوناهەکانتان خۆش دەبێت ، کیٚ گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی بێت سەرکەوتووە بە سەرکەوتنێکی گەورە و باش لەدنیاو قیامەتدا ..

**هەروەها خوای گەورە کاریان بۆ ئاسان دەکات** ﴿ ومن يتق الله يجعل له من أمره يسراً ﴾ الطلاق : ٤ .

(١٤) **لەرۆژی قیامەتدا پارێزکاران پلەوپایەیەکی بەرزیان هەیە و ، لەچەند بەهەشت و سەرچاوەیەکدا ئەوەی پەروەردگاریان پێیداون وەری دەگرن** ، ﴿ ان المتقين في جنات وعيون ، اخذين ما اتاهم ربهم ، انهم كانوا قبل ذلك محسنين ﴾ الذاريات : ١٦ .

## پێناسەکانی تەقوا :

**پێناسەی یەکەم / بسم الله الرحمن الرحيم** ﴿ الم ، ذلك الكتاب لاريب فيه هدى للمتقين ، الذين يؤمنون بالغيب ويقيمون الصلاة ، ومما رزقناهم ينفقون والذين يؤمنون بما أنزل اليك وما انزل من قبلك وبالاخرة هم يوقنون ، اولئك على هدى من ربهم واولئك هم المفلحون ﴾ البقرة : ٢

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ، ئەلف لام میم ، ئەم قورئانە هیچ گومانێکی تیا نیە ، رێپیشاندەری پارێزکارانە ئەوانەی :**

**ا ـ بڕوا دەهێنن بەشتی نادیار . ب ـ نوێژ دەکەن .**

**ج ـ لەوەی کە کردوومانە بە رۆزییان بەختی دەکەن .**

**د ـ بڕوایان هەیە بەو بەرنامەیەی کە بۆ تۆ نێرراوە و بەو بەرنامانەی کە پێش تۆ نێرراون .**

**هـ ـ بڕوایان هەیە بە رۆژی دوایی ... ئەوانە لەسەر ڕێی راستن لە لایەن پەروەردگاریانەوە ،وە هەر ئەوانن سەرفراز .**

**پێناسەی دووەم /** ﴿ ليس البر أن تولوا وجوهكم قِبَلَ المشرق والمغرب ولكن البر من امن بالله واليوم الاخر والملائكة والكتاب والنبيين ، واتى المال على حبه ذوي القربى واليتامى والمساكين وابن السبيل والسائلين وفي الرقاب ,واقام الصلاة واتى الزكاة والموفون بعهدهم اذا عاهدوا ، والصابرين في البأساء والضراءوحين البأس ، اولئك الذين صدقوا واولئك هم المتقون ﴾ البقرة : ١٧٧ **واتە : چاکە ئەوەنییە کە ڕووبکەنە رۆژهەلاٌت و رۆژئاوا ، بەڵکو چاکە ، چاکەی کەسێکە کە :**

**ا ـ بڕوای ببێت بەخوا ، بەرۆژی دوایی ، بەفریشتە ، بەنامە ئاسمانییەکان بەپێغەمبەران .**

**ب ـ دارایی خۆی ببەخشێت ، لەگەڵ ئەوەشدا کە خۆشی دەوێت ، بەخزمان و هەتیوان و بێنەوایان و ڕێبواران و سواڵکەران، ولەڕێی ئازادکردنی کۆیلەدا ...**

ج ـ نوێژ بکات و زەکات بدات .

د ـ پەیمان بەجێ دەهێنن کاتێك پەیمان ئەدەن .

هـ خۆڕاگرن لەکاتی نەبوونی و ناخۆشی و جەنگدا ، ئەوانەن کە ڕاستیان کردووە و هەر ئەوانەن کە پارێزکارن .

**پێناسەی سێیەم /**

ئایەتی ﴿ قل اؤنبئكم بخير من ذلكم للذين اتقوا عند ربهم جنـات تجري من تحتها الانهار خالدين فيها ابداً ، وازواج مطهرة ورضوان من الله والله بصـير بالعبـاد ، الذين يقولون : ربنا امنا فاغفر لنا ذنوبنا وقنا عـذاب النـار ، الصـابرين والصـادقين والقـانتين والمنفقين والمستغفرين بالاسحار ﴾ ال عمران : ١٧

بەدوای ئایەتی ﴿ زُين للناس حب الشهوات من النساء والبنين والقناطير المقنطرة من الذهب والفضة والخيل المسومة والانعام والحرث، ذلك متاع الحياة الدنيا والله عنده حسن الماب ﴾ ال عمران : ١٤ هاتە خوارەوە ، کە دەفەرموێ : ڕازێنراوەتەوە و جوان کراوە لەدەروونی خەڵکیدا ئارەزووی ئافرەت و بوونی نەوەی نێرینە و خاوەنێتی ئاڵتون و زیووی زۆر و زەبەندە و ئەسپی چاك و ڕەسەن و(هۆکانی هاتو چۆ ) هەروەها ماڵات و زەوی و زاری کشتوکاڵ ، ئەوانە هەمووی نازونیعمەتی ژیانی دنیان، خواش بۆ چاکان شوێنی گەڕانەوەی ڕازاوە و خۆشی لای خۆی ئامادەکردووە کە بەهەشتە .

ڕازاندنەوەی ئەوشتانە بۆ ئەوەیە لەڕێی حەڵاڵەوە بەدەستبهێنرێن و ژیان بەردەوام بێت ... عومەری کوڕی خەتتاب کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە فەرمووی : (الان وقد زينت لنا يارب ) ... پەروەردگارا ئەوشتانەت بۆ ڕازاندوینەتەوە...(چارەمان چییە ؟! ) خوای پەروەردگاریشی ئایەتی بەدوادا ناردەخوارەوە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەسەلەکە و فەرمووی : ﴿ قل : اؤنبئكم بخير من ذلكم ... هتد ﴾ واتە : ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ : ئایا هەواڵی چاکتر لەو ناز و نیعمەتەتان پێ ڕابگەیەنم ؟!

بۆ ئەوانەی پارێزکارن ، لای پەروەردگاریان باخەکانی بەهەشت ئامادەیە بۆیان کەچەندەها ڕووبار بەژێر دەرختەکانیدا و بەبەردەم کۆشکەکانیدا دەڕوات ، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوە لەگەڵ هاوسەرانی پاکیزەدا و بەدەم هەست کردنی بەردەوام بەرەزامەندیی پەروەردگاری ئازیز ، بێگومان ئەوخوایە بینایە بەبەندەکانی ...( ئنجا قورئان باسی پارێزکاران دەکات) .

ا ـ ئەوانەی دەڵێن پەروەدگارا بەراستی ئێمە باوەڕمان هێناوە ، دەلەگوناهەکانمان خۆش ببە و لەئاگری دۆزەخ بمانپارێزە.

ب . ئەو پارێزکارانە خۆڕاگرن و ، راستگۆ و خواپەرستن و ، ماڵ و سامان دەبەخشن و لەبەرەبەیانەکاندا داوای لێخۆشبوون دەکەن .

**پێناسەی چوارەم/**

﴿ وسارعوا الى مغفرة من ربكم وجنة عرضها السماوات والارض اعدت للمتقين : الذين ينفقون في السراء والضراء والكاظمين الغيظ والعافين عن الناس والله يحب المحسنين ، والذين اذا فعلوا فاحشة أو ظلموا أنفسهم ذكروا الله فاستغفروا لذنوبهم ومن يغفر الذنوب الا الله ولم يُصيروا على مافعلوا وهم يعلمون ، اولئك جزاؤهم مغفرة من ربهم وجنات تجري من تحتها الانهار خالدين فيها ونعم أجر العاملين ﴾ ال عمران:١٣٣

واتە : بەپەلەبن و پێشبڕكێ بكەن تا دەگەنە لێخۆشبوونی پەروەردگارتان و بەهەشتێك كەپانیەكەی بەهێندەی ئاسمانەكان و زەوی‌یە و ئامادەكراوە بۆ پارێزكاران ...( سیفاتەكانی پارێزكارانیش ) .

ا ـ ئەوانەی لەخۆشی و ناخۆشی‌دا ، لەهەرزانی و گرانی‌دا ماڵی خۆیان دەبەخشن و ، رق و كینەی خۆیان دەخۆنەوە و خۆگرن و ، لەخەڵكی خۆش دەبن و لێبوردەن و ، خوای میهرەبانیش چاكەكار و چاكەخوازانی خۆش دەوێت .

ب ـ ئەوانەش كە تاوان و گوناهێكیان ئەنجام دا ، یان ستەمیان لەخۆیان كرد ، خوا دێتەوە یادیان و داوای لێخۆش بوون دەكەن ، چاكێ هەیە كەلە گوناهان خۆش ببێت جگە لەخوا ؟! هەروەها لەسەر گوناهو تاوانیان بەردەوام نابن ، لەكاتێكدا دەزانن ئەوە تاوانە ...

ئەوانە پاداشتیان لێخۆشبوون و لێبووردنە لەلایەن پەروەردگاریانەوە لەگەڵ باخەكانی بەهەشتدا كەچەندان رووبار بەژێر درەخت و بەبەردەم كۆشكەكانیاندا دەڕوات و ژیانی هەمیشەیی تیایدا دەبەنە سەر ، ئەم بەهرەیە پاداشتێكی زۆر چاكی كۆششكارانە (كەهەوڵی بەدەستهێنانی رەزامەندی پەروەردگاریانە) .

**پێناسەی پێنجەم /**

﴿ ولقد اتينا موسى وهارون الفرقان وضياء وذكرى للمتقين ، الذين يخشون ربهم بالغيب ، وهم من الساعة مشفقون ﴾ الانبياء : ٤٨

ئەم پێناسەیە دوو سیفەتی پارێزكاران باس دەكات :

**ا ـ ئەوپارێزکارانە لەخوا دەترسن هەر بەغەیب و بەبێ ئەوەی بیبینن .**

**ب ـ هەروەها لەرۆژی دوایی دەترسن .**

**پێناسەی شەشەم /**

﴿ ان المتقين في جنات وعيون اخذين ما اتاهم ربهم ، انهم كانوا قبل ذلك محسنين ، كانوا قليلا من الليل مايهجعون ، وبالاسحار هم يستغفرون وفي اموالهم حق معلوم للسائل والمحروم ﴾ الذاريات : ١٦

**سیفاتەکانی پارێزکارانیش لەم پێناسەیەدا :**

**ا . چاکەکاران ﴿ شەرم دەکەن لەخواو دەزانن کە خوا چاودێرە بەسەریانەوە .**

**ب ـ شەو خەریکی شەونوێژن و کەم دەخەون .**

**ج ـ لەبەرەبەیاندا داوای لێخۆشبوون دەکەن لەخوا .**

**د ـ لەماڵ و سامانیان بەشی هەژار و بێنەوایان دەدەن .**

**پێناسەی حەوتەم /**

﴿ ان الذين اتقوا اذا مسهم طائف من الشيطان تذكروا فاذا هم مبصرون ﴾ الاعراف : ٢٠١ **واتە : ئەوانەی کەپارێزکارن ئەگەر خەیاڵێك لەشەیتانەوە لێیان بدات و پاڵیان پێوەبنێت بۆ هەواو ئارەزوو ، گورج بیرلە خوای پەروەردگار دەکەنەوە و پەنای پێ دەگرن ، خواش زوو حاڵیان چاك دەکات و بەرچاو رۆشنیان دەکات .**

**ئەم حەوت پێناسەیە زۆربەی سیفاتەکانی پارێزکارانی تیاباسکراوە هەتاوەکو بڕوادار چاویان لێبکات و هەوڵ بدات بگاتە ئەو پلە و پایە بەرزە .**

## **رێگاکانی گەیشتن بە پارێزکاری :**

**رێگای یەکەم :**

﴿ وكذلك انزلناه قرانا عربيا وصرفنا فيه من الوعيد لعلهم يتقون ، أو يُحدث لهم ذكرا ﴾ طه : ١١٣ **واتە:ئابەو شێوەیە ئێمە قورئانێکی عەرەبی و پاراوو رەوانمان دابەزاندووە و جۆرەها هەڕەشەمان تیادا باس کردووە ، بۆ ئەوەی لەخوابترسن ، یاخود ببێتە هۆی ئەوەی کە یاداوەریان تێدا بەدی بهێنێت .**

﴿ وان هذا صراطي مستقيما فاتبعوه ولاتتبعوا السبل فتفرق بكم عن سبيله ذلكم وصاكم به لعلكم تتقون ﴾ الانعام : ١٥٣ **واتە : ئەمانەی کەلەقورئانداییە رێگای راستی منن ، ئێوە پەیڕەویان بکەن و ، مەکەونە شوێنی هەواو ئارەزوو رێبازیتر ، چونکە ئێوە**

دوور دەخاتەوە لەرێگای راستی خوا ، ئەم ئامۆژگاریانەمان کردوون ، بەڵکو خۆتان بپارێزن لەگوناهو سزای خوا...

کەواتە خوێندنەوەی قورئان و تێگەیشتنی و پەیڕەوی کردنی دەبێتە هۆی دروست بوونی (تەقوا) پارێزکاری .

**رێگای دووهەم :**

﴿ والذين اهتدوا زادهم هدى واتاهم تقواهم ﴾ محمد : ١٧/ واتە : ئەوکەسانەی کەشارەزای هەق بوون و رێبازی هیدایەت و ئیمانیان گرتۆتەبەر ، خوای گەورە رێنمایی و هیدایەتی بۆ زیادکردن و پارێزکاری پێبەخشین .

مرۆڤ پاش ئەوەی قەناعەت بەم ئاینە دەکات و بڕوایەکی لا دروست دەبێت و ئنجا خەریکی ئیسلامەتی دەبێت ، قۆناغی‌تر دێت بەدوایی‌دا ... کە ئەویش زیاتر چەسپاندنی ئیمانە لەدڵدا و دوای ئەویش ڕۆیشتنە بەرە و پلەی (ئیحسان) واتە هەستکردنی بەچاودێری خوا و شەرم کردن لەنافەرمانی و سەرپێچی ، پاشان پلەی پارێزکاری و ئنجا پلەی سوپاسگوزاری ...هتد .

تێگەیشتن لەپلەکانی ئیمان مەسەلەیەکی زۆر گرنگە و لە(مدارج السالكين) ی (ئیبن قەییم)دا باسی زیاتر لەشەست پلەوپایەی ئیمانی کراوە کە هەق وایە باشتر لێیان شارەزابین ... چونکە ئاشکرایە کەسێك بۆ نموونە مانای خۆشەویستی نەزانێ چۆن دەتوانێ خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر و ئیسلام و موسڵمانان لەخۆی‌دا فەراهەم بهێنێت.

**رێگای سێهەم /**

﴿ يا ايها الذين امنوا كُتب عليكم الصيام كما كتب على الذين من قبلكم لعلكم تتقون ﴾ البقرة : ١٨٣ واتە : ئەی ئەوانەی کەبڕواتان هێناوە ڕۆژوتان لەسەر فەرزکراوە هەروەك چۆن لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە فەرزکرابوو ، بەڵکو ببێتە مایەی پارێزکاریتان ، کەواتە ڕۆژوو یەکێکە لەهۆکارە سەرەکی‌یەکانی گەیشتن بەپارێزکاری .

**رێگای چوارەم /**

﴿ يا ايها الناس اعبدوا ربكم الذي خلقكم والذين من قبلكم لعلكم تتقون ﴾ البقرة : ٢١ واتە : ئەی خەڵکینە ئەو خوایەی خۆتان بپەرستن کەئێوە و ئەوانەی پێش ئێوەی دروست کردووە بەڵکو بەو پەرستنە بگەنە پارێزکاری ، کەواتە خواپەرستی بەگشتی رێگایە بۆ گەیشتن بەپارێزکاری .

بەڵێ ... وەك پێشتر باسمانکرد پارێزکاریش یەکێکە لەپلـەکانی دینـداری و مـرۆڤ دەبات بەرەو پلەیەکی‌تر کە ئەویش پلەی سوپاسگوزاریە قورئان دەفەرموێت: ﴿ فـاتقوا الله لعلكـم تشـكرون ﴾ ال عمـران /١٢٣ کە ئەمـەش پلەیـەکی بـەرزە و رەنـج و هـەوڵ و ماندووبوونی دەوێ و کەسانێکی کەم پێی دەگەن ﴿وقليل من عبادي الشـكور﴾ السـبأ : ١٣ پێغەمبەر ﷺ بۆ گەیشتن بەم پلەیە ئەوەندە شەونوێژی کرد تا ئاوی پێی داهات ، جارێك هاوسەرێکی پێی وت: بۆچی ئـەوەندە خـۆت مـاندوو دەکـەیت لـەکاتێکدا خـوا لەگوناهی بەرو دوات خۆش بووە ، فەرمووی : ﴿ افلا أكون عبداً شكوراً ﴾ بوخاری .

## دامەزراوی

قورئان دەفەرموێت : ﴿ والو استقاموا على الطريقة لأسقيناهم ماء غدقاً لنفتنهم فيـه ، ومـن يُعـرض عـن ذكـر ربـه يسـلكه عذابـاً صـعـداً ﴾ الجـن : ١٦ واتـە : ئەگـەر دامەزراوبوونایە لەسەر رێی راست ، بارانی زۆر و بەسوودمان بەسەریاندا دەباراند، تا تاقیان بکەینەوە ، وە هەرکەسێك روو وەرگێڕێت لەیادی خوای خۆی دەیخاتە ناو سزای سەختەوە .سوفیانی کوڕی عبداللە پرسیاری لەحەزرەت ﷺ کرد و وتی: ( قل لـي فـي الاسلام قولاً لا أسال عنه احداً غيرك ، فقال : قل امنت بـالله ثـم اسـتقم ) مسـلم ، واتە : شتێکی وام پێبڵێ لەئیسلامدا کە ئیتر پێویست نەکات پرسیار لەکەسی‌تر بکەم ، ئەویش فەرمووی : بڵێ باوەڕم هێناوە و پاشان دامەزراوبە لەسەری .

قورئانی پیرۆز رێنمایی حەزرەت ﷺ و موسڵمانان دەکات و دەفەرموێ ﴿ فاسـتقم كمـا امرت ومن تاب معك ولا تطغوا انه بما تعملون بصير ، ولا تركنـوا الـى الذين ظلمـوا فتمسكم النار ومالكم من نـاصرين ﴾ هـود : ١١٣ واتە : ئەی(محمـد) ﷺ چۆن فـەرمانت پێدراوە ، هەروابەو بەراست و بەرێکی فەرمانەکان بەجێ بهێنە ، هەروەها ئەو کەسـانەش کەلەگـەڵ تـۆدان و گەڕاونەتـەوە بـۆ لای خـوا و تەوبـەیان کـردووە ، نەکــەن لەسـنووری فەرمانی خوا دەربچن ، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە بینایە بـەو کردەوانـەی کەدەیکـەن . نەکەن مەیلی دڵتان لەگەڵ ئەوانەدابێت کەستەمیان کردووە و لەخوا یاخی بوون ، چونکە ئەوکاتە ئاگر دەتانسوتێنێت ، کەسیش بێجگە لـەخوا پشتیوانتان نابێت ، لـەوەودواش یارمەتی نادرێن ...

ئیبن عەبباس دەڵێ : هیچ ئایەتێك ئەوەندەی ئەم ئایەتە قورسوگران نەبوو لەسەر حەزرەت ﷺ .

پرسیارکرا لەحەزرەت ﷺ کە بۆچی ئاوا زوو پیر بوویت ؟ لەوەڵاما فەرمووی : سوورەتی هود و دەستەخوشکانی پیریان کردم. کەمەبەستی ئەو ئایەتە و ئەو ئایەتانەیە کەباسی قیامەت دەکەن...

## پەروەردەی قورئانی

قورئانی پیرۆز چاودێربوو بەسەر هاوەڵانەوە ، پەیوەندی بەردەوام هەبوو لەنێوان ئاسمان و زەوی‌دا ، چی رووی‌دەدا زۆربەیان قورئان تیشکی دەخستنە سەر و روونی دەکردنەوە و ڕاستەوخۆ پەروەردەی دەکردن ...هافلاْن تۆ ئەم خەیاڵاتە هات بەدڵتا ، ئەی تۆ نەبوویت فلاْنە کارت کرد ، ئەوەش ڕاست و دروستی کارەکانتانە ... ئەی ئێوە پەیمان دەرانی ژێر درەختەکە خوا دەزانێت چی لەدڵتاندایە ... خوا لێتان خۆش بووە ...

هاوەڵان چەند بەختەوەر بوون ، چۆن لەخۆشیاباڵیان نەگرتووە ؟! چۆن لەخۆشیا شامەرگ نەبوون ؟ ئێمە ئێستا پاش نزیکەی ١٤٢٠ ساڵ ئەو ئایەتانە ئەخوێنین کەلەسەر ئەو خوا پێداوانە هاتوونەتە خوارێ ، سەرسام دەبین ، ئاواتیان پێ دەخوازین ... ئێمە دڵخۆش دەکەین بەئایەتێکی وەك ﴿ ان الله یدافع عن الذین امنوا﴾ الحج : ٣٨ خودا داکۆکی لەبڕواداران دەکات ، دەڵێین ئێمەش خۆمان بەبڕوادار دەزانین (ان شاء الله) ئێمەش دەگرێتەوە ! باشە ئەگەر ئەو ئایەتە لەسەر من یان تۆ بەتایبەت بهاتایەتە خوارێ ، چۆن دڵ بەرگەی دەگرێ ؟!

هاوەڵان باش لەم پەیوەندی‌یە ڕاستەوخۆیەی ئاسمان و زەوی و دابەزینی جوبرائیل تێگەیشتبوون ، بۆیە ڕۆژێك پاش وەفاتی حەزرەت ﷺ ئەبوبەکر و عومەر چوون بۆ سەردانی (ام ایمن) ، هەرکەچاوی بەمان کەوت زۆرگریا ، پێیان وت: بۆچی دەگریت ؟ مەگەر لای خوا باشتر نیە بۆ پێغەمبەر ﷺ ؟ ئەویش وتی : دەزانم لای خوا باشترە بۆی لەم دنیایە ، بەلاْم بۆ بچڕانی وەحی دەگریم لەئاسمانەوە ... ئەوانیش بەم قسەیەی کەوتنە گریان ! (ئیمامی موسلیم گێڕاویەیتەوە) .

## گرنگی‌دامەزراوی لەژیاندا :

لەژیاندا کۆسپ و تەگەرە و ڕێگر زۆرن ، وەك نەفس و شەیتان ... کەشەیتان هەمیشە لەرێی نەفسی (الامارة بالسوء) ەوە فەرمان دەدات بەخراپە ، مەگەر ئەوکەسە جڵەوی

نەفسی باش بگرێت و خوای گەورەش یارمەتی بدات و دەروونی پەروەردەبکات و ببێتە نەفسێکی لۆمەکار (النفس اللوامة) و لەسەر هەموو کاروکردەوەیەك لۆمەی خۆی بکات و بەخۆیدا بچێتەوە ...ئنجا زیاتر هەوڵ بدات و بەرەو نەفسی (المطمئنة) دڵنیاو ئارام بچێت

قورئان دەفەرموێت ﴿ ان النفس لأمارة بالسوء الا مارحم ربي ﴾ یوسف : ٥٣ شەیتان بەهەموو شێوەیەك هەوڵ و کۆشش دەکات بۆ فریودانی مرۆڤ ، هەر لەیەکەم ساتی لەدایك بوونیەوە سیخورمەی لێدەدات و خۆی پێدەناسێنێت و دەیخاتە گریان ، پاشان تا کۆتا هەناسەی ژیانی کۆڵی لێنادات ... پیاوچاکێك لەسەرەمەرگدا زۆر دەترسا لەخلیسکان و لادان ... پێیان ووت : بۆ ئەمەندە دەترسیت خۆ تۆ چاکەکار بوویت لەژیاندا ؟ ئەویش وتی: چۆن نەترسم ، ئەم چەند ساتەی کۆتایی ژیانم دوا فرسەتی شەیتانە و زۆر هەوڵدەدات زەفەرم پێبەرێت و لەدەستی قوتار نەبم ...

بەڵێ شەیتان شەوو رۆژ لەهەوڵدایە ، لەخەویشدا واز لەمرۆڤ ناهێنێ ،پیاوێك پرسیاری کرد لە حەسەنی بەسری : ئایا شەیتان دەخەوێت ؟! ئەویش لەوەڵامدا وتی : جابرا گەر بنووستایە پشوویەکمان دەدا !

ژن ومناڵ و پارە و سامانیش مرۆڤ سەرقاڵ دەکەن و شەیتان بەهۆیانەوە مرۆڤ لەرێلا ئەدات ﴿ ان من ازواجكم واولادكم عدواً لكم فاحذروهم ﴾ التغابن : ١٤ واتە هەندێ لەژن و مناڵتان دوژمنتانن و بەرەو دنیاپەرستی و دوور لەخواییتان دەبەن ، ئاگاداری خۆتان بن و لەرێ لامەدەن .

دیارە خۆشوویستنی ماڵ و مناڵ لەفیترەتدایە و جوانی ژیانی دنیان ، باشترین پاڵپشتیشن ئەگەر گوێڕایەڵی فەرمانی خوابن ، حەزرەت ﷺ دەفەرموێ : ( الدنيا متاع وخير متاعها المرأة الصالحة ) .

## گرنگی دامەزراوی لەسەرەمەرگ و ئاخیرەتدا :

سەرەنجامی دامەزراوی مزدەی خۆشی فریشتەکانە بۆ بڕواداران ، کەپێیان دەڵێن مەترسن لەداهاتووتان و خەم مەخۆن بۆ رابردووتان و ، بچنە ئەو بەهەشتەی کە پەیمانتان پێدرابوو ، ئێمە دۆست و هاوەڵتانین لەدنیا و قیامەتدا ... لەبەهەشتا چی ئارەزووبکەن هەیە و ، چی داوابکەن ئامادەیە بۆتان بەفەرمانی پەروەردگاری لێخۆشبووی میهرەبان ﴿ ان الذين قالوا ربنا الله ثم استقاموا تتنزل عليهم الملائكة الا تخافوا ولا تحزنوا وابشروا بالجنة التي كنتم توعدون نحن اولياؤكم في الحياة الدنيا وفي الاخرة ولكم فيها ماتشتهي أنفسكم ولكم فيها ماتدعون نُزلاً من غفور رحيم﴾ فصلت : ٣٢

زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت : فریشتەکان لەسەرە مەرگ و لەقەبر و لەکاتی زیندوو بوونەوەدا مژدەدەن بەبڕواداران .

**جۆرەکانی دامەزراوی :**

**ا ــ دامەزراوی لەتێگەیشتندا :**

ئەمەش بەوە دێتەدی کە بزانین (وحی) بنەڕەت و سەرچاوەیە و رووناکییە بۆ عەقڵ و چاو ، بۆیە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت :﴿لا تُقدموا بين يدي اللهِ ورسولهِ واتقوا الله ان الله سميع عليم ﴾ الحجرات ١/ واتە : بیروبۆچوون و هەواو ئارەزووتان مەخەنە پێش فەرمانی خوا و پێغەمبەرەوە ، حەزرەتیش ﷺ دەفەرموێت ﴿ لايؤمن احدكم حتى يكون هواه تبعاً لما جئت به ﴾ واتە : کەسێ لەئێوە بڕوادار نیە ، تاوەکو هەواو ئارەزووی شوێنکەوتووی ئەو بەرنامەیە نەبێت کەهێناومەو پێم راگەیاندوون ...

حەزرەت ﷺ بەعەبدوڵڵای کوڕی مەسعودی فەرموو(ئەزانی کێ زاناترین کەسە ؟) ئەویش وتی: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن ...فەرمووی : ﴿ فاعلم الناس أبصرهم بالحق اذا اختلفت الناس ، وان كان مقصراً في العمل ﴾ حاكم ٤٨٠/٢ کەواتە زاناترین کەس ئەوەیە کەلەکاتی فیتنە و ئاشووب و سەرلێ تێکچوونی خەڵکیدا بەرچاووی روونبێ و بەئاسانی بتوانێ هەق و ناهەق لێك جیابکاتەوە و دەمارگیری بۆ رایەك و بۆچوونێك وای لێنەکات لەهەق لابدات ، چونکە بەداخەوە موسڵمانی وا هەبووە کەدەمارگیری مەزهەبی وای لێکردووە بڵێت ( ئەگەر ئایەتێك یان فەرموودەیەك پێچەوانەی بۆ چوونی ئیمامەکەم بێت ئەوا تەئویلی ئایەت و فەرموودەکە دەکەم تابگونجێت لەگەڵ رای ئیمامەکەمدا )...

دەبێ بزانین کە هەمووکەس دەکرێ قسەی وەربگیرێ یان بدرێتە دواوە ، تەنها پێغەمبەر ﷺ نەبێ ، چونکە تەنها ئەوەکە (معصوم)ە و هەرچی دەڵێ(وەحی)یە و لەخواوەیە ﴿وما ينطق عن الهوى ان هو الا وحي يوحى﴾ ( النجم ) .

لەزەمانی حەزرەتدا ﷺ دەستەیەك لەموسڵمانان چوون بۆ ئەنجامدانی کارێك ، لەرێگا لەگەڵ فەرماندەکەیاندا تێکچوون ، ئەویش ویستی تاقیان بکاتەوە ، بۆیە ئاگرێکی پێکردنەوە و فەرمانی پێدان کەبچنە ناوئاگرەکەوە ، ئەوانیش وتیان : ئێمە لەتاو ئاگری دۆزەخ بڕوامان هێناوە ، ئێستا چۆن بچینە ئاگرەوە و فەرمانەکەیان شکاند ... کە

گەڕانەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و بۆیان گێڕایەوە ، ئەویش فەرمووی : بچوونایەتە ناویەوە لێی نەدەهاتنە دەرێ ، چونکە ( انما الطاعة في المعروف) ...

خاڵێکی تریش هەیە زۆر گرنگە و دەبێ ئاگاداری بین ئەویش ئەوەیە کە هەمیشە هەق بکرێت بەپێوەر بۆ ناسین و هەڵسەندگاندنی خەڵکی ، نەك خەڵکی بکرێنە پێوەر بۆ ناسینی هەق .

**ك- دامەزراوی لەپەرستنشدا :**

قورئانی پیرۆز لۆمە و سەرزەنشتی ئەوکەسانە دەکات کە خواپەرستی‌یەکەیان مۆڵەقە و دامەزراونین و دەفەرموێت :﴿ومن الناس من يعبد الله على حرف فان أصابه خير اطمأن به ، وان أصابته فتنة انقلب على وجهه خسر الدنيا والاخرة ذلك هو الخسران المبين﴾ الحج :١١/ واتە : کەسی واهەیە خواپەرستی دەکات لەسەر بەردێکی مۆڵەقی قەدپاڵی شاخێك ، ئەگەر تووشی خێر و خۆشی بوو دڵی پیّی خۆشە ، خۆ ئەگەر تووشی تاقیکردنەوەیەك هات هاوسەنگی خۆی لەدەست دەدات و سەرەنرێ دەبێ و دەکەوێتە خوارەوە ، بەمەش زیانمەند و خەسارەتمەندی دنیا و قیامەت دەبێت ، کەبەراستی ئەوەیە زیان لێکەوتنی راستەقینەی روون و ئاشکرا .

ئەم ئایەتە دەربارەی هەندێك عەرەبی کۆچەری هاتۆتە خوارەوە ، کە هاتن لەمەدینە جێگیربوون ، جا هەرکامیان ساغ و دروست بوایە و ماینەکەی بزایە و ژنەکەی کوڕی ببوایە ، دڵئارام دەبوو ، وە دەیووت : لەوکاتەوە کەهاتومەتە سەر ئەم ئایینە لەچاکە زیاتر تووشی هیچ نەبووم ، بەڕاستی ئایینێکی چاکە ، بەڵام ئەگەر یەکێك حاڵەکەی بەپێچەوانەوە بوایە دەیووت : لەوکاتەی هاتوومەتە سەر ئەم ئایینە لەخراپە زیاتر تووشی هیچ نەبووم (هەروەك ئاینەکە شووم بێت) ، بۆیە وازی دەهێناو لەدین وەردەگەڕا

لەگەرمەی جەنگی یەرموکدا ، نامەی عومەر گەیشتە دەست خالد کەسەرکردایەتی سووپاکە بداتە دەست ( ئەبوعوبەیدە) ، ئەویش وەك خواناسێکی بەئەمەکی دامەزرا و هاوسەنگی خۆی لەدەست نەدا و وتی:( من لەپێناوی عومەردا ناجەنگم ، بەڵکو لەپێناوی خوای عومەردا دەجەنگم ) .

بەڵێ خالید وەك لەبواری سەربازی‌دا سەرکەوتنی زۆری بەدەستهێنا لەبواری جەنگی دەروونی خۆشی‌دا سەرکەوتنی بەدەستهێنا و زاڵ بوو بەسەری‌دا ، کە ئەمەش دیارە

**کارێکی ئاسان نیە و خەڵکانێکی زۆر هەن لەبانگەوازدا نەك بەلەسەرکار لابردن بەڵکو تەنها ڕووگرژیەکیان بەسە کەواز لەهەمووشتێك بهێنن !!**

**٣ـ دامەزراوی لەخووڕەوشتدا :**

**دامەزراوی لەسەر ڕەوشتە بەرزەکان نیشانەی بڕواداری تەواوە ، ئاشکرایە شەیتان هەردەم لەهەوڵدایە بۆ تێکدانی نێوان خەڵکی و ئاژاوەنانەوە ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت** ﴿ ان الشيطان قد أيس أن يعبده المصلون في جزيرة العرب ولكن في التحريش بينهم ﴾مسلم

**واتە : شەیتان بێهیوا بووە لەوەی موسڵمانان لەنێوەدوورگەی عەرەبدا بیپەرستن و ڕازییە بەوەی ئاژاوە و دووبەرەکی لەنێوانیاندا بنێتەوە .**

**قورئانی پیرۆز دەفەرموێت :** ﴿قل لعبادي يقولوا التي هي أحسن ان الشيطان ينزغ بينهم ، ان الشيطان كان للأنسان عدواً مبيناً ﴾ الاسراء : ٥٣ **واتە : بەبەندەکانم بڵێ : چاکترین گوفتار بڵێن ، چونکە شەیتان بەراستی دەیەوێت نێوانیان تێك بدات ، بەراستی شەیتان دوژمنی ئاشکرای ئادەمیزادە.**

**جا بۆئەوەی فرسەت بۆ شەیتان نەڕەخسێنین و نەیەڵین ڕق و کینە لەدڵماندا بچێنێ ، چاکتروایە دڵفراوان و سینە ساف بین بەرامبەر موسڵمانان و هەمیشە خۆمان بەڕەوشتە جوانەکانی ئیسلام بڕازێنینەوە و هەرگیز فەزڵ و چاکەی یەکتری لەیاد نەکەین ئەگەر کەمیش بێت ، قورئان دەفەرموێت :** ﴿ولا تنسوا الفضل بينكم ﴾ البقرة : ٢٣٧ **..هەرچەندە ئەم ئایەتە بۆکاتی جیابوونەوەی ژن ومێرد هاتووە ، کەلەوکاتە ناخۆش و دژوارەدا ، شیر و تیر لەیەك نەسوون و لەهەق لانەدەن ، جا دیارە بۆ کاتەکان و باروزروفەکانی تر زیاتر دەبێت پەیڕەوی ئەم ئەدەبە بەرزە بکرێت .**

**هۆکارەکانی گەیشتن بەدامەزراوی :**

**یەکەم/ پاڕانەوە و داواکردن لەپەروەردگار ، کە یارمەتیمان بدات و دامەزراومان کات ، هەروەك چۆن حەزرەت دەیفەرموو :** ﴿يا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك ﴾ ترمذي **یان دەیفەرموو :** [ اللهم ياحي ياقيوم ويا بديع السماوات والارض لا اله الا أنت برحمتك أستغيث ، أصلح لنا شأننا كلها ولا تكلنا الى أنفسنا طرفة عين أو الى أحد من خلقك ] **.واتە : ئەی خوای زیندووی بەدەسەڵات و بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی ، هەر تۆ**

خوایت ، پەنا دەگرم بەمیهرەبانی‌یەکـەت ، کارەکانمـان بـۆ چـاك بکـە و تەنـها بـۆ چـاو تروکاندنێکیش مەماندەرە دەست نەفسمان و هیچ یەکێ لەدروستکراوەکانت ..

دووەم/ وازهێنـان لەقسـەی زیـاد و خـۆ خـەریك کـردن بـەکرداری چـاك و بەسـوودەوە، چونکە قسە هەموو کەس پی‌ی دەوێرێت ، بەلاّم کردار سەنگی مەحەکە .

پیاوێك هات بۆ لای ئیمام ئەحمەد پرسیاری کێشەی (خلق القران) ی لێکرد کە لەو رۆژەدا فیتنەیـەکی گـەورەبوو ، ئـەویش لەوەلاّمدا پـی‌ی ووت : بـرام ئـەو دوعایـە دەزانـی کەلەکاتی چوونە ناو مزگەوتەوە دەخوێنرێت ، کابرا وتی : نەخێر ، ئیمام ئەحمەد پـی‌ی ووت: دەبـڕۆ فـێری ئـەو دوعایـە ببـە و کـاری پـیّ بکـە ، ئـەوە چاکـتر و خـێرترە بـۆت ،...بەواتایـەکی‌تر ... با هـەولّ بدەیـن ریزبەندی (اولویـە) ی کارمـان لێنەشـێوێ ، چونکـە شەیتان یەکێك لەفێلّەکانی ئەوەیە کەسێك بەسوونەتەکانەوە سەرقالّ بکات و فەرزەکانی بیربەرێتەوە ...

سێیەم / هـاوەڵی کردنـی کەسانی ورەبـەرز و دامـەزراوو خوانـاس ، هـەروەك قورئـان دەفـەرموێت : ﴿ وکونـوا مـع الصـادقین ﴾ التوبـة : ١١٩ ، یـان عـەبدولقادری گـەیلانی دەڵێـت : ( سـیروا مـع الـهمم العالیـة ) هـاوەڵ و هـاودەمی هیممــەت بەرزان بـن و لەگـەڵ ئەواندا و شان بەشانی ئەوان بڕۆن بەرێدا.

دوانەکەوتن لەکاروان مەسـەلەیەکی گرنگـە بـۆ گەیشـتنە مـەنزڵ و ڕێ وون نـەکردن، دکتـۆر (محمد اقبـال) لەهۆنراوەیـەکی‌دا ، بـاس لـەوە دەکـات ئەگـەر بـۆ سـاتێك کەسـێك لەکاروانێکدا سەرقالّ بێت بەدڕکێکەوە کە چووە بەقاچی‌دا بۆ ئەوەی دەری بهێنێ ، سەر هـەڵدەبڕێ کاروانەکـە دوورکەوتۆتـەوە و بـەجێ‌یان هێشـتووە ، بەمـەش چـەندەها (میـل) ڕێگاکەی دووردەکەوێتەوە و ڕەنگە لەبرسێتی و تینوێتی‌دا بمرێت ... یان گورگ بیخوات

لحظة یاصاحبي انْ تغفل

ألف میل زاد بُعدُ المنزل

رام نقش الشوك حینا رجل

فاختفی عن ناظریه المحمل

چوارەم / خوای گـەورە پـی‌ی خۆشە ئێمە بە(صف) و بەکۆمەڵ ڕووبەڕووی دوژمنان ببینـەوە ، بۆیـە کـاری بەکۆمــەڵ بەرەکـەتی زۆرە و زامنـی لا نـەدان و دامەزراوی‌یـە ... حەزرەت ﷺ دەفەرموێ ( انما یأکل الذئب من الغنم القاصیة) واتە گورگ لەمەڕی دوورە ڕان

دەخوات ... ئاشکرایە شەیتان لەیەکێکەوە نزیکە و لەدوانەوە دوورە و لەسیانەوە زیاتر دوورترە و ناتوانێ بەئاسانی زەفەریان پێبەرێت و لەرێ لایان بدات ...

## دادوەری و هەق بێژی

لەقورئان و سوننەتدا گرنگی زۆردراوە بەمەسەلەی دادوەری و هەق بێژی ، وە ئەم گرنگی پێدانەش بۆ بەرژەوەندی تاك و کۆمەڵە و زۆر گرنگە کەلەژیاندا رەنگ بداتەوە ، بۆیە لەم کورتە باسەدا هەوڵ دەدەین تیشك بخەینە سەری .

**١ ـ خواوەند داد پەروەرە :**

خواوەندی میهرەبانی بالآدەست یەکێك لەناوە پیرۆزەکانی (العدل)ە ، وشەی (العدل) بەلیغترە لەدەلالەت کردنی‌دا بۆ دادپەروەری ، کەچاوگە و لەجیاتی وشەی (العادل) بەکارهاتووە ..قورئان دەفەرموێت : ﴿ شهد الله انه لا اله الا هو والملائكة واولوا العلم قائما بالقسط ، لا اله الا هو العزيز الحكيم ، ان الدين عندالله الاسلام ﴾ ال عمران : ١٨

واتە : خوای گەورە شایەتی داوە و دەریخستووە و سەلماندویەتی کەبەراستی جگە لەو هیچ خوایەکی تر نیە کەشایانی پەرستن بێت ، هەروەها فریشتەکان و خاوەن زانستەکانیش ( لەپێغەمبەران و زانایان ) ، لەحالێکدا کە ئەم شایەتی‌دانە هەق و راست و دادوەری‌یە و هیچ لادانێکی تیانیە ، هەر ئەو خوایە بەدەسەلآت و کاردروستە و ، بەراستی ئاینی پەسەند کراو لای خوا هەر ئیسلامە .

لەقیامەتیشدا تەرازووی داد دا ئەنرێت و کەس مسقاڵە زەرەیەك زولمی لێناکرێت ﴿ ونضع الموازين القسط ليوم القيامة ، فلا تُظلم نفس شيئاً ، وان كان مثقال حبة من خردل أتينا بها وكفى بنا حاسبين ﴾ الانبياء : ٤٧

واتە : ئێمە پێوەر و تەرازووەکانی دادپەروەری لەرۆژی قیامەتدا دادەنێین و ، هیچ کەس بەهیچ شێوەیەك ستەمی لێناکرێت ، ئەگەر بەقەدەر دەنکە خەرتەلەیەك لەکاری چاك یان خراپ ئەنجامدرابێ دەیهێنینە مەیدان ، جا ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە کە ئاوا بە وردی حساب و لێپرسینەوە ئەنجام دەدەین .

**٢ـ هەموو پێغەمبەران داد پەروەرن :**

پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ فەرمانیان پێدراوە بەدادپەروەری ﴿ فلذلك فادع واستقم كما امرت ولا تتبع أهواءهم ، وقل امنت بما انزل الله من كتاب وامرت لأعدل

بينكم ﴾ شورى : ١٥ **كەواتە ئەی پێغەمبەر ﷺ تۆ بۆ ئەم بەرنامەیە بانگەواز بکە و پایەدار و دامەزراوبە ، هەروەك فەرمانت پێدراوە و ، شوێن ئارەزووی ئەوان مەکەوە و بەئاشکرا بڵێ : من باوەڕم هێناوە بەو پەیام و پەڕاوەی کە خوا ناردوویەتی ، وەفەرمانم پێدراوە کەدادپەروەری بکەم لەناوتاندا ...**

**هەروەها قورئان دەفەرموێت :** ﴿ولقد أرسلنا رسلنا بالبينات وانزلنا معهم الكتاب والميزان ليقوم الناس بالقسط ، وانزلنا الحديد فيه بأس شديد ومنافع للناس وليعلم الله من ينصره ورسله بالغيب ، ان الله قوي عزيز ﴾ حديد : ٢٥

**واتە : بەراستی ئێمە پێغەمبەرانی خۆمانمان رەوانەکرد بەنیشانە و بەڵگەی زۆری روونەوە ، وە نامەی ئاسمانی و تەرازووی دادمان لەگەڵدا ناردن ، تا مەردووم بەدادویەکسانی کاربکەن لەگەڵ یەکتریدا ، وە ئاسنمان ناردە خوارەوە کە هەرچی هێزی سەختی جەنگی هەیە بەوە ، وە قازانجێکی زۆری هەیە بۆ خەڵکی و خوا ئەمانەی کرد تا دەرکەوێ ئەو بڕوادارانەی کە ئایینی خوا و پێغەمبەرەکانی سەردەخەن ، بەهۆی بڕوابوونیان بەغەیب ، بێگومان خوا بەتوانا و زاڵ و بالأدەستە.**

### ٣ ـ خوا فەرمان دەدات بەداد پەروەری و دەستپاکی :

﴿ ان الله يأمركم أن تؤدوا الامانات الى أهلها ، واذا حكمتم بين الناس أن تحكموا بالعدل ، ان الله نِعِما يعظكم به ، ان الله كان سميعاً بصيرا ﴾ النساء : ٥٨

**واتە : خواوەند فەرمانتان پێدەدات بەدانەوەی سپاردەکان بەخاوەنەکانیان وە هەرکاتێکیش داوەریتان کرد لەنێوان خەڵکیدا ، دادپەروەرانە فەرمانڕەوایی بکەن ، چونکە بەراستی خوا بەجوانی و تەواوی ئامۆژگاری و فەرمانتان پێدەدات ، بەڕاستی خوا هەمیشە و بەردەوام بیسەر و بینایە .**

**هەروەها قورئان دەفەرموێت :** ﴿ قل امر ربي بالقسط ﴾ ال عمران : ٢٨ **واتە : ئەی محمد ﷺ پێیان رابگەیەنە وبڵێ : پەروەردگارم فەرمانیداوە بەدادپەروەری .**

### ٤ ـ دادپەروەری لەمامەڵە و کڕین و فرۆشتندا :

﴿واوفوا الكيل والميزان بالقسط ﴾ الانعام : ١٥٢ **واتە : کێشان وپێوان بەرێك و پێکی بەکاربهێنن و بەدادگەری ئەنجامی بدەن و فێڵی تیامەکەن .**

**لەسوورەتی**(المطففين)**یشدا هەڕەشەیەکی سەخت کراوە لەوانەی تەرازووبازی دەکەن**
﴿ ويل للمطففين الذين اذا اكتالوا على الناس يستوفون واذا كالوهم أو وزنوهم يُخسرون

الا يظن اولئك أنهم مبعوثون ليوم عظيم ، يوم يقوم الناس لرب العالمين ﴾ واته : وای بۆ تەرازوو بازان ، ئەوانەی کە پێوانە بکەن لەسەر ماڵی خەڵکی بەتەواوی وەری دەگرن ، وەکاتێکیش بۆیان پێوانە یان کێشانە بکەن کەمیان دەدەنێ ، ئایا ئەوانە نازانن کە زیندوو دەکرێنەوە ، لەرۆژێکی گەورەدا ، رۆژێك کە خەڵکی لەبەر بارەگای پەروەردگاری جیهانیاندا دەوەستن .

**٥ ـ ناوبژی کردنی داد پەوەرانە :**

﴿ وان طائفتان من المؤمنين اقتتلوا فاصلحوا بينهما ، فان بغت احداهما على الاخرى ، فقاتلوا التي تبغي حتى تفيء الى امر الله ، فان فاءت فاصلحوا بينهما بالعدل واقسطوا ان الله يحب المقسطين ﴾ الحجرات : واته : ئەگەر دووتاقم و کۆمەڵێ ئیماندار شەڕیان کرد ، هەوڵبدەن بۆیەکخستن و ئاشتکردنەوەیان ، ئنجا ئەگەر یەکێکیان دەستدرێژی کرد ، ئەوا جەنگی لەگەڵدا بکەن و وازی لێمەهێنن تادەگەڕێتەوە بۆ لای فەرمانی خوا ، کەبریتی‌یە لەکۆتایی هێنانی ئاژاوە و شەڕ ، جا ئەگەر گەڕایەوە و ڕازی بوو بەئاشتی ، ئەوسا دادپەروەرانە سوڵحیان لەگەڵ بکەن ، بەڕاستی خوا ئەوکەسانەی خۆش دەوێت کە دادپەروەرن .

**٦ ـ فەرمانڕەوای داد پەروەر :**

حەزرەت ﷺ دەفەرموێت : ( سبعة يظلهم الله في ظله يوم لا ظل الا ظله ... امام عادل ... هتد ) بخاري ومسلم / واتە : حەوت کۆمەڵ هەن کە خوای پەروەردگار ئەیانخاتە ژێر سێبەری رەحمەتی خۆیەوە ، لەو رۆژەدا کە هیچ سێبەرێك نیە بێجگە لەو سێبەرە ... یەکەم پێشەوا و فەرمانڕەوای دادپەوەر ...

هەروەها دەفەرموێت ﴿ ان المقسطين عند الله على منابر من نور ، الذين يعدلون في حكمهم في اهليهم وماولوا ﴾ مسلم / واتە : دادپەروەران لە قیامەتدا لەخزمەت خوادا دەبن لەسەر مینبەری نوور ، ئەوانەی کەدادپەروەرن لەماڵ و کەسوکار و ئەوانەدا کەلەژێر دەستیاندان .

**دادوەری و هەق بێژی و پەروەردەی ئیسلامیی :**

تەنها ئیسلام و پەروەردەکەیەتی کە بتوانێت وا لەمرۆڤ بکات کەدادوەر و هەق بێژ بێت بەرامبەر بەهەموو کەس و ، لەبەر خواو لەترسی خوا بەسەر دەروونی خۆیدا زاڵ بێت و بەرژەوەندی‌یەکانی بخاتە لاوە .

**ئەوە بەڕاستی شتێکی گرانە لەسەر دڵ و دەروون ، بەتایبەت کاتێك ڕاستی لەکەس وکار یان لەخۆت بڵێیت ، یان بەهۆی هەق وتنەوە خۆت یان کەسوکارت تووشی ناڕەحەتی و زیانێك ببن . قورئان دەفەرموێت :**

١) ﴿ یا ایها الذین امنوا کونوا قوامین بالقسط شهداء لله ولو علی انفسکم أو الوالدین والاقربین ، ان یکن غنیاً أو فقیراً فالله أولی بهما ، فلا تتبعوا الهوی أن تعدلوا ، وان تلوو أو تعرضوا فان الله کان بما تعملون خبیرا ﴾النساء : ١٣٥ .

**واتە : ئەی کەسانێك کە بڕواتان هێناوە هەمیشە و بەردەوام پایەداربن لەسەر دادپەروەری و شایەت بن بۆ خوا لەسەر هەق ، هەرچەند ئەوشایەتی‌دانە زیانی خۆتان یان دایك و باوکتان ، یان خزمتانی تیابێت ، جا ئەوکەسەی شایەتیەکەی لەسەر دەدرێت دەوڵەمەندبێت یان هەژار ، ئێوە لەسەر هەق و ڕاستی لامەدەن بۆ کەسیان ، چونکە پەروەردگار لەپێشترە و نزیکترە بۆ چاوەدێری ئەوانە لەئێوە ، واتە مەڵێن ئەوکەسە هەژارە با ئێمە لایەنی ئەوبگرین ، چونکە جاری وا هەیە هەقی دەوڵەمەندەکەیە ، یان مەڵێن ئەوکەسە دەوڵەمەندە با ئێمە لایەنی بگرین ، چونکە جاری وا هەیە هەقی هەژارەکەیە .کەواتە هیچ شتێکی دنیایی نابێت کارتان تێبکات و لەڕاستبێژی و شایەتی‌دانی هەق لاتان بدات ، وە مەکەونە شوێن هەواو ئارەزووتان ، وە ئەگەر زمانتان بگۆڕن و هەق نەڵێن ، وەیان لادەن و ڕوو وەرگێڕن لەهەق ، ئەوە خوا ئاگادارە بەوەی کەدەیکەن ، وە هەموو کەس ڕوو بەڕووی پاداشتی کردەوەکانی خۆی دەبێتەوە .**

٢ ـ ﴿ ولا یجرمنکم شنان قوم أن صدوکم عن المسجد الحرام أن تعتدوا ، وتعاونوا علی البر والتقوی ولا تعاونوا علی الاثم والعدوان ، واتقوا الله ، ان الله شدید العقاب ﴾ المائدة : ٣ **واتە : باکینە و ڕق و دوژمنایەتیتان بۆ کۆمەڵێك کەرێ(مسجد الحرام) یان لێگرتن ، واتان لێنەکات زیادڕەوی بکەن لەتۆڵە سەندنەوەدا ، وەیارمەتی یەکتر بدەن لەسەر چاکە و پارێزکاری و یارمەتی یەکتر مەدەن لەسەر گوناهو تاوان ، لەخوا بترسن و پارێزکاربن بەڕاستی خوا سزاکەی سەختە ...**

٣ ـ ﴿ یا ایها الذین امنوا کونوا قوامین لله ،شهداء بالقسط ، ولا یجرمنکم شنان قوم علی الا تعدلوا ، اعدلوا هو اقرب للتقوی ، واتقوا الله ، ان الله خبیر بما تعملون ﴾ المائدة : ٨ **واتە : ئەی کەسانێك کەبڕواتان هێناوە ، ڕاوەستاوبن لەسەر هەق و شایەتی ڕاستی بدەن و ، با دوژمنایەتیتان بۆ گەلێك واتان لێنەکات کەدادپەروەرنەبن لەگەڵیاندا ، چونکە ئەوە نزیکە لە پارێزکاری‌یەوە ، لەخوا بترسن و پارێزکاربن ، خوا ئاگادارە بەکارەکانتان .**

٤ـ ﴿ واذا قلتم فاعدلوا ولو كان ذا قربى ﴾ الانعام : ١٥٢ واته : هەق وراستی بڵێن و دادپەروەربن ، تەنانەت ئەگەر ئەو هەق وتنە لەسەر خزم و کەس و کاریشتان بکەوێت .

**لەهەقدا براکەت سەربخە :**

بەڵێ ... پەروەردەی ئیسلامیی توانی ئەو نەفام و نەخوێندەوارانە کەلەهۆز و گەل و عەشیرەتیاندا توابوونەوە ، بەجۆرێکی ئەوتۆ پەروەردەبکات کە هەمیشە هەقبێژبن ، لەکاتێکدا کەلەناویاندا باوبوو ( انصر أخاك ظالماً أو مظلوماً ) واتە : براکەت سەربخە و هاوکاری بکە ئەگەر ستەمکاربێت یان ستەملێکراو . تیرە و هۆزەکەیان ئەوەندە لاپیرۆز بوو کوێرانە دوای دەکەوتن لەهەق و لە ناهەقدا ، هەروەکو یەکێ لەشاعیرەکانیان دەڵێت :

وهل أنا الا من غزية ان غوت
غويت ، وان ترشد غزية أرشد

واتە : من یەکێکم لەتیرەی (غوزیە) ئەگەر خوار بڕوات خوار دەڕۆم و ، ئەگەر راست بڕوا راست دەڕۆم .

پێغەمبەر ﷺ ئەو بیرو بۆچوونەی گۆڕی و فەرمووی : ( براکەت سەربخە ستەمکار بێت یان ستەم لێکراو) موسڵمانان وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا چۆن ستەمکار بێت سەری بخەین ؟ ئەویش فەرمووی : ئەگەر ستەمکار بوو رێی لێ بگرن ئەوە سەرخستنە بۆی .

تەنها ئیسلام توانی مرۆڤ بگەیەنێتە ئەو پلەیە ، کەهەمیشە هەق بڵێت ئەگەر زیانی خۆی و کەسوکاریشی تیابێت ...لەملاو لەولا رەنگە کەسێك لە کۆمەڵگایەکی نەفامیدا شتێکی وابکات لەبەرهەر هۆیەك بێت ، بەڵام کە هەموو خەڵکی یان زۆربەیان بخرێنە سەر ئەو رێگایە ، ئەوە هەرگیز نەبووە و نابێت ، چونکە (خۆ خۆیی : الانانیە) هێزێکە وا لەقوڵایی دەروونی مرۆڤدا ، وە تەنها ئیمان و بڕوایە دەتوانێت زاڵ بێت بەسەریدا .

پاش فەتحی خەیبەر پێغەمبەر ﷺ عەبدوڵڵای کوڕی رەواحەی نارد بۆ لای جوولەکەکان تا بەروبوومی ئەهلی خەیبەر بخەملێنێت و لەگەڵیاندا بیکات بەدوو بەشەوە بەپێی ئەو پەیمانەی کەبەستبوویان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ .

جولەکەکان ویستیان بەرتیل بدەن بە عەبدوڵڵا تاوەکو لەخەملاندنەکەدا کەم دابنێت و چاوی لێیان بێت ، ئەویش وتی: بەخوا لای خۆشەویسترین کەسمەوە هاتووم و ، بەخوا ئێوەش لەلام لەمەیمون و بەراز خراپترن و زیاتر رقم لێتانە ، بەڵام دڵنیابن ، نەخۆشەویستیەکەم بۆ ئەوو ، نەرقەکەم بۆ ئێوە ، وام لێناکات دادپەروەر نەبم لەگەڵتاندا

... ئەوانیش وتیان راست دەکەیت ئاسمانەکان و زەوی لەسەر ئەو دادپەروەرییە راوەستاون!!

بەڵێ ... قورئانی پیرۆز بەهۆی پەروەردە تاقانە بێوێنەکەیەوە ، هەردەم دەتوانێت خەڵکانی دادپەوەر و هەقبێژ فەراهەم بهێنێت ... لاپەڕە پرشنگدارەکانی مێژووی ئیسلام بەهەزارەها رووداوی لەو جۆرەی تۆمارکردووە و ، ئەوەش کە تۆمار نەکراوە لەژمارە نایەت .

زانایان و خواناسان هەردەم هەقیان وتووە بەکار بەدەست و دەسەلاتداران بەبێ ترس و مەبەستیشیان تەنها رەزامەندی خوابووە .

رۆژێك زانایەك بەخەلیفەی موسڵمانان هارونەرەشید دەڵێ :

ئەی هارون ئەوە کۆشك وتەلاری ئەوانەی پێش تۆیە و ئەوەش گۆڕەکانیانە ...

ئەی هارون مردن بەسە کە ئامۆژگاریکاربێت ...

## دادپەروەری لەقەزادا :

بۆ دادپەروەریش لەقەزادا و یەکسانی خەڵکی لەبەردەم دادگادا نموونەی زۆرمان هەیە کە گەورەیی ئەم ئیسلامە دەردەخات...

دەگێڕنەوە کە ئیمامی عەلی زرێ پۆشەکەی لێ ون دەبێت و دەکەوێتە لای کابرایەکی جوولەکە ، کاتێك ئیمامی عەلی دەزانێت زرێ پۆشەکەی لای ئەو جوولەکەیەیە شکاتی لێدەکات ، بەمەرجێ ئیمامی عەلی خۆی خەلیفە بوو ، دەیتوانی هەربێ سێ و دوو کردن لێی بسەنێتەوە ...

لەرۆژی دیاریکراودا ئیمامی عەلی و جوولەکەکە لەبەردەم قازی دا وەستان و هەریەکە قسەی خۆی کرد ... قازی بەخەلیفەی وت : من دەزانم کە تۆ راست دەکەیت، بەلاّم چونکە بەڵگەی وات بەدەستەوەنیە و تەنها حەسەنی کوڕیشت شایەتە ، ئەوا بڕیارماندا زرێ پۆشەکە بۆ جوولەکە کە بێت ...

ئیمامی عەلیش رازی بوو بەبڕیاری دادگا ... ئەم رووداوە کاری لەجوولەکەکە کرد و وتی: من شایەتی ئەدەم کە ئەمە رەوشتی پێغەمبەرانە و ، ئەم ئاینەش هەقە و زرێ پۆشەکەش هی ئیمامی عەلیە ... وە من لەسەر دەستی ئێوەدا موسڵمان بوونی خۆم رادەگەیەنم ... اشهد أن لا اله الا الله وأشهد أن محمداً رسول الله ...

# پابەند بوون

**قورئان دەفەرموێت :** ﴿ وما كان لمؤمن ولا مؤمنة اذا قضى الله ورسوله أمراً أن يكون لهم الخيرة من أمرهم ، ومن يعص الله ورسوله فقد ضل ضلالاً مبيناً﴾الاحزاب:٣٦

**واتە : بۆ هیچ پیاوو ئافرەتێكی بڕوادار دروست نیە ، كاتێك خواو پێغەمبەرەكەی بڕیاری شتێك بدەن ، ئەوان سەرپشك بن لەئەنجامدانی ئەو كارەدا ، چونكە ئەوەی سەرپێچی بكات لەفەرمانی خوا و پێغەمبەرەكەی ئەوە بەراستی سەرلێشێواوە ، سەر لێشێواوێكی ئاشكرا ...**

**پابەند بوون لەخەسڵەتی بڕواداره راستگۆكانە ، چونكە هەركەس هەواو ئارەزووی شوێنكەوتەی بەرنامەی خوا نەبێت ، باوەڕەكەی تەواو نیە و كەم و كوڕی تێدایە .**

**چەند راستی‌یەك كە ئەبێ بیزانین :**

**١ـ هەموو كەس ئازادە لەهەڵبژاردنی رێبازی ژیانی‌دا** ﴿فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر ﴾ الكهف : ٢٩ .

**٢ . پەروەردگار مرۆڤی دروستكردووە و هەر ئەو دەزانێت چی باشە بۆی لەدنیا و قیامەتدا** ﴿ الا يعلم من خلق ، وهو اللطيف الخبير ﴾ الملك : ١٤ ﴿ أأنتم أعلم ام الله﴾ البقرة : ١٤٠ **واتە : پێ‌یان بڵێ : ئێوە زاناترن یان خودا ؟ ... یان دەفەرموێت:** ﴿ومن أحسن من الله حكماً لقوم يوقنون ﴾ المائدة : ٩٠ ، **واتە : كێ هەیە حوكم و یاساكەی لەخوا چاكتر بێت بۆ بڕواداران .**

**٣ ـ پابەند نەبوون بەبەرنامەی خواوە مایەی سەرگەردانی دنیا و تیاچوون و بەدبەختی ئاخیرەتە** ﴿ومن أعرض عن ذكري فان له معيشة ضنكا ، ونحشره يوم القيامة أعمى ﴾ طه : ١٢٤ ، **واتە : هەركەس روو لەبەرنامە و یادی من وەرگێڕێت ژیانێكی نارەحەت و ناخۆش و تاڵی دەبێت ، وە لەقیامەتیشدا بەكوێری حەشری دەكەین**

﴿قال رب لم حشرتني أعمى وقد كنت بصيراً ، قال كذلك اتتك اياتنا فنسيتها وكذلك اليوم تنسى ، وكذلك نجزي من أسرف ولم يؤمن بايات ربه ، ولعذاب الاخرة أشد وأبقى﴾ ٢٧ طه **واتە : دەڵێت : ئەی پەروەردگار بۆ بەكوێری حەشرت كردم خۆ من كاتی خۆی چاو ساغ و بینا بووم ؟ لەوەلامی‌دا خوا دەفەرموێت : تۆ ئابەوشێوەیە بوویت ، كوێر**

بوویت لەئاستی ئایەت و بەڵگەکانی ئێمەدا ، کاتێك پێت ڕاگەیەنرا ، ئێمەش ئەمڕۆ ئاوا مامەڵەی کەسێکی لەبیرکراوت لەگەڵدا دەکەین و لەسزا و ئازاردا دەهێڵرێیتەوە .

ئابەوشێوەیە ، تۆڵە دەکەینەوە لەوکەسەی کەلەسنوور دەترازێت و باوەڕ بە ئایەت و فەرمانەکانی پەروەردگاری ناهێنێت ، بێگومان سزای قیامەت زۆر سەخت تر و بەردەوامترە لەسزای دنیا ...

٤ ـ دڵ تەنها جێگای یەك بەرنامە و ڕێبازە ﴿ماجعل الله لرجل من قلبين في جوفه﴾ الاحزاب : ٤ واتە : خوا دوو دڵی نەداوە بەکەس و هەموو کەسێك یەك دڵی هەیە و دەبێت خۆی یەکلاییبکاتەوە ، یان ئیسلام یان نەفامی هەڵبژێرێ ...

**پابەند بوون گرنگە :**

ا ـ پابەندبوون و گوێڕایەڵی مایەی سەرکەوتنە ، موسڵمانەکان لەغەزای ئوحوددا بەپابەند نەبوونیان بەفەرمانی حەزرەتەوە ﷺ تێك شکان و پەروەردگار وانەیەکی کرداری وای دادان کە هەرگیز لەبیریان نەچێتەوە و ببێتە پەند و عیبرەت بۆ خۆیان و بۆنەوەکانی دوای خۆشیان ﴿ولقد صدقكم الله وعده اذ تحسونهم باذنه ، حتى اذا فشلتم وتنازعتم في الامر وعصيتم من بعد ما أراكم ماتحبون ، منكم من يريد الدنيا ومنكم من يريد الاخرة ، ثم صرفكم عنهم ليبتليكم ولقد عفا عنكم والله ذو فضل على المؤمنين﴾ ال عمران : ١٥٢

واتە : سوێندبێت ، خوا بەڵێنی خۆی بۆ ئێوە بەراستی بردە سەر لەسەرەتای جەنگی ئوحوددا ، هەر بەمۆڵەت و یارمەتی ئەو ، دوژمنتان بەگیرهێنا و تێکتان شکاندن ، هەتا ئەو کاتەی کەساردیی ڕووی تێکردن و بوو بەکێشەتان لەسەر هەندێك شت و سەرپێچیتان کرد لە فەرمانی پێغەمبەر و سەنگەرتان چۆڵ کرد ، دوای ئەوە هەندێك شتی دنیایی (غەنیمەتی) پیشاندان کە حەزتان لێدەکرد ، هەتانە دنیای دەوێت و هەتانە قیامەتی مەبەستە ، لەوەودوا دەستی ئێوەی کۆتا کرد لەدوژمنان ، تا تاقیتان بکاتەوە ، سوێندبێت ، بەراستی خوا چاو پۆشی لێکردن و لێتان خۆشبوو ، وە خوا فەزڵ و ڕێزی هەیە بۆ بڕواداران.

٢ ـ پابەند بوون نیشانەی ڕاستگۆیی بەندەیە لەبەرەو خوا چووندا ، چونکە باوەڕداری تەنها بەقسە نابێت و ، کردار دەیسەلمێنێت ، قورئان دەفەرموێت ﴿يا ايها الذين امنوا لم تقولون ماتفعلون ، كبر مقتاً عند الله أن تقولوا ما لاتفعلون﴾الصف : ١

واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ، بۆ شتێك دەڵێن كە نایكەن ، گوناهێكی گەورەیە لای خوا كەسێك شتێك بڵێت و نەیكات ، واتە كردار و گوفتاری یەك نەبن .

پەروەردگار هەمیشە بەندەكانی تاقی دەكاتەوە ، تا باش و خراپ و راست و ناراست لەیەكتری جیابكاتەوە ، هەروەك دەفەرموێت :﴿ أحسب الناسَ أن يقولوا امنا وهم لايفتنون ، ولقد فتنا الذين من قبلهم فليعلمن الله الذين صدقوا وليعلمن الكاذبين ﴾ العنكبوت : ١ واتە : ئایا خەڵكی وایانزانیوە ، وازیان لێدەهێنرێت كەبڵێن باوەڕمان هێناوە و تاقیناكرێنەوە ؟ سوێند بەخوا ئێمە ئەوانەی پێش ئەمانمان تاقیكردۆتەوە بەجۆرەها شێوە ، تا لەجیهانی واقیعدا خوا راستگۆیان و درۆزنەكان دەربخات و بناسرێن .

یان دەفەرموێت ﴿ اولا يرون أنهم يفتنون في كل عام مرة أو مرتين ثم لايتوبون ولاهم يذكرون ﴾ التوبة : ١٢٦ ئایا دوو ڕووەكان نابینن و نازانن كە بەراستی ئەوان لەهەموو ساڵێكدا جارێك یان دووجار تاقیدەكرێنەوە و ،پیلان و نەخشە و دەستیان ئاشكرا دەبێت ، پاشان تەوبەناكەن و پەشیمان نابنەوە و یادەوەری وەرناگرن و ئەوان بیرناكەنەوە ...

## خەسڵەتەكانی بڕواداری راستەقینە :

١ـ وەرگرتنی عەزیمەت و نەگەڕان بەدوای ڕوخسەت و مۆڵەتدا ، بەتایبەت ئەوانەی كەپێشەوا و سەرمەشقن بۆ كەسانی دیكە ، ئەوەی سەیری ژیانی هاوەڵانی حەزرەت ﷺ بكات دەبینێت كە بەدوای ڕوخسەتدا نەدەگەڕان تا پابەندبوونی تەواویان دەربخەن بۆ ئاینی خوا . یەكێك لەهاوەڵان رۆژی جارێك خەتمی قورئانی دەكرد ، حەزرەت ﷺ فەرمانی پێدا كە بیكات بەمانگی جارێك ، وتی : توانام زیاترە ، فەرمووی : با هەفتەی جارێك بێت ، وتی : توانام زیاترە ، فەرمووی : باسێ رۆژ جارێك كەمتر نەبێت ...

(نعمان كوڕی مقرن المزنی) والی شاری (كسكر) بوو لەئێران ، زۆر ناڕەحەت دەبوو بەوەی كەپارە و ماڵی زەكات دەهاتە لای ، زۆرتكاو ڕجای كرد لای عومەری كوری خەتتاب كەلەكار بەدەستێتی لای ببات و بیكات بەسەر بازێكی سوپای ئیسلام ، عومەریش رازی بوو ، وە كردی بەسەركردەی یەكێك لەسوپاكانی (نەهاوەند) ، كاتێك (نعمان) گەیشتە (نەهاوەند) سەربازەكانی كۆكردەوە و پێی وتن: من دوعایەك دەكەم سوێندتان دەدەم بەخوا كە (امین) بكەن بۆم ، خوایە (نعمان) لەرێی خۆتا شەهید بكەیت ... هەموو سوپاكە سەرسام بوون چۆن دوعای وادەكات ! ئەویش دووبارەی كردەوە و

وتی: خۆ من سوێندم دان ! ئەوانیش ناچار هەموو بەیەك دەنگ وتیان : امین ... پاش دەستپێكردنی جەنگەكە بەماوەیەكی كەم(نعمان) شەهید بوو ، بەئاواتی خۆی گەیشت ... كە ئەمەش بەڵگەیەكی گەورەیە لەسەر هیممەت بەرزی و پابەند بوونی ئەو خواپێداوانە .

٢ـ گوێڕایەڵی و فەرمانبەری بێ‌ڕاوەستان و دوو دڵی ، ئەنەسی كوڕی مالیك دەڵێت : (مەی) م دەگێڕا بۆ ( ئەبی تەڵحە) و (ئەبی عوبەیدە) و(ئەبی دوجانە) تا تەواو سەرخۆش بوون ، ئنجا گوێم لەبانگەوازێك بوو دەیووت : مەی یاساغ كراوە ... هەر لەوێدا دەم و دەست و بێ ڕاوەستان هەموو كوپە مەیەكانمان قڵپ كردەوە و هەندێكمان خۆمان شت و هەندێكیشمان تەنها دەستنوێژمان شت ... ئنجا چووین بەرەو مزگەوت ، حەزرەت ﷺ ئەو ئایەتانەی بۆ خوێندین كەلەسەر یاساغ كردنی مەی هاتبوونە خوارێ ... ( ئاشكرایە مەی بەچوار قۆناغ یاساغ كراو ئەمە دوا قۆناغیان بووە )...

٣ ــ پەیڕەوی كردن بەبێ گەڕان بەدوای (تاویل) و لێكدانەوەی نادروستدا ، وەگێڕانەوەی هەموو مەسەلەیەك بۆ حوكمی خوا و پێغەمبەر ﷺ ﴿ فلا وربك لايؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بينهم ثم لايجدون في انفسهم حرجاً مما قضيت ويُسلموا تسليماً ﴾ النساء : ٦٠ واتە : سوێندبێت بەپەروەردگارت باوەڕیان تەواو دامەزراو نیە هەتاوەكو تۆ نەكەنە حەكەم و فەرمانڕەوا لەوكێشانەدا كەدێتە ڕێیان ، پاشان لەدڵ و دەروونیاندا ناڕەحەت وبێزارنەبن و بەتەواوی پابەندی فەرمانت بن.

٤ ـ بڕواداری ڕاستەقینە خۆی دەپارێزێ لەوشتانەی كەشوبهەی تیایە ، نەباوەكو تووشی حەرام بێت و خوای گەورەی لێ‌بڕەنجێت ... پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ( ان الحلال بين وان الحرام بين وبينهما امور مشتبهات لايعلمهن كثير من الناس ، فمن اتقى الشبهات فقد استبرأ لدينه وعرضه ، ومن وقع في الشبهات وقع في الحرام كالراعي يرعى حول الحمى يوشك أن يرتع فيه . ألا وان لكل ملك حمى ، ألا وان حمى الله محارمه ، ألا وان في الجسد مضغة اذا صلحت صلح الجسد كله ، واذا فسدت فسد الجسد كله ألا وهي القلب ) مسلم وبخاري .واتە : حەلاڵ دیار و ئاشكرایە و حەرامیش بەهەمان شێوە ، لەنێوانیاندا هەندێ شت هەن گەلێ كەس حوكمەكەیان نازانن ، جا ئەوەی خۆی بپارێزێ لەشتی گومانلێكراو ، ئەوا ئایین و نامووسی خۆی لەنەنگ و لەكەداری دەپارێزێ ، بەلاّم ئەوەی كە دوای شتی گومانلێكراو دەكەوێت و تووشی حەرام دەبێت ، وەك چۆن شوان ئەگەر ڕان لەدەوروبەری پاكژ و پاوەند بلەوەڕێنێ بەرەبەرە ڕانەكە لە پاوەندەكەیش دەلەوەڕێ . باش ئاگاداربن ! كە هەموو پادشایەك پاوەندی تایبەتی خۆی هەیە ، بزانن

کە پاوەندی خواش ئەوشتانەیە کە حەرامی کردوون .باش ئاگاداربن کە گوڵمەیەك گۆشت هەیە لەناو جەستەدا ئەگەر باش بوو ئەوا هەموو جەستەش باش دەبێت ، وە ئەگەر خراپ بوو ئەوا هەموو جەستەش خراپ دەبێت ، وە بزانن کە ئەوەش دڵە ...

هەروەها حەزرەت ﷺ دەفەرموێت : ( لا يبلغ العبد أن يكون من المتقين حتى يدع مالابأس به حذراً لما به بأس ) ترمذي /

واتە بەندەیەك ناگاتە ئەوەی ببێ بەیەکێ لەپارێزکاران ، هەتاوەکو واز لەهەندێ شتی ڕەوا و حەڵاڵ نەهێنێ لەترسی ئەوەی نەباوەکو تووشتی شتێ ببێ کەناڕەواو حەرامە .

## گۆڕانکاری

ئەم بوونەوەرە و هەرچی تێدایە موڵکی خوایە و هەر ئەویش باڵادەستە ، قورئان دەفەرموێت : ﴿ قل اللهم مالك الملك تؤتي الملك من تشاء وتنزع الملك ممن تشاء وتعز من تشاء وتذل من تشاء ، بيدك الخير ، انك على كل شيء قدير ﴾ ال عمران /٢٦ واتە : بڵێ خودایە ئەی خاوەنی هەمو شتێك ، موڵك و ماڵ و دارایی دەدەیت بەهەر کەسێك کەبتەوێت و، دەسەڵات و سەروەت و سامان دەسێنیتەوە لەهەرکەسێك کەبتەوێت ، هەرکەسێکت بوێت بەڕێز و بەرز و بڵندی دەکەیت و ، هەر کەسێکت بوێت بێڕێز و بێنرخ و نابوتی دەکەیت ، هەرچی خێر و چاکە هەیە بەدەستی تۆیە ، بەراستی تۆ بەسەر هەموو شتێکدا توانا و زاڵیت .

جا ئەم گۆڕانانە وەنەبێت هەر لەدارایی و پلە و پایەدا بێت بەڵکو ( تولج الليل في النهار وتولج النهار في الليل ، وتخرج الحي من الميت وتخرج الميت من الحي ، وترزق من تشاء بغير حساب ) ال عمران / ٢٧ شەو دەکەیت بەناو ڕۆژداو ، ڕۆژ دەکەیت بەناو شەودا ، زیندو دەردێنیت لەمردوو ، مردوو دەردێنیت لەزیندوو ، ڕزق و ڕۆزی بێئەندازە ئەدەیت بەهەرکەسێك بتەوێت .

**ئەوکاتەی خوا نیعمەتەکانی دەگرێتەوە !**

قورئان دەفەرموێت : ﴿ ذلك بان الله لم يك مغيراً نعمة أنعمها على قوم حتى يغيروا ما بأنفسهم ﴾ الانفال : ٥٣ واتە : خواناز و نیعمەتێك کەبیدات بەگەلێك لای نابات تاوەکو ئەوان دڵ و دەروونیان نەگۆڕن ...

کەواتە گۆڕانی باری ژیان پەیوەندی بەبیروباوەڕەوە هەیە ، خوا کاتێك بارو گوزەرانی خەڵکی چاك دەکات کەپەیڕەوی بەرنامە و یاساکەی بکەن .

**گۆڕین لەدڵەوە دەست پێ دەکات :**

قورئان دەفەرموێت : ﴿ ان الله لايغير ما بقوم حتى يغيروا ما بأنفسهم ، واذا أراد الله بقوم سوءً ، فلا مرد له ومالهم من دونه من وال ﴾ الرعد : ١١ واتە : بێگومان خوا بارودۆخی هیچ گەلێك ناگۆڕێت ، لەخۆشیەوە بۆ ناخۆشی ، یان لەگرانیەوە بۆ هەرزانی ، یان لەزەلیلیەوە بۆ سەر بەرزی ، هەتا ئەوان ئەوەی بەخۆیان دەکرێت نەیگۆڕن و نەیکەن ، کاتێکیش خوابیەوێ بەلایەك بەسەر هەر میللەتێکدا بهێنێت لەسەرەنجامی سەرکەشی و یاخی بوونیاندا ، ئەوە هیچ هێزێك ناتوانێت بەری بگرێت ، هیچ کەسیش ناتوانێت جگە لەخوا فریایان بکەوێت و رزگاریان بکات .

حەزرەتیش ﷺ دەفەرموێت : ( ان الله لا ينظر الى صوركم ولا الى أجسامكم ولكن ينظر الى قلوبكم وأعمالكم ) مسلم / واتە : بەراستی خوا سەیری لاشە و وێنەتان ناکات ، بەڵکو سەیری دڵ و کردەوەکانتان دەکات .

**سوننەت و یاسای گۆڕین لەکاردایە :**

قورئان دەفەرموێت : ﴿ وان تتولوا يستبدل قوماً غيركم ثم لا يكونوا امثالكم ﴾ محمد ٢٨ واتە : ئەگەر ئێوە پشت هەڵکەن و لەبەرنامەی خوا لابدەن ، ئەوا گەلێکی تردێنین و دەیخەینە جێگاتان کەچاك بن و وەك ئێوە نەبن . پرسیارکرا لەحەزرەت ﷺ ( أنهلك وفينا الصالحون ؟ قال : نعم اذا كثر الخبث ) واتە : ئایا لەناو دەچین ئەگەر پیاوچاکمان تیابێت ؟ فەرمووی : بەڵێ ئەگەر خراپە زۆر بوو ...

خوا هەمووان بەیەکەوە لەناو دەبات و دوایی هەرکەسە و لەسەرنیەتی خۆی زیندووی دەکاتەوە ...

**ئەو گۆڕانکاریانەی کە ئیسلام کردوونی :**

**١ـ لەسەرچاوەی وەرگرتندا :**

کاتێك ئیسلام هات ، خەڵکی دوای عورف و عادەت و هەواو ئارەزوو ، وەرچەو رێبازی باووباپیران کەوتبوون ، قورئان ئەو خەڵکەی گێڕایەوە سەر سەرچاوەی راستەقینەی وەرگرتن کەبەرنامەکەی خوایە .

بۆنموونه : کاتێك حەزرەت ﷺ چوو بۆ مەدینه ، بەفەرمانی خوا له نوێژەکانیدا روویان دەکردە (مسجد الاقصی) ، وە ئەمەش نزیکەی شانزە مانگی خایاند ، پاش ئەوەی گوێرایەڵی و پابەندبوونی خۆیان سەلماند ، خوای گەورە فەرمانی پێکردن رووبکەنەوە کەعبە ( کەدیاربوو ئەمەیان زۆر پێخۆش بوو ) قورئان دەفەرمووێت ﴿وما جعلنا القبلة التي كنت عليها الا لنعلم من يتبع الرسول ممن ينقلب على عقبيه﴾ البقرة : ١٤٤ واته : بۆیە(مسجد الاقصی) مان کردە رووگەتان تا دەربکەوێت کێ دوای پێغەمبەر دەکەوێت و کێش پاشگەز دەبێتەوە ، ( ئەمەیان لاقورس بوو ، چونکە کەعبە هەر لەدێر زەمانەوە پیرۆز بوولەلایان ) ، هەروەك عورف و عادەتێك دەقیان بەکەعبەوە گرتبوو ، جاکاتێ عورف و عادەتەکەیان لەلایەن خواوە شکێنرا و رووی پێکردنە (قدس) زۆر گران بوو لەسەریان ... بەلاّم چاك تێگەیشتن کەمەسەلەکە هەواو ئارەزووی ئەوان نیه بەڵکو خوا فەرمان دەدا و خۆشی دەزانێت بۆ چ حیکمەتێك ئەوکارەدەکات ... دواییش کە موسڵمانەکان قاڵ بوون و دامەزران هەر بەفەرمانی خوا روویان کردەوە کەعبەی پیرۆز .

٢ ـ لەپەیوەندی و دۆستایەتیدا :

کاتێك ئیسلام هات خەڵکی سەرگەرمی تایەفەگەری بوون ، هۆز و عەشرەت تاقە هۆکاری پەیوەندی و دۆستایەتی بوو ...ئیسلام برایەتی ئیمانی هێنایە کایەوە و دڵەکانی یەکخست ﴿ انما المؤمنون اخوة ، فاصلحوا بين أخويكم واتقوا الله ﴾ الحجرات،واته : بەراستی بڕواداران برای یەکترین ، جا نێوانی براکانتان چاك بکەن و لەخوا بترسن .

ئەم کارە کارێکی مەزن بوو ، بەفەزڵی خوا هاتەدی و ئوممەتێکی گەورە و فراوان فەراهەم هات ، کە هەموو هۆز و گەل و نەتەوەکان و رەنگە جیاجیاکان تیایا بوونە برا و هاوکار ، قورئان دەفەرمووێت :﴿لو أنفقت مافي الارض جميعاً ما الفت بين قلوبهم ولكن الله ألف بينهم ﴾ الانفال : ٦٣ واته : ئەگەر هەموو موڵکی دنیات سەرف بکردایە ، نەتدەتوانی دڵەکانیان یەك بخەیت و هەموویان ئاوا کۆبکەیتەوە ، خوا بەفەزڵ و میهرەبانی خۆی لەسایەی بیروباوەڕی بێگەردی ئیسلامدا دڵەکانی یەکخستن و کۆی کردنەوە .

٣ ـ لەبیروهۆش و ژیریدا :

ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەست و هۆش و بیری خەڵکی گۆڕی ، یەکێکی وەك عومەری کوڕی خەتتاب پیاوێکی توند و تیژی نەفام بوو ، بوو بەوپیاوە دڵناسکەی کەشەوێك

گوێی لەقورئان خوێنێك بوو کە ئایەتی ﴿ ان عذاب ربك لواقع ﴾ ی دەخوێند ، بەجۆرێك دای لەدڵی و کاری تێکرد کە بۆ چەند ڕۆژێك لەماڵەوە کەوت و خەڵك سەردانیان دەکرد .

ئەو عومەرەی کە دەیووت : ئەگەر بەڕۆژ بخەوم ڕەعیەتەکەم لەدەست ئەدەم و ئەگەر بەشەو بخەوم و عیبادەت نەکەم خۆم لەدەست ئەدەم .

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودیش شوانێکی ڕەش پێستی هەژار و لاواز بوو ، کاتێ موسڵمان بوو ، بووبەپیاوێکی بلیمەت و خواناس کە حەزرەت لەبارەیەوە دەفەرموێ : کێ دەیەوێ گوێی لەقورئانێکی تەڕ و تازە بێت ، هەرروەك چۆن دابەزیوە ، با گوێ لەقورئان خوێندنی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود بگرێت ...

لەفیقهیشدا عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود بووە قوتابخانەیەك و ڕۆڵی گرنگی بینی .

ڕۆژێك حەزرەت ﷺ لەبارەی لاوازی و باریکی قاچەکانی‌یەوە فەرمووی : ئەگەر سەیرتان دێ لەلاوازی و باریکی قاچەکانی ، ئەوە بزانن لەتەرازووی خوادا لەقیامەتدا لەکێوی ئوحود قورستر و سەنگینترە .

٤ ـ لەدڵقایمی و بەرگە گرتندا :

ئیسلام شوێنکەوتوانی لەسەر دڵقایمی و خۆڕاگری و ورەبەرزی پەروەردە دەکات ، نەك هەر پیاو بەڵکو ئافرەتیش ، نەك هەر گەورە بەڵکو منالیش ...

(خنساء) (صخر)ی برای کوژرا لەسەردەمی نەفامی‌دا ، ئەوەندەی بۆ گریا و ئەوەندەی بۆ لاواندەوە ، کە بەنموونە باس دەکرێت ، وە دەیووت ئەگەر شیوەنکەر و کۆستکەوتوو زۆر نەبوونایە لەدەورم لەوانەبوو خۆم بکوشتایە ...

ئەم ئافرەتە کەموسڵمان بوو ، هەرچوار کوڕەکەی هاندا بەرەو شەهیدی و کاتێك لەجەنگێکدا هەرچواریان یەك بەدوای یەکدا شەهید بوون ، ( خنساء ) وتی ( سوپاس بۆ ئەو خوایەی ڕێزی لێنام بەشەهید بوونیان ، داوا دەکەم خوا منیش بگەیەنێت بەوان ) ...لەم سەردەمەی خۆشماندا دایکانی فەلەستین ، زۆریان لەشەهید بوونی ڕۆڵەکانیاندا سەرخۆشی قبوڵناکەن و داوادەکەن پیرۆزباییان لێبکرێ و زۆریان شیرینی دەبەخشنەوە.

٥- لەڕەوشت و خوودا : ئاشکرایە ئیسلام هاتووە ڕەوشتە جوانەکان تەواو بکات و بیانچەسپێنێ ، حەزرەت ﷺ دەفەرموێت : ﴿ انما بعثت لأتمم مکارم الاخلاق ﴾ مسلم واتە : من هەڵبژێردراوم و نێردراوم بۆئەوەی ڕەوشتە بەرزە جوانەکان تەواو بکەم .

هەروەها دەفەرموێت : ( ان المؤمن ليدرك بحسن خلقه درجة الصائم القائم ) ئەبوداود واتە : بڕوادار بەڕەوشتی جوانی دەگاتە پلەی ئەو کەسەی کەبەڕۆژ بەرۆژوو بەشەویش خەریکی شەونوێژە ...

ئیسلام گرنگی‌دا بەچاکە لەگەڵ ماڵ و منداڵ و دایك و باوك و دراوسێ و میوان و ...هتد چاکەیەك کە مرۆڤ پاداشتەکەی بەچەند قات لای خوا وەردەگرێتەوە ، تەنانەت هانمان دەدات کە هیچ چاکەیەك بەکەم نەزانین ئەگەر زەردەخەنەیەکیش بێت لەڕووی خەڵکیدا ..بەکورتی ئیسلام گۆڕانکاری لەسەرتاپای ژیاندا کردو ، دنیایەکی تری هێنایە ئاراوە کە ئادەمی‌یەکان خەمی یەکتری بخۆن ، حەزرەت ﷺ دەفەرموێ ( لەئێمە نیە کەسێك کە گوێ نەدات بەکاروبار و حاڵی موسڵمانان ) ...

## خۆشویستن لەبەرخوا

ماموستا عەباس سیسی لەبارەی ئەم فەرموودەیە( مثل المؤمنين في توادهم وتراحمهم كمثل الجسد الواحد اذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمى ) و خۆشەویستی‌یەوە دەڵێ : ئەوبێ ئاگایی‌یە کە لاوانی ئەم سەردەمەی تیا دەژین وای کردووە کە سەرچاوەیەکی گرنگ لەسەرچاوەکانی ڕۆحیەتی ئیسلامیان لێ‌ون ببێ ، کەمایەی هیممەت و ورە بەرزی‌یە بۆ گێڕانەوەی سەربەرزی موسڵمانان و بووژاندنەوەی ژیاری ئیسلامی . ڕۆژئاوای زۆرزان و فێڵباز و داگیرکەران دەزانن کەلەهەموو مرۆڤێکدا غەریزەی سۆز و خۆشەویستی هەیە ، بۆیە پێش ئەوەی بەخۆشەویستی خوا و سۆز بۆ موسڵمانان پڕببێتەوە ، بە خۆشەویستی زایەندی و بەدڕەوشتی پڕی دەکەنەوە ...

بۆ ئەمەش هەموو هۆکارەکانی ڕاگەیاندن خراونەتەکار و بەرنامەی بۆدارێژراوە... حەزدەکەم بزانن کەمن لەهەژدە ساڵیمدا هەستم دەکرد کەبینای ڕۆحیم تەواو نەبووە و ، شتێك هەیە ڕێگری کامڵ بوونیەتی ، کە ئەگەر ئەو ناتەواوی‌یەی نەمێنێ زۆر بەختیار و شادمان دەبم ، بەمەوە دەتلامەوە بەبێ ئەوەی لای کەس بیدرکێنم ، تا خوای گەورە بەفەزڵی خۆی ڕێنمایی کردوم و لەشاری (رشید) لەساڵی ١٩٣٦دا بۆیەکەمجار ماموستای پێشەوا (بەننا) م بینی و گوێم ئاودرا بەوتارە شیرینەکانی لەوکاتەدا کەتەمەنی بەرێزیان (٣٠) ساڵ دەبوو ...

لەیەکـەم چاوپێکەوتنـەوە هەسـتم کـرد بـۆلای خـۆی رام دەکێشـێ و ، کانیـاوی خۆشەویسـتی هەسـت و سـۆزمی ژیانـەوە ... پاشـان سـێ شـەممان لـەوتاری (عاطفـة الثلاثـاء)دا هـەموو جـارێك گەشـتێکی پـیرۆزی رۆحـی پێدەکردیـن و لەجیهانێکـەوە دەیبردینە جیهانێکی تر و دڵەکانمانی دەبووژاندەوە .

**گەشتێك بەفەرموودەکاندا :**

حەزرەت ﷺ دەفەرموێت : (١) ( والذي نفسي بيده لا تدخلوا الجنـة حتـى تؤمنـوا ، ولا تؤمنوا حتى تحابوا ، الا ادلكم على شيء اذا فعلتموه تحاببتم ؟ أفشوا السلام بينكم ) مسلم .

واتە : بەوخوایەی گیانی منی بەدەستە ناچنە بەهەشتەوە تا ئیمان نەهێنن ، وە ئیمانیش نـاهێنن هـەتا یـەکتریتان خـۆش نـەوێ ، ئایـا شـتێکتان پـێ بڵێـم ئەگـەر بیکـەن خۆشەویستیتان لەلا دروست ببێ ؟ سەلام لەیەکتری بکەن ...

(٢) ( اذا أحب الرجل أخاه فليخبره أنه يحبه ) أبوداود / واتە : ئەگەر کەسێك برایەکی خۆش ویست باهەواڵی بداتێ کە خۆشی دەوێت .

(٣) ( أن رجلاً زار اخاً له في قرية أخرى ، فارصد الله له على مدرجته ملكا فلما اتى عليه قال : أين تريد ؟ قال : اريد اخاً لي في هذه القرية . قال : هل لـك عليـه مـن نعمـة تربُها عليه ؟ قال : لا ، غير أني أحببته في الله تعالى ، قال فاني رسول الله اليك ، أخبرك بأن الله قد احبك كما احببته فيه ) مسلم .

واتـە : پیـاوێ دەچێ بۆ گوندێك بـۆ دیدەنـی برادەرێکـی خـۆی ، خـودا فریشـتەیێ دەنێرێتـە سـەر رێگەکەی ، کە دەگاتـە لای پـێی دەفـەرموێت : بۆ کوێ دەچیت ؟ دەڵـێ: دەچم بۆ لای برادەرێکم لەم گوندەیە . فریشـتەکە دەفـەرموێت : ئایا هیچ نیازێکت پـێی هەیە ؟ دەڵێ : نەخێر ، تەنها بۆ ئەوەیە کەلەبەر خوا خۆشم دەوێت ، فریشتەکە فەرمووی : دە من فرستادەی خودام ، منی ناردووە بۆ لای تۆ کەپێت بڵێم: کە خوداش تۆی خۆش دەوێت چونکە تۆ ئەوت لەبەر خوا خۆش دەوێت .

(٤) ئـەبو ئیدریـس ئەلخـەولانی دەڵـێ ، چوومـە مزگـەوتی دیمەشـق ، پیـاوێکی رووگەشم بینی خەڵك لێی کۆبووبوونەوە و پرسیاریان لێ دەکرد ، پرسیارم کرد کە ئەو پیاوە کێیە وتیـان : ( معـاذ کوڕی جبل ) ە ، بۆ بەیانی زوو چوومە مزگەوت ، لەپێش مندا لەوێ بوو نوێژی دەکرد ، چاوەڕێم کرد تا تـەواو بـوو ، چوومە بەردەمی و سەلامم لێکرد و وتم : بەخوا من تۆم لەبەر خوا خۆش دەوێ ، وتی : توخوا ؟ وتم: بەخوا ، وتی : توخوا ؟ وتم : بەخوا ، ئنجا رای کێشام بۆ لای خۆی و باوەشی پیاکردم و وتـی: مژدەت

**لێبێ ، من گوێم لەپێغەمبەر بووە دەیفەرموو ( خوای گەورە فەرموویەتی :** وجبت محبتي للمتحابين في ، والمتجالسين في ، والمتزاورين في ، والمتباذلين في ) حديث صحيح رواه مالك **. واتە : خۆشەویستی من پێویست بووە بۆ ئەمانە : یەکەم بۆ ئەوانەی لەبەرمن یەکتریان خۆش دەوێت ، دووەم ئەوانەی کەلەبەرمن بەیەکەوە دادەنیشن و کۆڕ و کۆبوونەوە دەبەستن ، سێیەم : ئەوانەی لەبەر من سەردانی یەکتری دەکەن ، چوارەم : ئەوانەی لەبەرمن یارمەتی یەکتر دەدەن و شت بەیەکتری دەبەخشن .**

(٦) **مەعاذی کوڕی جەبەل دەڵێ : حەزرەت دەستی گرتم و فەرمووی : ( ئەی مەعاذ ...بەخوا من تۆم خۆش دەوێ ، ئنجا ئامۆژگاریت دەکەم ئەی مەعاذ : لەدوای هەموو نوێژێ بڵێ :** اللهم أعني على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك ) حديث صحيح رواه ابوداود والنسائي .

(٧) ( اقربكما من الله تعالى أشدكما حبا لصاحبه ) **واتە : نزیکترینتان لەخواوە و چاکترینتان ئەوەتانە کە خۆشەویستی زیاترە بۆ براکەی .**

(٨) **حەزرەت ﷺ لەگەڵ ئەنەسی کوری مالیك دا لەخەیبەر دەگەڕانەوە ، کەگەیشتنە لای شاخی (احد) فەرمووی :** (هذا جبل يحبنا ونحبه) **ئەوە کێوێکە ئێمەی خۆش دەوێ و ئێمەش خۆشمان دەوێت .**

(٩) ( من حق المسلم على المسلم خمس : اذا لقيته فسلم عليه ، واذا غاب فتفقده ، واذا مرض فعده ، واذا عطس فحمد الله فشمته ، واذا مات فشيعه ) (واذا دعاك فاجبه ، واذا استنصحك فانصح له ) ... **برایەتی موسڵمانان وایان لێدەکات کە مافەکانی یەکتری بدەن ، کە ئەومافانەش بریتین لە : ئەگەر پێی گەیشت سەلامی لێ بکات ، وە ئەگەر دیار نەبوو ئەحواڵی بپرسێت ، وە ئەگەر نەخۆش بوو سەردانی بکات وە ئەگەر پژمی و وتی سوپاس بۆ خوا پێی بڵێ : خوارەحمت پێبکات وەئەگەر مرد شوێن تەرمەکەی بکەوێ بۆ گۆڕستان ..جا ئەگەر بانگیشی کرد بۆ سفرە و خوان وەڵامی بداتەوە و بێ دڵی نەکات ، وە ئەگەر داوای ئامۆژگاری لێکرد ئامۆژگاری بکات . دیارە بەمانە هەمووی خۆشەویستی و برایەتی زیاتر پەرە دەسێنێ و گەشە دەکات و دەچەسپێ ...**

(١٠) ( ثلاث من كن فيه وجد حلاوة الايمان / أن يكون الله ورسوله أحب اليه مما سواهما ، وأن يحب المرء لايحبه الا لله ، وأن يكره أن يعود في الكفر بعد أن أنقذه الله منه كما يكره أن يقذف في النار ) بخاري ومسلم

واتە : هەرکەسێ ئەم سێ سیفەتەی تیابێ تامی شیرینی باوەڕ دەچێژێت ، یەکەم خواو پێغەمبەری لەهەمووشتێکی‌تر لا خۆشەویستربێت ، دووەم : هەرکەسێکی خۆش ویست لەبەرخوا خۆشی بوێت ، سێیەم :چۆن حەز ناکات بیخەنە ئاگرەوە ، ئاواش حەزنەکات کەجارێکی‌تر بگەڕێتەوە سەر کوفر و بێباوەڕی...

بەڕاستی هەوڵدان بۆ بەجێهێنانی ئەم سێ خەسڵەتە زۆر گرنگە تاوەکو تامی شیرینی ئیمان بچێژین ..

(١١) ( ما تفرق بين اثنين تحابا في الله الا بذنب قد اقترفه أحدهما ) هەردووکەسێك کەلەبەرخوا یەکتریان خۆشویستبێ و دوایی لەیەکتری جیابووبنەوە هەر بەهۆی ئەوەوەیە کەیەکێکیان گوناهێکی کردووە ، کە ئەمەش خراپی وشوومی گوناهو تاوان دەردەخات ، کە ئەمە یەکێکیانە و نەمانی بەرەکەت و کەمی ڕۆزی و ژیانی تاڵ...هتد ، هەموویان سەرئەنجامی گوناهکردنن ..

(١٢) ( ان من عباد الله عباداً ليسوا بأنبياء ولا شهداء يغبطهم الانبياء والشهداء لمكانتهم عند الله تعالى . قيل : من هم لعلنا نحبهم ؟ قال : هم قوم تحابوا بنور الله من غير أرحام ولا انساب ، وجوههم نور ، على منابر من نور ، لايخافون اذا خاف الناس ، ولايحزنون اذا حزن الناس ، ثم قرأ [ ألا انّ أولياء الله لا خوف عليهم ولاهم يحزنون ] يونس : ٦٢ ... النسائي وابن حبان) ...

واتە : کەسانی وا هەن لەبەندەکانی خوادا کەنە پێغەمبەرن و نەشەهیدن و پێغەمبەران و شەهیدان ئاوات دەخوازن بەپلەو پایەیان لای خوا ، وترا : کێن ئەوانە تا خۆشمان بوێن ؟ فەرمووی : ئەوانە کەسانێکن کەلەبەر خوا یەکتریان خۆش دەوێ بەبێ‌ئەوەی خزمایەتی و ناسیاویان هەبێت ، ڕوویان وەك نوور ئەدرەوشێتەوە و لەسەر مینبەری نوورن و ناترسن لەوکاتانەی کەخەڵك دەترسێ ، خەم ناخۆن و لەوکاتەدا کەخەڵك خەم دەخۆن ... ئنجا حەزرەت ﷺ ئەم ئایەتەی خوێند (خۆشەویستان و دۆستانی خوا ترسیان لەسەر نیە و خەم ناخۆن ) ... بەڕاستی مرۆڤ سەرسام دەبێت لەهاوەڵان کە چەندە وێڵ بوون بەدوای کاری چاکدا و بەدوای ناسینی چاکاندا ... چەند خێرا وتیان ئەو پیاوچاکانە کێن باخۆشمان بوێن ... بۆئەوەی هیچ نەبێت بەهۆی خۆشویستنیانەوە لەگەڵ ئەواندا حەشر بکرێن چونکە (المرء مع من أحب) .

(١٣) ( لو أن اثنين تحابا في الله وكان احدهما في المشرق والاخر في المغرب لجمع الله تعالى بينهما يوم القيامة وقال هذا الذي كنت تحبه فيَّ ) . واتە : ئەگەر دووکەس

یەکتریان خۆشویست لەبەرخوا ، یەکێکیان لەرۆژهەلاّت و ئەوی تریشیان لەرۆژئاوا بوو ، خوا کۆیان دەکاتەوە لەقیامەتدا بۆ ئەوەی بەیەکەوەبن و دەفەرمویٚ : ئەوەتە ئەو کەسەی کەلەبەر من خۆشت دەویست...

**چەند وشەیەکی تر لەسەر خۆشەویستی :**

عومەری کوڕی خەتتاب دەفەرمویٚت : ( اذا أصاب احدكم وداً من صاحبه فليتمسك به فقلما يصيب ذلك) واتە : ئەگەر کەسێکتان خۆشەویستیەکی چنگ کەوت لەبراکەیەوە بادەستی پێوەبگریٚ و بیپاریٚزیٚ چونکە خۆشەویستی کەم دەست دەکەوێت !

زەیدی کوڕی حاریسە وازی لەباوك و کەسوکاری هێنا ، وتیان کەس هەیە شتی وابکات و بەندایەتی لاباشتربێت لەئازادی و باوك و دایك و کەس و کاری ؟ وتی : بەلّیٚ من ئەوەی لەم پیاوەم دیوە وای لیٚکردووم نایگۆڕمەوە بەهیچ شتێك ...

کاتێك حەزرەت ﷺ کردی بەسەرکردەی سوپایەکی سیٚهەزار کەسی و ناردنی بۆ روو بەڕوو بوونەوەی رۆم و شەهید بوو ، حەزرەت ﷺ لەمەدینە بەهاوەلاّنی فەرموو ( داوای لیٚخۆشبوون بکەن چووە بەهەشتەوە بەخێرایی و بەهەلّپەوە) ...ئنجا هاتە مالّیان و هەوالّەکەی دانیٚ و ، کچی زەیدی بینی ، حەزرەت ﷺ زۆر گریا ، سەعدی کوری معاز وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ... ئەمە چی‌یە ؟ فەرمووی : (هذا شوق الحبيب الى حبيبه) ...

**برایەتی و خۆشەویستی لەرابوونی نویٚدا :**

پێشەوا بەننا دەلّێت : ( الاخوة في الله أن ترتبط القلوب والارواح برباط العقيدة وهي أوثق الروابط ، والاخوة أخوة الايمان ، والتفرق أخو الكفر ، ولا وحدة بغير حب، وأقل الحب سلامة الصدر وأعلاه مرتبة الايثار . والاخ الصادق يرى اخوانه أولى بنفسه من نفسه ، لأنه ان لم يكن بهم فلن يكون بغيرهم وهم ان لم يكونوا به كانوا بغيره ) وصدق الله العظيم [ لو أنفقت مافي الارض جميعاً ما ألفت بين قلوبهم ولكن الله ألف بينهم انه عزيز حكيم ] الانفال : ٦٣ [ واذكروا نعمت الله عليكم اذ كنتم أعداء فألف بين قلوبكم فأصبحتم بنعمته أخوانا] ال عمران : ١٠٣ .

واتە : برایەتی لەبەرخوا ئەوەیە کە دلّەکان و گیانەکان بەهۆی بیروباوەڕ و عەقیدەوە بەیەکەوە ببەسترێن ، کە پتەوترین پەیوەندی و پێکەوە بوونە ، برایەتیش برایەتی ئیمانە و جیاوازی و تەفرەقە برای کوفرە ، یەکبوونیش بەبیٚ خۆشەویستی نابێت و ، کەمترینی خۆشەویستیش سینەسافی‌یە و بەرزترینیشی ئەوەیە باوی براکەت بدەی بەسەر خۆتا ... برای راست براکانی لەپێشتر دەزانیٚ لەخۆی ، چونکە ئەو بەمانەوە نەبێت هیچ نیە و

لەگەڵ کەسی‌تردا هیچی بۆ ناکرێت ، هەرچەند ئەوان ئەگەر ئەمیش نەبێ هەر هەن ...
خوای گەورەش دەفەرموێ : ئەگەرچی موڵکی دنیایە سەرفی بکەیت ناتوانی دڵەکانیان یەك بخەیت و کۆیان بکەیتەوە ، بەڵام خوا بەفەزڵی خۆی کۆی کردونەتەوە و یەکی خستوون ، بەراستی خوا بەتوانا و کاردروستە ... هەروەها دەفەرموێت : یادی ناز و نیعمەتی خوا بکەن ئێوە دوژمنی یەکتری بوون ، دڵی یەکخستن و بەنیعمەتی ئەو بوونە برای‌یەکتری .

ئەم برایەتی‌یە لەپەروەردەی برایاندا رەنگی‌دایەوە و نەك هەر لەبارو زروفی ئاسایی‌دا بەڵکو لەناخۆشترین کاتدا ، لەزیندانەکاندا و لەژێر سزا و ئازاردا برایەتی و خۆشەویستیان دەپاراست ، لاوێکی مەسیحی مارونی لەرووداوی قەسابخانەی ( ليمان طره) لەساڵی ١٩٥٧دا لەگەڵ براياندا لەزینداندا بوو ، کەبینی حکومەت (٢٢) برای بەناهەق کوشت لەبەندیخانەدا ... سوێندی خوارد کە ئەگەر بەربوو پەڕاوێك لەوبارەیەوە بنووسێ ، کاتێك بەربوو پەڕاوێکی بەناوی (اقسمت أن اروي) نووسی ، کەتیای‌دا باسی برایەتی و خۆشەویستی و هاوکاری برایانی کرد و باسی ئەو هەموو ستەم و سزادانەی کرد کە کرابوو بەناهەق بەرامبەریان . کەبەڕاستی ئەمە بەڵگەیەکی مێژوویی کەسێکی بێ‌لایەنە ، کە هەر موسڵمانیش نیە و ئاوا بەئینسافەوە باس لەئەزموونی برایان و گیان فیداییان دەکات .

❁ پیاوێکی خواناس کە پێشتر هاوەڵی پێشەوا بەننابوو لە(دار العلوم) ، رۆژێك بە تووڕەیی هات بۆ لای بەننا و گلەیی هەبوو لەسەر جل و بەرگی کەشافەی برایان کە پانتۆڵەکەیان تاسەر ئەژنۆ بوو ... بەپێشەوا بەننای وت : حەسەنەفەنی ... ئەویش وتی : بەڵێ قوربان ...

_من زۆر ڕقم لێتە ... بەننا بەزەردەخەنەوە و زۆر بەلەسەر خۆیی وتی : بەخوا من تۆم خۆش دەوێ ... پیاوەکە وتی : من لەبەرخوا رقم لێتە ... بەنناش وتی : ئەمەش وام لێدەکات کە زۆرترم خۆش بوێ‌ی...

بەم سنگ فراوانی و رۆحیەتە بەرزەوە (بەننا) توانی خەڵکانێکی زۆر لەموسڵمانان بە ئاگابهێنێ و لەژێر ناونیشان و چەترێکدا کۆیان بکاتەوە بۆ خزمەتی ئیسلام .

❁پرسیارکرا لەپێشەوا بەننا ، ئایا تۆ دەوڵەمەندی ؟ وتی : بەڵێ من دەوڵەمەندم بەم دڵانە کە یەکتریان خۆش دەوێ لەگەڵ مندا لەبەر خوا ، پرسیارکەرەکە وتی : من مەبەستم

لایەنی ماددیە ، وتی : بەڵێ دەوڵەمەندم چونکە هەرچی لەگیرفانی براکاندایە موڵکی دەعوەیە .

❁ پێشەوا بەننا دەڵێ ( سنقاتل أعداءنا بالحب) ...واتە : لەگەڵ دوژمنانماندا دەجەنگین بەچەکی خۆشەویستی کە ئەمەش لەبنەڕەتدا لەم ئایەتەوە هاتووە کە دەفەرموێت ﴿ ومن أحسن قولاً ممن دعا الى الله وعمل صالحاً وقال انني من المسلمين ، ولايستوي الحسنة ولا السيئة ، ادفع بالتي هي أحسن فاذا الذي بينك وبينه عداوة كأنه ولي حميم وما يُلقاها الا الذين صبروا وما يُلقاها الا ذو حظ عظيم ﴾ فصلت : ٣٥ واتە : کێ لەوکەسە قسەی جوانتر و بەجێترە کەبانگەوازی کردووە بۆلای خوا و کارو کردەوەی چاکیشی ئەنجام داوەو وتوشیەتی : بەراستی من لەریزی موسڵمانانم. بێگومان چاکە و خراپە وەك یەك نین ، تۆ ئەی بڕوادار بەجوانترین و چاکترین شێوە بەرەنگاری خراپە ببەرەوە ، ئەوکاتە ئیتر دەبینیت ئەوەی کەلەنێوان تۆو ئەودا دوژمنایەتی و ساردیەك هەیە ، دەبێتە دۆستێکی دڵسۆز و گیانی بەگیانی . جا کەسیش ناتوانێ بەو رەفتارە هەستێت جگە لەوانەی کە ئارامیان گرتووە ، هەروەها کەسیش ناتوانێت هەڵوێستی وابنوێنێت جگە لەکەسێك نەبێت کەخاوەنی بەهرەیەکی گەورەبێت .

بەڵێ ... ئەم برایەتی و سۆز و خۆشەویستییە بۆ هاوسەنگەر و هاو خەبات و بۆ هەموو موسڵمانان کارێکی وای کرد هەرچی لێیان نزیك بێتەوە ، یان لەشوێنێك لەگەڵیاندا کۆبێتەوە سەرسام بێت پێیان ، بۆ نموونە :

❁ دکتۆر صلاح خەلیفە :

یەکێك بوو لەوچوار کەسەی کە(معید)بوون لەدەزگای ئەتۆمی میسری ، لەکاتی لێپێچینەوەدا ، سەرۆکی دادگای عەسکەری ویستی دکتۆر بخاتە بارێکەوە دژی برایان قسەبکات ، بۆیە پێی وت: تەحقیقەی لەگەڵیان کردوی خوێندومەتەوە کە تۆ لاوێکی هەڵکەوتوویت و لێکۆڵینەوەی زانستی گرنگت هەیە لەگۆڤارە زانستییەکانی جیهاندا ، هەروەها بۆم دەرکەوت کە تۆ لە(اخوان مسلمين) نیت و لەخشتەیان بردووی بەبێ ئەوەی بەخۆت بزانی ...

هەمووان چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد هەر هیچ نەبێت بۆ خۆ قوتارکردنیش بێت بکەوێتە سەرزەنشت و قسەوتن بەبرایان ، کەچی وەك شێر روو بەڕوویان بووەوە و شتێکی وت کە هەرگیز چاوەڕێی شتی وانەبوون ، د . صلاح وتی : پاش ئەوەی هەڵس و کەوت و

**مامەڵەم کرد لەگەڵ برایاندا و زۆرشتم زانی لەبارەیانەوە و راستییان تێگەیشتم ، ئێستا من خۆم بەیەکێ لەوان دەزانم !!**

**خۆشویستن و رق لێ بوون لەبەرخوا :**

**بڕوادار خوای لەهەموو شتێك خۆشتر دەوێت ، قورئان دەفەرموێت** ﴿ ومن الناس من يتخذ من دون الله أنداداً يحبونهم كحب الله ، والذين امنوا أشد حبا لله ﴾ البقرة : ١٦٥ **واتە : هەندێك کەس هەن لەجیاتی ئەوەی خواپەرست بن ، شتانی تر دەکەنە هاوبەش و هاوەڵ بۆ خوا و خۆشیان دەوێن وەك خۆشەویستی خوا ، بڕواداران زۆر زیاتر لەوان خوایان خۆش دەوێ** ﴿ ولويرى الذين ظلموا اذ يرون العذاب أن القوة لله جميعاً وأن الله شديد العذاب ﴾ البقرة : ١٦٥ **جا ئەوانەی کەستەمیان کردووە گەر دەیانزانی ئەوکاتەی کەسزاکە دەبینن و بۆیان دەردەکەوێت کە هەموو هێز و توانایەك هەر هی خوایە و بەراستی ئەو خوایەش سزاکەی توند و بەئازارە (هەرگیز وایان نەدەکرد و رێی راستیان دەگرتەبەر ) ...**

**لەخۆشەویستی خواوە و لەبەر خوا خۆشەویستیەکانی تر دێنەکایەوە ، بڕوادار لەبەرخوا پێغەمبەران و بەرنامەکانیانی خۆش دەوێت ، حەزرەت ﷺ دەفەرموێت** ( احبوا الله لما يغذوكم من نعمه ، وأحبوني لحب الله اياي ) ترمذي (حسن غريب) . **واتە : خواتان خۆش بوێت کە ئەو هەموو ناز و نیعمەتەی داوەپێتان ، وەمنتان خۆش بوێ چونکە خوا خۆشی دەوێم و (منی هەڵبژاردووە و ناردوومی بۆتان ) ...**

**بڕوادار هەرکەسێك و هەرشتێکی خۆش بوێت لەبەرخوایە نەك لەبەر بەرژەوەندی و روپامایی ، وە هەرکەسێك و هەرشتێکیشی رق لێبێت لەبەر خوایە و هەواو ئارەزووی تێکەڵ نابێت ، کە ئەمەش نیشانەی بڕواداری تەواوە** ( من أعطى لله ، ومنع لله ، وأحب لله ، وأبغض لله ، وأنكح لله ، فقد استكمل ايمانه ) البيهقي .

**رۆژێك حەزرەت ﷺ پرسیاریکرد :** أي عرى الايمان أوثق ؟ **(چ قوڵفێکی ئیمانداری پتەوترینە )؟ وتیان : نوێژ ، فەرمووی : نوێژ چاکە ، بەڵام ئەونیە !**

**وتیان : حەج کردن ، فەرمووی : حەج چاکە ، بەڵام ئەونیە !**

**وتیان : رۆژوو ، فەرمووی : رۆژووش چاکە بەڵام ئەویش نیە !**

**ئنجا فەرمووی :** ( اوثق عُرى الايمان أن تحب لله وتبغض لله ) **واتە پتەوترینی قوڵفەکانی ئیمانداری ئەوەیە کە خۆشویستنت لەبەرخوابێ و رق لێبوونت لەبەرخوابێ ...**

( ل ١٨٦ **بەرگی** ٣ منهاج التربية الاسلامية ) **بیهقي ریوایەتی کردووە .**

**ئەوەی کە خۆشی نازانێ بۆچی ڕقی لێتە ؟!**

لەسەردەمی حەزرەتدا ﷺ پیاوێك بەلای کۆمەڵێك لەیاراندا ڕۆیشت و سەلامی کرد ، ئەوانیش وەلاّمی سەلامەکەیان دایەوە...کەتێپەڕی یەکێك وتی: من ڕقم لەوپیاوەیە لەبەر خوا ! ئەهلی مەجلیسەکە وتیان : قسەیەکی خراپت کرد ، بەخوا پیێ دەڵێین !

ئنجا یەکێکیان لەخۆیان نارد ، ئەمەی بەپیاوەکە وت ... ئەویش هاتە لای حەزرەت و شکاتی لێکرد ... حەزرەتیش ﷺ ئەوکەسەی کە قسەکەی کردبوو ، بانگی کرد و لێی پرسی : تۆشتی وات وتووە ؟ وتی : بەڵێ ...

حەزرەت ﷺ فەرمووی : بۆچی ڕقت لێیەتی ؟ وتی : من دراوسێیم و ئاگام لێیەتی، بەخوا نەمدیوە لەفەرزەکان زیاتر نوێژی تر بکات ... شکاتکەرەکەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لێی پرسە بزانە نوێژەکانم هیچ دواخستووە لەکاتی خۆیان ، یان بەخراپی دەستنوێژم گرتووە ؟ یان ڕکوع و سجودم باش نەبردووە ؟ کەحەزرەت لێی پرسی : کابرا وتی : نەخێر ئەوانەی هەموو بەباشی ئەنجامداوە !

ئنجا کابرای خاوەن ڕق وتی : بەخوا لە ڕۆژووی ڕەمەزان کە چاك و خراپ دەیگرێ زیاتر نەمدیووە ڕۆژێك بەڕۆژوو بووبێ ... خاوەن شکات وتی : ئەی پێغەمبەری خوا لێی بپرسە ، بزانە هەرگیز دیومی ڕۆژووەکەم شکاندبێ و هیچ ڕۆژێکم لێخواردبێ ؟ کە حەزرەت ﷺ لێی پرسی ، کابرا وتی : نەخێر نەمدیووە هیچی لەفەرزەکان خواردبێ !

ئنجا وتی : بەخوا هەرگیز نەمدیوە هیچی دابێ بەهەژارێك ، وە نەمدیوە هیچی بەخشیبێت لەڕێی خوادا مەگەر ئەو زەکاتەی کەچاك و خراپ ئەیدەن !

پیاوی خاوەن شکات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لێی بپرسە ، ئایا لەو زەکاتدانەدا هیچ کەم و کوڕیم کردووە ، یان دوام خستووە ؟ کەلێی پرسی : وتی نەخێر دوای نەخستووە !

حەزرەت ﷺ کەزانی بەخۆڕایی ڕقی لەو موسڵمانەیە و خۆشی نازانێ لەبەرچی ڕقی لێیەتی ، پیێ فەرموو : (قم فلعله خير منك) هەستە ڕەنگە ئەو زۆر لەتۆ باشتربێت ! ( ل ٩٦ فقه الدعوه الميداني ) ئیمام ئەحمەد گێڕایەویتیەوە لە (عامری کوری وا ثل) ەوە .

**دوعای حەزرەت ﷺ بۆ خۆشەویستی :**

حەزرەت ﷺ فێرمان دەکات کە وەك خۆی بپاڕێینەوە ، کە خوا خۆشەویستی خۆیمان بداتێ و خۆشەویستی ئەو کارانەش کە دەمانگەیەنێت بەخۆشەویستی ئەو،

**وەخۆشەویستی هەموو ئەوانەی کە خۆشویستنەکەیان لەلای خوا سوودی دەبێت بۆمان ، هەروەك دەفەرموێت** (اللهم اني أسالك حبك وحب من يحبك والعمل الذي يبلغني حبك ، اللهم اجعل حبك أحب الى من نفسي وأهلي ومن الماء البارد) **هەروەها** ( اللهم ارزقني حبك وحب من ينفعني حبه عندك ) ترمذي .

**نموونەیەك لەخۆشەویستی هاوەڵێك بۆ حەزرەت :**

**رۆژێك هاوەڵێك کەناوی (جرير) بوو هات بۆ مەجلیسی پێغەمبەر ﷺ ، لەبەرئەوەی جێگا نەبوو لەناو دەرگاکەدا ویستی دانیشێ ، حەزرەتیش ﷺ جلێکی خۆی بۆ هەڵدا کەلەسەری دانیشێ ، ئەویش جلەکەی گرت و ماچی کرد و رازی نەبوو لەسەری دانیشێ و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن من لەسەر جلی تۆ دادە نیشم !!خوا رێزت لێ بگرێت وەك رێزت لەمن گرت .**

**بەڵێ هاوەڵان ئەوەندەیان حەزرەت ﷺ خۆش دەویست و ئەوەندەش شەرمیان لێدەکرد چاویان تێر نەدەبوو لەسەیرکردنی بۆیە ئەگەرلێت بپرسینایە کەوەسفی رەنگ و رووی حەزرەت بکەن ﷺ ، زۆریان نەیان دەتوانی یان تەنها دەیان وت : رووی نورینی وەك مانگی چواردە دەدرەوشایەوە ...**

# رێزدار و بێ رێز

**خوای گەورە کە** ( ذوالجلال والاكرام) **ە ورێزی لەنەوەی ئادەم گرتووە ، هەروەك دەفەرموێت** ﴿ ولقد كرمنا بني ادم وحملناهم في البر والبحر ورزقناهم من الطيبات وفضلناهم على كثير ممن خلقنا تفضيلا ﴾ الاسراء : ٧٠ **واتە : سوێند بەخوا ، بەراستی ئێمە رێزمان لەنەوەی ئادەم گرتووە و بەسەر وشکانی و دەریادا بەجۆرەها هۆکاری گواستنەوە هەڵمان گرتوون و لەرزق و رۆزی پوخت و چاکی جۆراو جۆر بەهرەوەرمان کردوون ... بەراستی ئێمە رێزی زیادەی ئەوانمان داوە بەسەر زۆربەی ئەو بەدیهێنراوانەدا کەدروستمان کردوون ، ( لەهەموو روویەکەوە ، تا قەدروڕێزی خۆیان بزانن)**

**خوای گەورە قورئانی بەرێز و پایەبەرزی ناردووە** ﴿ في صحف مكرمة ، مرفوعة مطهرة﴾ **کەلەچەندین لاپەڕەی بەرێز و پیرۆزدا هەڵگیراوە و لە** ( لوح المحفوظ ) **دایە ، کە بەرز و پاك و بڵندوخاوێنن ،** ﴿ بايدي سفرة كرام بررة ﴾ **بەدەستی فریشتەکانەوە کە**

بەڕێز و خواناس و ملکەچ و فەرمانبەردارن ... وە بەهۆی جوبرائیلی بەڕێز و (ئەمین) ەوە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەری بەڕێز و پایەبەرز تاوەکو مرۆڤێکی بەڕێزی پایە بەرز پەروەردە بکات و لەژیاندا ڕۆڵی چاکی خۆی ببینێ ..

**بەڕێزی و گەورەیی حەزرەت :**

لەباسی گەورەیی و بەڕێزی و پایەداری حەزرەتدا دەچینە خزمەت مەولەوی خواناسی خۆمان ، کەلەچەند دێڕ هۆنراوەیەکدا لەعەقیدەی مرضیەکەیدا دەڵێ :

چ فە ضلیکە حەق ، داگییە بەم خاکە ؟

ئەصلە بۆ ئەم گشت ، گەوهەری پاکە !

ئاسمان لەرتبەی علوی چیکەم بوو ؟

نەبوو بەمەدفەن بۆ عیسا ، ئەم بوو !

واتە : ئەمە چ بەهرە و گەورەییەکە خوا داویە بەخاکی ئەم زەوییە کە بنەڕەتە بۆ ئەم گشت گەوهەری پاکی پێغەمبەرانە ، لێی پەیدا ئەبن و بۆیشی ئەگەڕێنەوە ، ئاسمان بەو هەموو بەرزییەوە چی لێکەم بوو ، نەبوو بەئارامگای عیسا ئەم زەوییە بوو بەئارامگای کەلە نزیک قیامەتدا دادەبەزێتەوە و لەسەر زەوی دەمرێت و لەخاکەکەیدا دەنێژرێت ، ( لەلای قەبرەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ ) .

فەلەك نەقشی پێی دی لەزەمیندا

خوێی گرینی هات وە ڕووی بریندا

چاوگەی چاوەکەی لێڵ و حەسرەتمەند

(لیتنی کنت ترابا) ی دەخوێند !

واتە : ئاسمان جێ پێی حەزرەتی دی لەسەر زەوی گریانی بەڕووی بریندا هاتە خوارەوە و فرمێسکی سەربرینیش گەڵ بەئازار و سوێیە و لەبەر زۆری گریان چاوگەی چاوی لێڵ و ، دڵی پڕداخ و ناسۆر بوو ، بۆیە ئاسمان هەر (لیتنی کنت ترابا) ی دەخوێند و ئاواتی بەزەوی ئەخواست و لەدڵی خۆیدا ئەیووت :

هەرچی ریفعەت و عیزز و هەستی وێ

فیدای نەبوونی و خواری و پەستی وێ

واتە : هەرچی بەرزی و دەسەڵات هەیە (کەمن هەمە) ببێ بەقوربانی نزمی وبێچارەیی و نەبوونییەك کە زەوی هەیەتی .

حەق ڕەحمی ئاورد بەو سۆز و تاودا

دەقیقێ پەردەی لابرد لەناودا

سورمەی گەردی پێی کێشاوە چاودا

بەوچاوی پڕ ئێش دووری و بێخاودا

ئێشی چاوی چوو نەختێ پڕ خەوبوو

لەحیکمەت میعراج ئەویەکێ ئەوبوو

واتە : خوا بەزەیی هاتەوە بەو سۆز و دڵگەرمی‌یەی ئاسماندا و ماوەیەکی کەم پەردەی لابرد لەنێواندا و ، کلی گەردی پێی پێغەمبەری هێنا بەچاوی‌دا و ئەوچاوە پڕ لەسۆو بێخەوی ئاسمان لەگڵ کەوت و تێر خەوبوو ، بەڵێ یەکێ لەحیکمەتەکانی (میعراج) وچوونی حەزرەت بۆ ئاسمان ئەمە بوو ...

هەزاران ڕەحمەت لەگۆڕی مەولەوی بێت ، چەند جوان بەچەند دێڕ هۆنراوەیەك ئەسپی خەیاڵی تاوداوە و لەباسی میعراجەوە دەچێتە سەرباسی پایە بەرزی و ڕێزداری سەرداری پێغەمبەران ( هەزاران هەزار درودوسلاوی لەسەر بێت ) .

( هەڵبژاردەیەك لەعەقیدەی مرضیەی مەولەوی ) بابە عەلی شێخ عومەر قەرەداغی

## ڕێزگرتنی ئیسلام لەعەقڵی مرۆڤ :

بەژیری و عاقڵی ، مرۆڤ تەکلیفی دەکەوێتە سەر ، وە ئیسلام کە (مەی) حەرام کردووە بێجگە لەزیانە زۆرەکانی ، ئاگا لەخۆنەمان و لەدەستدانی عەقڵیش مەسەلەیەکە رەچاوکراوە ، کە ئیسلام هەرگیز پێی رازی‌نیە و بەسەرچاوەی هەموو خراپی‌یەکانی دا ئەنێ (ام الخبائث) ...

ئیسلام دەیەوێت بەبەڵگە روون و ئاشکرا زۆرەکانی قەناعەت و دڵنیایی بۆ ئادەمیزاد دروست بکات ...

ئایینی پیرۆزی ئیسلام کە دانوستان دەکات ڕێز لە عەقڵی‌بەرامبەر دەگرێت بۆیە دەفەرموێت ، ئێوە بەڵگەکانتان بهێنن ﴿ قل هاتوا برهانكم ان كنتم صادقين ﴾البقرة:١١١ جا ﴿ وانا أواياكم لعلى هدى أو في ضلال مبين ﴾ السبأ : ٢٤ ، ئێمەیان ئێوە لەسەر رێی راست و هیدایەتین یان لەگومرایی و سەرلێشوایی و ئاشکرادایین .

ئێمە ئەوەندە بەڵگە و بورهانمان لامەبەستە ، ئەگەر توانیتان بیهێنن ، ئێمە بێ دەمارگیری دواتان دەکەوین ﴿ قل ان كان للرحمن ولد فانا أول العابدين ﴾ الزخرف : ٨١

واته : پێیان بڵێ (ئەی محەممەد) ئەگەر خوای میهرەبان کوڕی ببوایە و(بەبەڵگە و بورهان بۆمان بسەلمێنرایە) ئەوا من یەکەم کەس دەبووم لەوکەسانەی کەملکەچ دەبووم ! ﴿سبحان رب السماوات والارض رب العرش عما يصنعون﴾ الزخرف : ٨٢ واتە: پاکی وبێگەردی بۆ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی ، بۆ پەروەردگاری عەرش ، دەربارەی ئەو گوفتارە ناقۆڵاو بێ سەروبنانەی کە نەفامان بۆ خوای هەڵدەبەستن .

کاتێك کە ئیبراهیمی کوڕی حەزرەت وەفاتی کرد خۆرگیرا ، هەندێك دەیانویست بڵێن لەبەرمردنی ئیبراهیم خۆرگیراوە ، حەزرەت ﷺ ئەمەی بۆ راستکردنەوە و فەرمووی : خۆرومانگ دوو بەڵگە و نیشانە و دروستکراوی خوان ، نە بۆ لەدایك بوونی کەس و نە بۆ مردنی کەس ناگیرێن ... کە بەراستی ئەمەش گەورەترین ئازادکردنە بۆ عەقڵی مرۆڤ کە نەبێ بەبەندەی دارو بەرد و دیاردە سروشتیەکان .

قورئانیش دەفەرموێت : ﴿ومن اياته الليل والنهار والشمس والقمر ، لاتسجدوا للشمس ولا للقمر واسجدوا لله الذي خلقهن ان كنتم اياه تعبدون﴾ فصلت:٣٧

واتە: لەنیشانە و بەڵگەکانی دەسەڵاتی پەروەردگار شەوو ڕۆژو خۆر و مانگە ، هەرگیز کڕنووش بۆ خۆریان مانگ مەبەن ، بەڵکو کڕنووش تەنها بۆ ئەو خوایە ببەن کە دروستی کردوون ( واتە خۆر و مانگی زۆری دروست کردووە کە ئەمەش موعجیزەیەکی قورئانە ئەگینا (محمد) ﷺ چووزانێ خۆر و مانگی تر هەیە ،ئەگەر هەر مەبەست ئەو خۆر و مانگە بینراوە بوایە دەبوایە بفەرموێ (خلقهما) ، ئەگەر ئێوە خۆتان بەبەندەی راستەقینەی ئەو دەزانن و هەر ئەو دەپەرستن .

## مرۆڤی ڕێزدار :

وتمان خوای گەورە قورئانێکی بەرز و پیرۆز و بەڕێزی بەجوبرەئیلی ئەمین و بەڕێزدا نارد بۆ حەزرەتی (محمد) ﷺ کە پایەدارترین و بەڕێزترین ئادەمیزادە ، بۆ ئەوەی کەخەڵکی پەروەردەبکات لەسەر ڕێزداری و پایەبەرزی ، هەروەك چۆن لەچاکترین شێوە و(احسن التقويم) دا دروستی کردوون دانەبەزنە (اسفل السافلين) هەروەك دەفەرموێت ﴿لقد خلقنا الانسان في أحسن التقويم ، ثم رددناه أسفل السافلين ، الا الذين امنوا وعملوا الصالحات فلهم أجر غير ممنون﴾ التين : ٦

واتە : بەراستی ئێمە ئادەمیزادمان دروست کرد لەجوانترین و ڕێك و پێك ترین شێوازدا ، ئەگەر ڕێبازی خوا نەگرێتەبەر ئەوا بەرەو نزمترین پلەی ئادەمێتیو سەخترین

شوێنی دۆزەخ دەچێت . ئەوانەشی کە باوەڕیان هێناوە و کاروکردەوەی چاکیان ئەنجام داوە پاداشتی هەمیشە و نەبڕاوەیان بۆ ئامادەیە .

ڕێزداری ڕاستەقینە ئەوەیە کەخوا ڕێزت بگریٚ ، بوونی ماڵ و سامان و نەبوونی نیشانەی ڕێزداری و بیٚڕێزی نیە ، قورئان لەم بارەیەوە دەفەرموێت ﴿ فاما الانسان اذا ما ابتلاه ربه فاكرمه ونعمه فيقول ربي أكرمن ، واما اذا ما ابتلاه فقدر عليه رزقه فيقول ربي أهانن ، كلا ... ﴾ الفجر / واتە : کاتێك ئادەمیزاد لەلایەن پەروەردگاریەوە تاقی دەکرێتەوە ، ڕێزی لیٚ دەنێت و ناز و نیعمەتی بەسەردا دەڕێژێت ، دەڵێت : بەخوا وادیارە پەروەردگارم خۆشی دەوێم و ڕێزم هەیە لای ... کاتێکیش تاقیدەکاتەوە و ڕزق و ڕۆزی کەمی پێدەبەخشێت و لیٚی دەگرێتەوە دەڵێت : وادیارە پەروەردگارم منی خۆش ناوێت و ڕقی لێمە و ڕیسوای کردووم ... نەخێر ئەو شتانە هیچی وانیە ، نە بەخشین مانای ڕێز و قەدرە ، نەلێگرتنەوە مانای بیٚڕێزی و بیٚ قەدرییە ...جا کەباس باسی ڕێز گرتنە ، با(گلەییەك) لەئێوە بکەین ، ئەی ئێوە بۆ ڕێز لەمنداڵی بیٚباوك ناگرن ، بۆهانی یەکتری نادەن خواردن بدەن بەهەژاران ﴿ بل لا تكرمون اليتيم ولاتحاضون على طعام المسكين ﴾

بەڵیٚ ... ڕێزگرتن لەهەتیوو لاکردنەوە لیٚی پاداشتی گەورەی هەیە ، ئەگەر دەست بهێنی بەسەریدا بەسۆز و میهرەبانییەوە ، بەقەدەر مووی سەری خێرت بۆ دەنووسریٚ و ، ئەگەر ژیانی بۆ دابین بکەی لەگەڵ حەزرەتدا ﷺ حەشر دەکریٚی لەقیامەتدا ...

**هەندیٚ لەوانەی کە پێویستە ڕێزیان لیٚ بگیریٚ :**

١- ڕێزگرتن لەحەزرەت ﷺ و فەرموودەکانی :

﴿ انا ارسلناك شاهداً ومبشراً ونذيرا ، لتؤمنوا بالله ورسوله وتعزروه وتوقروه وتسبحوه بكرة وأصيلا ﴾ الفتح : ٩ واتە : ئێمە تۆمان ڕەوانە کردووە ئەی محمد ﷺ کەشایەت و مژدەدەر و بەئاگاهێنەربیت بۆ گرۆی ئادەمیزاد . بۆ ئەوەی ئێوە باوەڕبهێنن بەخوا و پێغەمبەرەکەی و پشتیوانی لەپێغەمبەر بکەن و ڕێزی شایستەی خۆی لیٚ بگرن و تەسبیحات و ستایشی خوا بکەن لەبەرەبەیان و عەسراندا .

هەروەها دەفەرموێت ﴿ لاتجعلوا دعاء الرسول بينكم كدعاء بعضكم بعضاً ، قد يعلم الله الذين يتسللون منكم لواذاً ، فليحذر الذين يخالفون عن أمره أن تصيبهم فتنة أو يصيبهم عذاب أليم ﴾ النور : ٦٣ واتە : نەکەن بانگی پێغەمبەر بکەن ، وەك ئەوەی یەکتری بانگ دەکەن ( چونکە دەبێت ڕێز و قەدری پێغەمبەر ﷺ تایبەتی بێت) ، بێگومان خوا دەزانێت بەوانەی کەخۆیان دەدزنەوە لەکار و فرمان ، دەبا ئەوانەی کەسەرپێچی لەفەرمانی دەکەن

بترسن لەوەی کەتووشی تاقیکردنەوەیەکی سەخت ، یان تووشــی سـزایەکی بـەئێش و ئازاربین .

لەسوورەتی(الحجرات)یشدا دەفەرموێ ﴿يا ايها الذين امنوا لا تقدموا بين يدي الله ورسوله ، واتقوا الله ان الله سميع عليم ، يا ايــها الذيـن امنـوا لا ترفعـوا أصواتكم فـوق صـوت النبـي ولا تجـهروا لـه بـالقول كجـهر بعضكم لبعض أن تحبط أعمـالكم وأنتـم لاتشعرون ، إن الذين يَغُضّونَ أصواتهم عند رسول الله اولئـك الذيـن امتحـن الله قلوبـهم للتقـوى ، لـهم مغفـرة وأجـر عظيـم ، ان الذيـن ينـادونك مــن وراء الحجــرات أكـثرهم لايعقلون ﴾ الحجرات : ٤ واتە : ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێنـاوە لـەبڕیار و پێشنیار دا پێش پێغەمبـەری خوا مەکەون ، لـەخوا بترسـن و پارێزکـاربن ، چونکـە بەڕاستی خـوا بیسەرە بەگوفتارتان و زانایە بەنیاز و نهێنیەکانتان .

ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ، دەنگتان بەسـەر دەنگی پێغەمبـەردا ﷺ بەرزمەکەنەوە لـەکاتی قسـەکردندا ، هـەروەك چۆن قسـە لەگـەڵ یـەکتری دا دەکـەن ، نـەوەکو بـەو دەنـگ بەرزکردنەوەیـەتان خوالێتـان بڕەنجـێ و کردەوەکانتـان پووچـەڵ ببێتـەوە و هەستیشـی پێ نەکەن .

بەڕاسـتی ئەوانــەی بــەدەنگی نــزم لەخزمــەت حــەزرەتدا ﷺ قســـەدەکەن ، ئەوانــە ئەوکەسانەن کـە خـوای گـەورە دڵـەکانیانی زاخـاوداوە بـۆ تـەقوا و خواناسـین ، ئەوانـە لێخۆشبوون و پاداشتی گەورە ئامادەیە بۆیان .

بەڕاستی ئەوانەی لەدەرەوەی ژوورەکانەوە بانگت لێدەکەن ، ئەوانە زۆربەیان نەفامن و ژیری وەرناگرن ﴿ولو أنهم صبروا حتى تخرج اليهم لكان خيراً لهم والله غفور رحيم ﴾ خۆ ئەگەر ئەوانە خۆگربوونایە ، هەتا دەچوویتە دەرەوە بۆلایان ، ئەوەچاکتر بوو بۆیـان ، خوا لێخۆشـبوو میهرەبانـە ...لەئەنجامی ئـەم ڕێنماییـیانـەوە هـاوەڵان تـادوا پلـە ڕێزیـان لەحـەزرەت ﷺ دەگـرت و بـەدەنگی نـزم و لەسـەرخۆ قسـەیان لەگـەڵدادەکرد و لەخزمـەتیا بێدەنگ دادەنیشتن ، هەروەك ئەوەی کە باڵندە بەسەر سەریانەوە بێت و نەیانەوێ بفڕێت لەسەریان ...

زۆریان کە حەزرەت ﷺ وتاری بۆدەدان ، لەگەڵ ئەوەدا کەسەریان داخستبوو هۆن هۆن فرمێسـك بـەچاویاندا دەهاتـە خـوارێ!! هـەزاران ڕەحمـەت و میـهرەبانی خـوا بـڕژێ بەسەریاندا ...

هەمیشە حەزیان دەکرد شتیٚ بکەن ، یان شتێك ببیٚ ، کەمایەی دڵخۆشی ئەوبێت ، کاتێك باوکی حەزرەتی ئەبوبەکر موسڵمان بوو ، ئەبوبەکر فەرمووی : حەزم دەکرد لەجیاتی باوکم ، مامی پێغەمبەر ﷺ موسڵمان ببوایە ، چونکە ئەوە زیاتر چاوی حەزرەتی پیٚڕوون دەبۆوە و ، مایەی دڵخۆشی ئەبوو بۆی .

ئاشکراشە کە دوای کۆچی حەزرەت ﷺ ڕێزگرتن پێویستە لەفەرموودەکانی، هەروەها سەڵەوات و سەلام ، لەدوای ناوهێنانی ...

زانا پایە بەرزە خواناسەکانی ئەم ئوممەتە ، زۆریان بەبیٚ دەستنوێژ ، یان بەپێوە ، یان بەڕێگاوە فەرمایشتی حەزرەتیان نەگێڕاوەتەوە ، دیارە ئەمەش ڕێز و ئەمەکداری‌یە بۆ ئەو محەممەدەی کەجارێکی‌تر هیچ دایکێك وێنەی ئەوی نابێت ...

٢ ـ ڕێزگرتن لەدایك و باوك :

ئایینی پیرۆزی ئیسلام گرنگی زۆری بەدایك و باوك داوە ، تەنانەت ئەگەر کافریش بن پێویستە خزمەتیان بکریٚ و ڕێزیان لیٚ بگیریٚ و ئاخ و ئۆخ نەکرێت لە دەستیان ﴿ ولا تقل لهما اف ولاتنهرهما وقل لهما قولاً معروفاً ﴾ الاسراء : ٢٣ (لەزنجیرەی لەخزمەت قورئاندا چەند جار باسمان کردووە ) ...

٣ ـ ڕێزی پیرو مەشخەڵداری قورئان و فەرمانڕەوای دادپەروەر :

حەزرەت دەفەرموێت : ﴿ ان من اجلال الله تعالى اكرام ذي الشيبة المسلم وحامل القران غير الغالي فيه والجافي عنه ، واكرام ذي السلطان المقسط ﴾ (ئەبوداود ، حديث حسن ) ل ١٤٤ رياض الصالحين . واتە : ڕێزگرتنە لەفەرمان و بەرنامەی خوا ، ئەگەر ڕێز لەموسڵمانی بەتەمەن بگیریٚ و ، ڕێز لەو مەشخەڵدارەی قورئان بگیریٚ کەنەزیادڕەوی تیادەکا و نەفەرامۆشی دەکات ، وە ڕێز لەفەرمانڕەوای دادپەروەر بگیریٚ ...

هەروەها دەفەرموێت ﴿ ليس منا من لم يرحم صغيرنا ويعرف شرف كبيرنا ﴾ ترمذي ( حسن صحيح) واتە : لەئێمە نیە کەسێك بەزەیی بەبچووکدا نەیەتەوە و ڕێزی گەورەمان نەگرێت ...هەروەها دەفەرموێت ﴿ ما أكرم شاب شيخاً لسنه الا قيض الله له من يكرمه عند سنه ﴾ ترمذي ( ل ١٩٢ رياض الصالحين) .

واتە : هەر لاوێك ڕێزی پیرێك بگرێت ، لەبەرپیری‌یەکەی ، خوای گەورە یەکێکی بۆ دەنێریٚ کەلەپیری ئەمیشدا ڕێزی لیٚ بگریٚ ، خوا هەر لەدنیادا هەقی بۆ دەکاتەوە.

**٤ ـ ڕێزگرتنی میوان :**

**حەزرەت ﷺ دەفەرموێت :** ﴿من كان يؤمن بالله واليوم الاخر فلا يؤذ جاره ، ومن كان يؤمن بالله واليوم الاخر فليكرم ضيفه﴾ **واتە : هەرکەس باوەڕی بەخوا و بەرۆژی دوایی هەیە با ئازاری دراوسێی نەدات ، وە هەرکەس باوەڕی بەخوا و بەرۆژی دوایی هەیە بارێز لەمیوانی بگرێت .**

**٥ ـ ڕێزگرتن لەئەندامەکانی لەش**

**بڕواناکەم لەهیچ بەرنامە و پەیڕەوو پڕۆگرامێکی ئەم دنیایەدا ، وتەیەکی جوانی وەك ئەم وتەیەی حەزرەت ﷺ هەبێت ، کاتێك هاوەڵێك هات و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا سەرو قژم زۆرە ، ئایا خزمەتی بکەم و بیشۆم و دایبهێنم قەیناکە ؟! ئەویش فەرمووی ( بل اکرمها) ...نەك هەر ئەوەندە بەڵکو ڕێزی قژت بگرە ...**

**ئای ئەم ئیسلامە چەندە ناوازە و بەرزە ، لەکوێدا هەیە ڕێزگرتن لەئەندامەکانی لەش و لەقژ ...**

**ئاشکرایە لەشەرعدا ڕەوانیە کەسێك لایەکی لەبەرسێبەربێت و لایەکی لەبەر هەتاو ، یان دەبێ بەتەواوی بچێتە بەر سێبەر یان ئەگەر ناگونجێ بالەبەر هەتاوبێت !**

**ژنێك نەزری کردبوو قسەنەکات و لەبەر هەتاوبێت ، کە حەزرەت ﷺ بەمەی زانی فەرمووی : با قسە بکات و بچێتە بەر سێبەر ، خواشتی وای ناوێت ...**

**بەڕێز ترین کەس لای خوا :**

**قورئانی پیرۆز دەفەرموێت :** ﴿يا ايها الناس انا خلقناكم من ذكر وانثى وجعلناكم شعوباً وقبائل لتعارفوا ، ان اكرمكم عند الله أتقاكم ، ان الله عليم خبير﴾ الحجرات : ١٣

**واتە : خەڵکینە ئێمە ئێوەمان لەنێر و مێیەك دروست کردووە ، وەکردوومانن بەچەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆر بەجۆر ، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆشبێت بەیەکەوە ... بەراستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەیە ، کە زۆر تر پارێزکارن ، بێگومان خوا زانا و ئاگادارە بەهەمووان ...**

**دیارە هەرکەس خوا بەڕێزی بکات ئەوە ڕێزدارە و هەرکەسەش خوا ڕیسوای بکات ئەوە ڕیسوای ڕاستەقینەیە و کەس ناتوانێت فریای بکەوێت ، قورئان دەفەرموێت** ﴿الم تر أن الله يسجد له من في السماوات ومن في الارض والشمس والقمر والنجوم والجبال والشجر والدواب وكثير من الناس وكثير حق عليه العذاب ، ومن يهن الله فما له من مكرم ان الله يفعل مايشاء﴾

واتـه : ئایا نـەتبینیوە و نەتبیستووە کـە بەراستی هەرکـەس و هـەرچی هەیـە لـە ئاسمانەکان و زەویدا سوجدە بۆ خوا دەبەن ، هەروەها خۆر و مانگ و ئەستێرە و چیاکان و درەخت و مالآت و زۆرێك لەخەڵکی ، زۆرێکیش خۆی شایستەی سزاو تۆڵەکردووە ، ئەوەی خوا قەدر و ڕێزی بشکێنێت و ریسوای بکـات ، ئـەوە هیـچ ڕێزلێنـەرێکی نیـە ، بەراستی خوا ئەوەی بیەوێ دەیکات .

**بڕوادار ڕێز لەخۆی دەگرێت :**

بڕوادار بەهۆی بڕواکەیەوە ، پایە بەرز و بەڕێزە ، هەرچەند لەهەموو سـەردەمێکدا نەفام و ستەمکاران هەردەبن کەدژایەتی بکەن و تانە و تەشەری لێبدەن، بۆیە ڕێز لەخۆی دەگرێ و دانابەزێ ، قورئان ئاماژە بەم ڕەوشتە دەکات و دەفەرموێت : ﴿ وعباد الرحمن الذين يمشون على الارض هوناً واذا خاطبهم الجاهلون قالوا سلاماً ﴾ الفرقان : ٦٣ واتە : بەندەکانی خوای میهرەبان ئەوکەسانەن کە زۆر بەهێمنی و سەلاری بەسەرزەویدا دەڕۆن ، کاتێکیش نەفامان بەقسەی ناخۆش بـەرەنگاریان دەبـن ، لـەوەلآمیاندا دەڵێـن ، سـلاو ( بەمەش ڕەوشت بەرزی خۆیان دەنوێنن ) ئنجا باسی چەند سیفەتێکی تریان دەکات تا دەگاتە ﴿ واذا مروا باللغو مروا كراماً ﴾ الفرقان : ٧٢ واتـە : کاتێکیش بـەلای گـەمـە و گاڵتـەی نـەفامانـدا تێدەپـەڕن ، ڕێز لـەخۆیان دەگـرن و لاناکەنـەوە بـەلایاندا و بـەهێمنی و لەسەرخۆیی و سەربەزیەوە تێدەپەڕن .

**ڕێزداری یان ریسوایی لەقیامەتدا :**

ئەوانـەی کـەڕێزدار و خواناسـن ئەوانـە سـەرەنجام دەسـتی ڕێزیـان لێدەنرێـت و بەبەهەشتی بەرین پاداشتدەدرێنەوە و ڕێزیان لێدەگیرێ و ناز و نیعمـەتێکیان پێدەدرێت کە نەچاودیویەتی و نەگوێ بیستوویەتی و نەبەدڵی کەسیشدا هـاتووە...﴿ اولئـك فـي جنات مكرمون ﴾ المعارج : ٣٥

خراپەکاران و تاوانبارانیش ، هەورەك چۆن لـەدنیادا بێڕێـز و دووربـوون لەرەحمەتی خـوا ، لەئاخیرەتیشدا لـەناو دۆزەخـدا ریسـوا دەکرێـن و سـزای سـەخت دەنۆشـن ﴿ ومـن الناس من يشتري لهو الحديث ليضل عن سبيل الله ويتخذهـا هـزواً ، اولئـك لـهم عذاب مـهين ﴾ لقمـان : ٦ واتـە: هـەندێك لەخەڵکی هـەن قسەی بێخێر و بێمانـا دەکـەن ، تـا خۆیان و کەسانی تریش لەرێبازی خوا وێڵ بکەن و گاڵتە بەبەرنامەی خوابکەن ، ئائەوانە سزاو تۆڵەیەکی ریسواکەر و ئابڕووبەر چاوەڕێیانە .

# سینه سافی

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ﴿ ان الله يحب العبد التقي الغني الخفي ﴾ مسلم واحمد واتە : بەڕاستی خوا بەندەی پارێزکاری دەوڵەمەندی شاراوەی خۆش دەوێت...( دیارە دەوڵەمەندی بەهەردوو لایەنەکەیەوە ، بوونی ماڵی دنیا کەهەقی خوای لێ بدرێت و لەدەستا بێت و نەچێتە دڵەوە ، هەروەها دەوڵەمەندی نەفس کە حەزرەت ﷺ دەفەرموێ ( الغنى غنى النفس)...

لەپێغەمبەر ﷺ پرسیارکرا : کێ چاکترین کەسە ؟ فەرمووی : ( كل مخموم القلب صدوق اللسان ) وتیان (صدوق اللسان ) دەزانین ، ئایا (مخموم القلب) چیە ؟ فەرمووی : (هو التقي النقي لا اثم فيه ولا بغي ولا غل ولا حسد ) (ابن ماجه ، طبراني ، بيهقي ) الصحيح الجامع ٣٢٩١ واتە : (مخموم القلب) ئەو پارێزکارە دەروون پاکەیە کە دڵی نەگوناهو نەخراپە و نەڕق و کینە و نەئێرەیی تیا نیە بەرامبەرکەس .( وشەی مخموم لە ( خممت البيت) ەوە هاتووە ،واتە گسك دان لەناوماڵ و پاکردنەوەی ) .

بۆ نەوەی بگەینە نەو پلە نیمانیە :

١ ـ خۆبەزل نەزانین :

دەبێت خۆمان بەگەورە و پایەدار نەزانین و هەمیشە لەکەم و کورپیمان بترسین و بەخۆماندا بچینەوە ، واتە ترس و هیوا (الخوف والرجاء) لەدڵماندا بێت ـ حەزرەت ﷺ سەردانی لاوێکیکرد لەسەرەمەرگدا بوو ، فەرمووی : حاڵت چۆنە ؟ وتی : ئەی پێغەمبەری خوا هیوام بەرحمی خوایە و لەگوناهەکانیشم دەترسم ، حەزرەت ﷺ فەرمووی : ئەم دووشتە لەدڵی هەرکەسێکدا کۆببێتەوە ، خوای گەورە ئەوەی هیوای پێیەتی ئەیداتێ و دەشیپارێزێ لەوەی کەلێی دەترسێ .

عومەری کوڕی خەتتاب دەڵێت : ئەگەر بانگدەرێك بانگ بدات لەرۆژی قیامەتدا و بڵێ تەنهایەك کەس دەچێتە دۆزەخەوە ، دەترسم من بم ، وە ئەگەر بڵێ تەنهایەك کەس دەچێتە بەهەشتەوە ، هیوام وایە من بم ...

❁ پیاوباشان زیاتر ترسەکەیان زاڵ بووە ، بۆ ئەوەی خۆیان چاکتر بکەن و لەخۆیان بایی نەبن ، ( بکر عبدالله المزنی) لە رۆژی عەرەفەدا لەکێوی عەرەفە وتی ( لا الـه الا الله لو اني فيهم لقلت قد غفر الله لهم ) واتە تەنها هەر خوایە شایەنی پەرستنە ، ئەگەر منیان لست

تیانەبوومایە ، دەمووت بەراستی خوا لەهەموویان خۆش دەبێت ( واتە رەنگە بەهۆی خراپی منەوە خوا غەزەب لەوانیش بگرێت )

❁پیاوباشێك دەڵێت ، یەك لەسەر سێی هاوەڵانم بینی هەموو دەتووت لەپلەی ئیمانی (جوبرائیل و میکائیل) دان کەچی لەدووڕوویی دەترسان .

**٢ ـ لێخۆش بوون و سنگ فراوانی :**

یەکێك لەسیفەتەکانی بڕواداران ئەوەیە کەداوا دەکەن و لەخوا دەپاڕێنەوە ﴿ ربنا اغفر لنا ولأخواننا الذين سبقونا بالايمان ولا تجعل في قلوبنا غلا للذين امنوا ربنا انك رؤوف رحيم ﴾ الحشر : ١٠ واتە : پەروەردگارا لەئێمە و لەوبرایانەشمان خۆش ببە کە پێش ئێمە ڕێبازی ئیمانیان گرتە بەر و لەدڵەکانماندا هیچ جۆرە بوغز و کینەیەك مەهێڵە بەرامبەر ئەوانەی ئیمانیان هێناوە ، پەروەردگارا تۆ بەراستی بەسۆزو و بەخشندە و میهرەبانیت .

هەروەها قورئان بەحەزرەت ﷺ و بەموسڵمانان دەفەرموێت :﴿ خذ العفو وأمر بالعرف وأعرض عن الجاهلين ، واما ينزغنك من الشيطان نزغ فاستعذ بالله انه سميع عليم ، ان الذين اتقوا اذا مسهم طائف من الشيطان تذكروا فاذا هم مبصرون ﴾ الاعراف : ١٩٩

واتە : کاری ئاسان لەخەڵکی داوابکە و چاوپۆشی لەهەڵە و کەم کوڕی‌یەکانیان بکە و خەڵکی عەفوبکە بۆ ئەوەی خوا عەفوت بکات ، کە تۆ یەکێکت عەفو کرد ، وەك ئەوەیە کە عەفووی خوات وەرگرتبێ بۆیە هەردوو مەبەستەکە کورت دەکاتەوە وباسی (فاعف) ناکات و یەکسەر دەفەرموێ : (خذ العفو) ( ئەمە بۆچوونی شێخ متولی شەعراویە ) . هەروەها فەرمان بدە بەچاکە و کردەوەیەك کەپەسەندی شەرعە ، رووش وەرگێڕە لەنەفام و تێنەگەیشتوان . جا ئەگەر شەیتان تووشی وەسوەسەی کردیت و ویستی بێ بەلاتا پەنا بگرە بەخوا ، چونکە بەراستی ئەو زاتە بیسەر و زانایە .

بەراستی ئەوانەی کەپارێزکار و تەقواداران ، کاتێك خەتەرە و خەیاڵاتێك لەلایەن شەیتانەوە بەدڵیانابێت ، ئەوا خێرا بێدار ئەبنەوە و خوای خۆیان بیردەکەوێتەوە ، ئنجا دەسبەجێ بەرچاویان روون دەبێت و رێی راستیان لێ‌ناشێوێت .

**حەزرەت ﷺ ئامۆژگاری دەکات لەرێی پیاوێکەوە :**

حەزرەت ﷺ لەگەڵ هاوەڵاندا دانیشتبوو لەمزگەوتدا فەرمووی : ئێستا پیاوێك دێتە ژوورەوە ئەهلی بەهەشتە ، لەوکاتەدا پیاوێك کە ئاوی دەستنوێژ لە ریشی دەتکاو جووتێ نەعل بەدەستی چەپیەوە بوو خۆی کرد بەمزگەوتدا ...

بۆ سبەینێش حەزرەت ﷺ هەمان شتی فەرموو ، هەمان پیاو هاتە ژوورەوە ، بۆ رۆژی سێیەمیش بەهەمان شێوە ... عەبدوڵڵای کوری عەمر ، حەزیکرد بزانێ ئەوپیاوە چ کارێك دەکات وا گەیشتۆتە ئەو پلەوپایەیە بۆیە چوو بۆلای و وتی : من لەگەڵ باوکم زویر بووم و سوێندم خواردووە سێشەو نەرۆمەوە ماڵەوە جانازانم بەمیوان رام دەگریت ، ئەویش بەگەرمی پێشوازی لێکرد و پاش سێشەوەکە ، عەبدوڵڵا شتێکی زیادەی وای نەبینی کە ئەمان نەیانبێت ، بۆیە پێی وت : برا من هیچ شتێکم نیە لەگەڵ باوکمدا ، تەنها ویستم بزانم چ کارێك دەکەیت کە ئێمە نەمانکردبێ تاچاوت لێ بکەم ، چونکە حەزرەت ﷺ سێ رۆژ بەو جۆرە باسی تۆی کرد... ئەویش وتی : من لەدڵمدا هیچ شك نابەم بەرامبەر موسڵمانان و ، حەسەد بەهیچ کەس نابەم ئەگەر خواشتێکی پێدابێت ...

عەبدوڵڵاش وتی : ئەمەیە تۆی ئاوا بەرزکردۆتەوە کە بەهەموو کەس ناکرێت !

**کێ هەیە وەك ئەبی ( ضمضم )بێت :**

رۆژێك حەزرەت ﷺ بەهاوەڵانی فەرموو : کەس هەیە وەکو ( ابوضمضم ) ی پێبکرێت ، وتیان ( ئەبوضمضم )کێیە ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی : ئەوە پیاوێکە بەیانیان کەرۆژی لێبوەوە دەڵێت : خوایە من سەر و ناموسم بەخشیوە ئیتر هەرکەس قسەی پێ بووتایە وەڵامی نەئەدایەوە و ، ستەمی نەئەکرد بەرامبەر ئەوانەی کەستەمیان لێ دەکرد و ، دەست درێژی نەئەکردە سەر ئەوەی کەدەستدرێژی دەکردە سەر ) ئەبوداود وطبرانی .

( البزار )یش لەپەراوی ( کشف الاستار) دا لەبابی ( الزکاة ) دا دەڵێ : رۆژێك حەزرەت ﷺ هانی هاوەڵانیدا بۆ خێر و سەدەقە ، (علبە ی کوری زەید) هەستا و وتی: من لەبەر ئەوەی هیچم نیە ، تەنها سەروناموسی خۆم دەبەخشم ، هەرکەس هەرچی پێ وتم وستەمی لێکردم گەردنی ئازادبێت ...

حەزرەت پاش ماوەیەك فەرمووی : ( کوا علبەی کوریزەید ) ، دووسێ جار دووبارەی کردەوە ، ئنجا کە(علبە) هەستا ، پێی فەرموو ( تۆیت سەر و ناموسی خۆت بەخشی ، خوا لێی وەرگرتیت ) ...

**کاری کەم و پاداشتی زۆر :**

سوفیانی کوری دینار بە( ابی بشر ) دەڵێ کە هاوەڵی ئیمامی عەلی بوو ، هەواڵم بدەرێ لەبارەی ئیشی پێشینانمانەوە ، ئەویش وتی : ئەوان کاری کەمیان دەکرد و پاداشتی گەورەیان وەردەگرت ، وتی : باشە چۆن ؟ وتی : ئەوان دڵ وسینەیان ساف و

بێگەردبوو فضيلی کوڕی عياض دەڵێ : ئەوانەی لای ئێمە گەیشتوونەتە پلەی بەرز ، بەزۆری نوێژ و ڕۆژوو نەبووە ، بەڵکو بە سەخاوەتی نەفس و سینەسافی و دڵسۆزیان بووە بۆ ئوممەت .حەزرەتیش ﷺ بۆ ئەم مەسەلەیە دەفەرموێت : ( ان المؤمن ليدرك بحسن الخلق درجة الصائم القائم ) ئەبوداود و ئەحمەد / واتە : بەراستی بڕوادار بەڕەوشتی جوان ئەگاتە پلەی ئەوکەسەی کەهەمیشە بەرۆژووەو خەریکی شەونوێژە .

**حەزدەکەن خوالێتان خۆش بێت ؟**

ئەبوبەکر مانگانە هاوکاری هاوەڵێکی خزمی دەکرد لەبەرئەوەی هەژاربوو ، کاتێك زمانی نەپاراست و بووختانەکەی بلاّودەکردەوە بەنەفامی بۆ عائیشە ، ئەبوبەکر رقی هەستا و سوێندی خوارد ئیتر هاوکاری نەکات ... خوای گەورەش ئەم ئایەتی ناردە خوارەوە ﴿ ولا يأتل اولوا الفضل منكم والسعة أن يؤتوا اولي القربى والمساكين والمهاجرين في سبيل الله ، وليعفوا وليصفحوا ألا تحبون أن يغفر الله لكم والله غفور رحيم ﴾ النور : ٢٢ واتە : ئەوانەی خاوەنی سامان و بەخشندەیین لەئێوە باسوێند نەخۆن کەیارمەتی خزمان و هەژاران و کۆچکەران لەپێناوی خوادا نەدەن، دەبا لێبوردەبن و، چاوپۆشی بکەن ، مەگەر حەزناکەن خوالێتان خۆش بێت ، خواش هەمیشە لێخۆشبوو میهرەبانە .ئەبوبەکریش فەرمووی : بەڵێ ئێمە حەزدەکەین خوا لێمان خۆش بێت ، بۆیە لەخزمەکەی خۆش بوو ، وە هەموو مانگێك هاوکاریی یەکەی دەدایە .

**لێخۆشبوون عیززەتە :**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ( مازاد الله عبداً بعفو الا عزاً ) مسلم / واتە هەرکەس لێخۆشبوو بێت خوا عیززەتی بۆ زیاد دەکات .

﴿ بەبوخاری‌یان وت : چۆن دوعاناکەیت لەوانەی بوختانیان بۆ کردوویت و ئازاریان داویت ، وتی : حەزرەت ﷺ فەرموویەتی : ( اصبروا حتى تلقوني على الحوض) بخاري واتە : ئارام بگرن تا لەسەر حەوزی کەوثەر بەمن دەگەنەوە .

﴿ زين العابدين ئامۆزایەکی لێی توڕە دەبێت و قسەی پێ دەڵێت ئەویش هیچ وەلاّمی ناداتەوە ، شەوێ دەچێت بۆ لای و دەڵێ : ( برام ئەگەر ئەوەی وتت راستە ، خوالێم خۆش بێت ، وە ئەگەر ئەوەی وتت وانیە خوا لەتۆ خۆش بێت ) . ئیتر خوات لەگەڵ ئەویش لەم رەفتارە جوانە شەرمەزار بوو ، پەیمانی‌دایە کەجارێکی‌تر شتی وانەکاتەوە .

﴿ هاوەڵێکی ئیمام ئەحمەد شەو لەماڵیان میوان دەبێت ، سەیر دەکات ئەوشەوە ئیمام ئەحمەد زۆر دەگری ، بەیانی لێی دەپرسێ کە بۆچی ئەمشەو ئەوەندە گریای،

ئەویش دەڵێت : بیرم لە لێدان و قامچییەکانی خەلیفە موعتەصەم کردەوە لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە بیرم لەم ئایەتە کردەوە کە دوێنێ لەوانەیەکدا بەقوتابیەکانم وتەوە کە دەفەرموێت : ﴿وجزاء سيئة سيئة مثلها ، فمن عفا واصلح فاجره على الله﴾ ... بۆیە منیش سوجدەم بۆ خوا بردو گەردنی هەموو ئەوانەم ئازاد کرد کە ئازاریان داوم ، ئێمەچ سوودێك وەردەگرین ئەگەر برایەکی موسڵمان بەهۆی ئێمەوە سزابدرێت ، لەکاتێکدا ئەگەر لێی خۆش بین چاکترە چونکە خوالێمان خۆش دەبێ ..

۞ ئیبن تەیمیەش هەرگیز دوعای لەکەس نەکردووە ، بەپێچەوانەوە دوعای دەکرد بۆ ئەوانەی کەدژایەتیان دەکرد ، رۆژێك مژدەیان بۆ هێنا کەیەکێ لەدوژمنە سەرسەختەکانی مردوون ، ئەویش پێی ناخۆش بوو کە مردووە و پاشان چوو سەرەخۆشی کرد لەکەسوکاری و وتی هەرچیتان پێویست بوو من لەخزمەتتاندام .

بەڵێ ... بەلێخۆشبوون دڵ ئارام دەبێت و مرۆڤ پاداشتی گەورە وەردەگرێت ، رۆژێك پیاوێك بەعەمری کوری عاصی وت : بەخوا هەقت لێدەکەمەوە و چارت دەکەم، ئەویش وتی : دەی برا بۆ خۆت خراپە سەرقاڵ دەبیت ...

ئەبو دووجانە لەسەرەمەرگدا زۆر دڵخۆشبوو ، پرسیاریان لێکرد چۆن ئاوا دڵخۆشە وتی : قسەم لەشتێکدا نەکردووە پەیوەندی بەمنەوە نەبووبێ و هەرگیز دڵم هیچی تیانەبووە بەرامبەر موسڵمانان و دڵو سینە ساف بووم ..

لەکۆتاییدا وەك حەزرەت لەخوا دەپارێینەوە ( اللهم اني أسالك الثبات في الامر وأسالك قلباً سليما ) نسائي و احمد / پەروەدگارا من داوای دامەزراوی و داوای دڵێکی چاك و پاك و بێ غەل و غەشت لێدەکەم (پەراوی الانقياء)

## ئاسۆی هیمەت بەرزان

سەکینەی ئیمانی و لەززەتی وامان لێناکات دانیشین لەسوچێکی خەڵوەتگادا و خەریکی زیکر و فیکر و یادی خوابین ، بەڵکو لەگەڵ زیکر و فیکر و یادی خوادا ، هەوڵی بەردەوام و نەسرەوتن کارمانە بۆ گەیاندنی ئاینی خوا و (مراغمەی شەیتان)...

۞ لەسەرەتادا شەیتان دەیەوێت لەپڕ گومانی کوفر بخاتە دڵەوە و بەمەش خەڵکانێکی زۆری لەهەموو کاتێکدا سەرگەردان کردووە ، هەرچەندە ئەمە لەلای شوێن

کەوتوانی حەزرەت دا ﷺ کەمترە بەهۆی بەڵگەو بورهانی ئیمانیی‌یەوە ، بەتایبەت لەلای بانگخوازان .

۞ ئەگەر شەیتان ئەمەیانی بۆ نەکرا ئەوا هەوڵ دەدات بڕوادار بەرەو بیدعە و زیادوکەم لەعەقیدە و کاردا ببات ، بەمەش کەسانێکی زۆر گیرۆدە دەکات ، تەنانەت بانگخوازانیش ئەمەیان تووش دەبێت و لێرەوە هۆشیارکردنەوەی بەردەوام پێویستە بۆیان ...

۞ پاش ئەمە شەیتان هەواو ئارەزوو ، وەگوناهی گەورە جوان دەکات ، کە ئەمەش زۆرکەسی پێوە گیرۆدەیە ، هەرچەندە بانگخوازان زۆربەیان لەمەوە دوورن .

۞ شەیتان نەفەسی درێژە و ئەگەر ئەمانەی بۆ نەکرا ئەوا بە گوناهی بچووکەوە بڕوادار سەرقاڵ دەکات ، ئەوانەش کە بێ ئاگان ، لەم کێشمە کێش و بگرە و بەردەیەدا بریندار دەبن ، جا ئەگەر بانگخوازان بەهۆی هۆشیاریانەوە برینداریش نەبن ، رەنگە زۆریان بڕوشێن و کەم تا زۆرێك کاریان تێ‌بکات .

۞ شەیتان دەزانێت کەنابێ بەئاشکرا ڕوو بەڕووی بانگخوازان ببێتەوە ، چونکە ئەوان هۆشیار و زیرەکن و هیممەتیان ئەوەندە بەرزە بەئاسانی فریونادرێن ، بۆیە لەبەرگی ئامۆژگاری کاردا دێتە پێشەوە و وایان لێدەکات بەشتی (مباح)ەوە سەرقاڵیان بکات و وردە وردە ساردببنەوە ، بانگەوازیش( الدعوة )ئالێرەدا پێوویستت دەبێت لەسەری کەداوا لەبانگخوازان بکات زۆر خەریکی (مباحات) نەبن ، بۆئەوەی سەرقاڵ نەبن و دوورنەکەونەوە لەگۆڕەپانی هەوڵ و خەبات .

هەروەها بۆئەوەی هەمیشە گەرم و گوڕ و گیان لەسەر دەست و ئامادەبن بۆ هەموو ئەوپێشهاتانەی کەدێنەڕێ یان لەناو کۆمەڵگادا ..

۞ ئەگەر شەیتان لەهەموو ئەمانەدا سەرنەکەوت و زەفەری بە بانگخوازێك نەبرد، ئەوا هەوڵ دەدات ئەولەویەتی لێ بشێوێنێ ، واتە ئەگەر بانگخوازێك هەق بێت خەریکی زانست و زانین بێ ، وای لێدەکات خەریکی هەندێ سوننەت و کاری وابێ ، هەرچەند خێرن ، بەڵام لەشتانێك دوای دەخەن کە بۆ ئەو خێرترن .

۞ ئنجا ئەگەر بانگخواز لیستی ئەولەویاتی لێ نەشێواو نەبوو بەداوی شەیتانەوە ئنجا هەوڵ ئەدات کەدڵناسکی بکات ، بەجۆرێك ئەگەر ئەم چاکەیەکی کرد و ئەوانەی

دەوروبەری پێیان نەزانی ، یان بەچاکی مامەڵەیان لەگەڵدا نەکرد ، زوو دڵی گەرد بگرێ و هەمیشە لەبیانووبێت و لەسەر پێبێ بۆ خۆ تۆراندن و دوورکەوتنەوە ...

ئەمەش بەوەچارەبێت کەڕەوشت بەرزی و سنگ فراوانی بێتە کاڵای باڵامان و هەرکەس نیەتی خێر بوو بەرامبەرمان پێ بزانین و سوپاسی بکەین ، خۆ ئەگەر نیەتەکەشی بوو بەکردەوەی چاك بەرامبەرمان زیاتر دەستی رێز و حورمەتی لێ بنێین .

خەلیفە مەئمون دەڵێ : ( من لم يحمدك على حسن النية ، لم يشكرك على جميل الفعال ) واتە : هەرکەس سوپاست نەکات لەسەر نیەت چاکی ، سوپاسیشت ناکات لەسەر کردەوەی چاك ...

بەڵێ مەسەلەی نیەت زۆر گرنگە ، ئەگەر دۆستێك دڵنیابین کەنیەتی خراپ نیە بەرامبەرمان ، ئەگەر کارێکی نابەجێی بەرامبەرمان لێوەشایەوە هەقە زوو پیاهەڵنەشاخێین و نیەتە باشەکەی شفاعەتی بۆ بکات لەلامان .

خۆ ڕاستە ئێمە هەموو حەز بە دۆست و هاوەڵی نموونەیی دەکەین ، کە دڵفراوان و بێکەم و کوڕی بێ ، بەڵام هەروەك وتراوە ( من طلب أخاً بلاعيب صار بلا أخ ) واتە : هەرکەس بەدوای بەندەی بێ عەیب دا بگەڕێ بیکا بەهاوەڵی ، بێ هاوەڵ و بێبرا بەتاقانەیی دەمێنێتەوە .

دەستکەوتنی برایەکی ڕاستەقینەی بێ غەل و غەش هەموو موڵکی دنیا دێنێ بۆیە کە (مخارق) ئەم دێڕە هۆنراوەیەی ( ابی العتاهيه )ی بۆخەلیفە ( مأمون ) خوێندەوە :

واني لمحتاج الى ظل صاحب

يروق ويصفو ان كدرت عليه

واتە : من پێویستم بەسایەی هاوەڵێکە کە هەر ڕوون و چاك بێت ، ئەگەر من لێڵیش بووم بەرامبەری و کەم و کوڕیشم هەبێ ...

(مامون) حەوت جار پێی دووبارە کردەوە و پاشان وتی: (ئەی (مخارق) خەلافەتەکەم بەرە بۆ خۆت و هاوەڵێکی وام بدەرێ ئەگەر دەست دەکەوێت !

❁ شەیتان وا دەکات زوو هەڵچین و زوو بەر پەرچ بدەینەوە ، بەڵام دەبێ بزانین کەس بێجگە لەپێغەمبەران (معصوم) نیە .. کە ئەمەش حاڵی بووین دەبێت لەبەر خوا دەست بەینە باڵی ئەوانەی کە دەخلیسکێن ، بەتایبەت ئەوانەی بەتاوانکار و خراپەکار نەناسراون ، تەنها جارێك یان چەند جارێکی کەم شتێکیان لەدەست قەوماوە ، حەزرەت

❁ **دەفەرموێت :** ( اقيلوا ذوي الهيئات عثراتهم ) **واتە : کەسی بەشان و شەوکەت و نەناسراو بەخراپەکاریی ئەگەر کەوت زوو دەست بدەنە باڵی باهەستێتەوە .**

❁ **بڕوادار بەردەوام وا لەکێشمە کێشدا لەگەڵ نەفامی و شەیتاندا ، جا ئەوانەی کەبەرچاو ڕوون و شارەزان زیاتر دەتوانن لووتی شەیتان بشکێنن و خوا لەخۆیان رازی بکەن . قورئان دەفەرموێت :**﴿ ذلك بأنهم لايصيبهم ظمأ ولا نصب ولا مخمصة في سبيل الله ولايطئون موطئاً يغيظ الكفار ولاينالون من عدو نيلاً الا كتب لهم به عمل صالح ، ان الله لا يضيع أجر المحسنين ﴾ التوبة : ١٢٠ **واتە : بەڕاستی هیچ تینوویەتی و ماندوبوون و برسێتیەکیان تووش نەدەهات لەپێناوی خوادا بەزایە بچێت و ، نەدەچوونە هیچ شوێنێك و پێیان نەدەخستە هیچ جێیەك بێ باوەڕان پیێی سەغڵەت بێ و دەستیان لەهیچ دوژمنێك نەدەوەشان ، کەنەبێتە هۆی ئەوەی بەکار و کردەوەیەکی چاك بۆیان تۆمارنەکرێت ، بەڕاستی خوا پاداشتی چاکەکاران ون ناکات و بەزایەی نادات .**

**هەروەها دەفەرموێت :** ﴿ ومثلهم في الانجيل كزرع أخرج شطأه فازره فاستغلظ فاستوى على سوقه يعجب الزراع ليغيظ بهم الكفار ﴾ الفتح : ٢٩ **واتە : نموونە و پێناسەی بڕواداران لەئینجیلیشدا وەك رووەکێك وایە کەلەسەرەتاوە چەکەرە بکات و پاشان ئەستووربێت لەسەر قەدەکەی ، ئەوەندە زوو پێبگات کشتیارەکان سەرسام بکات و پێیان سەیر بێت : چۆن واپێگەیی ؟! چۆن ئاوا خۆی گرت ؟! ئەم پێناسەیە بۆ ئەوەیە خوا داخ و خەم بدات بەکافران ...**

**بەڵێ نەش ونمای موسڵمانان قین و داخ دەکا بەدڵی کافراندا و خەریکە لەداخا بتەقن و هەلاهەلا بن ، جا بڵێن** ﴿ قل موتوا بغيظكم ان الله عليم بذات الصدور ﴾ ال عمران ١١٩ **واتە : دەبمرن لە داخا ، خوا دینی خۆی هەر سەر دەخات و هەمیشە پشت و پەنای موسڵمانانە .**

**خەم وداخ دان بە کافران لەکاتی ڕوو بەڕوو بوونەوە و دووبەرەکیدا و ، بڕوای پتەوو ئیمانی دامەزراوو تەزاندنی لووتی شەیتان مەسەلەیەکە و ، هەر لێرەشەوەیە کە کاتێك شەیتان دەیەوێت بڕوادار لەنوێژدا سەرقاڵ بکات و ژمارەی ڕکاتەکانی لێ تێك بدات ، حەزرەت فێرمان دەکات کەمەکە حساب بکەین و نوێژەکە تەواوبکەین و دوایش دوو سوجدەی سەهو ببەین ، ئەم دوو سوجدەیە کاری شەیتان پووچ دەکاتەوە و خەمی پێدەخوات ،هەروەك دەفەرموێت** ( ان صلاته تامة ، كانتا (أي السجدتين ) ترغمان أنف الشيطان ) مسلم **گێڕاویەتیەوە ...**

لەکۆتایی‌دا ... بەرەو ئاسۆی هیممەت بەرزان ... با زیاتر دڵفراوان بین ، بارەوشت و خومان چاك بکەین و با زیاتر بەرچاو روون بین و شارەزابین لەفرت وفێڵی شەیتان و پیلانەکانی ... سا بەڵکو خوای گەورە لەخۆمان رازی بکەین ...

## هیوایەتی کۆکردنەوەی تۆزوخۆڵ !

ئەگەر بانگخوازێك بیەوێ دڵخۆش بکات ، بادڵ بەو بازرگانیە بێوێنەیە خۆش بکات کە پڕ خێر و بەرەکەت و ڕوون و ئاشکرا و بێ پێچ و پەنایە ...

بازرگانی بانگخوازان لەگەڵ خوادا ، وەکو بازرگانی خەڵکانی تر نیە ، هیچ ترسی دابەزینی نرخی دۆلار و کێشەی ناردن و تەحویلی پارە و کێشەی بۆرصەکانی تیا نیە ...

نرخی سەهمەکان دیاری‌یە و چەند زیاتر ماندووبێت زیاتر خوالێی رازی دەبێت و پاداشتی دەداتەوە و قازانج دەکات.

قازانجێك لەدەقاتەوە هەتا حەوتسەد قات بگرە زۆر لەوەزیاتریش ﴿ واللە یضاعف لمن یشاء ، واللە واسع علیم﴾ البقرة:٢٦١ .

بۆیە هەر بڕوادارێك لەم بازرگانی‌یە تێبگات ، شەوو رۆژ دەداتە دەم یەك و پیاوانە قۆڵی لێ هەڵدەماڵێت و کات بەفیڕۆ نادات .

ئای چ خۆشی‌یەکە ، گەیشتن بەپێغەمبەران و پیاوچکان و شەهیدان و راستگۆیان و هاوەڵی‌کردنیان بۆ هەتا هەتایی ، سەرباقی هەموو ئەوانەش نیعمەتی بینینی خوای گەورە کە لەهەموو نیعمەتێك گەورەترە .

ئاشکرایە بەهەشتیش پلەپلەیە ، هەر پلەیەك بتەوێ بیگەیتێ ، نرخی خۆی هەیە و ، هەوڵی تایبەتی خۆی دەوێت ، کەدەستیشت کەوت یەکجاری و موڵکایەتی‌یە و حسابی کرێچیت بۆ ناکرێ !

بەهەشت بەزەحمەت و نارەحەتی تەنراوە و ژیانیش ئەو هەوڵ و زەحمەت و رەنجەیە کە ئەدرێت بۆ گەیشتنە بەهەشت ﴿ یا ایها الانسان انك کادح الی ربك کدحاً فملاقیه ﴾ الانشقاق : ٦ واتە : ئەی ئادەمیزاد تۆ خۆت ماندوودەکەیت و رەنجدەریت بەرە و لای پەروەردگارت ، کە سەرەنجام لای ئەو پاداشتەکەی وەردەگریت .

جا ئەگەر ژیان بۆ خۆی بەگشتی زەحمەت و ماندوبوون بێ بۆ خەڵکی ، بۆ بانگخوازان زەحمەتترە بەتایبەتی ، چونکە ئەو هەقەی لای ئەمە بەزۆر کەس ناخوات و دژایەتی دەکرێت ﴿ واكثرهم للحق كارهون ﴾ المؤمنون : ٧٠

حەسەنی بەسری دەڵێت : ( ئەم هەقە قورس و گرانە ، خەڵکی هەوڵیان داوە و بۆتە رێگر و بەربەست لەنێوان خۆیان و زۆر لەهەواو ئارەزووەکانیاندا ، سا بەوخوایە کەسێ لەسەر ئەم هەقە دانامەزرێ مەگەر لەفەزڵەکەی تێ گەیشتبێ و چاوەڕوانی عاقیبەت و پاداشتەکەی بێت ) .

بەتێگەیشتن لەم راستیانە ، هەوڵدان دەبێتە خولیای سەری بانگخواز و هەموو شەوێ بێخەم سەرنانێتە سەر سەرین و هەموو رۆژێکیش خەمێکی تازەی لەبەرە بۆ کارێکی تازە و بۆ داهێنانێك کە خزمەت بەئاین و بەخەڵکی بکات .

ئنجا ئەگەر لەم رێگایەشدا خۆڵاوی ببێت و تۆز و گەردی لێ بنیشێت ، ئەو تۆز و خۆڵ و گەردەی بۆدەبێت بەپارێزەر لەئاگری دۆزەخ ، هەروەك حەزرەت ﷺ دەفەرموێت : ( من أغبرت قدماه في سبيل الله ، حرمه الله علـى النـار ). جا ئەگەر کەسانێك خەو بە دۆلارو دینارەوە دەبینن ، ئەم دڵخۆشی و دڵشادییەکەی بەو تۆز و خۆڵەیەکە لەبانقی قیامەتدا پاشەکەوتی کردووە !

پادشای دادپەروەری ئەندەلس(المنصور - باوکی عامر محمد بن ابی عامر) یەکێکە لەو خواناسە تێکۆشەرانەی کەچاك لەم مەسەلەیە تێگەیشتبوو ، بۆیە لەسەردەمی دەسەڵاتی‌دا بەردەوام خەریکی جەنگی ڕۆم بوو ، ئەوەندە شەوقی هەبوو بۆ جیهاد ، جاری وا هەبوو دوای نوێژی جەژن بەرێ دەکەوت بەرەو گۆڕەپانی جیهاد و ڕوو بەڕووبوونەوە ، سوپاکەشی بەدوایدا دەچوون و بەم جۆرە جەژنیان لەناو تۆز و غوباری گۆڕەپانی جەنگدا دەکرد !

لەماوەی فەرمانڕەوایەتیەکەی‌دا زیاتر لەپەنجا جار جەنگا لەگەڵ ڕۆمەکاندا و سەرکەوتنی باشی بەدەست هێنا کە ئەوانەی پێش خۆی بەدەستیان نەهێنابوو . کە ئەوانەش (ابومروان بن حيان) لەپەڕاوی (مآثر العامرية) دا باسی کردوون .

بەڵێ ... لەش سووك بوو بۆ جیهاد ، ساڵی واهەبوو دووجار دەچوو بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەی دوژمنان و ، هەرکاتێکیش لەجەنگ بگەڕایەتەوە فەرمانی دەدا جلەکانی بتەکێنن و ئەو تۆز و خۆڵەی کەپێیانەوەبوو کۆبکرێتەوە و هەڵبگیرێت ...

جا کاتێکیش لەسەرەمەرگدا بوو ، فەرمانیدا : ئەگەر مرد ئەو تۆز و خۆڵی جیهادەی کۆکراوەتەوە بیکەن بەسەر کفنەکەی دا ، کاتێك لەناو گۆڕدا دانرا و ئەسپەردە بەخاك کرا بەڵێ ... لەدوورترین ( ثغـور ) ی موسڵمانان ، لەناوچەیەك کە پـێی دەوترا ( مدینـة سالم ) بەئازاری ناوسك لەکاتی جیهادا وەفاتی کرد ، لەساڵی ٣٩٣ ی کۆچیدا ، کە ( أن شاء الله) شەهیدە و هەر لەوێش نێژدرا و وەسیەتەکەی جێبەجێکرا ...

## کەنارگرتنی بانگخوازان

ڕاست نیە و ناگونجێ بانگخواز دەستەوسان بێت و دەست لەئەژنۆ دانیشێ و هیچ کارێك نەکات بەرامبەر نەفامی ...کارکردنیش شارەزایی و لێزانینی دەوێت ، بانگ بۆ جیهاد نابێ سەرشێتانە بێت و حساب بۆ دەوروبەر نەکرێت ، هەروەك لەسەر خۆیی بانگخوازیش نابێت بەجۆرێك بێت کە فرسەتەکان لەکیس بچن کاتێك دێنە بەردەست...

چاوگێڕانێکی خێرا بەژیاننامەی حەزرەت ﷺ و هاوەڵاندا ئەم ڕاستیەمان زیاتر بۆ ڕوون دەکاتەوە و بەئاشکرا لەقۆناغ بەندی و خوێندنەوەیان بۆ دەوروبەریان تێدەگەین .

ڕاستە ئێمە دڵخۆش و سەربەرزین بەسەرکەوتنەکانی پێشینان ، بەڵام ئەبێ بزانین کە ئەو سەرکەوتنانە لەئەنجامی چوونە پێشەوەیەکی حساب بۆ کراوەوە بووە، ئەوەتە ئامۆژگاری سەرکردەیەك بەم جۆرە کراوە ( انت تاجر الله لعباده ، فكن المضارب الكيس الذي ان وجد ربحـاً اتجر ، والا احتفظ بـرأس مالـه ) واتە : تۆ بازرگانی خودایت بۆ بەندەکانی ، جا ئەو بازرگانە داناو وریایە بە کە ئەگەر زانی قازانجێتی پارەکەی دەخاتە گەڕو ، ئەگەر زانی قازانج ناکات سەرمایەکەی دەپارێزێ و نایخاتە کارەوە .

بەڕاستی ئامۆژگاریـیەکی بەرز و بەپێزە ، ئەوەتا بە بازرگانێکی ژیری دا ئەنێ کەلەمەوسیمی تایبەتدا بازرگانی دەکات ، کەدڵنیایە لەقازانج و سەرکەوتن ، خۆ ئەمەش عەیبی تیانیە ، مادام ئازایە و لەفرسەت دەگەڕێ و دەست لەئەژنۆ دانەنیشتووە..

بەڵێ ... ئازایەتی ئەوەیە کە عەقڵی لەگەڵدابێت ، غەزالی دەڵێت : ( مەبەستمان لەئازایەتی ئەوەیە کە هێز و توانای تورەبوون و تۆڵەکردنەوە مل بدات بۆ عەقڵ لەچوونەپێش و نەچوونە پێشدا ) .

بەنناش دەڵێت : ( پیاوی جیهادی تەنها ، وەك پیاوی جیهادی دانای بەبەرهەم نیە ، کەبەکەمترین بەخشین و بەختکردن زۆرترین قازانج بەدەست بهێنێ ) .

عبدالوهاب عەزام دەڵێت : ( هەموو حەرەکەت و جووڵەیەك بەرەکەت نیە ، وە هەموو چوونە پێشێك دانایی نیە ، وە هەموو رۆشتنێك رووەو خێر نیە ) .

جارێکی تریش بەننا بەقوتابی‌یەکانی دەڵێ : ( هەروەك چۆن بەهەڵچوەکانتان وترا لەسەر خۆبن و چاوەڕێی فرسەت و کاتی گونجاو بکەن ، ئاواش بەوانە دەڵێم کەدانیشتوون ، هەستن کاربکەن ، لەگەڵ جیهادا پاڵدانەوە نیە ﴿ والذين جاهدوا فينا لنهدينهم سبلنا وان الله لمع المحسنين ﴾ العنكبوت : ٦٩ بەرەوپێشەوە هەمیشە هەنگاوبنێن (والله اكبر) ...

ئێمە بێهیوا نابین و پەلەش ناکەین و پێش رووداوەکان ناکەوین ، دوورو درێژی رێی جیهاد سست و لاوازمان ناکات و کۆڵمان پێنادات ،چونکە دەزانین کە ئێمە پاداشت وەردەگرین ئەگەر نیەتمان چاك بێت و تەنها بۆ خوابێت ) .

لەبارەی کەنارگیری‌یەوە بۆ خۆ چاکردن و خۆ ئامادەکردن بۆ خزمەتی بەرنامەی خوا ، (د . مستەفا مەحمود) باسی خۆی دەکات و دەڵێت ( من جۆرێك لەکەنارگیریم هەیە ، بەلام سوودی زۆرم لێ بینیووە ، هەروەك چۆن زەوی‌یەك دەکێڵی و تۆوی پێوەدەکەیت ، منیش هەروام ، دیارە ئەبێ ئەو تۆوە ماوەیەك لەژێر خاکدا لەبەرچاو نەبێ ، بۆ ئەوەی چەکەرە بکات و پاشان بەرهەم بدات ) .

د . مستەفا مەحمود لەگەشتەکەی‌دا لەبێباوەڕی‌یەوە بەرەو ئیمان سوودی لەو کەنارگیری‌یە بۆ خۆشارەزاکردن وەرگرت و پاشان لەزنجیرە ئەڵقەیەکی بەرنامەی (العلم والايمان) دا زۆرترین سوودی بە موسڵمانانی جیهان گەیاند و تێی گەیاندن کە زانست و ئیمان دژی یەك نین ، بەڵکو دۆستی یەکترین و هەرگیز ئیمان دژ بە زانستی راست و بەسوود نەبووە کەلەخزمەتی مرۆڤایەتی‌دا بێت ...

## یەك بەدوو تا یەك بەهەزار !

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت : ﴿ يا ايها النبي حسبك الله ومن اتبعك من المؤمنين، يا ايها النبي حرض المؤمنين على القتال ، ان يكن منكم عشرون صابرون يغلبوا مئتين وان يكن منكم مئة يغلبوا الفا من الذين كفروا بأنهم قوم لايفقهون ، الان خفف الله عنكم وعلم أن فيكم ضعفاً ، فان يكن منكم مئة صابرة يغلبوا مئتين ، وان يكن منكم ألف يغلبوا ألفين باذن الله والله مع الصابرين ﴾ أنفال : ٦٦

واته : ئەی پێغەمبەر ﷺ تەنها خوا بەسە بۆ خۆت و ئەوانەی شوێنت کەوتوون لە ئیمانداران کە پشتگیر و یاریدەدەرتان بێت ، ئەی پێغەمبەر ﷺ هانی ئیمانداران بدە لەسەر جەنگ ، ( دژی ئەوانەی کە کۆسپن لەرێی گەیاندنی پەیامی خوادا )، ئەگەر بیست کەسی خۆڕاگر هەبێت لەئێوە ، ئەوە زاڵ دەبن بەسەر دووسەد کەسدا ، خۆ ئەگەر سەد کەس لەئێوە هەبن ، ئەوە بەسەر هەزار کەس لەوانەی کەبێ باوەڕن زاڵ دەبن ، چونکە بەراستی ئەوانە کەسانێکن کەتێناگەن ( چ هێزێك پشتیوانی لە ئێوە دەکات ) .

ئەی ئیمانداران ئێستا ئیتر خوا ئەرکی لەسەر کەمکردنەوە و ئەزانێ کەلاوازیتان تیایە لەرووی ماددی و مەعنەوییەوە ، لەبەرئەوە ئەگەر سەد کەسی خۆڕاگر هەبێت لەئێوە ، ئەوە زاڵ دەبن بەسەر دووسەد کەسدا و ئەگەر هەزار کەستان هەبێت ، ئەوەزاڵ دەبن بەسەر دوو هەزاردا ، ئەویش بەویست و یارمەتی خوا ، خواش یار و یاوەری خۆڕاگرانە .

لەڕاستیدا بەهۆی ئیمان و بڕواوە دەکرێت بڕوادارێك بەرامبەر دە کافر ببێتەوە، بەڵام خوا بەڕەحمە تەنها داوای بەرابەربوونەوەی یەك بە دوو دەکات ، هەرچەند ئەگەر سەیری جەنگی موسڵمانەکان بکەین زۆر جار لەو ژمارە و ڕێژانەش زیاتر بووە، بۆ نموونە :

لەبەدردا موسڵمانان ٣١٣ کەس بوون بەرامبەر زیاتر لە هەزار کەس و، لە (مؤتە)دا موسڵمانان سێ‌هەزار کەس بوون بەرامبەر دووسەد هەزار ، هەرچەند سێ سەرکردە شەهیدبوون پاش شەش ڕۆژ لەجەنگدا بەهەزارەها کافریان کوشت ، سەرەنجام بەسەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید کشانەوە ، بەجۆرێك کەلەمێژوودا کشانەوەی وا گرنگ و بێ زیان نەبووە ، کە ئەویش هەر جۆرێکە لەسەرکەوتن .

لەشەڕی یەمامەدا خالید ١٣ هەزار موسڵمانی لەگەڵدا بوو بەرامبەر سەد هەزاری هۆزی موسەیلەمەی درۆزن کە چل هەزاریان چەکداربوون و لەناو ناوچەکانی خۆیاندا شەڕیان دەکرد ، سەرەنجام موسڵمانان سەرکەوتن بەسەریاندا و(٢١) هەزاریان لێ کوشتن و لەموسڵمانان دوو هەزار کەس شەهید بوون ، کە نزیکەی یەك لەسەر سێیان کۆچکەران بوون و یەك لەسەر سێیان یاریدەدەران بوو ، لەناو هەموو شیاندا (٥٠٠) کەسیان قورئانیان زۆر لەبەر بوو !

لـەم سـەر ژمێریانـەوە بەجـەرگی و نەبـەردی و قارەمـانێتی بـڕواداران تێدەگـەین و پاڵەوانێتی و لەخۆ بوردوویـی و داستانی سـەیر و سـەمەرەش لـەزۆریان دەگێڕنـەوە بـۆ نموونە :

١ـ کاتێ خالید لەجەنگی فارسـەکاندا داوای یارمـەتی لەخەلیفە ئەبوبـەکر کـرد ، ئـەو (قـەعقاع) ی بـۆ نـارد و فـەرمووی : سـوپایەك قـەعقاعی تیـابێت ناشـکێت ! هـەروەها دەیفەرموو : دەنگی قەعقاع لەسوپایەکدا چاکترە لەهەزار جەنگاوەر !

کاتێ عەمری کوڕی عاصیش لەمیسر داوای یارمەتی کرد لە عومەری کوڕی خـەتتاب ، چوار کەسی بۆ نارد و فەرمووی : ئەو چوارکەسە لەجیاتی چوار هەزار جەنگاوەرن .

**نموونەیەك لەئازایەتی قەعقاع :**

کاتێك لەسـاڵی ١١ ی کۆچی‌دا خەلیفـە ئەبوبـەکر فـەرمانی‌دا بـەخالید بـەرەو عـێراق بکشـێ و لەگـەڵ فارسـدا بجـەنگێ ، کارەکـە زۆر قـورس و ناڕەحـەت بـوو ، بۆیــە داوای یارمەتی کرد و ئەبوبەکریش ﷺ قەعقاعی بۆ نارد ...

ئەم پاڵەوانە نەبـەردە بەردەوام لەگەڵ خالیدا بـوو ، لـەڕوو بەڕووبوونـەوەی سـوپای خالیددا لەگەڵ فارسەکاندا کەچل هەزارکەس بوون و موسڵمانان هەژدە هەزار کەس بوون ، (هرمـز) سـەرکردەی فارسـەکان بـوو ، هرمـز یـەکێ بوو لەو هەشـت سـەرکردەیەی کەلـە پلەیەکدا بوون کڵاوی تایبـەتیان دەکـردە سـەریان کـە نرخەکـەی سـەد هـەزار درهـەم بـوو ( خالید لەهەموو شەڕەکاندا ئەو هەشت سەرکردەیەی کوشت )...

هرمـز لەسـەرەتای شـەڕەکەدا بـەفێڵ داوای لـەخالید کـرد کـە هـەردووکیان بەتەنـها رووبەڕووی یـەك ببنـەوە ، خـالید رازی بـوو، کـاتێ لەناوەندی هـەردوو سـوپاکەدا بەیـەك گەیشتن ، لەژێرەوە هرمز لەگەڵ دەسوار چاکی خۆی‌دا رێکـەوتبوو کە بەخێرایی و لەپڕ لـەکاتی شـەڕی هـەدرووکیاندا پـەلاماری خـالیدبدەن ، چونکـە ئەگـەر بەهـەر هـەموویان توانیان زەفەر بەخالید بەرن و بیکوژن موسڵمانان تەواو دەبن ...

کاتێك ئەو دە سـوارە جـوڵان ، وەك شـێر قـەعقاع (کـە بـەوردی و زۆر بەوریایی‌یـەوە چاوی بڕیبووە دوژمن کە نەك خیانـەت بکـەن ) خێرابـەرەو دوژمـن و ناوەڕاستی مـەیدانی جەنگ هێرشی برد و نەیهێشت بگەنە لای خالید و رووبەڕووی هەر دەسوارەکە بووەوە و توانی بەتەنها پێنجیان لێ بکوژێ و بەمە پیلانەکەیان پووچەڵ بووەوە و خالیدیش توانی

هورمز بکوژێ ، بەمەش فارسەکان شکانێکی زۆر خراپ شکان ، کە ئەگەر وریایی و بلیمەتی و ئازایی قەعقاع نەبووایە موسڵمانان تووشی کارە ساتێکی گەورە دەبوون !

**خالیدی سەرکردە !**

خالیدیش بۆ خۆی یەکێکە لەو پاڵەوانانەی کە سەرکردایەتی هەر سوپایەکی کردبێ ، ئەو سوپایە نەشکاوە ، تا رۆژێك سەرکردەیەکی فارسەکان لێی دەپرسێ ، تۆ چۆن ئاوا لەهەموو شەڕەکانتدا سەردەکەویت ، ئاخۆ پێغەمبەرەکەتان شمشێرێکی خوایی لەئاسمانەوە داوە بەتۆ ؟ ئەویش وتی : نەخێر ، من پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ کردووم کەشمشێرێکی بەکار و زاڵ بم بەسەر کافراندا ...

سەرکردەیەکی تر کەناوی (جرجە) بوو ، پێش جەنگ گفت و گۆی کرد لەگەڵ خالیددا و موسڵمان بوو ، ئنجا لەریزی موسڵماندا جەنگا دژ بە فارسەکان و تەنها دووڕکات نوێژ فریاکەوت و شەهید بوو .

کاتێك خالید لەگەڵ دەستکەوتەکانی جەنگدا کڵاوەکەی هرمزی ناردەوە بۆ مەدینە کەبایی سەد هەزار درهەم بوو ، وە هەقی خالید بوو ، ئەبوبەکر ناردیەوە بۆ خالید ، ئەویش نەیویست و رازی نەبوو بیکاتە سەری وتی : من ئەو عەمامەیەی خۆم دەکەمە سەرم کە چەند تاڵ مووی حەزرەتم تیا داناوە ...

لەشەڕێکدا عەمامەکە لەخالید دەکەوێت و ون دەبێت ، کەتیبەیەکی(٥٠) کەسی دەنێرێ تا بۆی ئەدۆزنەوە ، ئەبو عوبەیدە پێی ناخۆش بوو ئەوەندە کەس بنێرێ بۆ عەمامەیەك ، خالید وتی ئەو عەمامەیە لەسەرما نەبێ شەڕناکەم ئەوە مووی موبارەکی حەزرەتی تیایە ! ئیتر پاش ماوەیەك گەڕان بۆیان دۆزیەوە و نایەوە سەر سەری !

**چەند دیمەنێکی جەنگی یەمامە و باخچەی مەرگ :**

شەڕی (یەمامە) لەقورسترین شەڕەکانی هەڵگەڕاوەکان بوو ، لەبەر ئەوەی ١٠٠ هەزار کەس بوون و چل هەزاریان چەکدار بوون و شوێنی قایم و قەڵاشیان هەبوو .

کاتێك سوپایەکی دوو هەزار کەسی بەسەرکردایەتی عیکرمە رووی کردە ئەو ناوچەیە ، بەفەرمانی ئەبوبەکر دەبوایە چاوەڕێ بکەن ، بەڵام عیکرمە پەلەی کرد وجەنگاو بەخێرایی شکا ، ئەبوبکر زۆر تووڕەبوو لەپەلەکردنی عیکرمە .

دوای ئەو (شرحبيل) بەسوپایەکەوە هات ئەویش هەر ڕۆژە و هەواڵێکی موسەیلەمە و درۆکانی موسەیلەمەی بۆ دەهات ، خۆی بۆ نەگیراو شەڕی کرد و ئەمیش شکا ...

بۆیە کە خالید هات بە ١٣ هەزار کەسەوە کارەکەی زۆرگرانتر بووبوو ، هەرچەند لەسوپاکەی دا ( زەیدی کوڕی خەتتاب) و (ئەبوو دوجانە) و (ام عمارە) و (وحشی) تیابوو ، بەلأم ئەو دووشکاندنە کاری کردبووە سەر ورەی موسڵمانەکان .

خالید سوپاکەی دابەش کرد و هەموو هۆزەکان تێکەڵ بوون ، لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگدا هەڵگەڕاوەکان گورزێکی توندیان لەموسڵمانان وەشاند و خەریك بوو بگەنە خێمەکەی خالید ...

بۆیە خالید پیلانەکەی خۆی گۆڕی وتی : خەڵکینە جیاببنەوە تا بزانین لەکوێ وە زەفەرمان پێ دەبرێ ! ئیتر بەم چەند وشەیە ، کۆمەڵی کۆچکەران جیابوونەوە و پارمەتیدەران جیابوونەوە و کۆمەڵێ لەوانەی قورئانیان لەبەربووجیابوونەوە ... ئیتر بەو جۆرە هەرکەسە و لەگەڵ کۆمەڵی خۆیدا ریز بوو ... ئنجا خالید هاواری کرد (وامحمداه ، وامحمداه ... ) ئەم هاوارەی خالید و ناوهێنانەی حەزرەتە ﷺ گوڕوتینی دایە موسڵمانان و پەلاماری دوژمنیاندا و دوژمنیان شپرزەکرد ...

**چەند دیمەنێکی ئازایەتی لەشەڕەکەدا :**

۞ پیاوێکی (انصار) بەبریندارى بەسنگە خشێ ، دەڕۆی بەرەو لای کۆمەڵی ( انصار) ، پێیان وت : تۆ بەم حاڵەوە و بەوهەموو خوێن و برینداریەوە ئەچی بۆلایان چی دەکەی ؟ وتی : ئەوان بانگی (انصار) دەکەن ، ئەترسم ئەوان بۆ بەهەشت حەشر بکرێن و دوایی منیان لەگەڵ نەبم !

۞ زەید وتی : دان بەخۆتانابگرن و رووبەڕووی دوژمنان ببنەوە ، بەخوا من ئیتر هیچ قسەیەك ناکەم ، تا خواسەرمان دەخات یان شەهیددەبم و ئەگەمەوە بەخوای خۆم ... پاش ماوەیەك ئەویش شەهید بوو بەبێ ئەوەی وشەیەك بڵێ .

۞ عەماری کوڕی یاسر کەلەشەڕەکەدا گوێی لێ بوبووە و تەنها تۆزێکی پێوەمابوو ، وە خوێنی لێ دەڕۆی ، هاواری کرد ( یا اهل القران ، زینوا القران بالفعال) ئەی ئەهلی قورئان ، بەکردەوە قورئانەکەتان جوان بکەن ، وەرن بۆ لای من ، بەمەش کەتیبەیەکی هەزار کەسی لەوکەسانە دروستکرد کە قورئانیان لەبەربوو ، ئەم کۆمەڵە ( سالم مولی ابو حذیفة ) سەرکردایەتی کردن ، سالم هاواری کرد : ﴿بئس حامل القران أنا ، اذا هزم

الاسلام بسببي ! ﴾ واته : من مەشخەڵدارێکی خراپی قورئانم، ئەگەر بەهۆی منەوە ئیسلام تێك بشکێت .

❁ خالید هاواریکرد کێ زۆرانم لەگەڵ دەگرێت ؟! کوا (موسەیلەمە) بابێت ، موسەیلەمە بەترسەوە هاتە پێشەوە و پاش ماوەیەکی کەم خۆی بۆ نەگیراو رای کرد، بەمەش لەبەرچاوی شوێن کەوتووانی شکاو ئەوەندە نرخی نەما !

لەم سەرەتای شەڕەوە نزیکەی حەوت هەزاریان لێ کوژرا و نزیکەی ٥٠٠ موسڵمان شەهیدکران .

ئنجا موسەیلەمە هاواریکرد ، بچنە باخچەکە.. بچنە باخچەکە ، ئیتر بەپەلەکشانەوە بەرەو باخچەکە و چوونە قەڵاکانەوە کە دیواری بەرزیان هەبوو ، وە دەرگایان داخست ، دیارە ئەوە بچوایەتە سەر موسڵمانان هیچیان بۆ نەئەکرا بەرامبەریان و فرسەتەکە لەدەست ئەچوو ... بۆیە ئالێرەدا (بەرائی کوڕی مالیك) زرێی پۆشی و وتی بەرزمەکەنەوە ، هەرچۆنێ بێت بەرزیان کردەوە سەر دیوارەکە و خۆی هەڵدایە ناو دوژمنان و بەپەلە بەرەو دەرگاکە چوو ، چەند کەسێك هاتنە رێی کوشتنی و پاش بریندار بوون لەسیلاوە گەیشتە دەرگاکە و کردیەوە ، بەم پاڵەوانێتیـیە بێوێنەیە ، دەرگا بۆ موسڵمانان کرایەوە و توانیان نزیکەی حەوت هەزاری تریان لێ بکوژن ...

❁ سێکەسیش بەتایبەت بەدوای (موسەیلەمە)دا دەگەڕان ، (ام عمارە) کە (حبیب) ی کوڕی بەدەستی ئەو شەهید بووبوو ، (وەحشی) کە لە ئوحوددا حەمزەی شەهید کردبوو دەیویست پاش موسڵمان بوونی ئەو گوناهەی بەوە بسڕێتەوە ، کە چۆن بەڕمەکەی (سەید الشهداء) ی شەهید کرد ، ئاوا تاوانبارترین کەسیش بەڕمەکەی بکوژێ ،هەروەها ئەبودوجانەش سێهەم کەس بوو کە مەبەستی بوو ئەوفەزڵەی دەست بکەوێ ، بەڵێ لەیەك کاتدا هەرسێکیان لەسەری حازربوون، ڕمەکەی وەحشی و دوو شمشێری (ام عمارە) و (ئەبودوجانە) موسەیلەمەیان پێکا ، بەمەش ئەو تاوانبارە سەر سەختە درۆزنە گیانی پیسی سپارد بەدۆزەخ . دوای تۆزێك هەر لەوێدا ( ئەبو دوجانە) ش شەهید بوو ... بەم جۆرە موسڵمانان سەرکەوتن و سەرجەم زیانی دوژمنان بیست و یەك هەزار کەس بوو ، بەرامبەر هەزار شەهید لەموسڵمانان .

( شایانی باسە ( بەرائی کوڕی مالیك) دوعای قبوڵ بووە ، لەجەنگێکدا لەعێراق موسڵمانان شپرزە دەبن ، پێی دەڵێن : بۆ دوعاناکەی سەرکەوین ؟ ئەویش دوعا دەکات

و دەڵێ : خوایە ئەمڕۆ موسڵمانان سەربخە و منیش شەهید بکە ! خوای گەورەش دوعاکەی گیراکردو موسڵمانان سەرکەوتن و ئەمیش شەهید بوو ! ) .

**قەعقاع لەشەڕی قادسیەدا :**

پاش ئەوەی قەعقاع لەگەڵ خالیدا چووبەرەو شام لەبەرئەوەی موسڵمانەکان بەسەرکردایەتی ئەبو عوبێدە حاڵیان باش نەبوو بەرامبەر ڕۆمەکان ، خەلیفە ئەبوبەکر فەرمووی ( شەرت بێت خالیدیان بۆ بنێرم ڕۆمەکان وەسوەسەی شەیتانیان بیربچێتەوە ) پاش ئەوەی سەرکەوتنیان بەدەستهێنا لەساڵی ١٥ ی کۆچیدا قەعقاع هاتەوە بۆ عێراق بۆ یارمەتی سوپاکەی ( سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) ، کە سەرگەرمی شەڕی قادسیە بوون .

فارسەکان لەنزیکەی شەش سەد ساڵ پێش زاینەوە خەریکی بناغەدانانی شارستانیەت و فراوان کردنی دەسەلأتیان بوون ، وە هەتا هەست سەد ساڵ دوای زایین بەردەوام بوون و لەسەردەستی ئیسلامدا شکان و پووکانەوە ...

واتە چواردە سەدە لەمەیدانا بوون وخاوەنی دەسەلأت و توانایەکی گەورەبوون و ئەزموونی گەورەیان هەبوو لەگشت بوارەکانی ژیاندا . بۆیە ڕوو بەرووبوونەوەیان بە سوپایەکی وەك سوپای ئیسلامی کارێکی ئاسان نەبوو ...

فارسەکان لەشەڕی قادسیەدا فیلێکی زۆریان پێ بوو کە ئەسپی موسڵمانەکان خۆیان نەدەگرت لەبەردەمیانا ... پاشان موسڵمانەکان بەلێبڕاوی‌و بەجەرگی خۆیان توانیان ئەو گوریسەی کەسندوقی سەر پشتی فیلەکەی بەستۆتەوە بیپچڕن و بەوەش سەربازەکانی ناو سندوقەکە دەکەوتنە خوارەوە ...

قەعقاع بیری کردەوە لەپیلانێك کە ئەسپی فارسەکان بتۆقێنێ ، بۆ ئەمەش ، قوماشی ڕەشی دەهێناو دەیدا بەسەر حوشتردا و تەنها دووچاوی حوشترەکە بەدەرەوە بوو بۆ ئەوەی بەرپێی خۆی ببینێ ، پاشان حوشترەکەیان راودەنا بەرەو کافرەکان ، بەمەش ئەسپەکانیان کە هەرگیز شتی وا سامناکی نەدیبوو ، هەڵدەستانە سەر پێ و ئەو سوارانەی لەسەر پشتیان بوون دەکەوتنە خوارەوە ، ئەمەش هۆکارێکی باش بوو بۆ زیان گەیاندن بەدوژمن .

**زوبەیری کوڕی عەوام بەرامبەر هەزار کەسە :**

زوبەیر یەکێبوو لەوچوار کەسەی کە لەجیاتی چوار هەزار کەس خەلیفە عومەر ناردی بۆ هاوکاری عەمری کوڕی عاص کاتێ ئابلووقەی قەلأی ( بابلیون) ی دابوو... جا

لەبەرئەوەی ئابلۆوقەکەی درێژەی کێشاو بێئاکام بوو ، زوبەیر وتی : من خۆم ئەبەخشم بەخوا ، وەهیوادارم بەهۆی منەوە خوا ئەو قەلآیەتان بۆ فەتح بکات ..

زوبەیر پیلانێکی ژیرانەی داناو لەنیوەشەودا لەجێگایەکەوە کە هەستی پێنەکەن توانی پەیژە بنێ بەدیواری قەلآکەوە و بەتەنها سەرکەوێ ، پاشان لەسەر دیوارەکەوە شێرانە بە (الله اکبر) ەوە پەلاماری دوژمنی دا و هەندێ لە پاسەوانەکانی سەر دیوارەکەی کوشت و بەو دەنگی (اللە اکبر) ە و بەو هێرشە لەپڕە دوژمن پەشۆکا و سەرەنجام دەرگاکرایەوە و موسڵمانان سەرکەوتن .

**غەزای ئوحود و حونەین :**

قورئانی پیرۆز لەباسی طالوت و جالوت دا لەسوورەتی ( البقرە) ئایەتی( ٢٤٦ ـ ٢٥٢) باسی وانەیەکی کرداری و ئەزموونێك دەکات کەبەسەر بروادارەکانی (بەنی ئیسرائیل) دا هاتووە و تیایدا جەخت دەکاتە سەر ئەو راستیەی کە ﴿کم من فئة قليلة غلبت فئة كثيرة باذن الله والله مع الصابرين﴾ واتە : چەندەها جار دەستەوتاقمی کەم سەرکەوتوون بەسەر دەستەی زۆردا بەفەرمانی خوا و بەئیزنی خوا ، وە خواش یارویاوەری ئارامگرانە

پاش ئەوەی بروادااران دوعادەکەن و دەپارێنەوە کەسەریان بخات ، خوای گەورەش بەئیزنی خۆی و فەزڵی خۆی سەرخستن ﴿ فهزموهم باذن الله ﴾ جاتێگەیشتن لەم مەسەلەی (باذن الله) یە زۆر گرنگە ، چونکە سەرکەوتنی تەنها لەلایەن خواوەیە ﴿ وما النصر الا من عند الله العزيز الحكيم ﴾ ال عمران : ١٢٦ جائەگەر موسڵمانان پابەند بوون بە دینی خواوە و چی لەتوانایاندابوو کردیان و مەبەستیان بوو ئایینی خوا سەربخەن ، خوای گەورە سەریان دەخات ، ئەگەر ژمارە و تواناکانیشیان کەمیش بێت ﴿ يا ايها الذين امنوا ان تنصروا الله ينصركم ويثبت اقدامكم ﴾ محمد /٧

جائەو نموونانەی پێشەوە کەباسمان کردن و سەدەهای تریش کەبوارنیە لێی بدوێین بەڵگەی روون و ئاشکران لەسەر ئەم مەسەلەیە ...

لەجەنگی ئوحودیشدا موسڵمانان هەزار کەس بوون چوون بەرەنگاری کافرەکان ببنەوە کەسێهەزار کەس بوون ، لەرێگا یەك لەسەر سێ ی سوپاکە بەهۆی (عەبدوڵلآی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول)ەوە گەڕانەوە و وتیان : مادام بەقسەی ئێمەیان نەکردووە و لەمەدینە نەماونەتەوە بۆ شەڕ ، ئەوا دەگەڕێینەوە ، بەمەش موسڵمانەکان نزیکەی حەوت

سەد کەسێك مانەوەو، لەسەرەتادا خوا وەعد و پەیمانی خۆی بردە سەر لەگەڵیان و سەری خستن ﴿ ولقد صدقكم الله وعده اذ تحسونهم باذنه ﴾ ال عمران/١٥٢ پاشان کەتیرهاوێژەکانی سەرشاخی ئوحود بینیان کافرەکان شکاون و هەڵدێن ، بە ئیجتهادی خۆیان شاخەکەیان بەجێهێشت و هاتنە خوارەوە بۆ غەنیمەت کۆکردنەوە و بەمەش فەرمانی حەزرەتیان شکاند و خوای گەورەش دەستی لێبەردان و ئنجا خالید کەهێشتا کافر بوو چووە سەرشاخی ئوحود و بەمەش پشتی موسڵمانان چۆڵ بوو ، شکان و بوو بە وانەیەکی زۆر گەورە کە ئەگەر سەرپێچی بکەن خوا سەریان ناخات : ﴿ حتى اذا فشلتم وتنازعتم في الامر وعصيتم من بعد ما أراكم ما تحبون منكم من يريد الدنيا ومنكم من يريد الاخرة ثم صرفكم عنهم ليبتليكم ﴾ ئنجا خوای گەورە لێیان خۆش بوو ، ﴿ ولقد عفا عنكم ﴾ وە خوا فەزڵ وبەخششی زۆرە بۆ ئیمانداران﴿ والله ذو فضل على المؤمنين ﴾ جەنگی حونەنیش وانەیەکی گەورە و مەزن بوو ، قورئان دەفەرموێ : ﴿ لقد نصركم الله في مواطن كثيرة ، ويوم حنين اذ أعجبتكم كثرتكم فلم تغن عنكم من الله شيئاً ، وضاقت عليكم الارض بما رحبت ثم وليتم مدبرين ، ثم أنزل الله سكينته على رسوله وعلى المؤمنين وأنزل جنوداً لم تروها وعذب الذين كفروا وذلك جزاء الكافرين ﴾ التوبة ٢٩ واتە : سوێندبێت بێگومان خوای گەورە لەزۆر شوێندا سەری خستن ( کە دیارە ژمارە تان کەم بووە و کافرانیش زۆر بوون ) .

لەرۆژی حونەینیش کاتێك کە زۆریی ژمارەی خۆتان سەرسامی کردبوون ، جا ئەو زۆریە هیچ فریاتان نەکەوت و شکان ، زەویش چەندە فراوانە لێتان هاتەوە یەك و لەوەودوا هەمووپشتان هەڵکرد و راتان کرد پاشان خوای گەورە ئارامی و ئاسوودەیی دابەزاندە سەر پێغەمبەرەکەی و سەر ئیمانداران و سەربازانێکی دابەزاند کە نەتاندیووە ، سزای ئەوانەشیدا کەبێ باوەڕبوون ، ئەوەش سزا و پاداشتی بێ باوەڕانە .

بەڵێ لەگەڵ ژمارەی زۆریشیاندا ، کە هەندێکیان دەیانووت ئەمڕۆ لەبەر زۆریمان ناشکێین ، خوا دەستی لێبەردان و شکان ، بەهۆی ئەوەی دوژمن کەمینی بۆ دانابون و موسڵمانان شپرزەبوون ، پاشان (عباس) بەدەنگی بەرزی هاواریکرد و نزیکەی سەد کەس لەکۆچکەر و یاریدەدەران لەدەوری حەزرەت ﷺ کۆبوونەوە ، ئەو سەد کەسە وەك برووسکە ، یان گەردەلوول دایان بەسەر دوژمندا و شکاندیانن ، ئەمەش وانەیەکی تری بەنرخ بوو بۆ موسڵمانان لەوەدا کەسەرکەوتن لەلایەن خواوەدێت ..

قورئان موسڵمانان پەروەردە دەکات لەسەر ئەوەی کەدانەبەزن و خۆیان بەکەم نەزانن چونکە بڕوادارن ﴿ولا تهنوا ولا تحزنـوا وأنتم الاعلـون ان كنتـم مؤمنيـن﴾ ال عمـران واتــە ئــەی بــڕواداران لاواز و سســت مــەبن و خــەم مــەخۆن ئێــوە پایەبــەرزترن و سەرکەوتووترن ئەگەر ئیمانداری چاك بـن ... ئنجـا باشـیش بزانـن کـە دینـی خـوا وەك درەختێکە کـە رەگـی داکوتـابێ و بـەناخی زەویداچووبێتـە خـوارەوە و لـق و پۆپـەکانی بەئاسماندا هەڵچووبن وەهەمیشە بەئیزنی خوا بەروبووم بدات : ﴿ الم تر كيف ضرب الله مثلاً كلمة طيبة كشجرة طيبة أصلها ثابت وفرعها في السماء تؤتي أكلها كل حيـن بـاذن ربها ويضرب الله الامثال للناس لعلهم يتذكرون﴾ ابراهيم : ٢٥ .

## ئافرەتانی پایەبەرز و شکۆمەند

قورئانی پـیرۆز باسـی پایەبـەرزی (مەریـەم) و (ئاسـیای ژنـی فیرعـەون) دەکـات وەك دوونموونەی ئیمانداری بەرز و خاوەن هیممەت ، هەروەها باسی دووئافرەتی کافر دەکات کە هاوســەری دوو پێغەمبــەربوون و چــاکی مێردەکانیــان هیــچ ســوودی پیّنەگــەیاندن ، قورئان دەفەرموێت ﴿ضرب الله مثلا للذين كفروا امرأت نوح وامرأت لوط كانتـا تحـت عبدين من عبادنا صالحين فخانتاهما فلم يغنيا عنهما من الله شيئا ، وقيل ادخلا النار مـع الداخلين ، وضرب الله مثلاً للذين امنوا امرأت فرعون اذ قالت ربي ابن لي عندك بيتاً في الجنة ونجني من فرعون وعمله ونجني من القوم الظـالمين ، ومريـم ابنـة عمـران التـي أحصنت فرجها فنفخنا فيها من روحنا وصدقت بكلمات ربها وكتبه وكانت من القانتين﴾ التحريم : ١٢ واتە : خوا نموونەی هێناوەتەوە بەژنی نوح ولوط بۆ ئەوانـەی کـەبێباوەڕ بوون ، کە ئەو دووئافرەتـە هاوسـەری دوو بـەندەی چـاك و پـاکی ئێمـە بـوون ، کـەچی خیانـەتیان کـرد و بڕوایـان پیّنـەهێنان ، ئیـتر ئـەو پێغەمبەرانـە فریـای هاوسـەرەکانیان نەکەوتن و ، لەقیامەتدا بەوژنانە دەوترێت : بچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە و لەگەڵ ئەوانەدا کەدەچنە ناوی . هەروەها خوا نموونەی هێناوەتەوە بەهاوسەرەکەی فیرعەون بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ، کاتێك وتی : پەروەردگارا لەلای خۆت لەبەهەشتاماڵێکم بۆ دروست بکە و لەدەست فیرعەون و کار و کردەوەی رزگارم بکەو ، لەدەست ئەم گەلە ستەمکارەش دەربازم بکە .

هەروەها نموونەی هێناوەتەوە بەمەریەمی کچی عیمرانیش کە داوێنی بەپاکی ڕاگرت ، لەوڕۆحەی کە بەدەستمانە ، فوومان پێداکرد ، ئەویش باوەڕی تەواوی هەبوو بەگوفتار

و فەرمانەکانی پەروەردگاری و هەمیشە و بەردەوام ملکەچ و فەرمانبەردار و خواناس و نزاکار بوو ...

بەڵێ ...تاقیکردنەوە و ئەرکەکەی (مەریەم) سەلامی خوای لێبێ زۆر قورس بوو ، لەمەسەلەی شەرەف و ناموسدا بوو ، موعجیزەیەکی گەورەبوو ، کەمناڵ بەبێ باوك و دایك ببێت ، یەکەم جار بوو شتی وا رووبدات بۆیە مەگەر بڕوادارەکان ئەگینا کەس نەبوو بڕوای پێبکات ، لەبەرئەوە خوای گەورە فەزڵی دا بەسەر هەموو ئافرەتانی جیهاندا ﴿ واذ قالت الملائكة يا مريم ان الله اصطفاك وطهرك واصطفاك على نساء العالمين ، يا مريم اقنتي لربك واسجدي واركعي مع الراكعين ﴾ ال عمران:٤٣

واتە : جوبرەئیل وتی : ئەی مەریەم بەراستی خوا تۆی هەڵبژاردووە و خاوێن و پاکیزەی کردویت ، هەڵی بژاردوویت و فەزڵی داویت بەسەر هەموو ئافرەتانی جیهاندا ، ئەی مەریەم ملکەچ و فەرمانبەرداری پەروەردگارت بە ، سوژدە و کڕنووشی بۆ ببە لەگەڵ کڕونووشبەراندا .

هەر لەئافرەتاندا ، خەدیجەو فاتمەی کچی حەزرەت ﷺ لەوشاژنە پایە بەرزانەن کەبەرامبەر هەزاران ئافرەتن ، هەروەك لەفەرموودەدا باس لەپلە و پایەیان کراوە ...خەدیجە خوای گەورە سەلامی بەجوبرائیلدا بۆ ناردووە کەئەویش بەحەزرەتی راگەیاندووە و مژدەی کۆشکێکی گەورەی نایابی داوەتێ ...

فاطمەش ( سيدة نساء أهل الجنة ) یەو هەرکاتێك بهاتایە سەری لەباوکی بدایە ، حەزرەت ﷺ بەو هەموو پایە بەرزی و گەورەییەوە کەباس ناکرێت لەبەری هەڵدەستا و ناوچەوانی ماچ دەکرد و لای خۆیەوە دای دەنا ...

کاتێکیش کە شووی کرد بە ئیمامی عەلی و ماڵەکەیان تۆزێ دووربوو لەمزگەوتەوە ، حەزرەت ﷺ داوای لەهاوەڵێك کرد کە ماڵەکەی چۆڵ بکا بۆ(فاطمە) لەبەرئەوەی نزیك ماڵی حەزرەت بوو ﷺ ئەویش چووە شوێنێکیترەوە و ماڵەکەی خۆیدا بە ئیمامی عەلی و (فاطمە) ...

**هاوسەرەکەی سوڵتان (قطز) شەهید دەبێت :**

سوڵتان (قطز) لەرۆژی جومعەدا بەهیوای دوعای موسڵمانان و یارمەتی خوای پەروەردگار پەلاماری تەتەرەکانیدا لەشەڕی (عين جالوت)دا ... لەشەڕەکەدا پێنج تەتەر فرسەتیان هێناو هەڵیان کوتایە سەر سوڵتان (قطز) خەریك بوو بیکوژن ، لەوکاتەدا سوارێکی دەموچاو هەڵبەستراو فریای کەوت و پەلاماری پێنج تەتەرەکەی دا و بەخەستی

برینداربوو ، کاتێ خەریك بوو بکەوێت هاواری کرد ( ئاگات لەخۆت بێت سولْتانی موسلْمانان ، وا من پێشت کەوتم بۆ بەهەشت ) ...

سولْتان هات بەلایەوە سەیری کرد ژنەکەی خۆیەتی ، هەلْیگرت و بردیەوە خێمەکەی و ناوچەوانی ماچکردوو دەگریا بەسەریاو دەیووت ( واحبیبتاه ... واحبیبتاه ) ، ژنەکەی لەگیانەلآدابوو بە دەنگێکی نزم بەهەزار حالْ وتی : مەلْێ (واحبیبتاه ) بەلْکو بلْێ ( وا اسلاماه ) و ئیتر گیانی سپارد و شەهید بوو ... سولْتانیش بەجێی هێشت و چووە ناو شەڕەکە و هاواری کرد ( وا ا سلاماه) (وا اسلاماه) ، ئەم هاوارە و شەهیدبوونی ژنەکەی بوونە مایەی بەرزبوونەوەی ورەی موسلْمان و بەگوڕوتینێکی بێوێنەوە پەلاماری دوژمنیاندا و شکاندیانن ... ( **باقات الورود** النضرة - ابراهیم النعمة) .

**(اردە کچی حارث ) و پالەوانێتیەك :**

لەکاتێکدا(ابرقباذ) خەلْکی (میسان) ی کۆکردەوە و هەستا دژ بە موسلْمانان ، (مغیرة کوری شعبة) چوو بەرەو روویان و مالْ و منالْ و کەل و پەلیان لەناوچەیەك بەجێهێشت و لەلای ( مرقاب) نزیك روو باری دیجلە بەدوژمنان گەیشت .

(اردە) بیری کردەوە کە هەروا دانەنیشێ و کارێك بکات ، بۆیە ژنانی هەلْنا کەلەگەلْیا بەرەو جەنگەکە بچن و هەندێ قوماش و لەچکیان کرد بە ئالآ و لەدوورەوە ئەو هەموو ئافرەتە دەرکەوتن و تەپ و تۆز بەرز بۆوە ، فارسەکان ترسان وایانزانی یارمەتی سوپای تر هاتووە بۆ کۆمەکی موسلْمانان و ، سەرەنجام شکان و هەلْهاتن)ل٩٢ لافتات للمبصرین / مریم النعیمی .

**رۆلی گرنگی دایك :**

ئاشکرایە دایك ئەگەر بەکاری خۆی هەستێو بەچاکی و بەرێك پێکی منالْەکانی پەروەردەبکات ، دەتوانێت لەرێی منالْەکانیەوە خزمەتی گەورە پێشکەش بکات ...

دایکی ئیمام مالیك حەزدەکات کوڕەکەی رێی راست بگرێ و خزمەتێك بە ئیسلام بکات ، بۆیە هەر ئەوەندە کوڕەکەی بالْغ دەبێت عەمامەیەك دەکاتە سەری و دەینێرێ بۆ فێربوون و دەلْێ لەپێشدا رەوشت و خوو ( ئەدەب) و پاشان (عیلم ) فێر ببە ...

ئەوەبوو ئیمام مالیك ئەو بلیمەتەی لێدەرچوو کەناوبانگی لەکۆن و نوێدا لەهەموو جیهانی ئیسلامیدا بلآوە ...

دایکی  شافیعیش هیممەت بەرز بوو بۆیە کورەکەی هەرچەند  هەتیویش بـوو ، بردی بۆ ماڵە خزمانی لەمەککە و وای کرد کە لەحەوت  ساڵیدا هەموو قورئان و لەدەساڵیدا ( موطأ) ی ئیمام مالیك لەبەربکات و پاشان لەشانزە ساڵیشدا فتوابدات و بوو بەو پیاوەی کە ئیمام ئەحمەد لەبارەیەوە دەڵێ( شافیعی وەکو خۆرە بۆ دنیا ) .

## نەوەیەکی خەڵەتاو !

دوژمنـان هـەوڵی زۆریـاندا ، نـەوەی نـوێی موسـڵمانان لـەرێ لابـدەن و سـەرقاڵی شتێکیان بکەن کە نە بۆ دنیا و نە بۆ ئاخیرەت سوودی لێ وەرنەگرن.

بەڵێ ... بێچووە  شێری موسڵمانیان دەستەمۆکرد و بەجۆرێك پەروەردەیان کرد کە خۆی لێ ببێ بەئاسك و لەنجە ولارو ناسکی لێ بباری !

ئنجا بیریان بـردەوە  کەباوکی شێربووە و چەندەها پاڵەوانێتی نوانـدووە و پادشـای دارستان بووە ... ئەم پیلانەش دکتۆر  محمـد اقبـال لەهۆنراوەیەکیدا ئامـاژەی بـۆ دەکـات

علموا الليث جفلة الظبي و امحوا

قصص الاسد في الحديث القديم

همهم غبطة الرقيق  برق

كل تاويلهم  خداع  عليم  (المنطلق ٥٧)

بەڵێ ... دوژمنانی ئیسلام شەوو  رۆژیـان نایە دەم یـەك تاسەرکەوتن لەکارەکەیاندا و بێچـووە شـێری موسـڵمانیان کـردە ئاسـك و هـەرچی چیرۆکی پاڵـەوانێتی شـێر هەیـە سڕیانەوە لەمێژووی دێریندا !!

لەفلیمێکی کـارتۆنی منـاڵاندا ، بێچووە شـێرێك لەناو کۆمـەڵێ بزنـدا گـەورە دەبێـت ، بۆیە وەك ئەوان رەفتار دەکا و کاتێکیش رووی خۆی لەناو ئاودا  دەبینیـەوە دەسڵەمیەوە و لای سەیربوو کەبۆچی ئەم لەهاوەڵانی ناچێت ...

تـا مـەیمونێك مـاڵی ئـاوابێت هاتە لای و ئامۆژگـاری کـرد و بەهـەر حـاڵێك بـوو تـێی گەیاند کە ئەم لەبنەماڵەی  شێرە و کـاتی خـۆی بـاوکی پاشـابووە ، ئەم بەرچاو روونـی و وریابوونەوەیە پـاڵی پێوەنـا کە ئـەمیش وەك باووباپـیرانی بێـت و سەرەنجامیش توانـی کاروباری دارستانەکە بگرێتەوە دەست ...

جا بەراستی موسـڵمانانیش هـەروایان لێ قـەوماوە ! بەهـەزارەها جـۆر هـەوڵدەدرێت رابـردووی پرشـنگداریان بیربـبرێتـەوە و پاشـان وایـان لێبێـت ئەوانـە بکەنـە  پێشـەوا و

مامۆستای خۆیان کە دوژمنـان فوویان پیادەکەن و پـڕو پاگەندەیان بۆ دەکـەن و نـاوی (النجم) ئەستێرەی گەشی ئاسمانی ( گۆرانـی ، سـینەما ، سـەماکردن،... هتـد ) یـان لێ دەنێـن یـان بەسـوپرمان و باتمانێکـەوە سـەرقاڵیان دەکـەن کـە مەگـەر هـەر لـە خــەیاڵی (هولیوود)دا هەبێت ...

بەڵام ئاشکرایە کەخوا ﴿ لایرضی لعبادہ الکفـر﴾ ، وە بەفەزڵ و رەحمـەتی خوایەتی خۆی کەسانێکی هیممەت بەرز و (مجددی) نارد کە بانگی موسڵمانانیان کردەوە بۆسـەر شارێگەی ئیسلام و توانیان بانگێکی وابدەن بەجیهاندا کە ژمارەیەکی زۆری پـێ هۆشیار بێتەوە ...

## دوا وتە

پاش ئەم گەشتە ئیمانی‌یە چاك وایە لەخۆمان بپرسین ئاخۆ ئێمە بەرامبەر بەچەندین ، یەك یان دوو یان دە یان سەد یان هەزار ؟!

ئاخۆ توانیبێتمان شتێك لەژیاندا زیادبکەین ، هەروەك مصطفی صادق الرافعي دەڵێ : ( ئەگەر نەتوانی شتێك لەژیاندا زیاد بکەی مانای وایە لەژیاندا زیادیت ! ) .

هەقە هەریەك لەئێمە لەکوێوە دەتوانێ و هەرچۆنێکی بۆ دەکرێ خزمەتێ پێشکەش بکـات ، ئەگـەر دەڵـێی دنیـا گـۆڕدراوە ، دەڵێـم ئـەوە کەناڵـەکانی راگـەیاندن رۆژانـە موسڵمانان بەرەو شەهادەت باڵدەگرن و بەبەردەوە رووبەڕووی زایۆنـی دەبنـەوە ، ئەگەر باسـی زیندووەکـانی لای خۆشمـان نەکـەین ، ئـەوە رابـردووی پرشـنگدار و پڕشـکۆی موسڵمانانی باوباپیرمانە ، کە هـەرچیان بۆکرابێ لەخزمەت کردوویانە ، کاك ئەحمەدی شێخ نموونەی بانگخوازێکی هۆشیار و کۆڵنەدەربووە کە لێرەدا نامەوێ باسـی بکەم و لەپەڕاوی ( کاك ئەحمەدی شێخ لەروانگەی مەکتووباتەکانیەوە) تیشك خراوەتە سەری ...

لەئافرەتانیشدا ئەوە ( حەپسە خانی نەقیب ) لەدایك بووی ١٨٦١ ز و لەساڵی ١٩٥٣ دا کۆچـی دوایـی کـردووە ، لـەو رۆژەی خـۆیدا شـاژنێك بـووە بەرامبـەر دەیـەها پیـاو ! لەماڵی خۆی زۆر یارمەتی هەژار و بێنەوایان و هەتیوانی داوە ، هەرچی رووی کردبێتە ماڵەکەی ئەو پەڕی رێزی لێگرتووە و پاشان نەیهێشتووە بەدەستی بەتاڵ و بەنا ئومێدی بڕواتـەوە ، لەهـەرچی خوادابێتـێ هاوکـاری کـردووە ، تەنانـەت بـیری لای شـێتەکانی شێتخانەی بەغداش بووە ، هەموو جار کە شێخ قادری مێردی چووە بۆ بـەغداد داوای لێکردووە کە سەربدات لەوشێتانە و ئەگەر موحتـاجی جل و بەرگێکن ، یان هەرشـتێکن

بۆیان دابین بکات ، بەتایبەت ئەوانەی کە خەڵکی سلێمانی بوون و لەوێدا ژیانیان بەسەر بردووە ! ( شایانی باسە کە بۆ یەکەمجار قوتابخانەی نەهێشتنی نەخوێندەواری کرایەوە لەسلێمانی ، ئەمیش وەك قوتابییەك دەچووە پۆلەوە و لەبەر مامۆستا هەڵدەستا ، ئەوانیش بەشەرمەوە تکایان لێدەکرد کە هەڵنەستێ و بەرێزیشی قایل نەدەبوو دەیووت من لەبەر زانستەکەتان هەڵدەستم کە بڵاوی دەکەنەوە ) ( ڕۆژنامەی ئاییندە ) .

بەڵێ ... لاکردنەوە لەهەژار و داماوو بێنەوایان مایەی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوایە هەروەك لەفەرموودەدا هاتووە ( انما تُرزقون وتنصرون بضعفائكم ) ، ئەمە لەبواری خزمەتە کۆمەڵایەتیەکاندا ، بەهەمان شێوە لەبوارەکانی‌تریشدا نموونەمان زۆرە ، ئەوە مەولەوی خواناسی پەپوولەی دەوری چرای ئیمان و ئیسلامەتی کە بەسێ زمان ( کوردی و فارسی و عەرەبی ) هۆنراوەی‌ئیمانی وتووە و لەوبوارەدا ئەسپی خۆی تاوداوە ..بۆ نموونە کاتێك لەبارەی (عەقیدە) وە هۆنراوەشاکارەکەی دادەنێ ، (شێخ عوسمانی سراج الدین) ی ڕابەری (خوای لێ‌ڕازی‌بێت) خەو بە حەزرەتەوە ﷺ دەبینێ ، کە پێی دەفەرموێ : ( ئەم نامەیە بۆ ئێمە نێردراوە و خۆشەویستە لامان و لێی ڕازین ) ... ئنجا کەجەنابی شێخ عوسمان ئەم مژدە خۆشە بەمەولەوی دەڵێت ئەویش لەخۆشیدا هۆنراوەکەی ناو دەنێت ( العقيدة المرضية ) ...سەیری لاپەڕە ( ٨٢١) عەقیدەی مرضیەی مەولەوی بکە .

**سەرچاوە :**

**١ ـ تەفسیری ئاسان ماموستا بورهان محمد امین**

٢ ـ ریاض الصالحین / نوری فارس

٣ـ لافتات للمبصرین / مریم النعیمي

٤ ـــ عقیـدەی مرضیـــە ی مەولـــەوی ( **لێکدانــەوەی ماموســتا مــەلا عبدالکــەریمی مودەریس)** .

٥ ـ رسالة في الحب ـ عباس السیسي

٦ ـ منهاج التربیة الاسلامیة / ل ١٨٦ ـ د ماجد عرسان الکیلاني )

٧ ـ الانقیاء ـ ابراهیم عبدالله الدویش

٨ ـ مقالات لمحمد احمد راشد / موقع المسار ـ الانترنیت

٩ ـ**بەرنامەی** ( نلقی الاحبة ) قناة **اقرا**

**١٠ ـ گۆڤاری ( المجتمع ) الکویتیە**

١١ ـ **باقات الورود** النضرة من حکایات المسلمین العطرة / ابراهیم النعمة

١٢ ـ المنطلق / محمد احمد راشد

١٣ ـ الامام حسن البنا ـ داعیة مجاهدا ـ شهیدا ـ محمد عبدالله الخطیب .

١٤ ـ سلسلة المنهاج ـ هاشم محمد علی .

١٥ ـ **هەڵبژاردەیەك لە عەقیدەی مەرضیە / بابە علی شێخ عومەر قەرەداغی .**

**١٦ ـ رۆژنامەی ئاینده / ژمارە / ٢٠ ساڵی ١٩٩٩ ( وتارێك لەبارەی حەپسەخانی نەقیبەوە ... ) .**

# پێڕست

## پێشەکی

سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ خوای پەروەردگاری جیهان و درووود و سـەلامیش لەسەر گیانی سەرداری پێغەمبەران و یار و یاوەر و شوێن کەوتوان ...

بەرگی سێیەمی(بەهاری دلاَن) دێتەوە خزمەت خوێنەرانی بەچەپکێك سەرگوزەشتەی هیدایەتەوە ، هیدایەتی کەسانێکی تینوو کە بەدوای ئاودا وێڵن و سەرەنجام پیێ دەگەن و دڵ و دەروون و هەست و هۆشـیانی پـیێ ئـاو دەدەن و ، هەریەکـەیان بـەزمانی حاڵیـان دەڵێن:

ئەو ڕۆژانەی ... کاتێك ویستم

تەمەنی کورتی ژیانم ... هەروا نەڕوا

دڵی تینووم ، مەزرایەك بیێ

پڕبیێ لەدرەختی بڕوا...

ویستم

کەشتی وێڵی ژینم ، کەناری دەریای

لیێدیاربیێ

سەری ماندووم

لەخەمی گومانی هەڵە و ... شەونخونی

بیرکردنەوە

هەتا هەتایە ڕزگاربیێ ...

ویستم

خاوەن پەیامێك بم... زۆر بەهێزبیێ

شوێن کەوتەی بەرنامەیەك بم

ووتەو کرداری پیرۆزبیێ

ویستم

بیێئامانج و مەبەست نەبیێ

کارو هەوڵدانم

خەوو خۆراك و پۆشاكم ، یاسا وسنووری

بزانم

ویستم

ڕێگای هەنگاونانم ڕاستە ڕێبێت

چاو هەق دیدەو ...زمان وشەی ڕاستی

پێبێت

کەوتمە گەڕان

هەرچی بیرو بۆچوون هەبوو ، سەرم لێدان

لای هەریەکە

بۆماوەیەك لەگەڵ فەرهەنگ و باسیدا

کەوتمە دووان...

تاسەر ئەنجام

ئەوەی دڵم پێی تینووبوو

ئەوەی گیانم لەپێناوی ، ڕێگەی دووری بۆ

بڕیبوو

دوای ماندوبوون ...

حەوایەوە لەپاڵ ئیسلام .... (بێداری خوشکان ژمارە (٠) ١٩٩٦ . دایکی خەلات)

قورئانی پیرۆز پەڕاووپەڕتوکێك نییە بۆکات بەسەر بردن بخوێنرێتەوە ، بەڵکو پەڕاوێکی موبارەکە و مایەی هیدایەتە ، قورئان خۆی لە دەیەها ئایەتدا جەخت دەکاتە سەر ئەو ڕاستییە ﴿قد جاءتكم موعظة من ربكم وشفاء لما في الصدور وهدى ورحمة للمؤمنين﴾ ٥٧: يونس ﴿ هذا بصائر للناس وهدى ورحمة لقوم يؤمنون ﴾ الجاثية : ٢٠

## خوای گەورە هیدایەت دەرە

لەم دنیایەدا شوێنەوار و ڕەنگدانەوەی ناوو سیفاتە پیرۆزەکانی خوادەبینین ، بۆ نموونە : کە دەڵێین خوا میهرەبانە و بەڕەحمە ، ئەوەتا بەشێك لەسەد بەشی ڕەحم و میهرەبانی خۆی لە زەویدا داناوە و ، بەهۆی ئەو میهرەبانییەوەیە کە دەبینین تەنانەت گیانداران میهرەبانی دەنوێنن بۆ بەچکەکانیان و باوك و دایك شەونخوونی دەکێشن بۆ منداڵەکانیان و بەدڵ و گیان و سەروماڵ گەورەیان دەکەن.

هەروەها سیفەتی (عدل) ی خوا ، ئەوەتا دەبینین چۆن تۆڵە لەستەمکاران دەکاتەوە و تاپەتی زوڵم وستەم پتەوو ئەستووربێت زووتر دەپچڕێت و لەفەرموودەی قوودسیشدا

دەفەرموێ : (یا عبادي اني حرمت الظلم على نفسي وجعلته محرما بينكم فلا تظالموا...).

**مەسەلەی هیدایەتیش هەروایە ، خوای پەروەردگار (هادی)یە و قایل نابێت بەندەکانی کافربن و دووربن** ﴿ ان تكفروا فان الله غني عنكم ولا يرضى لعباده الكفر﴾ الزمر : ٧ **واتە : ئەگەر کفریش بکەن ، خوا دەوڵەمەندە و پەکیلە کەس نەکەوتووە ، هەرچەندە رازی نابێ بەندەکانی کفربکەن ، لەبەرئەوە بەردەوام پێغەمبەرانی ناردووە ، چونکە تا ئەوان نەنێرێ و خەڵکی هۆشیار نەکاتەوە سزایان نادات** ﴿وما كنا معذبين حتى نبعث رسولاً ﴾ الاسراء : ١٥ **دەڵێن نزیکەی ١٢٤ هەزار پێغەمبەر هاتوونەتە سەر ئەم ڕووی دنیایە ، دواهەمینیان حەزرەتە ﷺ کەقورئان پێی دەفەرموێت** ﴿وكذلك اوحينا اليك روحاً من أمرنا ، ماكنت تدري ما الكتاب ولا الايمان ولكن جعلناه نوراً نهدي به من نشاء من عبادنا وانك لتهدي الى صراط مستقيم ، صراط الله الذي مافي السموات والارض ، الا الى الله تصير الامور ﴾ الشورى : ٥٣ **واتە : ئەی محمد ﷺ ئێمە قورئانمان بۆ رەوانەکردیت لەلایەن خۆمانەوە، کە ژیانبەخشە بەرۆح و گیان و عەقڵ ، تۆ نەتدەزانی قورئان چیيە و ئیمان چیيە ، بەڵام ئێمە ئەم قورئانەمان کردە نوور و ڕووناکی کە هیدایەت و رێنموویی هەرکەس کەبمانەوێت لەبەندەکانمی پێ دەکەین ، ئەوانەی کەدڵی بۆدەکەنەوە و بەچاکی گوێی بۆ دەگرن ، بێگومان تۆ ڕێ نیشاندەریت و رێنموویی دەکەیت بۆ ڕێگە و ڕێبازێکی ڕاست و دروست ، کەڕێگە و ڕێبازی ئەو خوایەیە ، کە هەر بۆ ئەوە ئەوی لەئاسمانەکان و زەویدایە ، سەرەنجامی هەمووکارێکیش هەر بۆلای خوا دەگەڕێتەوە .**

**دیارە هیدایەتی قورئان بۆ تەواوترین و ڕاسترین و چاکترین بەرنامەیە** ﴿ ان هذا القران يهدي للتي هي أقوم ﴾ الاسراء : ٩

**حەزرەت ﷺ وگشت پێغەمبەران و بانگخوازان ، تەنها کاریان ڕێنیشاندان و ڕێ ڕۆشن کردنەوەیە و کەس ناتوانێ بەزۆر کەس هیدایەت بدات ، تەنانەت پێغەمبەر ﷺ زۆر حەزی بەموسڵمان بوونی** (ابو طالب)**ی مامی دەکرد ، کەچی بڕوای نەهێناو بەکافری مرد ، قورئان لەم بارەیەوە هاتە خوارەوە و فەرمووی :** ﴿ انك لا تهدي من أحببت ولكن الله يهدي من يشاء ...﴾ **القصص : ٥٦ .**

**بەڵێ ... دڵەکان بەدەست خواوەن ، ئەگەر خێریان تیابێ و هەوڵبدەن و بیانەوێ خوا هیدایەتیان دەدات** ﴿ والذين جاهدوا فينا لنهدينهم سبلنا ﴾ العنكبوت : ٦٩

## بەڵاو موسیبەت خەڵکی هۆشیار دەکاتەوە

**خوای گەورە بێجگە لەوەی کە پێغەمبەرانی ناردووە ، کافران هۆشیار دەکاتەوە بەبەلا و موسیبەت ، جاروباریش تیٚیان دەسرەوێنێ ، خۆیان یان دەوروداوسێیان ، سا بەڵکو بگەڕێنەوە و لەخەوی غەفلەت و بیٚئاگایی بێدار ببنەوە** ﴿ولا یزال الذین کفروا تصیبهم بما صنعوا قارعة أو تحل قریبا من دارهم حتی یأتي وعد الله ، ان الله لا یخلف المیعاد﴾ الرعد : ٣١

**دووڕووەکانیش بەهەمان شێوە** ﴿اولا یرون أنهم یفتنون في کل عام مرة أو مرتین ثم لایتوبون ولاهم یذکرون﴾ التوبة : ١٢٦ **واتە : ئایا دووڕووەکان نابینن ساڵی یەك دووجار تاقیان دەکەینەوە و بەلاو موسیبەتیان بۆ دەنێرین ، سا بەڵکو بیربکەنەوە و واز لەدوو ڕوویی بهێنن ، کەچی ئەوان دوای ئەو هەموو بەلاو ناڕەحەتی و ئاگادارکردنەوەیە ، پەشیمان نابنەوە و وریانابنەوە !**

**موسوڵمانانیش بەهەمان شێوە خوای گەورە هەروا وازیان لیٚناهێنیٚ بلێن بڕواداڕین و تەواو ، بەهەموو جۆرێك تاقیان دەکاتەوە ، ( تا قولی ڕەش و سپی لەبواردا دەرکەویٚ ) ... هەروەك دەفەرمویٚ :** ﴿ما کان الله لیذر المؤمنین علی ما انتم علیه حتی یمیز الخبیث من الطیب﴾ الاعراف : ١٣٩ .

**هەروەها موسڵمانان داوایان لێکراوە کە هەموو ڕۆژیٚ حەڤدە جار لەنوێژە فەرزەکانیاندا داوابکەن و بلێن** ﴿ایاك نعبد وایاك نستعین ، اهدنا الصراط المستقیم﴾**چونکە هەموو کەسیٚ سەرگەردانە ، مەگەر ئەوەی کەخوا هیدایەتی بدات، هەروەك لەفەرموودەی قودسیدا هاتووە** ( یا عبادي کلکم ضال الا من هدیته فاستهدوني أهدکم ) **ئەی بەندەکانم ئێوە هەموو سەرگەردان و وێڵن مەگەر کەسێك من هیدایەتی بدەم ، داوای هیدایەت بکەن با هیدایەتتان بدەم ...﴿ ئەگەر سەیری سورەتی فاتحە بکەین کە تیایا داوای هیدایەت دەکریٚ** –اهدنا الصراط المستقیم– **دەبینین بە دوایدا لە سورەتی بەقەرەدا دەفەرمویٚت** – الم ذلك الکتاب لا ریب فیه هدی للمتقین – **کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنی کە هەرکەس هیدایەتی دەویٚ لە قورئاندا دەستی دەکەویٚ ﴾ .**

### ئازادی بیروباوڕ

**قورئانی پیرۆز لەڕۆژەکانی یەکەمی بانگەوازەوە ، ئازادی بیروباوەڕی ڕاگەیاندووە و لەمێژووی موسڵمانانیشدا لەکۆن و نویٚدا ڕەنگی داوەتەوە ، بۆ نموونە :**

١) لەسورەتی المزمل دا کەسێیەم سوورەتە هاتوەتە خوارەوە دەفەرموێت : ﴿ ان هذه تذكرة ، فمن شاء اتخذ الى ربه سبيلا ﴾ واتە : ئەم ئایەتانە یادخەرەوەن و هەرکەس دەیەوێت باریّی بەرەو پەروەردگاری بگرێتە بەر .

٢) لەسوورەتی المدثر کە چوارەم سوورەتە دەفەرموێت : ﴿ كلا انه تذكرة فمن شاء ذكره ﴾ وە لەسوورەتی (عبس)یشدا ئایەتی (١٢) هەمان شت دەفەرموێت .

٣) لەسوورەتی (یونس) ئایەتی(٩٩) دا دەفەرموێت : ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە هەموو ئەوانەی سەرزەوی بڕوایان دەهێنا ، دەی تۆ زۆر لەخەڵك دەکەیت کە بڕوا بێنن ؟ دیارە مرۆڤ سەرپشك کراوە و دنیاش تاقیکردنەوەیە ﴿ ولوشاء ربك لامن من في الارض كلهم جميعاً أفانت تكره الناس حتى يكونوا مؤمنين ﴾ .

٤) لەسورەتی (کهف)یش دا دەفەرموێت : پیّیان بڵێ : ئەم هەق و راستیە لەپەروەردگارتانەوەیە ، کیّدەیەوێت بابڕوابهێنێت ، کێش نایەوێت بابڕوا نەهێنێت، ئێمە حسابیان لەگەڵ دەکەین و ئامادەمان کردووە بۆ ستەمکاران ئاگری دۆزەخ ﴿ وقل الحق من ربكم فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر انا اعتدنا للظالمين ناراً احاط بهم سرادقها ﴾ الكهف : ٢٩ .

٥) ئەو ئایەتانەی پێشەوە هەموویان لە مەککە هاتونەتە خوارەوە ، لە مەدینەش بە هەمان شێوە جەختی لەسەر کراوەتەوە : ﴿ لا اكراه في الدين قد تبين الرشد من الغي ﴾ البقرة : ٢٥٦ واتە : لەئایین دا زۆرکردن نیە ، هەق و ناهەق روون کراونەتەوە و هەموکەس ئازادە چی هەڵدەبژێرێت .( ل٩٩ پەروەردەی ئیسلامی . نووسەر) .

دیارە خوای گەورە دەوڵەمەندە و پەکی لەکەس نەکەوتووە و ئاتاجی بەکەس نیە ﴿ ومن كفر فان الله غني عن العالمين﴾ ال عمران:٩٧

واتە : ئەوەی کە باوەڕی نەهێناوە وکوفر دەکات ، بابزانێت کە خوا دەوڵەمەندە و بیّنیازە لەهەموو خەڵکان ...

پێغەمبەرانیش ئەمەیان بەگەلەکانیان فەرمووە ، ئەوە حەزرەتی موسی سەلامی خوای لێ بیّ کە بە ( ئیسرائیلیەکان) دەفەرموێت : ﴿ ان تكفروا أنتم ومن في الارض جميعاً فان الله لغني حميد ﴾ ابراهيم : ٨ .

لەمێژووی ئیسلامیشدا ئەم سنگ فراوانی و زۆرنەکردنە ئاشکراو نمایانە ، (عتاب کوڕی شمیر) دەڵێ: وتم بەپێغەمبەری خوا ﷺ : ئەی نێردراوی خوا باوکێکی پیرو برام

هەیە ، با بیانهێنم بەڵکو لەسەر دەستتا موسڵمان بن ، ئەویش فەرمووی : ئەگەر موسڵمان بن چاکترە بۆیان ، خۆ ئەگەر لەسەر ئایینی خۆشیان بمێننەوە و موسڵمان نەبن ، ئەوا ئیسلام سنگی فراوانە ، ( وازیان لێ بهێنە بابەئارەزووی خۆیان بڕیار بدەن ) .

لەسەدەی چواری کۆچیشدا (ابن العطار الاندلسي) دەڵێت : ( بۆ موسڵمان بوونی هەر گاور و جوولەکەیەك دەبێت بەڵگە نامەیەك بهێنێت لەلای قازیەوە کەشایەتی چەند کەسێکی لەسەربێت ، کە زۆری لێنەکراوە و بەئازادی خۆی ئیسلامەتی هەڵبژاردووە ) حەزرەتیش بۆ پاراستنی مافی ئەوانەی کەبڕواناهێنن و لەژێر چەتری دەوڵەتی ئیسلامیدا دەژین و (ذمي) ن ، دەفەرموێت : ( من اذى ذمياً فقد اذاني) هەرکەس ئازاریان بدات ئازاری منیداوە !

هەروەها بۆ زیاتر پێکەوە ژیان و زۆرنەکردن لێیان ، لەئیسلامداڕێدراوە کەلەخاوەن نامەکان ، ژن بهێنرێ و خزمایەتی دروست ببێت ...

بەڵێ ... موسڵمانان بەسنگ فراوانییەوە مامەڵەیان کرد لەگەڵ ئەهلی کتابدا و ئازادیان لێزەوت نەکردن و دەستیان نەبرد بۆ پەرستگاکانیان ، بۆیە دەبینین ، شوێنکەوتووانی ئەو ئاینانە لەدێرزەمانەوە ماون لەناو موسڵماناندا و پەرستگاکانیشیان هەربەپێوەن .

لەلای خۆشمان ئەوپێکەوە ژیانە بەهەمان شێوە بووە ، بۆ نموونە کاك ئەحمەدی شێخ کە رابەر و پێشەوای موسڵمانان بوو لەسەردەمی خۆیدا زۆر بەئاسایی کچێکی گاوری هێنا بۆ کورەکەی و پاش ئەوەی کورێکیان بوو ، بۆی ناونان (عیسی)...

گاورەکانیش لەکوردستاندا رۆڵی نیشتمانی و خزمەت گوزاری خۆیان بینیوە کە هەقە لەبەرچاو بێت ، بۆ نموونە کەریمی عەلەکە لەساڵی گرانی و قات و قڕییەکەدا هاوکاری خەڵکی هەژار و لێقەماوی زۆری کرد .

جا ئێستاش بەڕێزان ئەوە سەرگوزەشتەی ئەوانەی کە بەبێئەوەی کەس زۆریان لێبکات و هیچ فشارێکیان لەسەربێت .خۆیان ئەم رێباز وبەرنامەیەیان هەڵبژاردووە ، فەرموون :

## (١) خالیدی کوڕی وەلید

خالید باسی تەوبە و پەشیمانی و گەڕانەوەی خۆی دەکات و دەڵێت :

هەرجارێك جەنگابم لەگەڵ موسڵمانانەدا ، دوایی سەیرم کردووە هیچمان بەهیچ نەکردووە و هەردەم داهاتوو بۆ ئیسلام بووە .

لەکاتێکدا موسڵمانان هاتن بەرەو حودەیبیە ویستیان بێنە مەککە و عومرەبکەن ، من و چەند سوارێك لەکافرەکان ویستمان فرسەتیان لێبێنین و پەلاماریان بدەین ، کەلێیان نزیك بووینەوە ، بینیمان نوێژدەکەن ، زانیم کەنوێژ هات هیچ شتێك گرنگتر نیە بەلایانەوە لەنوێژەکە ، موسڵمانان نوێژی (خوف)یان دەکرد و ئامادە و لەسەرپێ بوون بۆ ڕوو بەڕووبوونەوە بۆیە لەونوێژەدا کەنیوەڕۆ بوو هیچمان بۆ نەکرا ، خۆمان هەڵگرت بۆ نوێژی عەسر ، کەعسریش هات بەهەمان شێوە نەمانتوانی هیچ بکەین بەرامبەریان ، کەوتە دڵمەوە کە ئەمانە لەسەر هەقن و زانیم کە ئەوپیاوە (واتە حەزرەت) قەدەغەیە و پارێزراوە ) .

پاشان سوڵحیان کرد و منیش چارم نەما ، وتم ، ئەگەر بڕۆم بۆ حەبەشە بۆ لای نەجاشی ، خۆ ئەویش موسڵمان بووە ... وتم :ئەگەر بچم بەرەو شام ، باشە چۆن واز لەئاینەکەی خۆم بێنم و ببمەگاور و بچمە سەر ئایینی ڕۆمەکان ؟! بۆ ساڵی داهاتوو حەزرەت ﷺ هات بەرەو مەککە و منیش سەری خۆم هەڵگرت بۆناو شاخ و داخی ناوچەکە و خۆم ون کرد ، (ولید) ی برام کە موسڵمان بووبوو زۆر گەڕابەدوامدا ، پاشان نامەیەکەی گەیشتە دەستم کەتیایا نووسیبووی : ( بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ، لەدواییدا دەڵێم : دووریت لەئیسلام بەلامەوە جێی سەرسامیە ، لەکاتێکدا تۆ ئەوەندە ژیر و عاقڵیت ، چۆن شتێکی وەك ئیسلام هەیە و تۆی ژیریش هیچی لێنازانی ؟ سەیرە ! پێغەمبەری خوا ﷺ ئەحواڵی تۆی لێ پرسیوم و فەرمووی : کوا خالید ؟ منیش وتم : خوا دەیهێنێ ، ئەویش فەرمووی : چۆن یەکێکی وەکو ئەو دەبێ ناحاڵی بێ لەئیسلام ، ئەگەر تواناو هەوڵی لەگەڵ موسڵماناندا یەك بخستایە باشتربوو بۆی ، وە ئێمە لەپێش خەڵکانیترەوە دامان ئەنا ... جا بۆیە برام فریاکەوە و هەقی ئەو کارە ساڵحانە بکەرەوە کەلەمەوبەر لەکیست چوون ) .

کاتێك ئەم نامەیەم پێگەیشت گورج بوومەوە بۆڕۆیشتن و حەزم زیاتر کرد لەئیسلام ، وە زۆرم پێخۆش بوو پێغەمبەر ﷺ ئەحواڵی پرسیبووم !

لەوماوەیەشدا خەوێکم بینی ، کەلەخەوەکەم دا لەشوێنێکی تەنگ و تەسکدابووم خەریك بوو بخنکێم ، دوایی چوومە شوێنێکی فراوان و خۆشەوە و رزگارم بوو ! دوایی ئەم خەوەم بۆ ئەبوبەکر گێڕایەوە و فەرمووی : مژدەی خێرە (انشاء الله) ...

ئنجا چووم بۆ لای (صفوان کوڕی ئومەیە ) وتم : بەسە ئێمە چیمان لەم حاڵ و وەزعە دەست کەوت ، ئیتر بەسە عینادی و کەللەرەقی ، ئەویش زۆر بە ڕەقی وەڵامی‌دامەوە و وتی : ئەگەر تەنها من بمێنمەوە موسڵمان نابم ! لەدڵی خۆمدا وتم : کابرا باوك و براو کەسی کوژراوە کەیفی خۆیەتی موسڵمان نابێ ! ئنجا چووم بۆ لای (عیکرمە) ئەویش بەهەمان شێوە وەڵامی‌دامەوە ...پاشان چووم بۆ لای (عوسمان کوڕی تەڵحە )کە کلیلی کەعبەی لەلابوو ، ئەوهات لەگەڵمدا و پاشان لەرێگا بە ( عەمری کوڕی عاص) یش گەیشتین کەئەویش نیازی موسڵمان بوونی هەبوو...کە گەیشتینە مەدینە وەلید بەڕاکردن هات بۆ لام و وتی : خێراکە حەزرەت چاوەڕێتە ... وتم : ئاوا نایەم ، جارێ بابچم خۆم بگۆڕم و خۆم ئامادەکەم ... ئنجا چووم چاکترین جل و بەرگێ کە هەم بوو پۆشیم و هاتم بۆ لای حەزرەت ﷺ ، هەر لەدوورەوە کەبینیمی زەردەخەنە لەسە دوولێوی موبارەکی بوو ! کە گەیشتمە بەردەمی وتم : سەلامت لێبێ ئەی نێرراوی خوا...ئەویش بەڕوویەکی گەش و خۆشەوە سەلامەکەی سەندەوە ... وتم : اشهد ان لا الە الا اللە واشهد انك رسول اللە...فەرمووی : وەرە دانیشە ، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەهیدایەتی دایت، من ئەمزانی کەژیریت ، ئاواتە خوازبووم کەعەقڵت بەرەو خێرت ببات ...

منیش وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ، من دژایەتی هەقم کردووە و ڕووبەڕووی موسڵمانان بوومەتەوە دوعام بۆ بکە خوا لێم خۆش بێت ، حەزرەت ﷺ فەرمووی (ئیسلام بوون رابردوو دەسڕێتەوە ) وتم : لەگەڵ ئەوەشدا حەزدەکەم دوعام بۆ بکەی ، ئەویش فەرمووی :خوایە لەخالید خۆش ببە، هەرچی‌یەکی کردووە دژ بەئیسلام .

پاش منیش (عثمان و عه مر)یش بەیعەتیان دا ....شایانی باسە لەساڵی هەشتەمی کۆچی مانگی (صفر)خالید لەتەمەنی چلویەك ساڵیدا موسڵمان بوو ...

## ( ٢ ) سارا ئۆکۆدا

سارا لەبارەی خۆیەوە دەڵێت : من لە تۆکیۆی یابان لەدایك بووم ، لەلای ئێمە ئایین زیاتر وەك کولتور ماوەتەوە و خەڵکی لەکاتی جەنازەدا دەچن بۆ کەنیسەی بوذی، وەلەکاتی مارە بڕیندا دەچن بۆ کەنیسەی مەسیحی و، بۆ پیرۆزبایی ساڵی نوێش دەچن

بۆ کەنیسەی شنتۆ و، بەپێی نەریت ئافرەت خۆی پێش مارەبڕین هەڵگری باوەڕێك نیە و پاش مارەبڕین ئایینی مێردەکەی وەردەگرێت .

لەماوەی خوێندندا لەقوتابخانەی تایبەتی و خوێندنی کۆلیژم لەتۆکیۆ ، هیچ باسی ئایین لەئارادا نەبوو ، هەرچەندە من سەرقاڵی لێکۆڵینەوە بووم تاوەك بتوانم واتای راستی بوون تێبگەم .تۆکیۆم بەجێشهێت و بەرەو نیویۆرك رۆیشتم بۆ خوێندنی (بالیه) ، پاشان بۆ بەدیهێنانی خەونەکانم دەستم کرد بەگەڕان بەدوای خوێندنی فەلسەفەی سەردەمی نوێ ، بەلاَم ئەمیش سوودی نەبوو ... تێگەیشتم کە ئازادی وا لەناخی خۆمدایە ...پاشان بۆماوەی سێ‌ساڵ (ئایینی بەراوردم) خوێند ، لەسەرتاوە ئیسلامم لە بەرچاو کەوتبوو ، کاتێ لەپۆلدا مامۆستا دەربارەی تاك و تەنهایی (الله) قسەی دەکرد ، هۆشیاری تەواوی پێدەدام ، بەلاَم نەمدەتوانی بەتەواوەتی لەگەڵیدا رۆبچم ! بەر بەستێکی زۆر گەورە لەمێشکمدا هەبوو ، کە بەدیمەنی ناشیرین و وێنەی نەشیاوی ئەم ئایینە بنیات نرابوو ، تازەش یابانم بەجێ هێشتبوو ، وە لەخوێندنەکەمدا بەشەهادەی قەشەی راوێژکاری رۆحی دەرچووبووم . بۆیە لەخۆمم دەپرسی (چۆن قەشایەتی بۆ خەڵکی بکەم ، کاتێ کەمن خۆم ، ئایینم نیە ؟! ) جا لەبەرئەوەی وەلاَمم پێ‌نەبوو پشت گوێم خست !

رۆژێکیان لەتەلەفون دا هاوڕێیەکم وتی : السلام علیکم ، لێم پرسی : واتای ئەم قسەیە چی‌یە ! ئەویش بۆی روون کردمەوە ، وەلەبەر ئەوەی باوکی ئیمامێکی پاکستانی بوو زۆر زانیاریم دەربارەی ئیسلام و موسڵمانان لێ وەرگرت ، بەلاَم دیواری بەگری لەناخمدا هەر بەهێز بوو ...گەڕامەوە بۆ زانکۆ بۆ وەرگرتنی پلەیەك لەکارێکی کۆمەلاَیەتیدا ، لەوێ هاوڕێیەتی موسڵمانانم زۆر کرد ، یەکێکیان پێی وتم : ئایین شتێکە دەبێ بەتەواوەتی شوێنی بکەوی ، وەقورئانێکی پێشکەش کردم و وتی : ( هیوادارم ئەمە ئەو وەلاَمەی تیابێت کە تۆ بۆی دەگەڕێیت ) .

کاتێك قورئانەکەم خوێندەوە گەیشتمە واتای دەسەلاَتە بەتواناکە ( القوة العظمی ) بەلاَم نەمدەزانی چۆن ئەوبیروباوەڕە وەربگرم ؟ وەچۆن رێ لەتووڕەبوونی خێزانەکەم بگرم ؟ خەڵکی ئاخۆ چیم پێ بڵێن ؟ خوشکێکی موسڵمان دڵسۆزانە قسەی بۆ کردم و ژتی : گەر بەڕاستی دەزانی لەدڵتا ، قبوڵی بکە ، ئیسلام پێنج پایەیی هەیە و موسڵمان بوون گرنگترە لەبالاَپۆشی ، تۆشایەتمان بهێنە و شتەکانی‌تر دواتر لەکاتی خۆیاندا دێنە

دی .ئەوە خاڵی وەرچەخانم بوو ، ئەو وشانە چوونە مێشکمەوە و ڕۆحیان گرتم و بەربەستەکەیان رووخاند ، ئیتر ڕۆیشتم بەرەو مزگەوت و لەوێ شایەتمانم هێنا .خێزانەکەم زۆر زۆر تووڕەبوون ، باوکم هەوڵیدەدا پەشیمانم بکاتەوە و دایکیشم زۆر خەفەتی دەخوارد ، لەئیمامەوە فێربووم کەشەڕکردن باش نیە و بێ هودەیە ، لەبەرئەوە خۆم دوور ئەگرت لەتووڕە بوونیان و را ئەوەستام تا هێوردەبوونەوە .لەبانقی یابانیدا خەریکی کاری خۆم بووم و دەمزانی کەمن وورده ورده هەنگاو دەنێم ، هەرچەند پۆشاکی ئیسلامیم لەبەردایە ... بەم زوانەش سەردانی تۆکیۆم کرد کە زۆر مەڵبەندی ئیسلامی گەورەی لێکراوەتەوە و ، ئافرەتە یابانییەکانم بینی کە چۆن بەپەرۆشەوە ئیسلامیان لەئامێز گرتبوو ...هەندێکیان شوویان بەموسڵمانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست کرد بوو ، زۆر بەختەوەر بوون لەژیانی هاوسەریاندا .قبووڵ کردنی ئیسلام گەورەترین تاقیکردنەوەی ژیانمە و من بەختەوەرم بەم ئاینە و دەزانم ڕێگەیەکی راستە ، ڕۆح و جەستەم هاوسەنگییان وەرگرتووە و هەوڵی گەشە کردن ئەدەم ...( ئایندە ژمارە (٢٤) ساڵی ١٩٩٩ / پەیمان حەمە صالح لەئینگلیزییەوە وەری گێڕاوە ) .

(٣) جودیث هیلد بیرانت

(اللـه) م خۆش دەوێ ... بەو وشانە گۆرانی بێژ و ئەکتەری سینەمایی ئەڵمانی بەناوبانگ (جودیث) باس لەموسڵمان بوونی خۆی دەکات ، کەلەساڵی ١٩٩٧ ئایینی پیرۆزی ئیسلامی هەڵبژارد ، چونکە تەواوترین ئایین و بەرنامەی ژیانە و پاش موسڵمان بوونی ناوی خۆی گۆڕی بۆ (هدی).

کاتێك تەمەنی (١٢) ساڵان بوو ، دایکی موسڵمان بوو ، بەبێئەوەی زۆر لەم بکات موسڵمان ببێت ... (جودیث) لەپەڕاوەکانی فەلسەفە و ئاینیەکان کۆڵیەوە تابڕوای لەسەر ئیسلام دامەزرا ...

لەگەڵ ئەوەدا کە تەنها هەندێ نزا و پاڕانەوە بەزمانی عەرەبی دەزانێت ، پابەندی ئیسلامە و بەهیچ شێوەیەك توخنی خواردنەوە و مادە بێهۆشکەرەکان ناکەوێت کە زۆر بلاوە لەنێوان گەنجە ئەڵمانیەکاندا ...

(جودیث) ئێستا تەمەنی (٢٢) ساڵە و بەرێکوپێکی نوێژەکانی ئەنجام دەدا و دەڵێت : (نوێژی بەیانی ئەوەندە لام ئاسانە هەروەك ئەوە وایە بەیانیان دەم و دانم بشۆم ! ) .

هەروەها بەبەرگی بالاپۆشی‌یەوە لەناو کۆمەڵگادا دێت و دەچێت و شانازی دەکات بەئیسلامەوە و هەردەم خەریکی خۆ هۆشیار کردن و فێربوونی زیاتری ئیسلامە ...

(جودیث) دەڵێت : ئیسلام ئاینێکی تەواوو گشتگیرە و پەیڕەوە باشەکانی هەموو ئاینیەکانی تریشی لەخۆگرتووە ... وە جیّ داخەکە زۆربەی خەڵکی تەنها بەژیانی ئەم جیهانەوە سەرقاڵن و بیریك لەپاشەڕۆژ ناکەنەوە .

خاتوو (هدی) ئامادە نیە شووبکات بەکەسێکی نا موسڵمان هەرچەندە بەدڵیشی بێت و دەڵێت بیروباوەڕەکەم ڕێم نادات کاری وابکەم ... وە ئێستا لەشاری میونخ دەژی و لەمزگەوتەکەی ئەوشارەش نوێژەکانی ئەنجام دەدا و وەسیەتیشی کردووە پاش مردنی لەگۆڕستانی موسڵمانان بەخاك بسپێرێت .

( ئاینده (٣١) ساڵی ٢٠٠٠ کەلە ڕۆژنامەی تورکی ( Takvim) ی ڕۆژی ١٩٩٩/١٢/٥ ەوە وەرگیراوە ) .

## ( ٤ ) حنان

ژنە گۆرانی بێژی میسری (حنان) لەچاوپێکەوتنێکدا لەکەناڵی فەزایی (اقرا)بەرنامەی (المواجهات) دا وتی : لەچەند ساڵ لەمەوبەرەوە بیردەکەمەوە چی بکەم و چۆن خوا لەخۆم رازی بکەم . راستە خوا نیعمەتی زۆری بەمن داوە ،مێردی باش ، خێزانی باش ، دەستکەوتی باش لەکارە هونەریەکاندا ، بەڵام خۆنابێ تاسەر مەستی دنیا و هەواو ئارەزووبین ، بۆیە بەردەوام دوعام دەکرد و لەخوا دەپارامەوە ، خوای گەورەش کەسەیری دڵ و نیەت و ئیخلاص دەکات بەفەزڵ و میهرەبانی خۆی هیدایەتی دام و لەخەوی غەفڵەت بەئاگای هێنام .من دەستی قودرەتی پەروەردگارم دەبینی لەزۆرشتدا ، کەزیاتر دەبوونە مایەی خواناسین و ڕیّرۆشنی بۆم ... هەروەها لەریّی دۆستایەتیم لەگەڵ هونەرمەندە بالاپۆشەکاندا وەك ( شهیرە و عفاف شعیب و نسرین) ەوە لەخۆشەویستی راستی نێوان موسڵمانان تێگەیشتم و ئەوان بوونە پێشەوا و مامۆستام ...جاران من قورئانم دەخوێند ، بەڵام بەشێکی زۆرکەمی تێدەگەیشتم ، وام دەزانی خۆداپۆشین و بالاپۆشی سوننەتە ، کەچی کە زیاتر شارەزایم پەیداکرد زانیم کە فەرزە لەسەر هەموو ئافرەتێکی بالغ ...پاش ئەوەی کە خوا هیدایەتی دام ، تێگەیشتم کەدینداری راست تەنها نوێژوو ڕۆژوو نیە ، بەڵکو گێڕانەوەی نەفسە لە هەموو ئەوشتانەی کە خوای گەورە قەدەغەی کردووەلێمان و دیارە دەبێت مرۆڤ لەگەڵ نەفسی

خۆی تێبکۆشێ و عەقڵی خۆی نەداتە دەست دنیا و هەواو ئارەزوو ، چونکە هەموو ئەم دنیایە دەبڕێتەوە و لێپرسینەوەش لەرێی هەموومان دایە .کاتێك رێڕەوی ژیانی خۆمم گۆڕی بەرەو هەق و ڕاستی ، هەندێ کەس لۆمە و سەرزەنشتیان کردم و لایان شتێکی عاجباتی بوو ، هەندێکی دیکەش بەگەرمی پیرۆزباییان لێکردم ...لەسەرەتاوە تا ساڵێك حەزم نەدەکرد چاوپێکەوتن بکەم لەگەڵ هیچ رۆژنامە و گۆڤارێکدا لەترسی ئەوەی نەك شتێك بڵێم بەنەشارەزایی کەلەجێی خۆیدا نەبێت ... ئێستاش لەسایەی خواوەوە بەردەوامم لەسەر فێربوون و شارەزایی تەواو لەئاینەکەمدا و رۆژانە زیاتر بەرەوپێش دەچم . ( ئایندە ( ٣٠) ١٩٩٩ ) .

## ( ٥ ) رانیا علوانی

لەدیدارێکدا لەبەرنامەی (المواجهات) ی کەناڵی (اقرأ) کەلەگەڵ کچە پاڵەوانی جیهانی وەرزشی مەلەوانی (رانیا علوانی) سازکرا ، سەرنجی بینەرانێکی زۆری راکێشا ، بەتایبەت کە ئەم کچە میسریە تەمەنی (٢٣) ساڵە و لەدوای (١٧) ساڵ مەشق و راهێنان و بەدەست هێنانی دەیان مەدالیای سەرکەوتن ، کە دواهەمینیان بەشداریکردنی بوو لەئۆلۆمپیاتی (سیدنی) لەئوستراليا ، ماوەی پێنج ساڵیشە لەکۆلیژی پزیشکی دەخوێنێت لەئەمەریکا ، دوای بەدەستهێنانی پلەی پاڵەوانێتی جیهان و شکاندنی ژمارەی پێوانەیی بڕیاری وازهێنان و باڵاپۆشی راگەیاند .

(رانیا) لەلایەن حکومەتی میسرییەوە هەزارەها جونەیهی بۆسەرف کراوە تابگاتە ئەو پلەیە و بەتەمای سەرکەوتنی گەورە و مەزنی بوون ... بۆیە زۆر لە مەشق پێکەرەکانی سەرسام کرد و ناوەندی وەرزشی شڵەقاند ...

(رانیا) دەیزانی هەرگیز وەرزش بەپێی بەرنامەی ئیسلام هەڵە و یاساغ نیە ، بەڵکو بەهەڵە مومارەسەکردن و لادان لەبنەما شەرعیەکان دەیخاتە بەر نەزەر و قسە و باسەوە .

(رانیا) لەجلی مایۆی وەرزشی و تێکەڵی ناوپیاوانەوە ، بووە ئافرەتێکی باڵاپۆش و رایگەیاند کەوازهێنانم لەوەرزش ، لەلوتکەی سەرکەوتندا ، مانای دژایەتی کردنی نیە ، چونکە ئەمە ستەمە لەئاینێك کەچواردە سەدەیە فەرموویەتی ﴿علموا اولادکم الرماية والسباحة ورکوب الخيل)... وە جوانی وەرزش و هەموو هونەرێك لەوەدایە کەرەچاوی ئەوپەڕی جوانی ئەو هونەرە و ئەوپەڕی رەوشت و ڕواڵەتی تیا بکەی ، بۆ ئەوەی هونەرێکی راستبێ و هەستە زایەندییەکانی مرۆڤ نەوروژێنێ ...

لەبارەی داهاتووشەوە رانیا دەڵێ حەزدەکەم لەبواری پزیشکیدا خزمەتەکانم پێشکەش بەخەڵکی و بەکۆمەڵگا بکەم ... (ئاینده (٢٨)ساڵی ٢٠٠١) .

## ( ٦ ) زیزی مصطفی

سەماکەری میسری (زیزی مستەفا) پاش ئەوەی خۆیداپۆشی ، پاش پانزە ساڵ ، لەکەناڵی فەزایی (اقرأ)بەرنامەی (المواجهات) دا ساڵی ٢٠٠١ وتی :

بەمناڵی باوکم مرد و کەسوکارم لە(صعیدی میسر) ویستیان بە زۆر بمدەن بەشوو بەکوڕی عومدەی ناوچەکەمان ، منیش رام کرد و ماوەیەك لەماڵی هاوڕێیەکم بووم ، پاشان لەناچاری و بێکەسیدا لەمەلهاکاندا خۆم بینیەوە و بەسەماکردن بژێوی خۆم پەیدا دەکرد .

شەش جار شووم کردووە ، هەموویان پیاوی باش بوون ، حەزیان دەکرد لەماڵەوە دابنیشم ، منیش هونەرەکەمم لامەبەست بوو ، بۆیە جیابوونەوە رووی ئەدا و منیش هەر لەیەکێکیان جیابوومایەتەوە شووم دەکردەوە چونکە عادەتی کەس و کارم وابوو ئەگەر لەسایەی مێردا بوومایە نەدەهاتن بەلامدا و ئەگەر بیانزانیایە بێمێردم ، بۆ شۆردنەوەی عەیب و عارێ کە بەهۆی منەوە بەسەریان هاتبوو دەیان کوشتم !

کچێکم هەیە ئێستا لەپەیمانگای هونەرە جوانەکانە و ، بەو مەرجە هێشتوومە بچێت کە لەدواڕۆژدا لەرۆڵێکدا کاربکات کەخواو پێغەمبەر ﷺ پێی رازی بن .

ئەویش پەیمانی داومەتێ کەپابەندبێت بەکارێکی هونەری واوە کە سوودبەخش بێ بۆ خەڵکی و بێشەرعی تیا نەبێت .

کاتێك دەچووم بۆ سەماکردن و نواندن فاتیحەم دەخوێند بۆئەوەی کارەکەم بەبەرەکەتی ئەو سوورەتە سەربکەوێ ، تا هەقم نەبوو ئەوەندەم لێ دەزانی ، لێم شێوابوو

تا ڕۆژێك هاتمەوە لەکارێکی هونەریم ، کچەکەم هانیدام کەوازبهێنم ، منیش پەیمانم دایە ، پەیوەندیم کرد بەشێخ متولی شەعراویەوە و وتم : مامۆستا من لەبارێکی دەروونی خراپ دام و دەمەوێ وازبهێنم ، بەلاَم نازانم چۆن بژیم وزۆر دەترسم ... ئەویش فەرمووی ( ئەو خوایەی کەبێ ئەمریت کردووە و لەخۆتت رەنجاندووە رزق و رۆزی بۆناردویت ، قابیلە کە فەرمانبەریت کرد و لەخۆتت رازی کرد رزق و رۆزیت بۆ نەنێرێت و (ستر)ت نەکات ، کچم زۆر چاکە وازبهێنە و دوعاش بۆ من بکە)... لام سەیر بوو ، وتم : قوربان

گاڵته دەکەیت ؟ دوعای چی ؟ فەرمووی : تۆ ئێستا دەگەڕێیتەوە بۆ لای خوا و لەخۆتی ڕازی دەکەیت و چەند دەتوانی دوعاش بۆ من بکە ، ان شاء الله گیرا دەبێت .

بەڵێ وازم هێناو بەوپارانەی هەمبوون و بەپارەی (بانق) یش ویستم پرۆژەیەك بکەم و پێی بژیم ، بەداخەوە پرۆژەکە سەرنەکەوتوو ، زیانی زۆرم لێکەوت ...

ڕۆژانێك هەبوو جلێکم لەبەردەکرد تەنها بۆیەك جار و نرخەکەشی پێنج هەزار دۆلار بوو ، ئێستاش ئەو پارە و سامانە حەرامانە ڕۆیشتن و لەشوقەقەیەکی کرێدام و ئوتومبێلێکی شڕم هەیە ... خوا نەیبڕێ زۆرباشە و ئاسوودەم !

کچەکەم قورحەی هەبوو پارەی زۆرم تیا خەرج کرد و چەندجارێکیش چووم بۆ حەج و هەمووساڵێکیش دەچم بۆ عومرە و ، داوادەکەم لەخوا لەو نیعمەتی عومرەیە بێبەشم نەکات ، چونکە خۆشیو گەشت و گوزاری ڕاستەقینەی من ئەوەیە .

پێش ساڵێك چووم بۆ لای (سعاد حسنی) کە سی ساڵ هاوەڵ بووین و پێم وت : ئەوە کاتی حەجە و ئەوەش پارە بابەیەکەوە بچین بۆ زیارەتی ماڵی خوا ، وتی : بەپارەی خۆم نەبێت نایەم ، وتم : باقەرزبێت لات ، ڕازی نەبوو ...

لەلایەن ڕۆژنامەکانەوە هێرشێکی زۆر دەکرێتە سەر ئەو هونەرمەندە ئافرەتانەی کە خۆیان داپۆشیوە ، وە بەتایبەت من ، کە ئێستا لەدادگادا شکاتم کردووە لەرۆژنامەیەك ، کە دەڵێت : گوایە لایەنێك پارەی داوە بەمن و گوایە من بەپارە ویستومە (سعاد حوسنی) لەچك پێبکەم .

خوا شایەتە پارەی خۆم بووە ، خۆزگە کەسێك ، یان لایەنێك هەبوایە یارمەتیان بدامایە ،من خاکی بەرپێیانم ماچ دەکرد ... ئنجاخۆ ئەگەر هەوڵم دابێت خۆشتێکی خراپم نەکردووە ، چی لەوە باشترە کەسێك بانگ بکەیت بۆ ڕەوشت و خووی بەرزی ئیسلام و خۆداپۆشین ؟

## ( ٧ ) کامیلیا العربی

لەچاوپێکەوتنێکی کەناڵی فەزایی (اقرأ) بەرنامەی (المواجهات) کامیلیا العربی وتی : دەساڵ لەتەلەفزیۆن بەرنامەی منالآنم پێشکەش دەکرد ، ڕۆژانە خۆم ئامادە دەکرد و بەردەوام سەرقاڵ بووم ، تاوەکو لەگەڵ دایکم و براکەمدا چووین بۆ حەج ، لەکاتی (طواف) دا بڕیارمدا کە ئیتر بەیەکجاری خۆم داپۆشم و چیش دەبێ بابێت .

رۆژێك شوققەكەمان سووتا وهەرچی تیابوو بووە خۆڵەمێش ، تەنها ئەو قورئانە نەبێت كە لەسەر تەلەفزیۆنەكەدانرابوو ، خایە و مایەمان نەما ، تەنانەت ئەو پارانەش كە هەمان بوون لەبانقدا ، مێردەكەم دەری هێنابوون لەبانق و لەماڵەوە دانابوون ئەوانەش هەمووی سووتان و نەمان ... تاقیكردنەوەیەكی گەورەبوو ، بەڵام لەسایەی خواوە خۆمان راگرت لەبەردەمیا و بڕیارم دا زیاتر پابەندبم بە ئیسلامەوە ...

پاش وازهێنانم لەتەلەفزیۆن خەمم بوو چۆن كات بەسەر بەرم ، كەچی ئێستا كات بەشم ناكات و خواخوامە رۆژێكم ببێ بەهەفتەیەك ...

ماڵەكەمان وەك بەڕێوەبەرایەتی كاروباری كۆمەڵایەتی لێهات و هەردەم خەریكی چارەسەری كێشەی خەڵك بووین ... دیارە ئیسلامەتی ئەوەناگەیەنێ كە مرۆڤ لە ماڵەوە دانیشێ و لەخەڵكی دووره پەرێزبێت ، وە بەلای منەوە خۆدا پۆشینەكەم واتە : رەوشت بەرزی و مامەڵەی چاك لەگەڵ خەڵكیدا ...

لەسەرەتاوە چەند منداڵێكی بێباوكم سەرپەرشتیدەكرد ، دوایی زۆرتربوون و ژمارەیان گەیشتە سێسەد كەس ، لەساڵی ١٩٩٣دا ( كۆمەڵەی خۆشەویستانی خوا) (جمعية أحباب الله) م دامەزراند و نزیكەی سێسەد كەسی فەرمانبەر لەلام كاردەكەن و پارەشمان لەرێی كۆمەك وبەخشینی خێرخوازانەوەیە ...( دایەنگا و شوێنی پیرو پەككەوتە و بنكەی تەندروستی و بنكەی وەرزشی و قوتابخانەشمان هەیە ) كە هەموو ئامێرێكی پێشكەوتووی تیایە و بەچاكی پرۆسەی فێركردن و خزمەتكردن بەڕێوە دەچێت .

چوار ساڵێك لەمەوبەر واتە ساڵی (١٩٩٧) پارە و پولمان بەدەستەوەنەما ، زۆر خەمم خوارد و نەمدەزانی چیبكەم بۆ ئەو هەموو كەسەی كەلە ئەستۆی من بوون ، هیچ دەرگایەك نەما تەنها دەرگای رەحمەتی خوا نەبێت ، لە شەونوێژدا زۆر لەخوا پاڕامەوە ، بۆ بەیانی چوومە سەر مێزەكەی خۆم دانیشتم ، پێنج خولەكی نەبرد كابرایەك هات پاش سەلام وتی : پێویستان بەچیيە ؟ وتم : هەرچییەك بێت ، تەنانەت ئەگەر نانێكیشمان بدەیتێ بیدەین بەو منداڵە بێ باوكە برسیانە سوپاست دەكەین و بۆ ئێمە جێیەك دەگرێت ... ئەویش چووە دەرەوە و هاتەوە جانتایەكی هێنا لەسەر مێزەكەم دای نا كە سی هەزار جونەیهی تیابوو و بەبێئەوەی ناوی خۆی بڵێ رۆیشت ... منیش لەخۆشیا كە خوای گەورە دوعای قبوڵ كردم و هات بەهاناماناوە یەكسەر سوجدەی شوكرم برد و زۆر گریام

... ئیتر بەفەرمانبەرەکانی خۆمم وت : دڵنیابن خوا ئاگادارمانە وپەکمان ناخات ، مەگەر خوا نافەرموێ لەفەرموودەی قودسیدا ( وماز ال عبدي يتقرب الى بالنوافل ... تادەگاتە ...ولئن سألني لأعطينه ... ) .

... بەڵێ ئێمە هەموو موسڵمانین و ئاشکرایە بەهەشت سەد پلەیە ، بۆ هەوڵ نەدەین پلەو پایەمان بەرزبێ ...؟

ئێستاش ناحەزان بۆیان تێچاندووین لای میری ، بۆیە منیش داوا لە(سۆزان مبارك) دەکەم ، هاوسەری سەرەك کۆمار کە خۆی بێت و لەنزیکەوە کارەکەمان ببینێ و ئەوسا حوکمی خۆی بدات ...

## ( ٨ ) دکتۆر ئەحمەد

دکتۆر ئەحمەد کۆلیژی بەیتەرەی تەواو کردووە لەبەغداد و باس لەموسڵمان بوونی خۆی دەکات و دەڵێت :

ناوم (سورێن کارنیك جۆرج) ە و لەخێزانێکی مەسیحیدا لەدایك بووم و لەپاش چل رۆژ تووشی نەخۆشییەك بووم ، پزیشك ئامۆژگاری کردن کەخەتەنەم بکەن چاك دەبمەوە ، ئەوانیش ناچار خەتەنەیان کردم ، هەرچەندە ئەمە یەکەمجار بوو لەناو ئەرمەنییەکاندا شتی وا رووبدات ...

دایکم نەزری کردبوو لە (١/٢٤) دا هەموو ساڵێك مەڕێك بکات بەخێر بەهیوای تەمەن درێژی من و لەو بەروارەدا هەموو خزمانمان کۆدەبوونەوە ئاهەنگێك خۆ بەخۆی خۆمان سازدەکرا...

ماڵمان لای دوورگەیەکی جوانەوە بوو لەبەغدا ، بەتەنها دەچوومە سەر دوورگەکە و دەژیام لەگەڵ جوانی سروشتدا و کاری زۆری دەکردە سەر ئیمانم ...

خۆم و دایك و باوکم دووربووین لەکەنیسەی ئەرمەنییەکان و پەیوەندیمان لاوازبوو لەگەڵیان ، بەپێچەوانەی ماڵی پوورمەوە کە خۆی و منداڵەکانی بەگەرمی هاتووچۆی کەنیسەیان دەکرد .

باوکم لەگەڵ ئەوەدا کەبڕوای بەخوا لاوازبوو ، رۆژێك شتێکم لاباس کرد کە هێرشی تیابوو بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ ، ئامۆژگاری کردم و وتی : نابێ قسە بەپێغەمبەران بووترێت ، ئەم ئامۆژگارییەی زۆرکاری تێکردم .

زانکۆش کەش و هەوایەکی ناساز و ناخۆش بوو ، هاوەڵێکی کوردم هەبوو ناوی دلێر بوو ، ئەویش بەتەسکەرە موسڵمان بوو ، هەمیشە هانی دەدام کەبچمە ناوکۆمەڵی ئەرمەنییەکانەوە و بەئارەزووی خۆم سەرمەست بم لەئافرەت و لەخواردنەوە و ...هتد

بۆیە منیش چوومە یانەیەکی ئەرمەنییەکانەوە ، کەیاری تیائەکرا و ئاهەنگی تیا ئەگێڕدار و عەرەقی تیا دەخورایەوە ، هەرچیم دەکرد لەجیاتی ئەوەی دڵم خۆش بێت بەپێچەوانەوە دڵم تەنگ دەبوو .

باوکم عەرەق خۆربوو ، رۆژ بوێری نەدەکرد ، ئەگەریەکێ لەئێمە دانی بیەشایە ئەیووت عەرەق بخۆرەوە ، رۆژێك دانم زۆر ئازاری ئەدام و نەمزانی چی بکەم ناچار عەرەقم خواردەوە بۆئەوەی ئازارەکەی بشکێ ، کەچی زۆر ئازاریدام و رشامەوە و ، لەوەو دوا وام لێهات هەر بۆنی بهاتایە بەسەرما دڵم تێکەڵ دەهات و زۆر ڕقم لێ‌دەبۆوە ، کەئەمەش قەدەری خوا بوو کە ئیتر هەرگیز توخنی نەکەوم .

هاوەڵانی زانکۆم سڵیان نەدەکردەوە لەعەرەق و لەداوێن پیسی ، بەڵام من هەمیشە دەمزانی کە ئەوشتانە لەمن یاساغ و قەدەغەیە ...

لەساڵی ١٩٧٣ چوومە زانکۆ و لەساڵی ١٩٧٤ دا گەشتێك هەبوو بۆ لوبنان ، بینیم هاوەڵەکانم لەوگەشتەدا زۆر رەوشتیان گۆڕدرا و زیاتر بەرەو بەرەڵایی چوون و شوڵیان لێ هەڵکێشا ...

گەشتەکە دووهەفتەی خایاند و من خۆم زۆر دوورە پەرێز رادەگرت و لە ئۆتێلەکە نەدەهاتمە دەرێ ، جاروباریش لەداخا دەگریام ...

هاوەڵێك لەناو هەموویاندا سەرنجی راکێشام کەناوی ( ئەحمەد عبدالقادر) بوو ، هەمووان رێزیان دەگرت ، ئەو لەپۆلی چواربوو ، منیش لەپۆلی دوو بووم و ، زۆر رێزم لێ‌ئەگرت ...

کە گەڕاینەوە لەوگەشتە ، رۆژێك سواری پاص بووم بۆ ماڵەوە لەدوای دەوام، تەنها لەلای منەوە جێ‌هەبوو ، بەقەدەری خوا هاتە لامەوە دانیشت ، وتی برام (سورێن) تۆڕات چییە بەرامبەر بەهەق و راستی ؟ وتم : من بەدوای هەق و راستیدا دەگەڕێم ... ( لەوماوەیەدا کتێبم زۆر دەخوێندەوە )...

وتی : پەڕاوێکم هەیە ریێ راستت پیشان ئەدات ، وتم : من پێویستم پێیەتی... بەڵێ پەڕاوەکەی بۆ هێنام (قصة الايمان) بوو ، کەوتمەخوێندنەوە ی ، بەجۆرێك کاری

تێکردم ، سێ رۆژ لەسەریەك لەژوورەوە نەهاتمە دەرەوە تا بەچاکی تەواومکرد . تەواو گۆڕیمی و وام لێهات بیر لەئیسلام بکەمەوە ، دەستم کرد بەنوێژ بەڵام وەك ئەرمەنی‌یەکان کەبینیبووم و ، بەدزی‌یەوە لەبەینی خۆم و خوادا بوو .

کاتێك تێکەڵ بەخەڵك دەبووم دائەبەزیم ، ناچار ئەبووم بەخوێندنی چەندەها ئایەت خۆم شەحن بکەمەوە ، بۆیە هەندێ لەوئایەتانەم لەسەر دیواری ژوورەکەم نووسی تا هەمیشە لەبەرچاوم بن ...

ئنجا (ئەحمەد) ی هاوەڵم پەڕاوی (روح الدين الاسلامی) بۆ هێنام و ، دوو بەشی بۆدیاری کردم کەبیخوێنمەوە کەلەبارەی موعجیزاتی قورئان و یەکخواناسی‌یەوەبوو...کەخوێندمەوە زیاتر بەرەو ئیسلام هاتم و بیرم دەکردەوە ، باشە ئەگەر بێمە سەر ئەم رێبازە ، بەرد بارانم دەکەن ، باشە لە کۆلێژەکەمان چی وەڵامی کوڕان و کچان بدەمەوە !

بەخۆمم وت : ئەوەی بیەوێ بگۆڕێ ، پێویستە بەرگەبگرێ ... کارەکە لەدەروونما ئاسان بوو ، بەهاوەڵەکەم گەیشتمەوە و پەڕاوەکەم بۆ گەڕاندەوە ، وتی : سورێن خوێندتەوە ؟ وتم : بەڵێ . وتی : رات چی‌یە ؟ وتم : بەخوا ئیسلام زۆر خۆشە ، بەڵام نازانم چۆن دەست پێ بکەم ، رەنگە بمکوژن ...

وتی : ئێمە لەکەس ناترسین لەخوا نەبێ ... ئەو قسەیەی لەدەروونما (تحدی) دروست کرد ، ئنجا سوورەتی فاتیحەی بۆ نووسیمەوە و وتی : لەماڵەوە خۆت بشۆو شایەتمان بهێنە ... منیش هەرچی پێوتبووم کردم ، بووم بەمرۆڤێکی تر ...خەڵکی قسەیان لەگەڵ دەکردم من لەدنیایەکی تردا بووم ...

رۆژێك چووین بۆ مزگەوتی (١٤رمضان) لای ( جندی مجهول) لەوێ فێری دەستنوێژی کردم و نوێژی نیوەڕۆمان کرد و پاشان عەسریشمان بە کۆمەڵ ئەنجامدا ، لاسایی خەڵکەکەم کردەوە ، پاش نوێژ کە هاتمە دەرەوە ، هەستێکم بۆ دروست بوو ، وام دەزانی لەخۆشیا بەباڵ ئەفڕم .

ئنجا پەڕاوێکی فێربوونی نوێژی مامۆستا (صواف) ی دامێ ، تابەچاکی فێری نوێژبیم ، چونکە هیچم نەئەزانی ، تەنانەت نەم ئەزانی قیبلە لەکوێوەیە، جاری وا هەبوو بەپێچەوانەی قیبلەوە نوێژم کردووە ، قورئانێکیشی بەدیاری دامێ ، سورەتی مەریەمم خوێند ، هەرچەند هیچی لێ حاڵی نەبووم ...

سەیری باخەوانەکانی زانکۆم دەکرد کە نوێژیان دەکرد بۆئەوەی باشتر فێرببم ، پاشان بۆیەکەم جار چوومە مزگەوتی زانکۆ وە و زۆرلایان سەیر بوو ، جارێك منیان کرد بەئیمام زۆرم پێخۆش بوو ، بەلاّم مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێت چۆن نوێژێکم پیٚکردن ، هیچی بەسەر هیچەوە نەبوو !

مەسەلەی برایەتی زۆرکاری تێکردم ، ئێوە ئێستا هەستی پیٚناکەن ، بەلاّم ئەوانەی لەتاریکیدان و دوورن لەونیعمەتی برایەتی یە ئەوانە چاك هەستی پیٚدەکەن و بەهیچ شتێك نایگۆڕنەوە ...

هاوەڵەکانی پێشترم برا نەبوون ، ئەو خۆشەویستی یە پاکەی لەبەرخوایە هەرگیز لەلایان نەبوو ، بۆ یەکەم جار هەستم بەو برایەتی یە کرد لەبەرخوا ...برادەرەکەم ، هەموو هەینی یەك بەئوتۆمبیلەکەی دەهات و بەیەکەوە ئەچووین بۆ نوێژی هەینی لەمزگەوتی (حي الضباط) ،جا لەبەرئەوەی خێزانەکەمان تەنها لەهەینی دا کۆدەبوونەوە بۆنان خواردن و منیش بەهۆی نوێژەکەوە دوا ئەکەوتم ، بەوە دەنگی ناڕەزایی یان لیٚ بەرزبۆوە ، ئەم حاڵە سیٚمانگی خایاند ، پورێکم هەبوو لەجیٚی پیاوبوو ، خاوەن زەوی و زارێکی زۆربوو ، زۆر دژایەتی کردم و باوك و دایکمی لیٚ هان ئەدام ... کەوتنەچاودێریکردنم و بەدزی یەوە برابچووکەکەمیان دەنارد بەدواما ، منیش پیٚم نەزانی ، تادڵنیا بوون کە موسڵمان بووم ، لێیان کردم بەهەرا و دەیان قیڕاند بەسەرما : تۆشێت بووی ، تۆ ئابڕوومان دەبەی لەناو خەڵکا ، تۆچۆن موسڵمان دەبیت ؟

وام لیٚهات بیربکەمەوە واز لەئیسلام بهێنم ، نەم ئەتوانی ئارام بگرم ، ئەموویست بیٚ دەنگیان کەم ، ئەمووت : باشە ئەگەڕێمەوە ، بیٚدەنگ بن و بیبڕنەوە !

لەوکاتەدا خوشکەکەم کە پێنج ساڵ لەمن مناڵ تربوو ، هات چرپانی بەگوێمدا ، وتی : خۆزگە لەجیٚی تۆ بوومایە ... زۆر سەیر بوو لام ...

لەوکاتەدا هاوەڵەکەم تەلەفونی کرد ، وتم : فریام کەوە ، لیٚم قەوماوە و هەموویان دژم وەستاون ، وتی : برام ئارام بگرە ... پاش ئەو تەلەفۆنە گوێوتینم بۆ گەڕایەوە و ئەوانیش بیٚدەنگ بوون ، وتیان : دەی فەرموو قسەبکە ... وتم : چی ئەکەن بیکەن وازناهێنم و چوومە قاتی سەرەوە بۆ ژوورەکەی خۆم ....

ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بیٚتاقەت تردەبووم لەماڵەوە ، نەم ئەزانی چی ئەخۆم ، مێشکم زۆر هیلاك بوو ، ڕۆژانە شەڕیان پیٚ ئەفرۆشتم ... ناچار ئەچووم بۆ بەشی ناوخۆیی

له(ئەبوغریب) و بەدوو ڕۆژ نەئەگەڕامەوە و لەلای هاوڕێیەکی ئەفریقیم دەمامەوە کەناوی (محمد) بوو ، دایکم خۆی بۆنەئەگیرا و ئەهات بەدوامدا ... لەماڵەوە پەیمانیان ئەدامێ ئازارم نەدەن ، بەڵام هەرزوو بەیەکا ئەتەقینەوە ، وەك ساردو گەرم بەیەکەوە شۆڕتمان دەکرد . جاران باوکم کە دەیخواردەوە ، خۆم خزمەتم ئەکرد ، ئێستا خۆم بۆ نەئەگیرا و ئەمووت ئەمە حەرامە و وازم لێنەئەهێنا و ، ئەبوو بەبەزم ، ئەیان وت : باشە ئێمە دینمان نیە ؟ پێغەمبەرمان نیە ؟ تۆ بۆ وائەکەی ؟ .... دەی ئەبوو بەدەمە دەمێ و ئاژاوە ... من زۆربە شێوازی گفت و گۆی حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێ موعجەب بووم ، بەڵام هەرچیم دەکرد سوودی نەبوو لەگەڵیانا وباوکم دەچووە ژوورەکەم و پەڕاوەکانی ئەدڕاندم

لەم گفت و گۆ و موناقەشەیەمدا خوشکەکەم کەناوی (سلوی) بوو سوودی وەردەگرت ، بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەم ... ڕۆژێك کە چوو بۆ قوتابخانە لەچکی کرد ، کەهاتەوە کەوتنە وێزەی و ئەوەی خراپ بێ پێیان کرد و ئەویش کەوتە هەمان دەردەسەری و ناڕەحەتییەوە ...

نەم ئەتوانی واز لەخوشکەکەم بهێنم ، دەموویست فێری بکەم ، کەچی نەیان ئەهێشت بەیەکەوە دانیشین ، ناچار ڕێگەیەکی ترم گرتەبەر لەگەڵیا ، دەفتەریم ئەبرد و تەفسیری ئایەت و ڕێنمایم بۆ دەنووسی و بۆم دا ئەنایەوە ، ئەویش هەڵی دەگرت و دەیخوێندنەوە و سوودی لێئەبینی ! یان پەڕاوی (محمد رسول الله) (جودة السحار) بەرگەکەیم لێکردەوە و بەرگێکی ترم پێوەکرد بۆ ئەوەی بتوانێ لەناویاندا بیخوێنێتەوە و دەست نەهێننەرێی ڕۆژێك دەعوەتیان کردم بۆ ماڵی برادەرێکم لەرەمەزان دا ، خواردنێکی زۆریان کردبوو ، کێکیان کردبوو مۆمێکیان لەسەر دانابوو ، وتیان وەرە بیکوژێنەرەوە ، ئەوە ساڵێك بەسەر موسڵمان بوونتا تێپەڕی !

ئنجا قورئانێکی جوانی (مذهب)یان بەدیاری پێشکەش کردم و منیش دام بە خوشکەکەم ...

هەرچۆنێ بوو ئەویش فێری نوێژ بوو ، ئنجا بەدزییەوە لەحەمامی ماڵەوە نوێژی دەکرد [1]، ئەمەش نەچووە سەر ، هەر زوو پێیان زانی ، بەهۆی ئەوەی کە دەیانبینی زوو زوو دەچێتە حەمامەکەوە و کەدێتە دەریشەوە سەری نەشتووە و سەری تەڕنیە !؟ ئنجا

---

[1] دواییکە د. محمود خیاط مامۆستای بەلاغە لەزانکۆی بەغداد ئەمەمان بۆگێڕایەوە دەیووت : بەخوا نوێژەکەی تۆ لەو حەمامەدا زۆر گرنگتر و خێری زیاتر بووە لەنوێژەکەی ئێمە و مانان لەمزگەوت دا .

ناچار کەهەموو دەنووستن ، ئەویش لەژێر لیفەوە نوێژەکانی دەکرد  بۆئەوەی شەڕی پێ نەفرۆشن !

ئەوەش دایکم کەشفی کردوو بەتوندی موحاسەبەی کرد ... ویستم قورئانێکی بدەمێ ، ناچار بەدزی‌یەوە خستمە پاڵتۆکەیەوە و ئیتر هەموو کات لەگیرفانی‌دابوو !

خاڵۆزایەکم هەبوو زۆر زۆرزان بوو ، دەرچووی کۆلیژی زانستی بوو ، زۆر حەزی دەکرد خوشکەکەم بینێ ، باوکم حەزی لەچارەی نەئەکرد ، بەڵام دایکم پێی خۆش بوو ، چونکە برازای بوو ... بانگیان کردم و وتیان : هەر وازت لەخوشکەکەت نەهێنا، وا لەداخی تۆ ئەیدەین بە (جەلال)ی خاڵۆزات ... چوون (جەلالیان) بانگکرد کەلەناو بەغدادا لەشوقەیەکدا ئەژیا ، هیچ چارم نەما ، بۆیە چوومە ژوورەکەی خۆم و لەسوجدەدا کەوتمە نزاو پاڕانەوە کە (جەلال) نەیەت و خوشکەکەمی نەوێت ... کەوتە دڵمەوە کە (جەلال) نایەت و خوشکەکەمی ناوێ ، ئنجا هاتمەوە خوارەوە و بەباوکم وت : نە(جەلال) دێت و نەخوشکمی دەوێت ... کەوتنە قسە پێوتنم ، براکەم هاتەوە ، وتیان : کوا (جەلال) ؟ وتی : نەهات و وتویەتی ژن ناهێنم ... باوك و دایکم لایان سەیربوو ، لێیان پرسیم ، وەرە بزانین کێ بەتۆی وت کەجەلال نایەت ؟ وتم : خوا پێی وتم !

پاش ئەوەش ئیتر جەلال سەردانی دەکردین و خوا کردی باوکم رقی لێی هەستا و بەمنی وت : بیکەرە دەرەوە !

خوا بۆی دام کارێکم پێکرد نەکرابێ ، ئیتر چرچاویم نەدیەوە ! دیسان هەوڵێکی تریان دا ئەویش بەوەی  کاتێ کە براکەم ژنی هێنا ، مەرجیان دانا کە برای ژنەکەی ، خوشکەکەم بهێنێ ، منیش لەبەرئەوەی ناوبراو هاوەڵم بوو ، قسەم بۆ کردوو وتم : خوشکەکەی من بەدزیەوە موسڵمان بووە و ئەگەر تۆش موسڵمان بیت ئەوا هەمووشتێك ئاسانە ... ئەویش بەرەقی وەڵامی‌دامەوە و وتی: من بۆیە هاتومەتە پێشەوە کە خوشکەکەت لەچنگی تۆو لەئیسلامەتی رزگار بکەم ...

جا کەبراکەم ژنی هێنا ، قەشەیەکیان هێنا و ئەو رۆژە ویستیان لێی مارەبکەن و ئاهەنگ و هەڵپەرکێ بوو ... خوشکەکەم زۆر ئازابوو ، وە زۆر حاڵەکەی پێناخۆش بوو، بەردەوام ئەگریا ، منیش هیچم دەسەلات نەبوو دوعاکردن نەبێت ، بۆیە زۆر لەخواپاڕامەوە کەلەم بەلایەش رزگارمان بکات .

ڕۆژانە زاوا گیان سەری لێ ئەداین و خوشکەکەم وای لێهات لەگەڵیا دا نەئەنیشت و سەرەنجام ئەویش زویر بوو ، وازی هێنا ... ئەمەش سەرکەوتنی دووەمان بوو لەسایەی خواوە ، هەرچەندە هەوڵەکانیان دوایی نەدەهات !

ئێمە پرۆتستانت بوین، کەچی کۆمەڵێ قەشەی کاثولیك هاتن بۆ لام و پاش کۆمەڵێ دانوستان ، داوایان لێکردم کەبچم بۆ کەنیسە بۆلایان و منیش جاروبار سەرم لێئەدان و گفت و گۆمان دەکرد ، هەرچیمکرد لەگەڵیان سوودی نەبوو ، ناچار ئایەتی (مباهلە) م بۆ خوێندن ﴿فمن حاجك فيه من بعد ماجاءك مـن العلـم فقـل تعـالوا نـدع أبناءنـا وابنـاءكم ونساءنا و نساؤكم وأنفسنا وانفسكم ثم نبتهل فنجعل لعنت الله على الكاذبين﴾ال عمران ٦١

وتم : وەرن بالەعنەت لەدرۆزن و ناراست بکەین ... ئیتر نەمبینینەوە !

ساڵی ١٩٧٩ خوێندنم تەواو کرد ، وتیان بۆ دەرەوە ، لەکۆڵمان بەرەوە ... باپیرەشم هەمیشە قسەی پێ ئەوتین تاشەرێکمان بوو ئیتر وازی هێناو تامرد بێدەنگ بوو پوریشم لەگەڵ دایك و باوکم داتێك چوو ، ئەویشمان لەکۆڵ بووەوە و چوو لەگەڵ خزمێکماندا دانیشت کەتەنها بوو ، پاشان تووشی شێرپەنجە بوو ، بە ئازار و ئەشکەنجەوە مرد .

خۆم و خوشکەکەم لەبەردەم قازی دا بەشایەتی دووبرادەر موسڵمان بووین ، ئنجا هیچ چارمان نەما و هەردووکمان بەهەندێ کەل و پەلی کەمەوە ماڵمان بەدزییەوە بەجێهێشت و نامەیەکمان بۆ دانان کە تیایا نوسیبوومان : حەزمان دەکرد لەگەڵتانا بژین و هەرکەسەو ڕێی خۆی ، کەچی ئێوە نەتانویست بۆیە سەری خۆمانمان هەڵگرت پیاوێك لەمزگەوت کەهەموو جار موجامەلەی دەکردم و بەحاڵمانی دەزانی ، ویستم بچینە ماڵیان ، کەلەدەرگاماندا خۆی لەماڵ نەبوو ، منداڵەکانی زۆر بە ڕەقی قسەیان لەگەڵ کردین و دەرگایان بەڕووماندا داخست .

ناچار برادەرەکەی کەلەگەڵمان بوو بردینیەوە ماڵی خۆیان و منیش لەوێوە پەیوەندیم بە (ابوعمر)ەوە کردکە دکتۆرای هەبوو ، وەمامۆستای زانکۆی بەغداد و ، هاوەڵی (دکتۆرعبدالکریم زیدان) بوو ...

(ئەبو عمر) دڵی و ماڵی بۆ کردینەوە و نزیکەی ساڵێك لەلایانماینەوە ، لەو ماوەیەدا من چووم بۆ خزمەتی سەربازی و مانگی شەش دنیار مووچەم هەبووکەبەشی هیچی نەدەکرد ، (ئەبو عمر) مانگی (٢٥) دیناری ئەداینێ و برایەکیش کەمووچەکەی شەست

دیناربوو ، ماڵ و منالیشی هەبوو ، مانگی سی دینار هاوکاری دەکردین ، حەزمان کرد ماڵی ( ئەبو عمر) یش بەجێبهێڵین و ئەرك و زەحمەتیان لەسەر سووك بکەین ، هەرچەند وەکو بەهەشت وابوو بۆ ئێمە !

لەرێی (ام عمر)ەوە چووین لە (شارع المغرب) دا لە (منتدی المرأة المسلمة) دا جێیان کردینەوە و ژوورێکیان داینێ ، کە هەموو سێشەممەیەك خوشکان تیا کۆدەبوونەوە و تەنها پیرێژنێك و خزمەتکارێکی تیابوو ...

لەسەربازی رزگارم بوو ، خەریکی بانگەوازکردن بووم ، پاسکیلێکم کڕی بۆهات و چۆ ... لەو ماوەیەدا زۆر کەس داوای خوشکەکەمی کرد ، بەلاَم (ئەبو عمر) کەلەجێی باوکمان بوو رازی نەئەبوو ، وەهەمیشە دوعای دەکرد کەیەکێکی باش ببێ بەنسیبی و کەسێکی بۆ خوا سوڵحاوبێت ...

لەگەڕەکی (المنصور) من لای (شێخ اسماعیل ) لەمزگەوت وانەی (فیقە)م دەخوێند ، ئەویش کەبەحاڵمانی زانی داوای خوشکمی کرد و خوشکیشم ڕازی بوو. منیش وەك دکتۆرێکی بەیتەری ماوەیەك خەریکی ئیشی (دواجن) بووم و دوایی وازم لێهێنا چونکە بەیانی تا ئێوارە سەرقاڵی دەکردم ...ناچارچووم بەدەم وەزیفەوە و لە (دۆر) دامەزرام ...

پاش شووکردنی خوشکەکەم داوای چەند ئافرەتێکم کرد رێك نەکەوت ، تا رێمان کەوت لەئافرەتێك کە بەهۆی خوشکەکەمەوە رێی راستی گرتبوو ، داوامان کرد و رازی بوو. ئیتر ناوبەناو خۆم و خوشکەکەم چەند جار سەردانی دایك و باوکمان دەکرد پاشان دایك و باوکیشم هێنا بۆ (دۆر) و مەسرەفم دەکێشان و هاوەڵەکانم پێیان دەووت (ابو ابراهیم) و زۆر رێزیان دەگرت ...

لەبەرئەوەی زۆر خزمەتی هاولاَتیانم دەکرد ، ناوبانگم دەرکرد و خەڵکی خۆشیان دەویستم ، دەنگ و باس گەیشتەوە دەزگاکانی رژێم ، لەوێوە هەواڵم بۆدەهاتەوە کەنیازی شتێکیان هەیە ...

لەبەرئەوەی جارێکیتر بۆ ماوەی مانگێك لەبەغدا لە (امن) گیرابووم ، بۆیە کە بارووەزعەکەم لێتێك چوو ، ناچاربووم لەسەر رای برایان عێراق بەجێ بهێڵم ...![*] .

---

(تائێرە دکتۆر ئەحمەد لەنزیکەی سێ سەعات دا لەشریتێکی ڤیدیۆدا باسی دەکات و لەبەر زۆری باسەکە هەندێ کورتم کردۆتەوە ) ئێستاش ناوبراوئەندامیمەکتەبی سیاسی حزبیئیسلامی عێراقییە

گۆڤاری (النور) ی یەمەنی (ژمارە ۷۹ ساڵی ۱۹۹۷) لەگەڵ (عقیل) ی تازە موسڵماندا دیمانەیەکی سازداوە کەتیاییدا ناوبراو لەبارەی موسڵمان بوونیەوە دەدوێ : من لەتاریکی و گومڕاییدا دەژیام ، (مەی) م ئەخواردەوە و بیروباوەڕێکی هەڵەم هەبوو لەبارەی ئاینەکانەوە ، خوا بەمیهرەبانی خۆی هیدایەتی دام بەرەو ڕووناکی و نووری بەرنامەکەی خۆی .

من قەشە بووم لەکەنیسەی (مریم العذراء)لەبەغداد و ، هەر لەمنداڵیمەوە ئالوودەی ئەم کەنیسەیەبووم و تیایا پەروەردەبووم ، تاگەیشتمە پلەی مامۆستایی ، پاشان گوێزرامەوە بۆ کەنیسەی کاثولیك لەشاری نەینەوا...

هەمیشە پرسیارم دەکرد لەبارەی ئینجیلەکانەوە کە بۆچی زیاد لە دانەیەکن و زۆر هەوڵم ئەدا ئینجیلی (برنابا) م دەست بکەوێ چونکە هەندێ شتم بیستبوو لەبارەیەوە . ئەو کەنیسەیەیەی منی لێبووم کەوتبووە نێوان دووشاخەوە ، لەناوچەی (حمدانیە) لە دەرەوەی شاری موسڵ ، لەناو کەنیسەکەوە دەرگایەك هەبوو دەچووە سەر ئەشکەوتێك کەهەمیشە داخرابوو ، کلیلەکەی لای (راهبە) یەك بوو بەناوی ( ئیزابیلا) .

ئەم (راهبە) یە کەلەتەمەندابوو منی زۆر خۆش دەویست و زۆر ڕێزی لێدەگرتم و وەك کوڕی خۆی سەیری دەکردم ، ڕۆژێك پێم لەجەرگی خۆم ناو داوای کلیلەکەم لێکرد ، ئەویش زۆر تکای لێکردم کە ئەو دەرگایە نەکەمەوە و نەچمە ژوورەوە ، چونکە لەچەندەها ساڵ لەوەو بەرەوە هەرکەس چوبێتە ژوورەوە گوایە مردووە و نەهاتۆتە دەرێ . منیش زۆر تکام لێکرد و سەرەنجام دڵی نەرم بوو کلیلەکەی پێدام لەسەر مەسئولیەتی خۆم کەتووشی هەرچی ببم لۆمەی خۆم بکەم ...

خواردن و لایت و گوریس و پێویستی تەواوم ئامادەکرد و لەفرسەتێکدا بەبێ ئەوەی کەس پێم بزانێ دەرگاکەم کردەوە و چوومە ژوورەوە و لەودیوەوە دەرگاکەم داخستەوە ، پاشان بەرەوناو ئەشکەوتەکە کەوتمە ڕێ ، هەرچەند برۆیشتمایە نیشانەیەکم لەسەر دیوارەکانی دیاری دەکرد بۆئەوەی لەگەڕانەوەدا ڕێم لێ تێك نەچێت ، جا هەرکاتێك هیلاك بوومایە ، پشووم دەدا و، خەوم بهاتایە دەخەوتم ... تا گەیشتمە دەرگایەکی زۆر کۆن ، کە تۆزی سەدەها ساڵی لێنیشتبوو پاڵم پێوەنا ، تۆقیم کەچاوم بەو هەموو کاسە سەر و

ئێسك و پروسكانەی ئەو كەسانە كەوت كەلەوێدا گیانیان لەدەست دابوو بەهۆی ڕێ لێتێك چونیانەوە .

هەروەها پەڕاوو دەستخەت و پێستەی زۆرم بینی كە تۆز و خۆڵی زۆر بەسەریانەوە بوو ... پاكم كردنەوە و كەوتمە خوێندنەوەیان .پەڕاوەكان بە(سریانی) نوسرابوون ، منیش زمانی عەرەبی و فارسی و توركیم دەزانی و سریانیش لە كوردەكانی عێراقەوە فێربووم.

لەو دەستخەتانەدا دە ئامۆژگاری‌یەكەی حەزرەتی عیسام خوێندەوە (سەلامی خوای لێبێ) كە حەزرەتی (محمد)یش ﷺ فەرمانی پێداون ، كە دەڵێت : كەس مەكوژن و عەرەق مەخۆن و زینا مەكەن و گۆشتی بەراز مەخۆن ...هتد .. هەروەها مژدەی هاتنی (محمد) م ﷺ خوێندەوە ، كە دەڵێت : پێغەمبەرێكی بێ باوكی نەخوێندەوار دێت و لەسەر شانی نیشانە و مۆرێك هەیە كە بەهێندەی هێلكە كۆترێك دەبێت و ناوی ( ئەحمەد)ە ...

دوایی بۆم دەركەوت كە ئەو نووسینانە بەشێكن لەئینجیلی (برنابا) ، زۆرم خوێندەوە و لەوشوێنە كپ و سامناكەدا زۆر گریام ...

ئنجا هەندێكم لەو دەستخەتانە هەڵگرت و بەهۆی نیشانەكانەوە گەڕامەوە ، كە هاتمە دەرەوە ، زۆرێك لە(راهب) و (راهبە)كان لەكەنیسەكەدا كۆبووبوونەوە كەمنیان بینی ، یەكێكیان هاواری‌كرد ، چۆن چوویتە ئەو ئەشكەوتەوە ؟ چۆن هاتیتە دەرەوە ؟ (ئیزابیلا)ش وتی : ئەی (ملكوت) ی خوا چۆن لەژیانا ماویت ؟ خواوەند ویستی تۆ سەر لەنوێ زیندووبیتەوە ، ئایا دەزانی كەوا سێ ڕۆژە لەو ئەشكەوتەدایت و ئەمڕۆ چوارەم ڕۆژتە .... بەڕاستی منیش ئاگام لەكات نەبوو بۆیە لام سەیر بوو ! هەمووگریان بۆ رزگاربوونم و منیش لەگەڵیاندا گریام ...

جاكاتێ ئەو دەستخەت و پێستانەیان بینی لێم تووڕەبوون و وتیان بۆچی دەرت هێناون ؟ وتم : بۆ ڕاستیم لێ دەشارنەوە ؟ وتیان : ڕاستی چی ؟ وتم : ڕاستی ژیان ، ئێمە بۆ دروست كراوین ؟ ئایا دروست كراوین بۆ ئەوەی ژنێك یان پیاوێك بپەرستین ؟ یان كەسێك بپەرستین كەلەژن و پیاو مەزن تر و لەمانگ و خۆر گەورەترە!

وتیان : تۆ قسەیەك دەكەیت وەك یەكتاپەرستێك ، وتم : بەڵێ من یەكتاپەرستم و بڕوام هەیە بەوەی كە حەزرەتی عیسا و مەریەمی بەتول باوەڕیان پێ ی‌بووە ، وە

هەروەها باوەڕم هەیە بەوەی کە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل باوەڕیان پـیّ بووە ، هەر کە ئەوەم وت پەلاماریان دام و پێستە و دەستخەتەکانیان لەچنگ دەرهێنام ...

پاشان (ئیزابیلا) خوێندیەوە و گریا و ئەوانی تریش خوێندیانەوە و گریان بەڵام لەبەر کەللـەڕەقیان وتیـان نایـەڵین کـەس ئەمانـە بخوێنێتـەوە و هەرکەسـیش خوێندویەتیـەوە باپەردەپۆشی بکات و هەڕەشەشیان لـەمن کرد کە بەهیچ جۆرێك باسی ئەم مەسەلەیە نەکەم! بۆماوەیەك لەکەنیسە مامەوە و دوایـی گەڕامەوە شاری بەغداد و زۆر تێکـەڵاوی موسڵمانانم دەکرد و پرسیارم لێدەکردن .

بەداخەوە نازانم بۆچی ئەم ئوممەتـە پشـتیان کردۆتـە ئاینەکـەیان ، ئەگـەر قیمـەتی ئیسلامیان بزانیایە وازیان لێنەدەهێنا ، جارێکیان گوێم لەگاورێك بوو دەیووت :

ئەگەر (صلاح الدين) گاوربوایە هەموو خەڵکی دەبوون بەگاور !

ئەمە ڕاستیەکە دەیڵێم : موسڵمانان چیتانە ؟ بۆ واز لەئاینەکەتان دەهێنن ؟ ئەوا ئێمـە دێینە ناو ئیسلامەوە و ئێوەش لێی دوور دەکەونەوە ! کەواتـە نـەدەزانن ئیسلام چیـیە و نەدەزانن هەقیقەتی ئەم ئاینە چۆنە .

بیرمە جارێك مەلەم دەکرد لەڕووبارێکدا ، کاتێك بەخۆم زانـی واخەریکە نقووم دەبم و دەخنکێم ، کەسیش نەبوو بیّ بەهانامەوە ، بەچاوی خۆم مردنم بینی ، لەدڵی خۆمدا وتم : ئەگەر ئەمجارە خوا ڕزگارم بکات موسڵمان دەبم !

ئیتر نازانم چیم بەسەرهات ، کـاتێك هاتمـەوە هـۆش خـۆم خـەڵك بـەژوور سـەرمەوە وەستابوون و دەیانووت : سوپاس بۆ خوا ، ئەوەتە زیندووە ، خوای گـەورە سـەر لـەنویّ ژیانی پیّ بەخشیەوە ، ئەمە زۆر کاری تێکردم و زانیم کەخوا وەڵامی داومەتەوە !

من لەگـەڵ هاوەڵـە موسـڵمانەکانمدا ئـەچووم بـۆ نوێـژی هـەینی ، ئـەوان دەچوونـە نـاو مزگەوتەوە و منیش لەدەرەوەی مزگەوت گوێم دەگرت ... قەناعەتی تەواوم پەیداکرد بوو بەئیسلام بـەڵام نـەم ئەوێرا ئاشـکرای بکـەم ، لەبەرئـەوەی برادەرێکـی زۆر خۆشەویسـتم هـەبوو بـەناوی (جونسـون یونـان) دڵـی چووبـوو بـەئافرەتێکی موسـڵماندا کـەناوی (فاطمـە)بوو ، چووە داوای نەیاندایە لەبەرئەوەی گاوربوو ، پاشان جونسون موسڵمان بوو ، لـەڕۆژێکدا کەژنەکـەی گواسـتەوە لەئاهەنگەکـەیدا لەگـەڕەکی (آثـوری) یـەکان بەدەسـتی گاورەکـان کـوژراو شـوفێری ئوتومبیلەکـەش کـوژرا لەگـەڵیا و (فاطمـە)ش بریندابوو بەجلی بوکێنیەوە!

دوایی حکومەت تاوانبارانی دەستگیرکرد و لەرێی دادگاوە بەسزای خۆیان گەیشتن ، ناشتنی ( جونسون )یش بووبەکێشە لەنێوان (آثوری) و موسڵمانەکاندا ، تا وەزارەتی ئەوقاف کێشەکەی یەکلاییکردەوە کە(جونسون) موسڵمانە و دەبێ لەقەبرستانی موسڵمانان بنێژرێت ...

من دەترسام بەهەمان دەردی (جونسون) م ببەن ، بۆیە بڕیارم دا کۆچ بکەم بۆ یەمەن ، بۆ ئەوەی بەئازادی وبەبێ ترس ئیسلامەتی خۆم بکەم .

خێزانەکەمان پێك هاتبوو لەشەش خوشك و من تاقە برایان بووم ، لەدوا سەردانمدا پاش گفت وگۆیەکی زۆر یەکێکیان موسڵمان بوو ، یەکێکیتریشیان دەزانم دەترسێ ئەگینا زۆر دڵی وابەئیسلامەوە ، لەخوا دەپاڕێمەوە کە هیدایەتی هەموویان بدات .

خاڵێکم هەیە لەتورکیا داوای لێکردم سەردانی بکەم ، کە چووم بۆ لای پاش ماوەیەك هەستی کرد موسڵمان بووم ، بەشەق و جنێو تێم بەربوو ، ناچار منیش رامکرد و بەجێم هێشت ، بەلام لەپەلە پەلێدا قاچم وەرگەڕاو زۆر ئازاری دام ... بەوحاڵەوە لەبەردەم قوتابخانەیەکی لەبەرکردنی قورئاندا خۆم بینیەوە کە( شێخ محمود ئەفەندی) سەرپەرشتی دەکرد ، زۆر رێزی لێگرتم و چەند رۆژێك لەلای مامەوە ، پاشان گەڕامەوە یەمەن لەترسیخاڵم و لەترسی فیتنە و فەسادی تورکیا ..

جارێك لەفڕۆکەخانەی روسیا کاتی نوێژی ئێوارە هات و دەستنوێژم شت و چاکەتەکەم داخست نوێژی لەسەر بکەم ، چەند ئەفریقیەك هاتن لەدوامەوە نوێژیان کردو وشەی (امین) لەو ناوەدا دەنگی دایەوە ، دوای تەواوبوونی نوێژەکە چەند سەربازێکی رووسی بردیانم بە تۆمەتی ئەوەی من شیشانیم ! پاشان بۆم سەلماندن کە من عێراقیم و هیچ پەیوەندییەکم بەشیشانەوە نیە ، ئنجا بەریان دام و رزگارمبوو!

بەڵی ... گەڕامەوە یەمەن و هەموو دنیام کرد بەقوربانی ئاینەکەم ، راستە من هەژارم بەلام هەروەك حەزرەتی عیسا سەلامی خوای لێ بێ دەفەرموێ ( چ سوودێکی وەرگرتووە کەسێك کە دنیا بباتەوە و خۆی بدۆڕێنێ ) ؟!

دنیا بۆچی باشە ، ئەگەر خۆت بدۆڕێنی و دۆزەخ جێت بێت ؟!

ئەوەیە هەقیقەت ، ئێمە بۆ خواردن و خەو دروست نەکراوین ، ئێمە بۆ عیبادەت دروست کراوین ، لەبەرئەوەبوو منیش وازم لەماددیات هێناو رومکردە ئیسلام و فەزڵم دا بەسەر هەموو شتێك دا ، جا زۆر کەسی دەوڵەمەندیش هەن کە هەقیقەتی ئەم دینە

تێنە گەیشتوون ونازانن ، ئەگەر بیانزانیایە دەگەڕانەوە بۆ لای ئەوەی کە پێشەوامان (محمد) ﷺ بۆی هێناون لەلایەن خواوە .

## ( ١٠ ) البرتو اوبتشینی

البرتو اوبتشینی پیاوێکی ئیتاڵییە و پاش ئەوەی موسڵمان بوو لەچاوپێکەوتنێك دا لەگەڵ گۆڤاری الاسرة ژمارە(٨٥) ساڵی ١٤٢١ كۆچیدا دەڵێت :

سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕێنمایی‌کردم بۆ ئایینی هەقی خۆی ، پاش ئەوەی کە من مولحید و سەرخۆش بووم و هەواو ئارەزووی خۆمم دەپەرست وماددە زاڵ بووبوو بەسەر هەموو ژیانم دا و ، ڕقم لەهەموو ئاینەکان بوو لەپێش هەمووشیانەوە ئیسلام ، کەلە کەلتوور و مێژووی ئێمەدا بەخراپترین ئایین ناوبراوە .

موسڵمانان بەلای ئێمەوە بت ئەپەرستن و ڕازی نین لەواقیع دابژین و پەنا دەبەنە بەر غەیبیات بۆ چارە سەری کێشەکانیان ، ئەوان زۆردار و خوێن ڕێژن و ، شەڕەنگێزن و نایانەوێ بەئاشتی لەگەڵ کەسدا بژین ... پێغەمبەری ئیسلامیش لای ئێمە واباسکراوە کە ئارەزوو پەرستەو هەموو ناتەواویەکی لێوەشاوەتەوە ، وە ئاینێکی هێنا بۆ ئەوەی لەمەسیحیەت جیابێتەوە و خۆی ببێ بەڕابەری ، قورئانیش هەڵبەستراوی خۆیەتی و هاوەڵانیشی دوو ڕوون !

من ئالەو ئاووهەوایەدا گەورەبووم کەهەمووی دژایەتی ئیسلامە ، بەڵام خوا هیدایەتی‌دام بەهۆی گەنجێکی موسڵمان کە بۆ بژێوی پەیداکردن کۆچی کردبوو بۆ ئیتالیا ... بەبێ ویستی خۆم ناسیم ... ئەویش بەوەی شەوێکیان لەیەکێ لەبارەکاندا هەتا بەرەبەیان مامەوە وتەواو سەرخۆش بووم ، کاتێك گەڕامەوە ، فرم بەدنیاوە نەمابوو ، بێئاگاو بێهۆش بەسەر شەقام دا قاچم تێکەڵ وپێکەڵ ئەبوو ، دەڕۆیشتم ... ئوتومبیلێکی تیژڕەو لێی دام ، کەوتم و لەخوێنی خۆما گەوزام ... ئەوەی سەیر بوو لاوەکە خۆی فڕاندمی بۆ خەستەخانە و بەدیارمەوە بوو تاچاك بوومەوە ، بڕوام نەدەکرد ئەوەی وای لەگەڵ دەکردم موسڵمانە ! کەزانیم موسڵمانە داوام لێکرد باسی بیروباوەڕەکەیم بۆ بکات ، کە فەرمان دەدا بەچی و جڵەوگیری دەکات لەچی ... هەروەها پرسیارم لێکرد لەبارەی بۆ چوونی ئیسلامەوە بەرامبەر ئاینەکانی‌تر ...

بەڵێ ... من ئیسلامم ناسی بەهۆی ڕەوشت بەرزی ئەو گەنجەوە ، دوایی گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کەمن لە گومڕایی‌و سەر گەردانیدا بووم و ئیسلام ئاینی هەقە ، وە هەروەك

خوای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿ومن يبتغي غير الاسلام دينا فلن يقبل منه﴾ ... پاشان موسڵمان بووم و ناوی خۆم نا ( عبدالواحد). دوای ئەوەی خوا هیدایەتی دام و موسڵمان بووم ، هەستم بەگوناهباری دەکرد ، کەلەوەوبەر دوژمنایەتی ئیسلامم کردبوو ، وە هەستم کرد کە هیدایەتم تەواو نابێ ئەگەر هەڵنەستم بەسڕینەوەی گوناهەکانم ، بەهۆی بانگەوازکردن و خزمەتکردنی ئیسلام ... بۆیە لەگەڵ چەند موسڵمانێکدا بنکەیەکی ئیسلامیمان دامەزراند ...

لەنیعمەتەکانی خوا بەسەرمەوە ئەوەبوو کە کوڕەکەم و بووکەکەم خوا لەسەردەستی مندا هیدایەتی دان و ئەوانیش لەگەڵما خۆیان نەزرکرد بۆ خزمەتی ئیسلام، ئنجا بڕیارماندا بلاۆکراوەو گۆڤار دەرکەین بۆ بەرپەرچدانەوەی پڕوپاگەندەی جوولەکە لەرۆژئاوا دژ بە ئاینی ئیسلام و دەرخستنی رووی جوان و پیرۆزی ئیسلام بۆ خەڵکی چەواشەکراوو بێ ئاگا ...

لەسایەی خواوە هیچ هەفتەیەك رانابوورێ چەند کەسێك تیایا موسڵمان نەبێت ، وە ئێمەش باوەشیان بۆ دەکەینەوە و هەموو یارمەتیەکی ماددی و مەعنەویان ئەدەین و زۆر لەوانەش لەگەڵمانا دەکەونە بانگەوازکردن .

ئیسلام ئایینی فیترەتە ، گرنگی دەدات بەدنیا و ئاخیرەت و هاوسەنگی بۆ مرۆڤ دروست دەکات ، بەپێچەوانەی عیلمانیەت و ئیلحادەوە کە ئەمرۆ باڵیان کێشاوە بەسەر رۆژئاوا داو نەفسیەتی شێواندون ، بەجۆرێك زۆرترین رێژەی خۆکوشتن لەجیهاندا لەولاتی (سوید) دایە کەلەوپەڕی رەفاهیەت و خۆشگوزەرانیدان ...

خۆزگە موسڵمانان بەچاکی ئیسلامیان ، بەکردار وگوفتار پێشکەش بکردایە ، خۆ ئەگەر وایان کرد ئەوا رێژەی موسڵمانەکان زۆر زیاد دەکات لەجیهاندا و ، وە من پێشبینی دەکەم هەروەك بیریاری ئیرلەندی بەناوبانگ (جورج برناردشو) کەلەپێش پەنجا ساڵدا وتویەتی ( ئایینی محمد قبول دەکرێ لەئەوروپای سبەینیدا ، هەروەك چۆن لەئەوروپای ئەمڕۆدا وردە وردە خەریکە قبول دەکرێ ...وادەزانم تاقە ئاینە کەتوانای خۆ گونجاندنی هەیە لەگەڵ گۆڕانکاریەکانی ژیاندا و ئەمەش وای لێدەکات کە هەمیشە خەڵك پێی سەرسام بن لەهەموو سەردەمێکدا ) .

بیرۆکەی (صراع الحضارات) یش بیرۆکەیەکی پیس و ژەهراویە و مەبەستیانە کە هەمیشە دوژمنێکیان ببێ بۆ ئەوەی خۆیان یەکگرتوو بن بەرامبەری ، بەتایبەت پاش

رووخانی شـیوعیەت ...ئیسـلامیان دانـا بـەدوژمنی سـەرەکی و خۆیـان سـاز دەدەن بـۆ ڕووبەڕووو بوونەوەی ڕابوونی ئیسلامی لەرۆژئاوا و ڕۆژهەلآت دا ... بەتایبەت لەمڕۆدا کە ئیسلام هەر ڕۆژەی لەخاکێکی نوێدا ڕەگ دائەکوتێ ، هەروەك (ڕوجیە دی باسکیە) دەڵێ ( شتێکی بەڵگە نەویستە ئێستا کە ئایینە گەورەکان دێنە دواوە و وان لە(دیفاع) دا ، وە تەنـها ئیسـلامە کـە لەبـەرەو پێشـچوون و هەڵمـەت بردنداپـە ، ئەگـەڵ ئـەوەدا کـە موسڵمانانیش لاوازن ) .

## ( ١١ ) بامیلاشارب

بامیلا ئافرەتێکی ئەمریکی‌یە و لەدایکبووی ساڵی ( ١٩٣٧) ەو لەخێزانێکی گـاوردا چاوی بەدنیا هەڵهێناوە ، لەبارەی موسڵمان بوونیەوە دەڵێت :

منیش وەك زۆربەی ئافرەتانی ڕۆژئاوایی بەدوای هاوەڵدا دەگەڕام و هـەواو ئارەزووی خۆمم دەپەرست .

لەسـەرەتای خوێندنـی زانکۆمـەوە گرنگیـم دەدا بـەمناڵ و هەسـتم کـرد کـە منـاڵ لـەرۆژئاوادا لـە بـارێکی خراپـدا ئـەژی ، هـەمووان لـە کۆمـەڵگای ئێمـەدا بـەدوای ماددەوتێرکردنی ئارەزووەکاندا ڕادەکەن و مناڵان ژێر پێ دەکەون ، یان هەر بیر لەلەدایك بوونیان ناکەنەوە...

زۆرکەس لەژن و پیاوی ڕۆژئاوایی خۆیان دوور دەگرن لەمناڵ بوون ، بۆ ئـەوەی نـەبن بەژێر بەرپرسیارێتی‌یەوە ، وە ئەگەر بشیانبێت ئەوە لەدەرەوەی خێزان دەبێت و بەوەش کۆتایی بەخێزان دێت .

(بامیلا) لەرێکخراوی یونسیف دا لێکۆڵینەوەی زۆری کرد لەسەر مناڵ لەکۆمـەڵگای ڕۆژئاوایی و ئیسلامیدا ، سەرەنجام گەیشتە ئەوەی کەخێزان لەئیسلامدا گرنگی زۆری پێدراوە و ماف و ئەرکی هەریەکەیانی بەچاکی دیاری کردووە ، کەبەمەش خێزان تونـد و تـۆڵ و پتـەو دەبێت و ئەتوانێت خـۆی بگرێـت لەبـەر ئـەو ئافاتانـەی کەتووشـی ڕۆژئـاوا هاتووە ، کەئەویش خۆخۆیی ( انانیە) و زاڵبوونی مەبدەئی ( الغایة تبرر الوسیلة) یـە ، لەرۆژئاوا زۆریان نزیکترین کەسیان دەکەن بە قوربانی هاتنە دی هەواو ئارەزوویان .

(بـامیلا) لـەبارەی ئیسـلامەوە زۆری خوێنـدەوە و زۆر سەرسـام بـوو بـەگرنگی دانی‌ئیسلام بە خێزان ، وە زیاتر سەرسام بـوو پـێی کـاتێك لەئـەزموونێکی تـاڵدا ژیـا بەهۆی ئەوەی کەمێردە ئەمریکی‌یەکەی خۆی و مناڵەکانی بەجێهێشت و لێی نەپرسینەوە

... وەکـاتێك شكاتیشـی لێکـرد هیچـی دەست نەکـەوت . لەگەرمـەی ناڕەحەتیـیەکـەیدا ئەندازیارێکی میسری ناسی بەناوی (احمد الشایب) کە زۆر دڵی دایەوە و هاوکاری کرد و بەهۆی ناوبراویشە وە زیاتر شارەزای ئیسلام بوو ... پاش ئەوەی (بامیلا) جیابووەوە لەمێردە ئەمریکی‌یەکەی ، شووی کرد بە ( ئەحمەد ) و بڕیاریاندا بگەڕێنەوە بۆ (میسر) و ، لەوێش بووە بەڕێوەبەری لقی یونسیف لە خۆرهەلاّتی ناوەڕاست دا .

بەیانیەکیان ( بامیلا) بە مێردەکەوی وت : ئـەمڕۆ دەمـەوێت موسڵمان بوونـی خـۆم رابگەیەنم ، ئنجا هەردووکیان چوونە لای لیژنەی فەتوای ئەزهەر و لەبەردەمیاندا وتـی : ئەمڕۆ خوای گەورە دڵی هیدایەت دام بۆ ئیسلام ، پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر و لەسەرخۆ ، وە خـۆم نـەزرکردووە بـۆ خزمـەتی منـالاّن بەگشـتی و منـاڵی موسـڵمانان بەتایبـەتی ، چونکە منالاّن خۆشەویستی خوان و هەرکەسیش خۆشەویستانی خوای خۆش بوێت و دڵنـەواییان بکـات ، خـواش ئـەوی خـۆش دەوێـت ، جـا منیـش هـەموو هیـواو ئـاواتم بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا و خۆشەویستی‌یەتی .

ئنجا ناوی خۆی گۆڕی لە( بامیلا سو اورمان شارب) ەوە بۆ ( اسماء بامیلا شارب) ، پـاش ئـەوەی کـە رایگـەیاند سـەربازێکی خوادەبێـت بـۆ خزمـەتی منـالاّنی ڕۆژهـەلاّتی ناوەڕاست و ، بەرگری‌کردن لەشێواندنی شێوەی ئافرەتی موسڵمان لەرۆژئاوادا ، چونکە بەراسـتی لـەرۆژئاوادا وێنـەی ئـافرەتی موسـڵمان ناشـرین کـراوە و وادەدەنـە قەڵـەم کەلەئیسلام دا دەچەوسێنرێتەوە و هەندێ هەڵسوکەوت و ڕەفتاری ناجۆری هەندێ بەناو موسڵمانیش دەکەن بەنموونە و بەبیانوو لەم کارەدا ...

( بامیلا) دەڵێت : بەهۆی ئیسـلامەوە کەرامـەت و مافەکانم دەستکەوتەوە ، لەکاتێکدا کە ئافرەتی ڕۆژئاوا بەسووك سەیر دەکرێ و تەنها بەهۆکاری رابواردنـی دەزانن و لەسـەر سفرە و خوانـی خراپەکاران پێشکەش دەکرێت . ئافرەتیش لەوێ بـۆ خـۆی خەڵـەتاوە بەشیعاری ( ئازادی ژنان) کەلەڕاستی‌دا بازرگانیان پێوەدەکەن و بۆ رابواردنـی نابەجێ و نامە شروع و دوور لەهەموو ڕەوشتێك بەکاریان دەهێنن .

(بامیلا) داخ لەوە دەخوات کە زۆربەی ئافرەتانی ڕۆژئـاوا هەقیقـەتی ئیسلام نـازانن ، کە چۆنـە بەرامبـەر چارەسـەری کێشـەی ئافرەتـان، خۆ ئەگەر بیانزانیایـە زۆر بـەخێرایی دەستیان پێوەدەگرت و دیفاعیان دەکرد لێ‌ی و سەرو ماڵیان دەکرد بەقوربانی ...گۆڤاری (الاسرە) ژمارە ( ٦٦) ساڵی ١٤١٩ کۆچی .

## ( ١٢ ) فابیان

(فابیان) نمایشکەرێکی فەرەنسی جلو بەرگە و تەمەنی بیست و هەشت ساڵە ، کات و ساتی هیدایەتی وا هاتە پێشەوە کەلە لوتکەی ناوبانگ و دەرکەوتندا بوو ، بەبێدەنگ کشایەوە و رۆیشت بۆ ئەفغانستان ، تاوەکو خزمەتی موسڵمانانی ئەفغانی بکات وەك برینپێچێك ...

فابیان دەڵێ : ( ئەگەر فەزڵ و رەحمەتی خوا نەبوایە ، ئەوا ژیانم لەدەست ئەچوو لەجیهانێك دا کە مرۆڤ سەرەو خوار دەبێتەوە بەرەو ئاژەڵێتی و هەموو ئامانج و ئاواتی دەبێتە تێرکردنی هەواو ئارەزووی) ئنجا باسی سەر گوزەشتەی خۆی دەکات و دەڵێت : ( من لەمناڵیمەوە حەزم دەکرد ببمە برینپێچێکی خۆبەخش و کاربکەم لەکەم کردنەوەی ئازاری مناڵی نەخۆشدا ، رۆژ لەدوای رۆژ گەورەبووم ...... جوانی و قەد و باڵام سەرنجی دەوروبەرمی راکێشا و ، هەمووان هانیان دام بەتایبەت کەس و کارم کەواز لەئاوات و حەزی مناڵیم بهێنم و سوود لەجوانیەکەم وەربگرم و پارەی پیێپەیدا بکەم ، کە ئەوەش ئاواتی هەموو مێرد منداڵێکە و رێگای موستەحیلی بۆ دەگرێتە بەر ...

رێگای بەردەمم ئاسان بوو بۆم ، زۆر زوو تامی ناوبانگم چەشت و دیاری بەنرخم بۆ دەهات ، کە هەرگیز لەخەویشا نەم ئەدی ... بەڵام زۆر کەوت لەسەرم ! دەبوو دەرچم لە ئینسانیەتی خۆم و ، مەرجی سەرکەوتنم ، نەمانی هەست و شعور و حەیا و حورمەتم بوو ...

دەبوو گوێ بەهیچ نەدەم تەنها جووڵەی لەشم نەبێ لەسەر ئیقاعاتی موسیقا ، هەروەها هەموو خواردنێکی خۆش و بەتامم لێ قەدەغە بوو ، وە دەبوو لەسەر ڤیتامینات و ( مقویات) بژیم و ، واز لە مشاعرم بهێنم و نەکەسم خۆش بوێ و نەکەسم رق لێ بێت و هیچیش رەفز نەکەم .

( بیوت الازیاء ) منیان کردە بووکەشووشە و بتێك کە ئیشی یاری کردن بێت بەدڵ و ژیری ، فێربووم چۆن ساردو سڕبم و توند و لووت بەرزبم بەرووکەش و لەناویشەوە بۆش و هەروەك قاوغێك جلەکان بپۆشم ... من دار و بەردبووم ئەهاتم و ئەچووم و زەردەخەنەم دەبەشیەوە ، بەڵام هەستم نەمابوو ، ئەمەش وەنەبێ هەر بۆ من وابووبێ ، هەرچی زیاتر لەکەسێتی و بەشەرییەتی خۆی داماڵیایە ئەوە پێشتر دەکەوت لەوجیهانە سارد و سڕەدا

، جا واوەیلا بۆ ئەوەی کە لەڕێنمایی‌یەکانی بۆی دا ئـەنرا دەربچووایـە ، سزایان دەدا بەهەموو جۆرێك ، نەك هەر سزای نەفسی بەڵكو سزای جەستەشی تووش دەبوو !

من ژیام و گـەڕام بەجیهاندا بۆ عەرز کردنـی جل و بـەرگ بـەبێ شـەرم و حـەیا ... وە ئەوانـەی لـەوبوارەدا کاردەکـەن راپێـچ دەکرێـن بـەرەو جیـهانی داوێـن پیسـی بەهـەموو شێوەکانیەوە ، واوەیلا بۆ ئەوەی ملیان بۆ نادات ...

خاڵی وەچەرخانیشم لەگەشتێکماندا بۆ بەیروت دەستی پیٚکرد ، کاتێك دەمبینی کە لەژێر تۆپباران دا ئوتێلیان دروست دەکـرد ، کوژرانـی منـاڵانیش زۆرکاریـان تێکـردم ، پەردە لەسەرچاوودڵم لاچوو ، تێگەیشتم کە ئەوەی من تیا دەژیم بیٚمانەیە ، بەپەلە چووم بەدەم ئەو مناڵانەوە کە گیانیان تیامابوو تا رزگار یان بکەم ... هاوەڵەکانیشم لەنەفامی و ماددیاتی خۆیاندا نقوم بووبوون و ئەو دیمەنە دڵتەزێنە کاری تێنەدەکردن .

ئیـتر نەگەڕامـەوە بۆ ئوتێـل و پیشاندانی جل و بەرگی مـۆدە ، بـەڵكو ریٚی ئیسـلامم گرتەبـەر و (بـەیروت) م بەجێهێشـت بـەرەو پاکسـتان ، لەسـنووری ئەفغانسـتان ژیـانی راستەقینە ژیام ، فێر بـووم چۆن ئادەمی‌یـەتی خـۆم بسـەلمێنم ... هەشـت مـانگ لـەویٚ مامەوە یارمەتی خێزانە هەژارەکانم دا ... ئـەوانیش پـێزان بوون و زۆر رێزیـان لیٚدەگـرتم .لەویٚ زیاتر قەناعەتم بۆ دروسـت بوو کە ئیسـلام ئاینە و دەسـتووری ژیانیشـە ، پاشـان خۆم فێری زمانی قورئان کرد و زۆر بەرەو پێش چووم .

( بیـوت الازیـاء العالمیـة) کە بەمـەیان زانـی فشاری زۆریان بـۆ هـانیم ، وتیـان سـیٚ ئەوەندەی جاران مووچەت دەدەینـیٚ ئەگـەر بگەڕێیتـەوە سەرنمایشـكردنی جل و بـەرگ ، منیـش پشـت بـەخوا سـوربووم لەسـەر ئاینەکـەم و گوێـم پیٚنـەدان ، ئیـتر کەوتنـە بڵاوکردنـەوەی بـەرگی ئـەو گۆڤارانـەی کەوێنـەی منـی تیـابوو ، بۆئـەوەی بـەهۆی رابردوومـەوە خەڵکەکەم لیٚبکەن بەدوژمن ، لەسایەی خواوە ئەوەشیان بۆ نەچووە سـەر .هەرگیز من لەوبڕوایەدا نەبووم کە ئەو دەست و پەنجەیەم کە هەمیشە خەمی نـەرم و نۆڵیەکـەیم بـوو بەرگـەی سارد و سـەرما و خزمـەتکردنی هـەژار و دامـاوو ئاوارەکـانی ئەفغانسـتان بگرێـت ... لەسایەی خواوە ڕاهاتم و دەسـت و پەنجـەم لـەجاران چاکـترن و پاداشتی گەورەش لای خوایە ( ان شاء الله) ... رۆژنامەی المسلمون ژمارە( ٢٣٨ ) .

## (١٣) الكساندر فرتز

الكساندر فرتز منداڵێکی ئەمریکی بلیمەت و زرنگ و هۆشیارە و لەساڵی ١٩٩٠ دا لەدایك و باوکێکی مەسیحی لەدایك بووە ، لەشەش ساڵیەوە دایکی پەڕاوی بۆ دابین کردووە لەبارەی ئاینەکانەوە و ئەویش زۆر بەچالاکی دەیخوێنێتەوە و پرسیاردەکات و ، بەبێ ئەوەی چاوی بەهیچ موسڵمانێك کەوتبێت لەهەشت ساڵی‌دا موسڵمان بوو ...

الکساندر ناوی خۆی گۆڕی بۆ (محمد عبدالله) لەخۆشەویستی بۆ حەزرەتی (محمد) ﷺ و بەماوەیەکی کەم فێری نوێژبوو ، وە کەم کەم خەریکی فێربوونی زمانی‌عەرەبی‌یە و چەند سورەتێکی کورتیشی لەبەرکردووە و خۆشی بانگ ئەدات بۆ خۆی لەماڵەوە .

ڕۆژنامە نووسێك کەجارێك چاوپێکەوتنی لەگەڵدا سازداوە دەڵێت : الکساندر لێی پرسیم : تۆ قورئانت لەبەرە ؟ وتم : نەخێر ! هەستمکرد پێی ناخۆشە و نائومێد بوولێم ، ئنجا وتی : بەلای خۆتەوە موسڵمانی و عەرەبیش دەزانی ، وانیە؟!

پاشان پرسیاری تری کرد و وتی ( حەجت کردووە ؟) (عومرەت کردووە ؟) چۆن جلی ئیحرام دەست دەکەوێت ؟ ئایا پارەی زۆری دەوێ ؟ ئەتوانم بیکڕم لێرە ، یان تەنها لەولاتی سعودیە هەیە ؟ منیش بەپێی توانا وەڵامم دایەوە !

ئنجا منیش بەفرسەتم زانی و لێم پرسی : لەم کەش و هەوا نا ئیسلامیەدا چ ناڕەحەتیەك هاتۆتە ڕێگات ؟ وام زانی : ئێستا باسی جل و بەرگی ، یان هاوەڵەکانی ، یان خواردن و خواردنەوەی ، یان ئەو عەمامەیەی کردوویەتیە سەری لەسەر شێوەی یەمەنیەکان ، یان بانگدانی لەناو باخچەی گشتی‌دا دەکات ، کەچی بەداخێکەوە زۆر بەلەسەر خۆیی وتی : گرانی و زەحمەتی ڕێم تەنها ئەوەیە هەندێ نوێژم دەچێت چونکە کاتی نوێژەکان نازانم !

لێم پرسی چی رایکێشای بۆ ئیسلام ؟ بۆچی ئیسلامت هەڵبژارد ؟

تۆزێك بێدەنگ بوو ئنجا وتی : ( نازانم ، ئەوەی کە هەستی پێ بکەم ئەوەیە ، چەند زیاتر بخوێنمەوە زیاتر ئیسلامم لا خۆشەویست دەبێت )

لێم پرسی : ڕەمەزان بەرۆژوو بوویت ؟

پێکەنی و وتی : بەڵێ سوپاس بۆ خوا هەموو مانگەکە بەرۆژوو بووم ، کە ئەمەش یەکەمجارە بەرۆژوو ببم ، هەندێ قورس و گران بوو لەسەرەتاوە ، دایکم تەحەددای کردم کە ناتوانم رۆژووەکە بگرم ، بەلام بۆچوونەکەی وا دەرنەچوو ، توانیم بەرۆژوو ببم ...

لێم پرسی ئاواتت چی‌یە ؟

گورج وەڵامی دامەوە ( چەند ئاواتێکم هەیە ، هیوادارم بچم بۆ مەککە و بەردە رەشەکە ماچ بکەم )

وتم : دەبینم کە زۆر گرنگی دەدەیت بە حەج ؟ نازانم چی وایلێکردویت ؟

دایکی وەڵامی‌دایەوە ( وێنەی کەعبە ژوورەکەی پڕکردووە ، هەندێ کەس وایان دەزانی کە ئەوەی دەیکات خەیاڵی منداڵی‌یە ، یان جۆرێك لەسەرکەشی‌یە و تەواو دەبێت ، ئەوانە نازانن کە نەك هەر جدی یە بەڵکو ئیمانەکەشی زۆر قوڵ و دامەزراوە...

(محمد عبدالله) پێی خۆش بوو کەدایکی ئاوا دیفاعی لێدەکات !

ئنجا (محمد) کەوتە قسە و باسی تەوافی کەعبە و یەکسانی موسڵمانانی کرد لە حەج دا و پاشان وتی : ( من هەوڵدەدەم پارە پاشەکەوت بکەم تا ڕۆژێك بتوانم بچم بۆ حەج ، بیستوومە کەلێرەوە نزیکەی چوار هەزار دۆلاری تێدەچێت و ئێستاش من ( ٣٠٠) دۆلارم کۆکردۆتەوە ...دایکیشی لەم بارەیەوە وتی: بەلامانەوە ئاسایی‌یە کە بچێ بۆ مەککە ، بەڵام پارەمان نیە کە ئێستا بتوانێت بینێرین .

لێم پرسی : ئاواتی ترت چی‌یە ؟ وتی : ئاواتەخوازم کە فەلەستین بگەڕێتەوە بۆ موسڵمانان ، چونکە ئەوە خاکی موسڵمانانە و جوولەکە بە زۆر داگیری‌کردووە ، دایکی بەسەرسامی‌یەکەوە سەیری کرد و ئەویش بەدایکی وت : دایە تۆ مێژووت نەخوێندۆتەوە ، فەلەستین داگیرکراوە .

وتم : ئاواتی ترت هیچ ماوە ؟ وتی : حەزدەکەم فێری زمانی قورئان ببم و لەبەری بکەم .

لێم پرسی : ئەتەوێ ببیت بەچی لەداهاتوودا ؟ وتی : ئەمەوێ ببم بەوێنەگر تاوەکو وێنەی راستی موسڵمانان بگەیەنم بەخەڵکی ، چونکە زۆر فلیمم بینیوە کە وێنەی موسڵمانان دەشێوێنن ، هەرچەند فلیمی باشیش هەیە ، وە دەشمەوێ کە دیراسەی ئیسلام بکەم لەزانکۆی (اکسفۆرد) ، وادەزانم کە بەرنامەیەکی چاکیان لایە لەسەر دیراساتی ئیسلامی .

پێم وت : حەزدەکەی لەجیهانی ئیسلامی‌دا بخوێنی ؟ وتی : بەدڵنیاییەوە ، بەتایبەت لە ئەزهەردا حەزدەکەم بخوێنم .

پێم وت : ئەی لەبواری خواردندا ؟ چۆن خۆت دەپارێزی لەگۆشتی بەراز ؟ وتی : بەراز ئاژەڵێکی زۆر پیسە ، من لام سەیرە چۆن گۆشتی دەخۆن ، ماڵەوە دەزانن کەمن نایخۆم بۆیە بۆم دانانێن ، وە کەبشچین بۆ خواردنگە ، پێیان دەڵێم من گۆشتی بەراز ناخۆم ...

پێم وت : نوێژەکەی لەقوتابخانە ؟ وتی : پەنایەکم دۆزیوەتەوە لەکتێبخانەی قوتابخانەکەمان ڕۆژانە لەوێدا نوێژدەکەم .

ئیتر کاتی ئێوارە بوو ، سەیری کردم و وتی : ڕێم ئەدەی بانگ بدەم ، هەستا و بانگی دا و منیش دڵم پڕ بوو لەگریان وبەیەکەوە نوێژمان کرد... (ڕۆژنامەی الوطن ژمارە /١٣٤) .

## ( ١٤ ) جیرمان جاکسون

جیرمان جاکسون گۆرانی بێژێکی جیهانی‌یە وبرای مایکلْ جاکسۆن ە ، پاش سەرگەردانی و دوور لەخوایی ڕێی ڕاستی دۆزی‌یەوە و موسڵمان بوو ، لەبارەی ئەم گۆڕانە مەزنەی ژیانی‌یەوە دەڵێت : لەویلایەتی کالیفۆرنیا هەندێ لاوی عەرەبی موسڵمانم ناسی و وردە وردە دۆستایەتی‌یەکی پتەو لەنێوانماندا دروست بوو ، بەهۆی ئەوەی کەسەرسام بووم لە ڕەوشتی بەرزیان و هەڵس وکەوتی جوانیان .

تێگەیشتم کە ئەو ڕەوشتە بەرزانە لەبۆشەوە پەیدانابن و بێگومان پاڵنەرێك هەیە لەپشت ئەو هەڵسوکەوتە پاك و بێگەردەوە ... دوایی زانیم ئەوەی وای لەو گەنجانە کردووە بەوجۆرە ڕەفتاربکەن ئایینی ئیسلامە کە هەردەم موسڵمانان هان دەدات بۆ کاری چاك .

هیچ یەکێکیان ڕاستەوخۆ نەیان وت موسڵمان بە ، تەنها ڕەوشتی بەرزیان بوو کە بە ناڕاستەوخۆ کەمەندکێشیان دەکردم بەرەو ئیسلام و منیش موسڵمان بوونی خۆمم ڕاگەیاند بەبێ دوودڵی .

من لەڕێی ڕەفتاری جوانی ئەو برادەرانەوە گەیشتمە ئەو قەناعەتی کە ئاینی ئیسلام ، ئاینێکە دەست ئەدات بۆ هەموو کات و شوێنێك .

کۆمەڵگای ئەمریکی ئێمە ڕەوشت بەرزی بڵاونیە تیایا ، ژیانی ئێمە ماددیات زاڵە بەسەری‌دا ، بۆیە لەگومان و دوودڵی و (قلق) دا دەژین ، ئەمەش وای کردووە ژەهری سپی و ماددە بێهۆشکەرەکان ڕەواجیان زۆربێ و بازاڕیان گەرم بێ .

سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەلەگەڵ ئەو لاوە موسڵمانانەدا کۆی کردمەوە و باسی ئیسلامیان بۆ دەکردم و نەیان دەوت وەرە ئاینەکەمانەوە .

ئەمڕۆ بەگشتی دەبینین ئیسلام بلاّودەبێتەوە لەئەمەریکا ، کە ئەمەش مایەی سەرفراز بوون و رزگاری‌یە لە هەموو ئەو تەنگ و چەڵەمانەی دێنە ڕێمان . شتێکی گرنگیشە کەسایەتی ناسراوو دیار کاربکەن لەبانگەوازی ئیسلامیدا ، کە ئەمەش هیوا بەخشە بەموسڵمانان و، بلاّوبوونەوەی ئیسلام لەئەمەریکادا خێراتر دەکات .

## ( ١٥ ) امیرە

لەنامەیەکدا بۆ بلاّوکراوەی (الشرق) ژمارە( ٣٥٨٦) لەبەرواری (١٩٩٨/٤/١١) ، (امیرە) دەڵێت : من لەویلایەتی (ارکنساس) لەدایك بووم لەولاّتە یەککگرتووەکانی‌ئەمەریکا ، لەدایك وباوکێکی گاور ، لەلادێدا گەورەبووم لە کێڵگەکەی باوکم دا ، دایکم ژنی ماڵەوەبوو ، منیش کچی تاقانەیان بووم ... باوکیشم لەکەنیسەی (معمدانی) ناوچەکەماندا ئامۆژگاری و وتاری هەبوو کەناو بەناو پێشکەشی دەکرد .

بۆیەکەمجار لەزانکۆی (ارکنساس) ئافرەتێکی موسڵمانم بینی ، لەسەرەتاوە سەیر بوو لام جل و بەرگ و سەرداپۆشینەکەی ، بۆیە هەر ئەوەندەی فرسەتم بۆ ڕێکەوت لێی نزیك بوومەوە و بووم بەهاوڕێی کە ئەوەش هەموو ژیانمی گۆڕی .

ئەو ئافرەتە ناوی (یاسمین) و ، لەدایك بووی فەلەستین بوو ، بەچەند سەعات وتووێژمان دەکرد لەبارەی خواو پێغەمبەران و ولاّتەکەی و خێزانەکەی و هاوڕێکانی ، قسەکانی لای من زۆر خۆش بوون ، من بەماڵەوەم نەووت کە یاسمین هاوەڵمە و ئەویش دنیای لا هیچ بوو ، هەموو مەبەستی ڕەزامەندی خوا و ئاخیرەت بوو ...

جا کاتێك گەڕایەوە بۆ فەلەستین دەمانزانی جارێکی‌تر یەکتری نابینینەوە لەم دنیایەدا ، بۆیە گریا و تکای لێکردم کە بەردەوام بم لە دیراسەی ئیسلام دا بۆ ئەوەی لەبەهەشتا بەیەکتری بگەینەوە ... تا ئێستا قسەکانی لەگوێما دەزرنگێنەوە ، لەیەکەم ڕۆژەوە کەیەکترمان ناسی و ناوینام (امیرە) بۆیە منیش کەموسڵمان بووم ناوی خۆم گۆڕی بۆ (امیرە) .

پاش دوو هەفتە لەگەڕانەوەی یاسمین بۆ ولاّتەکەی ، لەدەرەوەی ماڵەکەی بەگوللەی جوولەکە شەهیدکرا ... ئەم دەنگ و باسەش زۆر کاری تێکردم و زۆرگریام بۆی .

چەندەها هاوەڵی ترم ناسی کەخەڵکی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست بوون و زمانی عەرەبیم لاخۆشەویست بوو ، بەتایبەت کاتێك گوێم لەیەکێك دەبوو قورئانی دەخوێند ، یان کاتێك گوێم لەشریتێك دەگرت .

پاش چەند ساڵێك موسڵمانێکی سەر ڕاستی ترم دەست کەوت و پرسیاری زۆرم لێکرد و هەرچیم دەست کەوت خوێندمەوە لەبارەی ئاینەوە و زۆر دوعام کرد کە خوا دەست بداتە باڵم و ڕێنماییم بکات ، خوای گەورەش دوعاکەی گیراکردم و لە ١٥ ی ابریلی ١٩٩٦ دا موسڵمان بووم و ، تاقە شتێك کە زۆر کاری تێکردم و قەناعەتی بۆ دروستکردم و کەهەرگیز لەبەرئەوەش واز لەئیسلام ناهێنم ، شیعاری ( لا الە الا اللە محمد رسول اللە ) یە ، جاکاتێك خێزانەکەم زانیان لەئیسلام دەکۆڵمەوە تووڕەبوون ، دواییش کەزانیان موسڵمان بووم بەتەواوی حاشایان لێکردم و خەریك بوو لەشێتخانە توندم بکەن ، گوایە بەلای ئەوانەوە من شێت بوم ! بەراستی حاشاکردنیان لەمن زۆر قورس و گران بوو لەسەرم و زۆر جاریش دوعایان لێدەکردم !

مەسەلەکە بەوەندەوە نەوەستا ، خزمێکیشم شکاتی لێکردم و داوای کرد کەلەڕێی یاساوە نەهێڵێت توخنی ماڵیان بکەوم ، دایکیشم هەمان کاری کرد بەرامبەرم ! شەوێکیان لەپارکی ئۆتۆمبیلەکان پیاوێك هێرشی کردە سەرم و ئازاری دام و بریندار کردم ، باش بوو دوایی گیرا ، چەندجاریش تایەی ئوتومبیلەکەمیان پەنچەر دەکرد و بەشەو لای شوققەکەمەوە تەقەیان دەکرد ، بۆ ترساندنم ... لەوەش سەیرتر هەرچی جلەکانم دەنێرم بۆ شتن و ئوتوکردن ،جل و بەرگە ئیسلامیەکانم بۆ نانێرنەوە و تەنها پانتۆڵەکانم بۆ دەنێرنەوە و هەڕەشەشم لێدەکەن تانەوێرم شکاتیان لێبکەم !

تاکاتی نووسینی ئەم باسە ، مەسەلەکەم لەدادگادایە ، لەگەڵ ئەوەدا کە من هیچ تاوانێکم نەکردووە دادگا یاساغی کردووە لێم شار بەجێ بهێڵم ! بەلاَم پشت بەخوا هەر من سەردەکەوم و گرە و دەبەمەوە !

جا کەمن ئەم چەند دێڕەم هۆنیوەتەوە بۆ ئەوەنیە کە موسڵمانان بەزەییان پیامابێتەوە ، بەڵکو تەنها داوام ئەوەیە لێتان کەلەنوێژەکانتاندا دوعام بۆ بکەن . وە زۆر سوپاسی ڕۆژنامە و سەرنووسەری دەکەم کەئەمەم بۆ بلاْودەکەنەوە .

## ( ١٦ ) سیلی

ڕەنگە ئەم چیرۆکە سەیر بێت بۆ کەسێك کە پاڵەوانی چیرۆکەکەی نەدیبێت و بەگوێی خۆی قسەکانی لێ نەبیستبێ ، چیرۆکەکە ئەگەر لەخەیاڵیش بچێت ، لەراستیدا لەعالەمی واقعیدا ڕوویداوە ، فەرموون بابەیەکەوە بچین بەرەو (جوهانسبرگ) شاریدەوڵەمەندی

کانی ئاڵتون لەوڵاتی خواروی ئەفریقیا کە من لەو شارە بەڕێوەبەری نووسینگەی (رابطة العالم الاسلامي ) بووم ...

ساڵی ١٩٩٦ فەسڵی زستان بوو ، سەرمایەکی بێئەندازە وڵاتی گرتبۆوە ، رۆژێك کە ئاسمان هەور داپۆشیبوو وە چاوەڕێی زریانێکی سەخت بووین ... لەماڵەوە چاوەڕێی میوانێك بووین و خێزانم سەرقاڵی چێشت لێنان بوو .

مەوعیدمان هەبوو لەگەڵ کەسایەتیەکدا کە خزمی سەرۆکی ئەفریقیای باشوور ( نیلسون ماندیلا) بوو ، کەسایەتیەك کە لەوەوبەر خەریکی بڵاوکردنەوەی گاورێتی بوو ، ئەویش قەشە سیلی بوو ... ڕەنگە بپرسن چۆن ئەم پیاوەم ناسی ، جا با ئەوەتان بۆ باس بکەم :

رۆژێك سکرتێری نووسینگەی (رابطە)(عبدالخالق) پێی راگەیاندم کە قەشەیەك دەیەوێ سەردانم بکات ، منیش مەوعیدێکم بۆ دانا ، لەکات و ساتی دیاری کراودا قەشە (سیلی) لەگەڵ (سلیمان) ناوێکدا ئامادەبوون ، ئەم سلێمانە یاری بۆکسێنی دەکرد و بەهۆی ( محمد علی کلای)یەوە موسڵمان بووبوو ... لەنووسینگەکەمان پێشوازی گەرمم لێکردن و زۆر خۆشحاڵ بووم .

( سیلی) کورتە باڵاو رەش پێست بوو ، هەمیشە زەردەخەنە لەسەر لێوی بوو ... پێم وت : برام سیلی ، ئەگەر دەکرێ چیرۆکی موسڵمان بوونت بگێڕەرەوە بۆمان .

سیلی پێکەنی و وتی بەسەرچاو ... جابراییینە ئێوەش بێدەنگ فەرمون گوێ بگرن لێی و دوایی خۆتان حوکم بدەن :

سیلی وتی: من قەشەیەکی چالاك بووم ، بەهەموو تواناموە کارم دەکرد و لەگەورە قەشەکانی خواروی ئەفریقیا بووم ، وە لەبەر ئەوەی زۆر چوست و بزێو بووم فاتیکان منی هەڵبژارد کە هەستم بەکاری مژدەدان بەمەسیحیەت و پارەو یارمەتیم لەوێوە بۆ دەهات ، منیش هەموو هۆکارێکم بەکاردەهێنا بۆ گەیشتنە ئامانجەکەم .

گەشت و سەردانی بەردەوامم دەکرد بۆ پەیمانگاکان و قوتابخانەکان و خەستەخانەکان لەشار و لادێ و دارستانەکان ، وە بەو پارانەی بۆم دەهات دەستی هەژار و لێقەوماوەکانم دەگرت لەشێوەی دیاری و یارمەتیدا ... ئەمەش بۆ ئەوەی مەسیحیەتیان لاشیرین بکەم ... کەنیسەش پارەیان بۆ رشتبووم و بەوەش دەوڵەمەند

بووم و خاوەنی ئوتومبیل و خانووی خۆم بووم و مووچەی باشیان بۆ بڕیبوومەوەو، وە من پلەوپایەکی بەرزم هەبوو لەناو سەرجەم قەشەکاندا ...

ڕۆژێك چووم بۆ بازاڕێکی گەورەی شار کە هەندێ کەل و پەل بکڕم ، (مفاجـاة)ە کە ئالـەوێدا بـوو ، لـەم بـازاڕەدا ، بازرگانەکـە بەسـەرو سـیما و جـل و بـەرگیدا دیـار بـوو موسڵمان بوو ، منیش جل و بەرگی تایبەتی قەشەیم لەبەردابوو ، پاش مامەڵەکردنی کەل و پەلێك کە بۆ دیاری دەمویست ، بازرگانەکە لێی پرسیم : تۆ قەشەنیت ؟

وتم : بەڵێ ...وتی : کێخواتە ؟ وتم : (مەسیح) خوایە ...

وتـی : مـن تەحـەددات دەکـەم کـە تەنـها ئایـەتێك بـهێنی لـەئینجیلدا لەسـەر زمـانی حەزرەتی (مەسیح) کەبڵێ : ( انا الله ، او انا ابن الله) بمپەرستن ...

قسـەکانی کـابرا وەك چەکوش دای بەسـەرما ، نەمتوانی وەڵامـی بدەمـەوە ، هەرچـەند بیرم کردەوە و بەدڵ پیاچوونەوەم کـرد بەئینجیلـەکاندا نەمتوانی ئایـەتێکی وا بدۆزمـەوە لەسەر زمانی ( مەسیح) ، زۆر ئیحـراج بووم لەبەردەم پیاوەکـەدا و دڵتـەنگ بـووم ، باشـە چۆن مـن وەڵامـی ئـەم پرسیارە نـازانم ؟ پیاوەکـەم بەجێهێشـت و گەڕامـەوە بـەبێ ئـەوەی ئاگام لەخۆم بێت بۆ کوێ دەچم ... ئنجا بڕیارمدا کە بگەڕێم بەدوای ئەو باسـەدا ، چەند گەڕام هیچم چنگ نەکەوت ، ناچار چووم بۆ مەجلیسی کەنیسە و داوای کۆبوونەوەیەکم کرد لەگەڵ ئەندامەکاندا ، ئەوانیش قایل بوون . لەکۆبوونەوەکـەدا ئـەوەی بیستبووم پێم وتن ،هەمووان وتیان: کابرای هیندی خەڵەتاندویتی ( بەموسڵمانی ئەوێ دەڵێن هیندی) ، ئەو دەیەوێ سەرت لێ بشێوێنێ بەئاینی هیندییەکان ( واتە ئیسلام ! )

وتم : باشە وەڵامم بدەنەوە ! وەڵامی پرسیارەکەی ئەوبدەنەوە ! کەس وەڵامی نەدایەوە .

ڕۆژی یەك شەممە هات و وەستام وانە بڵێمەوە و ئامۆژگاری بکەم لەکەنیسە ، هەرچیم کرد دەمم چووە کلیلـە و نەمتوانی هیچ بڵێم ، ناچـار داوام کـرد یەکێکیتر لـەجیاتی مـن قسەیان بۆ بکات ، چونکە لەراستیدا من ڕووخابووم و دەروونم شپرزبوو !

ڕۆیشتمەوە ماڵەوە و زۆر خەفەتبار بووم ، ئنجا لەسوچێکدا دانیشـتم و زۆر گریـام ، پاشان سەرم بەرزکردەوە و چاوم بڕیە ئاسمان و کەوتمە دوعاکردن ، بەڵام داوا لەکێبکەم ؟ ڕووم کردە ئەوەی کە بڕوام هەبوو هەر ئەوخوایەو بەدیهێنەرمانە ، لێی پاڕامەوە و وتم ( پـەروەردگارا ... بەدیهێنـەرم ... هـەموو دەرگاکـان بـەڕووما داخـراون تەنـها دەرگـای میـهرەبانی تۆ نـەبێت ، بـێ بەشـم مەکـە لـەزانینی ڕاسـتی ، هـەق و ڕاسـتی لەکوێیـە ؟

پەروەردگارا ، پەروەردگارا لەم سەرگەردانیەدا مەمهێڵەرەوە ، ڕێی هەق و راستیم نیشان بدە ) .

پاشان خەوم لێ کەوت ، لەخەوما بەتەنها لەهۆڵێکی زۆر گەورەدابووم ، لەپێشەوەی هۆڵەکە پیاوێك دەرکەوت لەبەر رۆشنایی درەوەشانەوەی نەمتوانی زۆر دیقەتی بدەم ، پیاوەکە ئاماژەی بۆ کردم و بانگی کردم : ئیبراهیم ، سەیری دەوروبەری خۆمم کرد بزانم ئیبراهیم کێیە ؟ کەسم نەبینی لەهۆڵەکەدا . پیاوەکە پیێ وتم : تۆ ئیبراهیمی ...ناوت ئیبراهیمە ... تۆ داوات نەکرد لەخوا کە هەق و راستی بناسیت ؟ وتم : بەڵێ ... وتی : سەیری لای راستت بکە ... سەیرم کرد ، کۆمەڵێ پیاوم بینی دەڕۆیشتن و کەل و پەلیان بەکۆڵیانەوە بوو ، جلی سپیان لەبەردابوو ، عەمامەی سپیش بەسەریانەوە بوو ! پیاوەکە وتی : دوای ئەوانە بکەوە ، بۆئەوەی هەق وراستی بزانیت ! خەبەرم بۆوە و زۆر خۆشحاڵ بووم ، بەڵام بێتاقەت بووم کە ئەگەڕام بەدوای ئەو کەسانەدا و لەو بابەتەم نەئەبینی ...

بڕیارمدا بەردەوامبم و کۆڵ نەدەم بەدوای هەقدا ، هەروەك لەخەودا رێنمایی کرابووم ، وە دڵنیاش بووم کە ئەوە هەمووی لەخواوەیە ، مۆڵەتم وەرگرت لەکارەکەم و کەوتمە گەڕان شارەو شار ، هەر موسڵمانێکم دەبینی ، پانتۆڵیان لەبەردابوو ، وە عەمامەیان بەسەرەوە نەبوو ... تا گەیشتمە شاری (جوهانسبرگ) و لەنووسینگەی پێشوازی لیژنەی موسڵمانانی ئەفریقیا خۆم بینیەوە ! پرسیارم لێکردن ئەو جۆرە موسڵمانانە لەکوێن ، کەجلی سپیان لەبەردایە و عەمامەیان لەسەردایە ؟ وایان زانی سواڵکەرم ویستیان شتێ پارەم بدەنێ ! وتم : من داوای پارە ناکەم ! باشە پەرستگای نزیکتان نیە لەم دەوروبەرە ؟ ئەوانیش مزگەوتێکی نزیکیان پیشاندام و بۆی کشام !

ئەوەی سەیرە پیاوێکی جل سپی لەبەردەرگا بوو ، وە عەمامەیەکیشی بەسەرەوە بوو ، زۆر دڵخۆش بووم و گەشامەوە ، وتم : ئەمە ئەوەیە کە من بەدوایدا ئەگەڕێم ، ڕۆیشتم بەرەو رووی ! بەبێ ئەوەی من هیچ بڵێم پیاوەکە دەستپێشخەری کرد و وتی : مەرحەبا ئیبراهیم ! لام سەیر بوو ، ئەبلەق بووم ! ئەم پیاوە چۆن ناوم دەزانێ ، ئنجا وتی : لەخەوما بینیم کە بەدوامانا دەگەڕێیت و ئەتەوێ بگەیتە هەق و راستی ، هەق و راستی ئەو ئاینەیە کە خوا قایلە پێی بۆ بەندەکانی کە ئەویش ئیسلامە !

وتم : بەڵێ بەدوای ئیسلامدا دەگەڕێم و پیاوێکی نوورانیم بینی لەخەوما پێی وتم : دوای کۆمەڵێك بکەوم جل و بەرگیان وەکو تۆیە...دەتوانی پێم بڵێی ئەوەی بینیومە

لەخەودا کێیە ؟ وتی : ئەوە پێغەمبەرمانە (محمد) ﷺ ، پێغەمبەری ئیسلام و ئایینی هەقی خوایە !

وتم :چۆن من پێغەمبەری خوام بینیوە ، لەخۆشیدا باوەشم کرد بەو موسڵمانەدا وپێم وت : بەراست ئەوە پێغەمبەرەکەتان بووە ، هاتۆتە خەوم تا هەق و راستیم پیشان بدات ؟ پیاوەکە وتی : بەڵێ ئەوە خۆیەتی!

ئیتر چووینە مزگەوتەکەوە و پێشوازی گەرمیان لێکردم و من لەسوچێکدا لەدواوە دانیشتم و ئەوانیش نوێژی نیوەڕۆیان کرد...بینیم رکوع و سجود دەبەن بۆ خوا ، لەدڵی خۆمدا وتم ( بەخوا ئاینی هەقە ، لە زۆر پەڕاودا خوێندبوومەوە کە پێغەمبەران ناوچەوانیان بۆ خوا دەخەنە سەر زەوی و سوجدە دەبەن ) ...

پاشان شایەتمانم هێنا و زۆر گریام لەخۆشی ئەوەی کەخوا هیدایەتی دام ... ماوەیەك لەلایان مامەوە و فێری ئیسلام بووم و ئنجا لەگەڵیان دەرچووم بۆ بانگەوازکردن و ، سەردانی چەندەها شار و گوندیان کرد ، زۆر دڵخۆش بووم لەگەڵیاندا و فێری نوێژ و رۆژوو شەونوێژ و دوعا و راستگۆیی و ئەمانەت بووم ، تێگەیشتم کە موسڵمانان ئوممەتێکن و خوا بەرپرسیاری کردوون کە ئاینەکەی بڵاوبکەنەوە ، فێربووم چۆن موسڵمانێکی بانگخوازبم و بەحیکمەت و بەئارامەوە کاربکەم و خۆم بۆ خوا بڕەنجێنم !

پاش چەند مانگێك گەڕامەوە شارەکەی خۆم ، سەیر دەکەم خزم و کەس بەدواما دەگەڕێن ، هەر کە بەجل و بەرگی ئیسلامی‌یەوە بینیانم ، زۆر نارەحەت بوون و داوایان لێکردم بەزوویی لەگەڵ مەجلیسی کەنیسەدا دانیشم ... بەڵێ لەکاتی دیاری کراودا کۆبوونەوەم لەگەڵدا کردن و ، زۆر سەرزەنشتیان کردم کەوازم لەگاورێتی هێناوە و گوایە هیندی‌یەکان (موسڵمانەکان) سەریان لێشێواندووم ... منیش وتم : کەس سەری لێنەشێواندووم و نەیخەڵەتاندوم ... لەخەوما نێرراوی خوا(محمد) رێنمایی کردووم بۆ رێی راست و هەقیقەت ، کە ئەویش ئاینی ئیسلامە ...( وە ئەوەش ئاینی هیندی نیە وەك ئێوە دەڵێن ) ، جا من بانگتان دەکەم بۆ هەق و بۆ ئیسلام... زۆر سەرسام بوون !

ئنجا لەرێیەکی‌ترەوە بۆم هاتن ، ویستیان بەپارە و ماڵ و پلەو پایە و کورسی لەخشتەم بەرن ، وتیان : فاتیکان داوای کردووە شەش مانگ لایان بمێنیتەوە و لەسەرەتاشەوە هەموو خەرجی‌یەکت پێدەدەن و هەروەها خانوو ئوتومبیلی تازەشت بۆ دەکڕین و! پلەشت بەرزدەکەینەوە لەکەنیسەدا ! منیش وتم : بەخوا واز لەئیسلام ناهێنم

ئەگەر پارچە پارچەشم بکەن ... ئنجا کەوتمە ئامۆژگاریان بۆجاری دووەم ، لەسایەی خواوە دوو قەشە موسڵمان بوون ... جا کەزانیان سوورم لەسەر ئیسلامەتی هەرچیان پێدابووم لێیان سەندمەوە ...

ئەمە چیرۆکی (ابراهیم سیلی) بوو ، کەلە نووسینگەی خۆم لە ( رابطة العالم الاسلامي)لەئەفەریقای خواروو بۆی گێڕامەوە بەئامادەبوونی ( عبدالخالق میتر) ی سکرتێرم و دووکەسی تریش .

بەڵێ لەماڵەوە میوانداریم کرد و زۆر خزمەتم کرد ، ئیتر خواحافیزیکرد و منیش گەڕامەوە بۆ مەککە ، پاش ماوەیەکیتر گەڕامەوە بۆ شاری (کیب تاون) لەخوارووی ئەفریقیا ، بۆ کاری بانگەواز ، کاتێکم زانی (ابراهیم سیلی) هات بۆ لامان و ناسیمەوە ، وتم : ئەوە چی دەکەی لێرە ؟ وتی : خەریکی بانگەوازم و دەمەوێ ئەو خەڵکە رزگاربکەم لەتاریکییەکانەوە بەرەو نووری ئیمان ...

ئەوەی سەرنجی راکێشام (ابراهیم ) جل و بەرگێکی زۆر سادە و کۆنی لەبەردابوو ، هەژار کەوتبوو ! هەرچی هەبوو لەرێی خوادا دایتابوو ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندە نەفس بەرزبوو داوای هیچی نەکرد ...دوایی زۆر گریام و هەستێکی زۆر سەیرم لادروست بوو ، لەدڵی خۆمدا وتم : ئێمە ومانان یاری بەبانگەواز دەکەین و ئەوانە بەراستی جیهاد دەکەن لەرێی خوادا...

بەڵێ برایان ئێمە تەمبەڵو سستین ، دنیا دڵمانی گرتووە ، چەندەهای وەك ئیبراهیم و بانگخوازی ئیسپانی (احمد سعيد) یش خەوو خۆراکیان بووە بەم کارە و هەرچیان هەیە دەیکەن بە قوربانی ، خوایە لێمان خۆش ببە ! خوایە بمانبەخشە !

وەرگیراوە لەوتاری (عبدالعزيز احمد سرحان) عەمیدی کۆلیژی مامۆستایان لەمەککە کە بەرپرسی‌نووسینگەی رابیتەی عالەمی ئیسلامی بوو لە شاری جوهانسبرگ لە وڵاتی خوارووی ئەفریقیا. لەرۆژنامەی عكاظ/ ساڵی ٤١ ژمارە ( ١٢٠٠٠) ساڵی ( ٢٠٠٠) .

### ( ١٧ ) کچێکی بەریتانی

شێخ عبدالرحمان ابوذر لە گۆڤاری (النور) ی کوەیتی ژمارە (٣٤) لەژێر سەردێری (بسم الله موسڵمانی کرد) دەڵێت: کاتێك ویستم بچم بۆ لەندەن ، هەر لەکوەیت لە (بيت التمويل الكويتي) پارەکانم کرد بەچەك کەلە (بنك الكويت المتحد) لەلەندەن بیگۆڕمەوە ...کاتێك گەیشتمە لەندەن ، چەکێکم دا بەکچێکی بەریتانی سفور کە فەرمانبەربوو لە

(بنك الكويت المتحد) دا ، ئەویش سەرێکی بادا و وتی ئەمە لای ئێمە ناگۆڕدرێتەوە ، چونکە ناوی (بیت التمویل الكويت)یم نەبیستووە ، منیش پێم وت : ئەگەر ئەرك نیە پرسیاربکە لەبەڕێوەبەرەکەتان ، ئەویش چوو پرسیاری کرد و پاش کەمێك گەڕایەوە و داوای لێبووردنی لێکردم و وتی : گوایە (بیت التمويل الكويت) ی تازە کراوەتەوە و پەیوەندی هەیە لەگەڵماندا و من نەمزانیوە ...پاشان کە پارەکەی بۆ گۆڕیمەوە لەسەر چەکەکە (بسم الله الرحيم) سەرنجی راکێشا و وتی : ئەمە چی‌یە نوسراوە و بۆچی باشە و ؟ بۆچی تەنها لەسەر ئەم چەکەی (بیت التمويل) ئەم (بسم الله) یە نووسراوە ؟ منیش پێم وت : ئەگەر تۆ جوولەکەیت ، ئەوا بگەڕێرەوە بۆ ئەونامەیەی کە حەزرەتی سولەیمان ناردی بۆ پادشای (سبأ) و سەرەتاکەی : (بسم الله الرحمن الرحيم) بوو...وە لەئەنجامدا شاژنی (سبأ) موسڵمان بوو لەسەردەستی حەزرەتی سولەیماندا بۆ خوای پەروەردگاری جیهان .

وە ئەگەر گاوریشی ئەوا بزانە کە حەزرەتی عیسا سەلامی خوای لێبێ بە (بسم الله الرحمن الرحيم) نەخۆشی چاك دەکردەوە و مردووی زیندوو دەکردەوە ... وەبشزانە کە هەر بە(بسم الله الرحمن الرحيم) و بەناوی خواوە حەزرەت ﷺ پەنجەی موبارەکی درێژکرد بۆ مانگ و دووکەرت بوو ... وە هەر بە (بسم الله) و ناوی خوا بوو کە موسڵمانان لەجەنگەکانیاندا سەرکەوتن ...وەهەموو سوورەتەکانی قورئان تەنها یەکێکیان نەبێ هەمووی بە (بسم الله الرحمن الرحيم) دەست پێدەکات و جمهوری عولەما بەئایەتێکی دادەنێن لەسوورەتەکان . جا بۆ ئەوەش رەنگە بڵێی ئەم (بسم الله) یە پەیوەندی چی‌یە بەچەکی پارەوە ، دەڵێم : ئەمە پەیوەندی بەبیروباوەڕی ئێمەوە هەیە ، بۆ نموونە : خوایە ئەم پارەیەی داوە بەمن و دەبێت لەدڵەوە بترسم لەوەی کە بەفیڕۆی بدەم و خوا لەخۆم برەنجێنم .

وە لەکۆتایشدا بزانە کە بە(بسم الله) زەوی رام بووە و شاخەکان لەنگەریان گرتووە و رووبار و دەریاکانیش رێیان گرتۆتەبەر ، وە بە (بسم الله) و بەئیزانی خوا تۆ دروستبوویت و گەیشتویتە ئەمڕۆت و لەم بانقەدا دامەزراویت ، بۆیە تەنها داوا لەو بکە یارمەتیت بدات و بێت بەهاناتەوە ...پاش ئەم قسانە داوای لێکردم ئەگەر دەگونجێ زیاتر باسی ئیسلامی بۆ بکەم ، لەبەر ئەوەی منیش ماڵ و منالم لەگەڵدا بوو وە پەلەم بوو پێم وت : دەتوانی بچیت بۆ (مركز اسلامی لندن) و لەوێ هەرچیت بوێت بۆت دەکەن ...

مـن ڕۆیشـتم و ئـەویش بـەچاوی پـڕ لەفرمێسـکەوە خواحـافیزی لێکردیـن ... دوای هەفتەیـەك گەڕامـەوە بـۆ هـەمان بـانق بـۆ گۆڕینـەوەی چـەك ، کـاتێکم زانـی ئـافرەتێکی داپۆشراو بانگی کردم (مستر ابو ذر)و بەگەرمی سلاوی لێکردم ، تومەز دوای من چووە بۆ (مرکزی اسلامی لندن) و لەوێ دکتۆر (ابراهیم) سەرۆکی (مرکز) ە کە زۆر خزمەتی کردووە و ئاییني پیرۆزی ئیسلامی بـۆ ڕوون کردۆتـەوە و ئـەویش موسڵمانەتی خـۆی ڕاگەیاندووە و بەزووترین کات لە کۆگایەکی جل و بەرگی ئەو دەوروبەرە جل و بەرگی ئیسلامی کڕیوە و خۆی داپۆشیوە ...

ئافرەتەکـە هیـچ جـۆرە ئارایشـتێکی نـەکردبوو ، بەپێچەوانـەی پێشـترەوە کـە ڕەنـگ نەمابوو نەیدا لەدەم و چاوی ! پێش ئەوەی مـن پرسیاری لێ بکـەم ئـەو دەستپێشخەری کرد و وتـی : خـوا هیدایەتی دام بەبەرەکەتی (بسـم الله الرحمـن الرحیـم) وسـوێندی بـۆ خواردم کە پاش خوێندنەوەی چەند پەڕاوێکی ئیسلامی لەدوو ڕۆژدا بڕیاری خۆی داوە و ڕێی ڕاستی هەڵبژاردووە و ئێستا بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە نوێژ وەکو وەستان و ڕکوع و سجود دەکات چونکە هێشتا فێری عەرەبی و قورئان نەبووە ...

( ئـەو ڕۆژئاواییانـەی کـە موسـڵمان دەبن ئەوەندە بـەرێك و پێکـی و بەشـەوقەوە دێنـە سەر ئەم ئاینە ، ئەگەر لەنیوەڕۆی ڕەمەزاندا موسڵمان بن ، ئیتر ئەو پاش نیوەڕۆیە نیەت دێنـن و باقی ڕۆژەکە بـەڕۆژوودەبن ، یـان ئەوەتـە ئـەم کچـە بەریتانیـیە نوێژەکـانی وەك (حرکات) جێبـەجێدەکات و یەکسـەر بێخۆخەلـەتاندن خـۆی داپۆشـی هەرچـەند تاقـە وشەیەك لەقورئان نازانێت ! بەراستی ئەم سەر گوزەشتانە وادەکات بەخۆماندا بچینەوە و زیاتر شەرم بکەین لەخوا و باشتر خزمەتی ئیسلام بکەین ) .

## ( ١٨ ) دکتۆر علی سلیمان بنوا

دکتـۆر علـی سـلمان بنـوا لـەبارەی خۆیـەوە دەڵێـت : مـن پزیشـکێکی فەرەنسـیم و لـەخێزانێکی گاوریکـاثولیکیدا چـاوم بـەدنیا هەڵـهێناوە . وە لەبـەر ئـەوەی خـەریکی پزیشکی بووم ، زیاتر گرنگیم ئەدا بەبواری زانستی و گوێم نەئەدا بەلایەنی ڕۆحی .

من بڕوام بەخوایەکی تاك و تەنها هەبوو پێش ئـەوەش کە موسڵمان ببـم کە ئـەوەش بەشـی یەکـەمی شـایەتمانە( اشـهد ان لا الـه الا الله...) کـەقورئانیش لەسـوورەتی (الاخلاص)دا جەخت دەکاتە سەری ﴿ قل هو الله احد ، الله الصمد ، لم یلد ولم یولد ، ولم یکن له کفوا احد ﴾ ...

ئیمان بوونم بە غەیب وای لێکردم بڕوا بە ئیسلام بهێنم ، هەرچەند ، هۆی تریش هەبوون هانیان دام بۆ هاتن بەرەو ئیسلام ، لەوانە بڕوانەبوونم بەداوای کەنیسە کە گوایە توانای لێخۆش بوونی گوناهیان هەیە ولەخواوە وەریان گرتووە ، هەروەها مەسەلەی (العشاء الرباني) و(الخبز المقدس)ئەمانە بەعەقڵم دا نەدەچوون ...

لەلای ئێمە گرنگی نەدەدرا بەپاك و تەمیزی لاشە پێش نوێژ ، ئەمەش بەلای منەوە نابێت بکرێت لەهەقی خوادا ، چونکە هەروەك خواوەند رۆحی بۆ دروستکردوین ، لاشەشی بۆ دروستکردوین و پێویستە گرنگی پێ بدرێت ...

هەروەها تێبینی ئەوەم دەکرد لەلای ئێمە بێدەنگییەك هەیە بەرامبەر غەریزەکانی مرۆڤ ، کەچی لەئیسلامدا زۆر گرنگی دراوە بەباسی سرووشتی ئادەمی و حسابی بۆ کراوە .

زیاتر لەهەموو ئەوانەش قورئان کاری تێکردم و هۆکاری بنەڕەتی یە لە موسڵمان بوونم دا ، پێش ئەوەی موسڵمان ببم کەوتمە لێکۆڵینەوەی ، وەمن زۆر خۆم بەقەرزاری (بەرێز/ مالك بن نبی) دەزانم کە پەڕاوی (الظاهرة القرانیـة)ی داناوە ، قەناعەتی تەواوی پێکردم کە قورئان سرووشە و خوا ناردوویەتیە خوارەوە .

جا ئەو ئایەتانەی کەباسی لایەنی زانستی دەکەن لە زیاتر چواردەسەدە لەمەوبەرەوە و تازە زانستی سەردەم دەیان سەلمێنن ، وایان لێکردم کەبڕوا بەبەشی دووەمی شایەتمان بێنم (واشهد ان محمدا رسول الله ) .

ئابەو جۆرە لەرۆژی ٢٠ ی فبرایری ساڵی ١٩٥٣ دا موسڵمان بوونی خۆم لەمزگەوتی پاریس راگەیاند و ناوم لەسجلی موسڵماناندا تۆمارکرا بە (علی سلمان)...

من خۆم بەبەختەوەر دەزانم بەم عەقیدە و بیروباوەڕەمەوە ، وە جارێکیتر رایدەگەیەنم (اشـهد ان لا الـه الا الله وان محمـدا رسـول اللـه) . پەڕاوی ( لمـاذا اسـلمنا ، دانـراوی عبدالحمید بن عبد الرحمان السحیباني ) .

## (١٩) تود أسكاو

ئاشکرایە بانگخوازان هەمیشە هەوڵی داهێنانی نوێیانە بۆ گەیاندنی بانگی خوایی ، بانگخوازێك بیری کردەوە کە لەبەندیخانەکانی ئەمریکادا جێ دەستێك بەجێبهێڵێ و کارێك بکات بۆ خوا ... بۆیە لەبەندیخانەکانی کالیفۆرنیاوە دەستی پێکردو بەرهەمەکەی

بینی ، کە چەندەهای نەفام ونەزان و دوورلەهەق و راستی روویان کردە دوا پەیامی خوایی و سەرتاپا ژیانیان گۆڕدرا بەرەو خێر و چاکە .

لەساڵی (١٩٩٢) ش دا یەکێك لەبانگخوازان دەچێتە بەندیخانەیەکی (لوس انجلوس) ەوە ، بۆ پێشکەش کردنی هەندێك ئامۆژگاری خێر و دابەشکردنی چەند پەڕاوێکی ئیسلامی ، یەکێك لەو بەند کراوانەی کتێبیان وەرگرت ، لاوێکی تەمەن (٣٢) ساڵ بوو کە چەندەها برینی قوڵ بەلەشیەوە بوو ، کەس بڕوای نەدەکرد هیچ سوود لەو کتێبانە ببینێ ... چونکە ئەم برادەرە ناوبانگی دەرکردبوو بە ترسناکترین و تاوانبارترین کەس لەگەڕەکی ڕەش پێستەکانی لوس انجلوس دا...

ئاشکرایە هەر کەسە و بەشێك خێری تێدایە ، گرنگ ئەوەیە هەرچەند کەمیش بێت کاری لەسەر بکرێت و ڕێنمایی بکرێت چونکە هیچ شتێك بۆ خوا ئەستەم (مستحیل) نیە ( اسکاو) کاتێك پەڕاوی (ان هذا الدین عالمي)خوێندەوە زۆرکاری تێکرد و بڕیاریدا واز لەتاوان و خراپەکاری بهێنێ و لاپەڕەیەکی نوێ لەژیانیدا هەڵبداتەوە و موسڵمان ببێت ... بۆیە هەر ئەوەندەی بەربوو لەبەندیخانە ، یەکسەر چوو بۆ مزگەوت بۆ لای ئەو بانگخوازەی کە پەڕاوەکەی دابوویە و لەسەر دەستیا موسڵمان بوو ... لەو رۆژوە ناوی خۆی گۆڕی لە( تود اوسکاو) ەوە بۆ (ناجی علي)

ئنجا بۆ ئەوەی کارێك بکات بۆ خوا و بەندەکانی خوا ، وە بۆ ئەوەی هەق بکاتەوە بۆ ئەو خەڵکەی کە تا دوێنێ بوو زەلالەتیان بوو بەدەستیەوە ، بڕیاریدا بەپێچەوانەی رابردوەوە ، خزمەتی خەڵکی داماوو هەژار بکات و یارمەتیان بدات بۆ ئەمەش کۆمەڵەی (هوب) ی خێرخوازی دامەزراند و کەوتە کاری خێرخوازی لەگەڕەکەکاندا و هەروەها لەبەندیخانەکانی خوارووی ویلایەتی کالیفۆرنیادا ...لەم کارەشدا ئافرەتێکی بانگخواز هاوکاری کرد کەناوی (منیره کریم) بوو ...

کارکردن لەو کۆمەڵەیەدا خێرابوو وەك خێرایی موسڵمان بوونی (ناجی علی) ، هەر زوو داوای لەهەموو (مرکز) و مزگەوتەکان کرد کەچیان پەڕاوی ئیسلامی لایە کۆی بکەنەوە و دابەشی بکەن بەسەر بەندیخانەکاندا ، وێڕای ئەم کارە دەستی کرد بەهاوکاری کۆکردنەوە بۆ نان دان بەو دەربەدەر و ئاوارانەی شەو لەسەر شەقامەکان رۆژدەکەنەوە ، کە ئەوەش کێشەیەکی کۆمەڵایەتی گەورەیە لەئەمەریکادا ...

هەروەها جل و بەرگیش بۆ هەژاران دابین دەکەن و هاوکاریان دەکەن کەبتوانن کارێك بۆخۆیان بدۆزنەوە و بژێوی خۆیانی پێ بەدەست بهێنن .

بەم کارە پیرۆزانە بەدەیەها کەس لەسەردەستیا موسڵمان بوون ، چونکە کارەکەی جێی رێز و پێزانینی خەڵکی‌یە بەگشتی و لەسەرروو هەمووشیانەوە سەرکردەی موسڵمانە ڕەش پێتەکانی ولایەتی کالیفۆرنیا کە زۆر دڵشادە بەو هەوڵە بەسوود و پڕ خێرانە .

یەکێکی‌تر لەچالاکی‌یە گرنگەکانی ئەو کۆمەڵەیە هۆشیار کردنەوەی موسڵمانانە لەمەترسی (ئایدز) ، وە داوایان کرد لەهەموو مزگەوت و (مرکز) ەکان کە بەهیچ جۆرێك پیاوو ئافرەت لەیەك مارە نەکەن هەتاوەکو هەموو پشکنینێکی پزیشکی پێویست ئەنجام دەدەن ...

بەڵێ ئەو ئیسلامەی کەلەپێش زیاتر لەچوارده سەدەوە لەحەزرەتی (محمد) ەوە دەستی پێکرد ، ئەمرۆ زیاتر لەسێ‌سەد هەزار کەسی بەندکراوی بەندیخانەکانی ئەمریکای هێناوە بەرەو ئیمان و سەرفرازی دنیا و ئاخیرەت ، ژمارەیەکی باشیشیان بوون بەبانگخواز و بەسەروماڵەوە تێدەکۆشن بۆ ئیسلام ، ئەمە بێجگە لەوەی ئێستا نزیکەی سیانزە هەزار سەربازی ئەمریکی هەیە کە موسڵمان بوون .ل ١٦١ (المعجزة المتجددة).

هەزاران رەحمەت لەعومەری کوڕی خەتتاب کەفەرموویەتی ( قوڵفەکانی خێمەی ئیمانی کەسێك یەك بەدوای یەکدا دەبچڕێن ، ئەگەر لەئیسلام دا پێ بگات و نەزانێ نەفامی چی‌یە ) ... سەیری لای خۆمان بکە لەبەر ئەوەی زۆر کەس لەناوماڵێکی سادەی موسڵمان ودایك و باوکێکی موسڵمان دا هاتونەتە دنیاوە ، ساردوو سڕن و خاوو خلیچکن ومەگەر بەپاڵ بڕۆن بەرێی خێردا ، چونکە قەدری ئیسلام نازانن و شارەزاییان نیە لەجاهیلیەت ، بەپێچەوانەشەوە ئەوانەی بەئاگری نەفامی داخ بوون و سەردەمانێك تیا ژیاوون و شارەزان ، دەبینین چەندە ئیمانیان پتەوە و چەندە گەرم و گوڕن لەئیسلامەتی و هەوڵ و کۆشش و دروستکردنی کۆمەڵەی خێرخوازی‌دا ، سا بەڵکو کەس وەکو رابردوویان گیرەوە نەبێ و بشتوانن کەسێ زیاتر رزگار بکەن و خوا لەخۆیان رازی بکەن . تێبینی:

لەوڵاتی سعودیەش هەمان سیاسەت پەیرەودەکرێت لەرێنمایی کردنی بەندکراواندا بەرەو رێی خێر و خۆشی دنیا و ئاخیرەت و ، ئەوانەی کەماوەیەك لەحوکمەکەیان تەواو

دەکەن ، ئەگەر قورئان لەبەربکەن و بەرەو چاکی برۆن لەماوەی بەندکردنەکەیان بۆ کەم دەکەنەوە .

لاوێك هەروەك (ناجی علی) ەکەی ئەمریکا ، ناوچەکەیان گیری خواردبوو بەدەستیەوە ، لەسەر خراپە و تاوان بەندکرا ، لەبەندیخانە لەگەڵ هاوەلآنیدا هەر بۆ گاڵتە کەوتە قورئان خوێندن ، وردە وردە قورئان کاری تێکرد و سەرەنجام خوا دڵی هیدایەت دا و هەموو قورئانی لەبەرکرد و بەریاندا ، بەمەش بووە مایەی خێر و بەرەکەت بۆ ناوچەکەی بەپێچەوانەی رابردوویەوە ! ل١٦٠ المعجزة المتجددة.

## (٢٠) بیتاماهیروماتی و دوویابانی

(بیتا ماهیر و ماتی) پزیشکە لەخەستەخانەی گەورەی (تۆکیۆ) ، بەیانییەك بەلای مزگەوتی گەورەی (تۆکیۆ)دا دەڕوات ، دیمەنی وەستانی موسڵمانان بەڕیز لەپشت ئیمامەوە و سەدای وشەی (امین) ی نوێژ خوێنان سەرنجی رادەکێشن و بڕیار دەدات پرسیار لەموسڵمانێك بکات و لەئیسلام تێبگات .

ئەم دیمەنە کار لەدوو کەسی تریش دەکەن ، کە ئەوانیش (شیر ماهو ماکی) مامۆستای قوتابخانەی تەکنیکی پیشەسازی و (هیرومامهی تانك) ە کە بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی پیشەسازییە لەیابان ... ئەمانیش بڕیار دەدەن هەوڵ بدەن بۆ فێر بوونی ئیسلام ...سەرەنجام هەرسێکیان دیراسەی قورئانیان کرد و دڵ و دەروونیان رووناك بووەوە بەنوری ئیمان و رۆژێك چوون لەسەردەستی مامۆستای مزگەوتی گەورەی (تۆکیۆ) دا موسڵمان بوون... لەخۆشی ئیمان و ئیسلامەتی فرمێسکی شادی هۆن هۆن بەچاوانیاندا هاتە خوارێ...

دکتۆر بیتا ئافرەتێکی موسڵمانی هێنا و دووکیژۆڵەی بۆ ئیسلام بەرهەمهانی کەناوی نان( فاطمة وعائشة) ...

(شیروماهوکی) مامۆستایش ئافرەتێکی موسڵمانی خواست و پاش چەند ساڵێك کوڕێك و کچێکیان بوو ، یەکەمیانی ناونا (عبدالله) و دووەمیانی ناونا (خدیجە) .

( هیروماهی) بەڕێوەبەریش بەتەمایە ئافرەتێکی موسڵمان بخوازێ ...

لەبەشی یەکەمدا باسی شێخ علی گرگاویمان کرد کە لەمیسرەوە بەپارەی خۆی گەیشتە یابان بۆ گەیاندنی بانگی خوا ، پاش دەیەها ساڵ لەو هەوڵە پیرۆز و پڕ فەڕ و بەرەکەتە ، ئەوەتا وردە وردە یابانییەکان روودەکەنە ئایینی پیرۆزی ئیسلام و ، ئەگەر

**رەفتاری ناجۆر و ناپەسەندی هەندێ بەناو موسڵمانی ناحاڵی نەبوایە ، ئێستا ئیسلام دوو ئەوەندە شوێن کەوتووی دەبوو ...**

**یابانییەکەی موسڵمان بەداخ و خەفەتێکی زۆرەوە دەڵێت ( موسڵمانینە ئێوە ستەم لەخۆتان دەکەن و ستەم لەئێمەش دەکەن بەوەی کە ئیسلامی راستمان پێ‌ناگەیەنن هەروەك چۆن خوا ناردویەتیە خوارەوە ...وەلەبەر ئەوەی بەچاکی پەیڕەوی ئیسلام ناکەن ، فرسەتتان داوە بەجوولەکە و گاور کەزیاتر ئاینەکەتان بشێوێنن و خەڵکی بتۆرێنن لەئیسلام ...ئێوە ستەم دەکەن لەو گەلانەی شارەزای ئایین نین ودەچن ئیمبراتۆر و خۆرو داروبەرد دەپەرستن لەجیاتی خوای مەزن . ئێوە چۆن ڕووتان دێ بچنەوە بەردەمی خوای پەروەردگار ، ئێمە شکاتتان لای خوا لێدەکەین ، ئەی ئەوانەی کە قورئان بەزمانتان هاتۆتە خوارەوەو تێ‌ی دەگەن ...**

**جاکەمن باش لەئیسلام شارەزابووم و موسڵمانانم ناسی و زانیم کە حکومەتەکانیان کەمتەرخەمن لەهەقی ئەم راستیانەدا ، سوپاسی خوام کرد کە لەهەق تێ‌گەیشتم هەروەك قورئان دەفەرموێ :**﴿ وقل الحمد لله سيريكم اياته فتعرفونها﴾النمل ٩٣ **وەمن دڵنیام کە ئەگەر موسڵمانان خۆیان چاك نەکەن خوای گەورە کۆمەڵێکی تر دەهێنێت کەپەیامەکەی بگەیەنن** ﴿ وان تتولوا يستبدل قوماً غيركم ثم لايكونوا امثالكم﴾محمد ٣٨ **بەراستی ئیسلام بڵاودەبێتەوە و زیاتریش سەردەکەوێت نەك لەیابان بەڵکو لەهەموو جیهاندا لەبرەودایە** ﴿ولن يجعل الله للكافرين على المؤمنين سبيلا ﴾ النساء ١٤١ -

**شایانی باسە تەنها (مرکزی اسلامی لەیابان) لەساڵی ١٤١٨ کۆچی‌دا ناوی هەشتا کەسی تۆمارکرد کە موسڵمان بوون ، وە رۆژنامەی (یابان تایمز) لە ڕێ‌ی ئینتەرنێتەوە وتارێکی بڵاوکردەوە لەژێر سەردێڕی ( دیاردەی موسڵمان بوونی ئافرەتان لەیابان) کەتیایدا باسی لەموسڵمان بوونی ژمارەیەکی زۆرکردووە لە ئافرەتانی یابان ...**

**هەروەها لەساڵی ١٩٩٣دا لەزانکۆیەکی گەورەی شاری (میباشی) یابان کۆڕێکی گەورە گیرا بۆ باسی (ئافرەت لەئیسلام)دا و کاریگەری کۆڕەکەش وای کرد کە هەر لەوێدا ئافرەتێکی یابانی موسڵمان بوونی خۆی رابگەیەنێ !**

**دیارە بەدەیەهای تریش کاریگەری بووە لەسەریان و رەنگە لەداهاتوودا رێ‌ی راست بگرنە بەر** .:. ل ١٥١-١٥٣ (المعجزة المتجددة) .

سەرۆکی (رابطة المسلمين اليابانيين) لەکۆنفرانسێکی رابیتەی عالەمی ئیسلامیدا لەمەککە رایگەیاند (٢٢) هەزار یابانی موسڵمان بوون لەدووساڵدا و یەکێ لەوانەی موسڵمانبوون سێ مەلهای شەوی هەبووە و پارەی باشی لێدەست کەوتووە ، وازی لەهەموو ئەو کارە نارەوایانە هێناوە وجێگاکانی گۆڕیون بۆ شوێنی خواناسی و بانگەوازکردن .( لماذا أسلم هؤلاء الاجانب / محمد عثمان عثمان / ل ١٧٢) (المعجزة المتجددة ) .

## ( ٢١ ) جەنراڵ اناتولی

جەنراڵ (اناتولی اندر بوفتش) لەسوپای روسیدا کاریدەکرد و یەکێبوو لە گەورە ملحیدەکان و بە شیری کۆمۆنیستی گۆشکرابوو ، رقی دنیای لەموسڵمانان بوو ، لەجەنگی ئەفغانستاندا بەشداری کرد و ژمارەیەکی زۆری لەموسڵمانان شەهیدکرد ، بەتایبەت لەبەرەی جەنگی (جلال اباد) کە دوو ساڵ تیا مایەوە ...لەپڕ گۆڕدرا و موسڵمان بوو ، وازی لەپلەو پایە و هەموو (مغريات)ێك هێنا و بوو بەبانگبێژی مزگەوتی شاری (المعطأة)...بەڵام ئەمە چۆن ڕوویدا ، رۆژنامەی (المسلمون) چاوپێکەوتنی لەگەڵدا کرد ... رۆژنامەنووسەکە واقی وڕمابوو ، لەکاتی گفتوگۆکەدا فرمێسکی پەشیمانی لەرابردوو ، دەهاتنە خوارەوە لەچاوی جەنراڵێکی خوێن رێژی دڵڕەقی سوپای رووسی ! ( سبحان الله ئیمان چۆن مرۆڤ دەگۆڕێت ) ... ئەو رۆژنامە نووسە دەڵێت :

بەیانیەکیان مەوعیدم هەبوو لەگەڵ جەنڕاڵ (اناتولی) کە موسڵمان بوو بوو وەناوی خۆی کردبوو بە(علی) ، موسڵمان بوونی شتێکی سەیر وسەمەرە بوو بۆ موسڵمانانی (قازاخستان) ، چۆن جەنڕاڵێك واز لەو هەموو دەستکەوتە دنیاییە دێنێ لەسوپای رووسیدا و دەبێت بەبانگبێژی مزگەوتێك .

کاتی نوێژ هات ، کاتێکمان زانی بەدەنگێکی خۆش (اناتولی) بانگیدا و ئەوبرادەرەی لەگەڵمدا بوو (رضى مراد) کە خۆبەخشە و لەدەزگای فریاکەوتنی ئیسلامی جیهانیدا کاردەکات خۆی پێنەگیرا و دەستی کرد بەگریان و زوو بەکامێرای ڤیدیۆکەی وێنەی گرت بۆ یادگار !

پاش نوێژ لەمزگەوت لەگەڵی دانیشتین و نوێژ خوێنانی تریش بەدەورمانا دانیشتن ، (جەنڕاڵ اناتولی) سادە وخاکی بوو ، ئیمانێکی پتەوو دامەزراوی هەبوو ، دەت ووت ئەوە چەندەها ساڵە موسڵمانە ، کەلەراستیشدا چەند هەفتەیەك بوو موسڵمان بووبوو !

وتمان ئێمە لەولآتی ( سعودیە)ەوە هاتووین ، زۆر بەخێرهاتنی کردین و وتی : هەموو ئاواتم ئەوەیە زیارەتی کەعبەی ماڵی خوابکەم و ، دەستم بگرم بەدامێنی کەعبەوە سابەڵکو خوالێم خۆش ببێ و زۆر گریا و ئێمەشی هەموو خستە گریان !

وتم : سبحان الله ئەمە ئەو جەنراڵەیە کە لەگەڵ موجاهیدانی ئەفغاندا دووساڵ جەنگاوە و چەندەهای لێ شەهید کردوون !

شێخ محمد حسین جێگری سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی ئایینی قازاخستان ، پرسیارەکانی بۆ وەرگێڕا و ، ئەویش لەوەڵامدا بەدەم گریانەوە وتی : من دەمەژێم هەرکە ئەفغانستانم بیردەکەوێتەوە ، بەڵام ئەو ئەزموونە تاڵە بردمی بەرەو ئیسلام ، لێتان ناشارمەوە من ڕقی زۆرم لەئیسلام بوو ، وەیەکێ بووم لەمولحیدە گەورەکان و! لینینیەت تاقە ڕێبازم بوو ، پاش دووساڵی بەرەی (جلال اباد) ڕێڕەوی ژیانم گۆڕدرا و ، بووم بە کەسێکیتری جیاواز لەوەی کە پێشتر دەیان ناسیم !

من ڕووسیم ، هەرچەند لەباکۆی (ازربیجان) لەدایك بووم و قۆناغی خوێندنی پێش زانکۆشم هەر لەوێ تەواوکردووە ، من مولیحد بووم تا سەر ئێسقان و زۆر توندڕەوبووم بەرامبەر ئەو موسڵمانانەی کەلەخوێندندا لەگەڵما بون و گاڵتەم ئەکرد بەوەی باسی ئایین و غەیبیاتی بکردایە ( هەرچەند دایك و باوکم مەسیحیش بوون) ، دەمووت : باشە چۆن مرۆڤ بڕوا بێنێ بەشتێك کەنیە و چۆن ئادەمیزاد دەبێت بەگڵ و دوایی زیندوو دەبێتەوە تا خوا لێی بپرسێتەوە و بیخاتە بەهەشت ، یان دۆزەخەوە ؟!

من بەدوای ڕاستیدا نەدەگەڕام ، چونکە تۆزقاڵێك گومانم لەراستی بیروڕاکەم نەبوو ، کاتێکیش چووم بۆ بەرەی جەنگی ئەفغانی ، ئامانجی من و هاوەڵانم نەهێشتنی بەرگری ئەفغان بوو ، فرسەت بوو بۆم کەڕقی خۆم بەموسڵمانان برێژم و ! بەلای منەوە موسڵمانان بەگشتی و ئەفغانیەکان بەتایبەت دواکەوتوو نەزانبوون ! لەراستیشدا ئەوەندە لەئایین تێگەیشتبووین چونکە ئێمە حەفتا ساڵ لەژێر چەپۆکی پۆڵاینی شیوعیەت دابووین .

جەنراڵ اناتولی ... حەزی نەدەکرد رابردووی بکەوێتەوەیاد و باسی بکات ، بەڵام لەبەر ئێمە ناچاربوو بەدەم خەم و خەفەت و گریانەوە بەردەوام بێت لەسەرباسی ڕۆژانی ژیانی و وتی : من داوام لەسەربازەکانم دەکرد کە زۆر دڵڕەقانە لەگەڵ موسڵماناندا بجوڵێنەوە و زۆر خراپ مامەڵەی دیلەکانیان بکەن ... ئێمە هەموو جۆرە چەکێکی خۆمانمان لەگەڵدا تاقیکردنەوە لەکاتێکدا ئەوان هیچی وایان نەبوو پیێ بجەنگن ، من دەمووت ئەوانە

(شێتن) ! ئەوان لەمردن نەئەترسان و بەبێ سڵکردنەوە دەهاتن بۆمان و گوێیان نەئەدایە ئەو هەموو ئاگری تۆپ و تەیارەیەی دەمانباران بەسەریاندا ، بۆیە سەربازانی ئێمە خۆیان نەدەگرت لەبەردەمیانا و هەڵدەهاتن !

زۆرجار بیرم ئەکردەوە ، باشە ئەوانە چۆن سەردەکەون بەسەرمانا ، لەکاتێکدا ئێمە لەهەموو شتێکدا لەوان لەپێشترین ، دەمووت : دیارە هێزێکی گەورە وا لە پشتیان و هاوکاریان دەکات ، ئالێرەوە : گومانم بۆ دروست بوو ، وە بووە سەرەتای گەڕانم بەدوای هەق و راستیدا ، داوام کرد لەسەربازەکانم کە ئەو دیلانە بهێننە بەردەمم کە رووسی دەزانن ، بۆ زانیاریشتان زۆریان رووسیان دەزانی و خۆیان فێرکردبوو ، چونکە لەگەڵ جەنگەکەدا کە بواریان بۆ بڕەخسایە سەربازەکانی ئێمەیان بانگ دەکرد بۆ ئیسلام !

هەندێکیان کە دەهاتنە لام باسی ئیمان و ئیسلامیان دەکرد و منیش چاك گوێم بۆ دەگرتن ، دوایی کەبەتەنها دەبووم بیرم دەکردەوە ، قسەکانیان خەویان لەچاوم تۆراندبوو ... تا فەرمان دەرچوو کە بگەڕێینە دواوە ، منیش گەڕامەوە (باکۆ) و گەڕام بەدوای بانگخوازێکی موسڵمان دا بۆ ئەوەی پرسیاری لێبکەم و وەڵامی پرسیارەکانم دەست بکەوێ ...سەرەنجام رێم کەوتە لای ئەم (شێخ محمد حسین) ە و ، یەکسەر تێگەیشت کە من لەقۆناغی گوماندا دەژیم و ، بەسنگێکی فراوانەوە وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دامەوە و چەندەها پەڕاویشی دامێ کە سوودی زۆرم لێوەرگرتن .

بەیانیەکیان کە هەستام لەخەو ، هەستم کرد گەیشتومە ئەو یەقینەی کەبە دوایدا دەگەڕام ، ئەو یەقینەی کەساڵەهای ساڵی تەمەنم لێم ون بووبوو !

ئەوەی پێی گەیشتم لەهەق و راستی بەهاوەڵانم وت : ئەوانیش ئامۆژگاریان کردم کە وازبهێنم و کاری وانەکەم ، بەڵام من گوێم بۆ نەگرتن و بڕیارمدا لەم دنیایەدا لەخوا نەبێ لەکەسیتر نەترسم...

ئنجا بەخێرایی چووم بۆ لای (شێخ محمد حسین) وپێم راگەیاند کە ئەمەوێ موسڵمان ببم ،ئەو لەخۆشیا بە دەنگی بەرز (الله اكبر) ی وت و ئامادەبوانیش لەخۆشیا گریان !

بەڵێ ... موسڵمان بووم و بۆ یەکەمجار لەژیانما هەستم بەدڵنیایی و ئاسایش و قیمەتی ژیان کردو ، تێگەیشتم مانای ئەوەی کە خوا دەتبینێ ، هەرچەند تۆ ئەویش نەبینی ... لەسەرەتاوە واقیان ورمابوو لەموسڵمان بوونم و چون بۆ مزگەوتم و بانگدانم رۆژی پێنج جار . ژنەکەم وتی : چۆن تۆ دەست لەو هەموو پلەوپایە و دەسەڵاتە

هەڵدەگریت و رووبەکەیتە مزگەوت ؟! ناهەقی نەبوو چونکە ئەویش لە گوماندا دەژیا ... من بڕیارمدا کە بانگخوازێکی لەسەرخۆ و نەرم و نیان بم لەگەڵیان و زۆر پاڕامەوە لەخوا کە هیدایەتیان بدات ، سوپاس بۆ خوا زۆری نەخایاند هاوسەرەکەم و کوڕەکەم و کچەکەم هەموویان موسڵمان بوون ...( ل ٢٨٢ المعجزة المتجددة) .

شایانی باسە لەساڵی ١٩٩٢ دا لەشاری (المعاطــأة) دەستکرا بەدروستکردنی مزگەوتێك لەسەر پارچە زەوی‌یەك کەڕووبەرەکەی حەوت هەزار مەتر دووجا بوو ، پاش(٥) ساڵ تەواو بوو ، وە بەرزی منارەکەی چل وپێنج مەترە و لەگەڵ مزگەوتەکەدا بینای کۆلێژی دیراساتی ئیسلامی و هۆڵی وتاردانو شوێنی نوێژی ئافرەتانی هەیە ...کە ئەمەش بەڵگەی هەڵسانەوەی موسڵمانانی (قازاخستان)ە پاش حەفتا ساڵ لەزوڵم و ستەمی شیوعیەت ، زوڵم و ستەمێك کە کەسیان بیری جەژنی قوربان و رەمەزانیان نەمابوو ، وە تەنها خەڵکی سەری ساڵی زاینی‌یان بەجەژن دەزانی و ئاهەنگیان تیا دەگێڕا .

بەڵێ لەساڵی ١٩٩٠ ەوە تا ساڵی ١٩٩٥ ژمارەی مزگەوتەکانی (قازاخستان) لە(٦٧) ەوە بوو بە پێنج هەزار مزگەوت !!

ئەمە بێجگە لە نووسینی تەفسیری قورئان بەزمانی قازانی و دەرکردنی یەکەم گۆڤاری ئیسلامی لەوناوچەیەدا ... ل ٣٤٠ هەمان سەرچاوە .

بەڵێ رووسیای رووسیا هەرچی خراپ بوو کردی بەرامبەر ئەفغانی هەژار و کەم دەست ، راستە سەرەنجام شکان ، بەڵام وەك سەرکردەیەکی ئەفغانی دەڵێ : ( ئەگەر ئێمە سەد ساڵ شەڕیان لەگەڵ بکەین ناتوانین بەشێکی زۆرکەم لە هەقی خۆمانیان لێبکەینەوە ، بۆیە ئەیاندەینە دەست خوا و حەواڵە بەوخوایە بن کە هەرگیز خەوو خەوەنوچکە دایناگرێ و لەدروستکراوەکانی غافڵ نابێ ) .

جا خوای گەورە هەرزوو تۆڵەی لێ سەندن ، ئەوە رووداوی تەقینەوەی (مفاعل نووی تشرنوبل) کەلەچەند چرکەیەکدا نزیکەی سەد و بیست هەزار کەسی لێ کوشتن و زیانیشی بەردەوامە و دەڵێن : ئەوناوچانەی کە کاریگەری تەقینەوە ئەتۆمی‌یەکەی گەیشتویەتێ تا چل ساڵی تر دەنکێ گەنمی لێ سەوز نابێت !

هەروەها لەو کاتەی کە گەورە سەکردە و سوپای رووسیا ئاهەنگیان دەگێڕا بەبۆنەی کشانەوەیان لەئەفغانستان ، تووشی بوومەلەرزەیەك بوون ، لەماوەیەکی کورتدا نزیکەی

سەد هەزار کەسی لێ کوشتن ، (الله اکبر) بەراستی ﴿ ان ربك لبالمرصاد﴾ الفجر : ١٤ ﴿ ولاتحسبن الله غافلاً عما يعمل الظالمون ﴾ ابراهيم : ٤٢ خوای گەورە ئەفغانی ستەملێکراوی سەرخست بەسەر ستەمکاراندا ، بەڵام بەداخەوە نەیانتوانی سەرکەوتنەکە بپارێزن ، بەهۆی تەفرەقە و عەقڵیەتی عەشایەریانەوە لەلایەك و بەهۆی پیلانی دوژمنانی دەرەوە لەلایەکی‌ترەوە ، دیارە دوژمنانی ئیسلام نەیانهێشت ئەو هەوڵ و خەباتە بێتەبەر بەچاکی و هەر زوو لەباریان برد ، کە هیوا وایە ئەگەر ئەم نەوەیەیان هیچی وای پێنەکرێ ، نەوەی داهاتوویان سوود لەهەڵەکانی ئەزموونی رابردوویان وەرگرن و وڵاتەکەیان بەرەو خێر و خۆشی و ئارامی ببەن . ل ٢٨٤ هەمان سەرچاوە.

## ( ٢٢ ) پزیشکێکی ئەڵمانی

( احمد عبدالرحمن الصويان) دەڵێت : لەسەردانێکدا بۆ بنکەی ئیسلامی لەئەڵمانیا ئافرەتێکی ئەڵمانی داپۆشراوم بینی ، سوپاسی خوام کرد کە موسڵمان بووە و ، لەگەڵ مێردەکەی‌دا کەوتمە گفت و گۆ لەبارەی چیرۆکی موسڵمان بوونی هاوسەرەکەیەوە و ، بەرێزی وتی : هاوسەرەکەم ئەڵمانی‌یە و پزیشکی پسپۆڕە لەنەخۆشی‌یەکانی ژنان و منداڵ بووندا و ، لێکۆڵینەوەی زۆری هەیە لەسەر ئەو نەخۆشیە زایەندیانەی کە تووشی ئافرەتان دەبێت .. زۆر لەو نەخۆشانەی کە دەهاتنە لای حاڵەتەکانیانی تۆماردەکردن و بۆ چاکترکردنی لێکۆڵینەوەکەی پزیشکێکی هاوڕێی پێی وت کە بچێت بۆ وڵاتێکی تر و لەوێش چاوی بەکۆمەڵێك نەخۆشی‌تر بکەوێت ، ئەمیش چوو بۆ (نەرویج) و سێ‌مانگ لەوێ‌مایەوە ، سەیری کرد جیاوازی‌یەکی ئەوتۆی نیە لەگەڵ (ئەڵمانیا) دا ، بۆیە بڕیاری‌دا بۆ ساڵێك لەوڵاتی (سعودیه) کاربکات ، کاتێك هات بۆ کارکردن لەم وڵاتە ، لەدڵەوە بەسووك تەماشای ئافرەتانی داپۆشراوی دەکرد و ، دەیووت چۆن دەبێت ئاوا لەخۆیان بکەن و ئازادیان نەبێت ... لەم وڵاتەدا ناچاربوو وەك جاران جل و بەرگی تەسك و کورت لەبەرنەکات و تۆزێ لەهەواو ئارەزووی خۆ دەرخستنی کەم بکاتەوە لەبەر دەستکەوتنی زانیاری چاك بۆ تەواوکردنی باسەکەی !

چوارمانگ لەعیادەدا ئیشی کرد و ژمارەیەکی زۆر ئافرەتی سعودی هاتنە بەردەستی ، بەڵام سەیر لەوەدا بوو نەخۆشی زایەندی ئەوەندە تیا نەبوو کە شایانی باس بێت !

پاش ئەو هەوڵە زۆرە و دەست نەکەوتنی هیچ ئەنجامێك زۆر تووڕە بوو ، یەکێك لەسستەرەکانی بەردەستی پرسیاری هۆی تووڕە بوونەکەی لێ‌کرد و ، ئەویش وتی : من

هاتمە ئەم ولاّتە بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر نەخۆشیە زایەندی‌یەکانی ژنان و ، ئەوا ساڵێکە هیچم دەست نەکەوتووە ، سستەرەکەش وتی : ئەوەی کەدەبینی نەخۆشی زایەندی لای ئێمە وەکو لای ئێوە نیە هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ڕەوشت و خووی ئیسلامی و نەبوونی تێکەلاّوی بی‌مانای پیاوان و ئافرەتان ، کە ئەوەش ئەگەڕێتەوە بۆ پاراستنی عەورات کە فەرمانی قورئانە ودەفەرموێ ﴿والحافظين فروجهم والحافظات﴾ الاحزاب ٣٥

ئەم ئایەتە هەست و هۆشی هەژاند و ڕاستییەکی خستە بەردەم کە لێی بی‌ئاگابوو ، ئەمەش بووە سەرەتایەك و خاڵی وەرچەرخان و تێگەیشتن لەئیسلامی ڕاستەقینە و ، کەوتە لێکۆڵینەوەی قورئان و سوننەت و سەرەنجام موسڵمان بوو ، وەزانی کە خۆداپۆشینیش فەرمانی خوای گەورەیە ، بۆیە خۆی داپۆشی ...

بەراستی ڕەوشت و خووی بەرز و داوێن پاکی گەورەترین هۆکارن بۆ پارێزگاری کردن و شیرازە نەبچڕانی کۆمەڵگا و ، تەنها ڕێگەش بۆ گەیشتن پیێ دەست گرتنە بەبەرنامەی خواوە ، وە ئەو ڕۆژەش کۆمەڵگاکانی ئێمە نەگبەتیان بوو ، کە خوو ڕەوشت و داوێن پاکی هەرەسی هێنا و ئافرەتان بوون بە بووکە شووشە و یاری بەدەست چاوپیس و دڵ پیسەکانەوە !

ئەوەی کە ئێمە زۆر لێی دەترسین ئەوەیە کە کۆمەڵگای موسڵمانانیش بەرەو ئەو چارەنووسەی ڕۆژئاوا بچێ بەهۆی هەوڵ کۆششی‌ئارەزووپەرستانەوە ، کە حەز دەکەن فاحیشە و بەد ڕەوشتی لەناو موسڵماناندا بلاّوبکەنەوە ، قورئان دەفەرموێ ﴿ ان الذين يحبون أن تشيع الفاحشة في الذين امنوا لهم عذاب اليم في الدنيا والاخرة ﴾ النور : ١٩ واتە : بەراستی ئەوانەی کە حەزدەکەن فاحیشە بلاّوبکەنەوە لەناو موسڵماناندا ، سزای بەسوێیان بۆ هەیە لەدنیا و لەئاخیرەتدا . ( لەئینتەرنێت)ەوە وەرگیراوە .

## ( ٢٣ ) ئافرەتێکی ڕووسی

قاچاخچیەکی ڕووسی کۆمەڵێ ئافرەت بەناوی شت کرینەوە دێنێت بۆ ولاّتێکی خلیج و گوایە هەریەکەیان ئامێرێکی کارەبایی‌یان بۆ دەکڕێت و بەناوی ئەوەی بۆ بەکارهێنانی شخصیە لەگەڕانەوەدا گومرگیان لێ‌ناسێنرێ و پارەیەکی باش قازانج دەکا و شتێکیش قازانج بەر هەریەکە لەوئافرەتانە دەکەوێت ..

کە ئافرەتەکان دەگەنە خلیج ، تێدەگەن کە قاچاخچی‌یەکە فێڵی لێکردون و بۆکاری بەدرەوشتی هێناونی ، هەموویان ناچار رازی دەبن لەبەر هەژاری و بی‌چارەیی ، تەنها

ئافرەتێکیان نەبێت ، کەفرسەت دەهێنێ وپەساپۆرتەکەی لەقاچاخچیەکە دەفڕێنێ و ڕادەکات ، قاچاخچیەکەش بانگی لێدەکات و دەڵێت : تۆ نەزمان دەزانی و نەپارەشت پێیە و نەکەس دەناسیت ، هەرپەشیمان دەبیتەوە و دێیتەوە !

ئافرەتەکە لەسەر شەقامەکان دێت و دەچێت ، ژنێك و کچ و کوڕێك دەبینێت ، (کەلەبنەڕەتدا فەلەستینی بوون و ، لەولاتی خلیج دەژیان) بەرووسی قسەیان لەگەڵ دەکات، تێی ناگەن ، ئیتر بەزمانی ئینگلیزی باسی حاڵی خۆی دەکات و ئەوانیش لێی حاڵی دەبن...لەسەرەتادا ئەمانیش دوودڵ دەبن ، کێ دەڵێ درۆناکات و شتێك لەژێر سەریانیە ...بەهەرحاڵ ڕازی دەبن و لەگەڵ خۆیانا دەیبەنەوە ماڵەوە ، هەرچەندە دەیەوێت پەیوەندی بەکەس و کاریەوە بکات ، لەوەدەچێت تەلەفۆناتیان تەواو نەبێ و بۆی وەرناگیرێ !

کوڕی ئەو خێزانە کەناوی خالید بوو باسی ڕووداوەکان دەکات و دەڵێت :

خوشکەکانم زۆر بەڕێزەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد و وردە وردە باسی ئیسلامیان بۆ دەکرد ، ئەویش دەیویست باشتر قەناعەتی بۆ دروست ببێوپرسیاری دەکرد ...

منیش چەند پەڕاوێکی ئیسلامیم بۆ پەیداکرد کە بەزمانی رووسی بوون و سەرەنجام موسڵمان بوو ، وە پۆشاکی ئیسلامی پۆشی...خوشکەکانیشم لەگەڵ خۆیاندا ئەیانبرد بۆ وانەی فێربوونی قورئان و ڕۆژ بەرۆژ بەرەوپێشتر دەچوو...ئنجا لەبەرئەوەی لەسەر ژن هێنان بووم لەگەڵ خوشکەکانم و دایکمدا رامان هاتە سەر ئەوەی کەداوای بکەم و بیخوازم لەسەر شەرعی خوا ، ئەویش رازی بوو ، بەو جۆرە بووە هاوسەرم ...

ئنجا کێشەی تەواوبوونی پەساپۆرتەکەی و تازەکردنەوەی هاتەکایەوە و ،ناچاربووین کەبچین بۆ رووسیا بۆ تازەکردنەوەی ، لەفڕۆکەخانە دوو جێگامان (حجز) کرد و خێزانەکەم بەجل و بەرگی سەرتاپای ئیسلامیەوە هات لەگەڵمدا ، دیارە ئەم جل و بەرگە لەهێلی ئاسمانی رووسیدا شتێکی سەیر بوو !

بەهەرحاڵ چووینە ئەو شارەی کە پەساپۆرتەکەی لێدەرچووبوو ، داوای وێنەیان کرد بەسەر و قژی رووتەوە ، ئەویش وێنەیەکی دانێ کەبەسەرپۆشەوە بوو ، چی هەوڵیان لەگەڵدا رازی نەبوو وێنەیەك بگرێ کەسەر و قژی رووت بێت .

ئەوانیش لەرقا کارەکەیان بۆ نەکردین و ناردیانین بۆ(مۆسکۆ) ، من بەڕاستی نەرم بووم و وتم : خوادەفەرموێ ﴿ فاتقوا الله ما استطعتم ﴾ ﴿ لایکلف الله نفسا الا وسعها ﴾ ،

کەچی بەو روخسەت وەرگرتنە رازی نەبوو ، وتی : من تەحەددایان دەکەم و ئەبێ هەر وێنەی کاتی داپۆشراویم بکەن بەپەساپۆرتەکەوە و چی دەبێ بابێ ...

پاشان چووینە مۆسکۆ و لەوێش ئەو بەرپێوەبەرەی چووینە لای تووڕەبوو ، وە پەساپۆرتەکەی لێ سەندین و کردیانینە دەرەوە !

ئەوشەوە چووینە ئوتێل و زۆربەی شەو شەونوێژی کرد و لەخواپاڕایەوە کارەکەی بۆ ئاسان بکات ، کەبەیانی چووینەوە یەکێ لەفەرمانبەرەکان ناوی خێزانەکەمی خوێندەوە و پەساپۆرتەکەی بەتەواوبوویی دایەوە دەستی ، خێزانەکەشم پێی وتم : نەمووت ﴿ومن یتق الله یجعل له مخرجا﴾ الطلاق : ...بەراستی وانەیەکی زۆر گەورەی لەدینداری‌دا فێرکردم ، کە هەرگیز ئاوا بەچاکی تیێ نەگەیشتبووم !

ئنجا ناچار بووین بچینەوە بۆ شارەکەی خۆی ، تامۆرێکی بۆ لێ بدەن ، کە گەڕاینەوە چووینە ئوتێل و پاش ئەوەی کارمان تەواو بوو ، وتی : باسەرێکی ماڵی باوکم بدەین ، منیش لەگەڵیا چووم بۆ ماڵی باوکی کەلەگەڕەکێکی هەژاردابوون ...

لەدەرگای دا و برایەکی دەرگاکەی کردەوە ، هەرواقی وڕما خوشکەکەی بینی بەو جلانەوە ، هەرچۆنێ بوو چوینە ژوورەوە و من دانیشتم و ئەو لەژوورێکی تر کەوتە قسە لەگەڵ باوکی و سێبرایدا و پیێ وتن کەئاوام بەسەرهاتووە و دوایی ئەوماڵە فریام کەوتوون و موسڵمان بووم و شووم کردووە و ئەوەش مێردەکەمە ، وردە وردە دەنگیان بەرزبۆوە و بوو بەهەراو فەرتەنە و بەهەموویان کەوتنە لێدانی ، ئنجا هاتن بۆ من و بەهەر چوار پیاوەکە هەرچی گیانم هەبوو بەشەق و مستەکۆڵە شکاندیان و کردیانمە دەرەوە ، منیش ناچار گەڕامەوە ئوتێلەکە و هەر دڵم لای هاوسەرەکەشم بوو، دەمووت : رەنگە ئێستا ئەو بەستەزمانەیان کوشتبێ !

ئنجا خەیاڵاتی سەیرم بۆ دەهات و دەمووت ئەگەر نەشیان کوشتبێ لەژێر فەللاقە و لێداندا پەشیمان بۆتەوە و ئیتر نایبینمەوە !

ناچار هەموو رۆژێ دووراو دوور بەدزی‌یەوە چاودێری ماڵیانم دەکرد بزانم چی هەیە ؟ رۆژی چوارەم پاش ئەوەی باوك براکانی چوون بۆ سەر ئیش ، دەرگاکە کرایەوە و خێراچووم بۆلای و، بینیم هەموو سەروچاوی شکاوە و جل و بەرگی هەموو دڕاوە و دەست و قاچیشتی بەستراوە ، بەهەرحاڵ تیێ‌گەیاندم کەلەسەر عەهد و پەیمانەکەی خۆیەتی و سوورە لەسەر ئیسلامەتی‌یەکەی و ، و تی : ئەوەی کە تووشی من بووە یەك

لەسەر هەزاری ئەوەنیە کە تووشی پێغەمبەران و هاوەڵان و موسڵمانان بووە ، بڕۆرەوە لەئوتێلەکە چاوەڕێبکە خوا کەریمە و ! دوعا و شەونوێژت بیر نەچێ !

منیش گەڕامەوە بەو هەموو خەم و خەفەتەوە چرکەکانم ئەژمارد ! پاش سێ ڕۆژ کەنەشەوم شەوبوو ، نە ڕۆژم ڕۆژ بوو ، هەر شەوو ڕۆژەی ئەتووت ساڵێکە ... لەدەرگا درا ، بەترس و لەرزەوە کەنەوەك کەسوکاری بن و هاتبنە سەرم ، دەرگاکەم کردەوە ، سەیردەکەم هاوسەرەکەمە رای کردووە ، خێرا جلی ترمان پێبوو لەبەری کرد و وتم : بابچین بۆ فرۆکەخانە ، وتی : نا دەچین بۆ شارێکی تر و لەفرۆکەخانەیەکی نێودەوڵەتیەوەدەگەڕێینەوە ، چونکە ئەگەر لێرەبین باوکم و براکانم دێن و دەمان دۆزنەوە و گیردەخۆین ..

پاشان لەفرۆکەخانەی شارێکیترەوە گەڕاینەوە و رزگارمان بوو ، لەرێگا لێم پرسی چۆن دەرباز بوویت ؟ وتی : پاش ئەوەی هەموو ڕۆژێ چینێکی باش دارکاریان دەکردم و دەست و قاچیان دەبەستمەوە ، خوشکێکی پانزە ساڵم هەیە دەهات بەلامەوە و ئاووخواردنی دەدامێ هەتا دەهاتمەوە هۆش خۆم و منیش باسی ئیسلامم بۆ دەکرد و کەزانی لەسەر هەقم بڕیاری‌دا کە هاوکاریم بکات ، ئەو ڕۆژەی کە رزگارم بوو ، هەروەك عادەتی خۆیان ، براکانم و باوکم مێزیان رازاندەوە و کەوتنە خواردنەوە و خوشکەکەشم زیاتری دەرخواردان هەتا تەواو سەرخۆش بوون و ئاگایان لەخۆیان نەما ، ئەویش کلیلەکەی لێفڕاندن و دەست و پێی منی کردەوە و بەپەلە خۆم دەربازکرد ، وە من داوام لێکرد کە ئەگەر موسڵمان بوو جارێ خۆی ئاشکرا نەکات تا خوا دەروویەکی لێدەکاتەوە و چارەسەرێکی بۆ دەدۆزینەوە !

(ئەم باسە شێخ (ابراهیم الفارس) لەشریتی ( قصص مؤثرة) دا باسی کردووە کە ئەویش لە مێردی ئافرەتەکەوە وەری گرتووە )...تۆڕی ئەنتەرنێت .

## ( ٢٤ ) گاری ملیر

دکتۆر گاری ملیری کەنەدی مامۆستای زانکۆی مەلیك فەهدی نەوتە لەسعودیە و زۆر حەزی بەزانستی (ریاضیات) ە و زانیاری‌یەکی تەواویشی هەیە لەبارەی پەراوە پیرۆزەکانەوە و یەکێکە لەمژدەدەرە وریا و چالاکەکان ...ڕۆژێك ویستی قورئان بخوێنێ و لێی بکۆڵێتەوە ، تاوەکو کەم و کورتی و ناتەواویەکانی ئاشکرا بکات و دڵی موسڵمانانی پێ ساردبکاتەوە ...وای دەزانی کەپەڕاوێکی کۆنی پێش چواردە سەدە باسی بیابان و

ئەوزەمانە دەكات ، كەچی سەرسام بوو لەوەی كە ئەوشتانەی لەم پەڕاوەدایە لەهیچ پەڕاوێكی تردا نیە لەجیهاندا .

وای دەزانی ئێستا باسی ئەو رووداوە ناخۆشانەی تیایە كەبەسەر (محمد)دا هاتووە وەك مردنی خەدیجەی خێزانی و مردنی منداڵەكانی ، كەچی هەرچی گەڕاو لاپەڕەكانی پشكنی شتی وای نەبینی ...

ئەوەی كەزیاتر سەرسامی كرد ، ئەوەبوو كەبینی سورەتێكی تەواو بەناوی (مریم)ەوە ناونراوە كەهاوشێوەی نیە لەتەورات و ئینجیلدا ...لەكاتێكدا سوورەتێك نیە بەناوی (عائشه) یان(فاطمه)ەوە ...

هەروەها دیقەتی دا كە(٢٥) جار ناوی حەزرەتی عیسا هاتووە سەلامی خوای لێبێ ، وە تەنها (٥)جار ناوی حەزرەت ﷺ خۆی هاتووە...

ئنجا زۆر زیاتر سەرسام بوو بەئایەتی ژمارە(٨٢) ی سورەتی (النساء)كە دەفەرموێ: ﴿ أفلا يتدبرون القران ولوكان من عند غير الله لوجدوا فيه اختلافاً كثيراً﴾ ئەم ئایەتە بەتەواوی وای لێكرد بەچاكی بگەڕێ بەقورئاندا سا بەڵكو كەم و كورتی و ناتەواویەكی تیا بدۆزێتەوە !

د.ملیر دەڵێ : هیچ نووسەرێك نیە لەدنیادا بتوانێ زاتی ئەوەبكات ، بڵێ نووسراوەكەم بگەڕێن هیچ هەڵەیەكی تیانیە !... دیارە ئەم قسەیە لەمرۆڤەوە نیە و فەرموودەی پیرۆزی خوایە !

هەروەها د.ملیر وەستا لەبەردەم ئایەتی : ﴿أولم ير الذين كفروا أن السموات والارض كانتا رتقاً ففتقناهما وجعلنا من الماء كل شيء حي أفلا يؤمنون ﴾ الانبياء : ٣٠

و وتی : ئەم ئایەتە دەقاودەق باسی ئەوتەقینەوە گەورەیە دەكات كە ئاسمانەكان و زەوی و ئەستێرەكانی لێوە دروست بوون ... كە وشەی (رتق) باسی بەیەكەوە بوون دەكات و (فتق) یش باسی لەیەك جیابوونەوە دەكات و هەروەها باس لە دروست بوونیهەموو زیندەوەرانیش دەكات لەئاو ، ئەمە بە هیچ جۆرێك لای كەس نەزانرابوو، هەتا لەم ساڵانەی دواییدا ئەو زانایەی وەك بیردۆزێك ئەمەی دۆزیەوە ، خەڵاتی نۆبڵیان دایە لەساڵی ١٩٧٣دا ... بەراستی كەسێكی نەخوێندەواری پێش هەزار و چوارسەد ساڵ لەمەوبەر ناتوانێ خۆی لەقەرەی دەنگ و باس و مەسەلەی ئاوا گرنگ بدات .

بەڵێ ...دکتۆر ملیر لەساڵی(١٩٧٧) دا موسڵمان بوو ، کەوتە هەوڵ و کۆشش و وتاردان لەبارەی راستیەکانی ئیسلامەوە .

جارێك لەوتارێکیدا رووبەڕووی موسڵمانان وتی : ( ئەی موسڵمانان ئەگەر فەزڵی ئەوەی لاتانە بتانزانیایە لەچاو ئەوەی لای خەڵکیترە ، ئەوا سوجدەی شوکرتان دەبرد بۆ خوا کەلەدایك و باوکێکی موسڵمان دروستی کردوون و لەکەش و هەوایەکی موسڵمانەتیدا گەورەبوون ) .

( هەروەها ئەگەر سەیری مانای خوایەتی و پەیام و پێغەمبەرایەتی و زیندوو بوونەوە و لێپرسینەوە و بەهەشت و دۆزەخ بکەن لەلای خۆتان و بەراوردی بکەن لەگەڵ ئەو مانا وشێوازانەی کەلەلای خەڵکیتر هەن ، ئەوە سوجدەی موسڵمانانە وتەسلیم بوون دەبەن بۆ خوا ، چونکە ئەو مانا و مەبەستانە لای خەڵکانیتر دەستکاری کراون و عەقڵ و فیترەتی ساغ قبوڵیان ناکات ) ...

دکتۆر ملیر چەند پەڕاوێکی نووسیوە لەوانە( جیاوازی لەنێوان قورئان و کتاب المقدس دا) وە ( القران المذهل) و(نظرة اسلامية لأساليب المبشرين)وە زۆر نووسراوی تر کە بەزمانی ئینگلیزین و لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت دەست دەکەون ...

دکتۆر ملیر خەڵکانێکی زۆر لەسەر دەستیا موسڵمان بوون و ئەزموونی چاکی هەیە لەبانگەوازدا ... وە زۆر لەبانگخوازان سوودیان لەو زانیاری و ئەزموونانەی بینیوە و بانگکراوە لە زۆر شوێن بۆ وتاردان ، بۆ نموونە شێخ (احمد دیدات) بانگی کرد بۆ ئەفریقیای خواروو ، وەلەوێ زۆر باس و خواسی ئیمانی چاکی پێشکەش بەموسڵمانان کرد . ئەمەش ناونیشانێتی بۆ کەسێك کەبیەوێ پەیوەندی پێوە بکات ( http:www.kfupm.edu./math/45.ktm )

شایانی باسە یەکێك لەو زانا ناودارانەی کە رۆڵێکی گرنگیان بینی لەدانوستان دا لەگەڵ ئەهلی کیتابدا لەم سەدەی بیستەمەدا ، شێخ ئەحمەد دیدات بوو لە ئەفریقیای خواروو ، وەتوانی زۆری ئەو دەستکارییانە بخاتە ڕوو کەلەتەورات و ئینجیلدا هەن و کەسانێکی زۆری ئەو دووئاینە بەرەو ئیسلام هاتن بەوپەڕی قەناعەتەوە ، تەنانەت شێخ دیدات داوای گفت و گۆو دانوستانی کرد لەگەڵ پاپای فاتیکان دا ، بۆ ئەوەی کەبەڵگەبێ بەسەریەوە و ، بەئاشکرا داوای لێکرد کە موسڵمان ببێ ، بەلام (پاپا) وەلامی ئەم داوایەی نەدایەوە و قایل نەبوو بە گفتو گۆ و دانوستان... ل ٢٠٦ المعجزة المتجددة .

## ( ٢٥ ) عبدالصبور

شێخ محمد حسان لەوتاری (الاسلام قادم) دا دەڵێت :

لەم چەند ساڵەی رابردوودا کە چووم بۆ ئەمەریکا ، چاوم کەوت بە ئەفسەرێکی ئەمریکی کەناوی (مایکل) بوو ، پاش موسڵمان بوونی ناوی (عبدالصبور)ی لەخۆی نابوو و، کۆمەڵەیەکی ئیسلامی دامەزراند بوو ، لەبارەی موسڵمان بوونیەوە پرسیارم لێکرد ئەویش لەوەڵامدا وتی : من لەگەڵ ئەوەدا کە ئەفسەربووم ، پلەیەکی گەورەی ئاینیشم هەبوو ، وە خەریکی قەشەیەتی و رێنمایی کردن بووم ... من قورئان و وەرگێڕانەکەیم خوێندەوە و دیراسەی فەرموودەکانی (بوخاری و موسلیم) م کرد ،برادەرێکم پێش من موسڵمان بوو ، چووم بەدوای‌دا لەمزگەوت دۆزیمەوە ، کاتی بانگ بوو ، لێتان ناشارمەوە لەناخەوە هەژاندمی ، بەجۆرێك کەناتوانم دەری ببڕم و باسی بکەم ... موسڵمانانم بینی نوێژدەکەن ، زۆرکاریگەری هەبوو لەسەرم ...پرسیارم کرد چۆن موسڵمان ببم ، وتیان : خۆت بشۆ و شایەتمان بهێنە ...منیش ئەوەی پێویست بوو کردم و بەو جۆرە هاتمە ریزی موسڵمانانەوە ..

بەراستی ئیسلام زۆر بەخێرایی لەئەمەریکادا بڵاودەبێتەوە ، لەکۆی پەنجا و چوار هەزار ئەفسەری پیاوو ژنی ئەمریکی تا ئێستا لەسایەی خواوە ، نزیکەی سیانزەهەزاریان موسڵمان بوون و (تەنها لەو سەرباز و ئەفسەرانەش ، کەلەجەنگی کەنداودا بەشداریان کرد نزیکەی حەوت هەزار موسڵمان بوون ( المعجزة المتجددة )

رۆژێك ئەفسەرێکی ئافرەت موسڵمان بوو، بەخۆداپۆشراوی هاتە سەرکارەکەی ، بەرێوەبەرەکەی پی‌ی وت : برۆ بەرگەکەت بگۆڕە ولەچکەکەت لابە ، ئەویش وتی : ئەم لەچك وجلە فەرمانی خوایە و هیچ دەسەڵاتێك نیە بتوانێ رێم لێ بگرێت !

عبدالصبور وتی :من سێ نامەم هەیە بەتۆدا دەینێرم ، یەکەم بۆ ئەمریکیەکان کە دەڵێم : ئێمەی موسڵمان ئیمانمان بەحەزرەتی عیسا هەیە ، هەروەك چۆن ئیمانمان هەیە بەحەزرەتی (محمد) ﷺ .

نامەی دووەمیشم بۆ موسڵمانەکانی ئەمریکایە و دەڵێم : ئارام بگرن و پەلەمەکەن هیچ کارێك بەبێ ئارامگرتن ناگاتە ئەنجام و ، خەمبار مەبن لەهەڵە و کەموکوڕی لەکاتێکدا کە سوورنین لەسەری و تەوبە دەکەن .

نامەی سێیەمیشم بۆ موسڵمانان بەگشتی و میسریەکانە بەتایبەتی کە پێیان دەڵێم : هەرچەندە هەزارەها میل لێتانەوە دوورین ، بەڕاستی ئێمە خۆشمان دەوێن لەبەر خواو بەبرای خۆمانتان دەزانین ...

## پاشە رۆژ بۆ ئیسلامە

لەفەرەنسادا ژمارەی موسڵمانان لەم چەند ساڵەی رابردوودا گەیشتە نزیکەی پێنج ملیۆن کەس و لەبەریتانیاشدا گەیشتە نزیکەی دووملیۆن کەس و ساڵی نزیکەی دووهەزار کەس لەوانەی کەبەئەسڵ بەریتانین موسڵمان دەبن ، هەروەها لەئەمەریکاش دا نزیکەی ١٣ ملیۆن موسڵمان هەیە و نزیکەی دوو هەزار مزگەوت و مەرکەز لەئەمەریکا بەگشتی و (١٧٥) مەرکەز ومزگەوتیش لەنیویورك هەیە بەتایبەتی .

د.عادل الشویخ لەوتاری (المبشرات) دا جەخت دەکاتە سەرئەوەیئەگەر موسڵمانان بانگەوازیش نەکەن لەداهاتوودا دەبن بەزۆرینە لە رۆژئاوادا ، ئەمیش بەهۆی ئەوەی کە ئەوروپییەکان منداڵیان ناوێت ، یان زۆر بەکەمی دەیانەوێت ، موسڵمانانیش ژمارەیەکی زیاتر لەوان منداڵیان دەبێت و بەو جۆرەش رێژەیان زیاد دەکات ...

### ئامارەکان دەڵێن

پرۆفیسۆر یوسف ای کالیفانو لەزانکۆی کۆلۆمبیا دەڵێت ( ئەمریکا ئەمرۆ دەناڵێنێ بەدەست نەخۆشییە کۆمەڵایەتیەکانەوە ، وەك تاوان و توند و تیژی و هەژاری و گوێنەدان بەمناڵ و ، بڵاوبوونەوەی ئایدز و نەخۆشییە زایەندیەکان ) .هەروەها دەڵێت :- * ١٢ ملیۆن ئەمریکی ماددەی (مخدر) ی یاساغ بەکاردەهێنن وەك (مارگوانا) کە زۆر بەکاردێت .

* ساڵی نزیکەی سەد هەزار کەس بەهۆی (کحول)ەوە گیان لەدەست دەدەن وە لە(٤٠٪) ی ڕووداوە دڵتەزێنەکانی هات و چۆ بەهۆی ئەم ماددەیەوەیە .

* لەساڵی ١٩٩٣ دا ئابووری ئەمریکا (٥٠) ملیار دۆلاری بەهۆی ماددە بێهۆشکەرەکانەوە زیان لێکەوت .وە لەساڵی (١٩٩٥)دا (١٥٠) ملیار دۆلار زیانیان لێکەوت بەگشتی کۆی بەهەدەردانی پارەی ئەمریکی بۆ نەهێشتن و چارەسەرکردنی کێشەی (مخدرات) و (عەرەق) لەم ساڵانەی دواییدا گەیشتۆتە (٢٧٦) ملیار دۆلاری ئەمریکی . کە ئەوەش نیوەی زیاتری بڕی ئەو بوودجەیەیە کە بۆ بواری تەندروستی دابین دەکرێت .

* بڕی ئەو پارەیەی کە بۆ چارەسەری کێشەی نەخۆشییە دەروونییەکان خەرج کرا لەساڵی (١٩٩٠) دا گەیشتە (١٤٧) ملیار دۆلار کە نزیکەی (٤٧) ملیاری بۆ مەسەلەی دوو دڵی و دڵەڕاوکێ بوو . وە لەسەدا سیویەکی ئەو پارەیەش بۆ چارەسەری (شیزۆفرینیا) بوو ... ژمارەی ئەوانەی لەساڵێکدا بەدەست خەمۆکییەوە گیردەخۆن نزیکەی (١١) ملیۆن ئەمریکییە ، کە نزیکەی (٤٤) ملیار دەکەوێت چارەسەرە و بنەبڕکردنەکەی لەسەر خەزێنەی وڵات .

* هەموو هەژدە خولەکێك هەوڵێکی خۆ کوشتن دەبێت و نزیکەی (٣٠) هەزاریان دەمرن و دووسەد هەزاریشیان هەوڵەکەیان پووچەڵ دەکرێتەوە و چارەسەردەکرێن و فریایان دەکەون!

*ڕۆژانە نزیکەی (٦٥) کەس بەهۆی توندوتیژی و تاوانەوە گیان لەدەست دەدەن و ڕۆژی نزیکەی شەش هەزار کەسیش لەسەر تاسەری ئەمریکادا بریندار دەبن کەساڵی دەکاتە ( ٢٣٧٢٥) کوژراوو نزیکەی دوو ملیۆن بریندار ...

* نزیکەی (٥٦) ملیۆن حاڵەتی نەخۆشی زایەندی هەیە (وەك زهری و سیلانو...هتد) و ساڵانەش چەند سەد هەزارێك زیاد دەکات.

* لەساڵی ١٩٨٦ دا (١٠) ملیار دۆلار بۆ ئایدز خەرج کراوە ولەساڵی ١٩٩١ دا بڕی خەرجکراو گەیشتە (١٦) ملیار دۆلار .

* ژمارەی ئەو منداڵ و هەرزەکارانەی کەڕایان کردووە و خێزانەکانیان بەجێهێشتووە لەکوڕ و لەکچ لەساڵی ١٩٨٣ دا گەیشتە ملیۆنێك و سێسەد هەزار منداڵ و هەرزەکار . ( گۆڤاری المجتمع ژمارە /١٤٨٦/ساڵی ٢٠٠٢) .

ڕاستە ئەمریکا ژمارەی دانیشتوانی نزیکەی (٣٠٠) ملیۆن کەسە و نزیکەی (٢٠) ملیۆنی موسڵمانە و ، ئەو ڕێژانەش کە باسکران ڕەنگە هەموو کەس هەستی پێنەکات ، بەڵام ئامارە حکومییە ڕەسمییەکان ئاوا باس لەو دەردە کۆمەڵایەتیانە دەکەن و زاناو بیریارە ژیر و هۆشمەندەکانیان هەردەم ئاگاداریان دەکەنەوە ، هەرچەند ڕاگەیاندنی جوولەکە و (لوبی) جوولەکە کە هەرگیز خێریان بۆ هیچ وڵاتێك نەداوەتەوە ، دەیانەوێ ئەو دەنگانە کپ بکەن ، بۆئەوەی باشتر دایان دۆشن و دەست بگرن بەسەر سیاسەت و ئابووریاندا ...چارەی گشت کێشەکانی جیهان بەگشتی و ئەمریکاش بەتایبەتی هەر ئەو پەیڕەوو پرۆگرامە جیهانییەیە کە خوا ناردوویەتی بۆ سەرجەم گرۆی بەشەر ، هەر ئەو

بەرنامەیەیە کە بتوانێ ڕێزی مرۆڤ و پایەداری‌یەکەی بگێڕێتەوە ، چونکە خوایەك ناردویەتی کە دەفەرموێت : ﴿ولقد كرمنا بني ادم﴾ الاسراء ٧٠.هەروەها هەر خوایەکە دەزانێت مرۆڤ چۆن دروست بووە و چی باشە بۆی ﴿الا يعلم من خلق ، وهو اللطيف الخبير﴾ الملك ١٤.

ژنێکی ئەمریکی کە موسڵمان بوو وتی : حەزدەکەم بەهەموو توانامەوە هاوار بکەم و ئافرەتانی ئەمریکا لەدەورم کۆببنەوە و پێیان بڵێم : وەرن من ئاینێکم دۆزیوەتەوە کەبەڕاستی ڕێز لەئافرەت دەگرێت ! (وتاری شێخ محمد حسان / ئینتەرنێت ) .

## چەند وێستگەیەکی هیدایەت

١ ـ لە (حەلقەی ئیسلامی) لەئەمەریکای باکوردا رایان گەیاند کە ئامادەن هەرکەس بەنامە پەیوەندیان پێوە بکات وەڵامی بدەنەوە وچی دەوێت بۆی روون بکەنەوە ، ئەم کارە خێرە وای کرد کە خەڵکی لەگشت لایەکەوە نامەیان بۆ بنێرێ و داوای شارەزابوون بکەن لەبارەی ئیسلامەوە ... رۆژانە نزیکەی چل نامە دەگەیشتە دەستیان ...هەرچەندە ئێستا لەرێی ئینتەرنێتەوە دەتوانرێت کاری باشتر بکرێت .ل٤٦ المعجزة المتجددة.

٢ – لەو وڵاتانەی کەنداو کە ژمارەیەکی زۆر هیندی و فلیپینی و تایلەندی و روسی و ...هتد کاردەکەن ، بنکەی تایبەت بەشارەزابوون لەئیسلام کراوەتەوە بەناوی (مركز اكتشف الاسلام) ، لەو بنکەیەدا وتار دەدرێت بەزمانی ئەو جۆرە کەسانە و رووی گەشی ئیسلامیان پیشان دەدرێت ، بەوەش ژمارەیەکی زۆر موسڵمان دەبن ، کە دەگاتە هەزارەها کەس ، لەوانەش هەندێکیان هاوکاری دەکرێن بۆ چوون بۆ حەج . ل٥٦ المعجزة المتجددة .

(ئامارەکان دەڵێن کەلەچەند ساڵێکدا پانزە هەزار کەس لەهیندی و فلیپینی و تایلەندی و روسی موسڵمان بوون لەوانەی کە بۆ کارکردن روویان کردۆتە وڵاتانی کەنداو ) ل ١٤٣ هەمان سەرچاوە .

٣ ـ خوای گەورە پەیمانی داوە کە ئەم ئاینە دەپارێزێ و ، بەردەوامیش لێرەو لەوێ نموونەی ئاشکرا دەبینین لەم بارەیەوە .

رۆژنامەی (جسكياتاف كوبو) ی نەیجیری ، بڵاوی‌کردەوە کە مژدەدەرێکی مورتەد و هەڵگەڕاوەی لای خۆیان ، کە تا دوا پلە رِقی لەئیسلامە و ، ناوی (غیمو)یە ، رۆژێك لەناو کۆمەڵێ گاوردا لەکەنیسەی (بابتیس) بە تەحەدداوە وتی : ( داوا دەکەم لەخوا ئەگەر ئەم

ئیسلام و قورئانە هەقە نەگەمەوە مالەوە بمرم ) ...خوای گەورەش پی‌ی نواند ، هەرکە گەڕایەوە و پی‌ی هەڵهێنایەوە و ویستی لەجۆگەیەك بپەڕێتەوە ، قاچی هەڵنووتا و کەوت و مرد ...

پاش ماوەیەك یەکێك ویستی بچێت بەلایەوە و لەو جۆگەیە دەری بهێنێتەوە ئەویش بەقەدەری خوا مرد ! پاشان کۆمەڵێ لەکەنیسەوە هاتن و بردیان بۆ چەند خەستەخانەیەك هەموویان یەك قسەیان کرد و وتیان : (غیمو) مردووە ...هەر ئەوەندەی ئەم هەواڵە بڵاوبۆوە چوار لادێ لەویلایەتی (گونگولی) لەباکوری نەیجیریا موسڵمان بوون ، کەناوەکانیان (فال) و (یلوا) و (غراتی) و(موب) ە .

هەرهەمان رۆژنامە باسی رووداوێکی تری لەوجۆرە دەکات و دەڵێت : لەناوچەی (لنکبیری) لەهەمان ویلایەت مژدە دەرێکی ئەورووپی (رفلینت ولفی بوث)نوسخەیەك قورئانی سووتاند و سووکایەتی پێکرد ، دەستی خۆی پێوە سووتا و تابردیان بۆ خەستەخانەمرد ! ل١١٦ المعجزة المتجددة .

٤ ـــ خەڵکی‌دێی (کوانگۆ) کە (٦٠کم ) دوورە لەشاری (سیۆل)ەوە لەکۆریای خواروو، کە ژمارەیان سێ‌هەزار کەس بوو موسڵمان بوون ، وەپاش ئەوەی مزگەوتەکەیان بریتی‌بوو لەژوورێکی بچکۆلە بۆ نوێژ و بۆ فێربوونی ئیسلام لەماڵی (حاجی عبداللە) دا کەیەکەمین موسڵمانی دێیەکە بوو ، ئێستا مزگەوتێکی گەورەیان هەیە و چالاکی هەمەڕەنگی تیا ئەنجام دەدەن .

ئەمینداری گشتی یەکگرتووی موسڵمانانی کۆریا دکتۆر (جمیل لی سو ) بە یارمەتی (رابطة العالم الاسلامي) کەچەندەها کۆڕ و کۆنفرانسیان گرت لەبارەی ئیسلامەوە لەشاری (سیۆل) دا ، دەڵێت : ئیسلام داهاتوویەکی رۆشنی دەبێت لەکۆریادا (أن شاء الله) .

هەر لەکۆریای خواروو خاتوو(جون صون) سەرۆکی کەنیسەی بەناوبانگی شاری (جنحو) ، خۆی و شوێنکەوتوانی هەموویان چوون بۆ مزگەوتی (ابی بکر الصدیق) لەشارەکەی خۆیان و موسڵمان بوون ، وەناوی خۆی گۆڕی بۆ (خدیجە) ...ئەمەش موفتی کۆریای خواروو( شێخ عبدالوهاب زاهد باسی کردووە ) . (ل ١٢٠ المعجزة المتجددة) .

هەروەها لەشاری (بوسای) لەکۆریای خواروو گەورە قەشەی برۆتستانت کەناوی (سین) بوو ، موسڵمان بوو ، وەناوی خۆی کرد بە(عمر یاسین) ...و وتی ( بەڕاستی

دەمێکە ئیسلام سەرقاڵی کردوم و هیچ چارم نەماوە  دەبێ موسڵمان ببم و ، هەوڵ بدەم لەرێی خوادا ، پاش ئەوەی کەدڵنیابووم  ئەم ئاینە هەقە ) ل ١٢١ المعجزة .

٥ ـ لەئەفەریقیا ژمارەیەکی زۆر لەپیاوانی ئایینی مەسیحی موسڵمان بوون ، بۆ نموونە لەوڵاتی میسر بیست قەشە موسڵمان بوون پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر خەریکی مژدەدان بوون ، سەرۆکەکەیان (جیمس) دەڵێت : ( من سەرکردەی گەورەترین کاری مژدەدان بووم لەرۆژهەڵاتی ناوەراستدا و ئیشرافی (٢٢) بنکەی مژدەدانم دەکرد و لەئەمەریکا و فاتیکانەوە سەپەرشتی دەکراین ، پاش قووڵ بوونەوەی تەواوم لەعیلمی لاهوتدا ، پەیوەندیەکی پتەوم بۆ دروست بوو لەگەڵ راوێژکاری رۆشنبیری سعودی لەسوّدان ، ئەویش کتێبخانەکەی بۆ دەخستمە سەرپشت لەسەفارەت و منیش و هاورێکانیشم پەراوی زۆرمان خوێندەوە ، دواتر داوای گفت و گۆ و دانیشتنمان کرد لەگەڵ زانا موسڵمانەکاندا و ، پاش دانوستانێکی زۆر موسڵمان بووین ، ئێستاش پاش موسڵمان بوونمان دەست دەکەین بەبانگەوازکردن و ئەو ژمارە زۆرەی کەلەخەڵکی لەسەردەستمانا بوونەتە گاور ، بانگیان دەکەینەوە بۆ ئیسلام ، ئێستا زیاتر لە ( ٢١٠٠٠) کەس چاوەرێی ئێمەن و پشت بەخوا موسڵمان دەبن .

من دەمەوێ پێتان بڵێم : کەلە ئەمەریکا و فاتیکان و ئەوروپاوە خەڵکانێك دێن بۆ بانگەوازکردن بۆ بەرنامە و رێبازێك کە ناهەقە و دەستکاری کراوە ، ئیتر چۆن ئێمەی موسڵمان بانگ نەکەین بۆ پەیرەوو پرۆگرامی هەقی خوایی ؟

کەبەراستیش ئەمەکاری لاوانە و ئەرکی سەرشانیانە و ، لەهەموو کۆمەڵگاکاندا دەبێ بەوکارە هەستن ) .

لەوتەکانی ئەم قەشانەوە ئەو گۆرانە دەبینین کە چۆن لەماوەیەکی کەمدا دێتە دی و چۆن یەکسەر دەکەونە بانگەواز بۆ ئاایینی پیرۆزی ئیسلام و بەئەرکی سەرشانیانی دەزانن ... بۆ نموونەی زیاتریش دەڵێین : هەر لەئەفریقیا (٣٠) قەشە موسڵمان بوون ، تەنانەت سەرکردەی بانگخوازانی (رواندا) ش هەر قەشە بوو کە موسڵمان بووبوو ، وە بەجۆرێك گورج و گۆڵ و گەرم بوو لەسەر بانگەوازکردن ، تەنانەت رۆژێك کەتووشی نەخۆشی گرانەتا دەبێت و ناتوانێت لەجێگادا هەستێ ، داوا دەکات کەلە بەردەرگا جێی بۆدابنێن و لەوێدا دابنیشێ ، بەو جۆرە هەرچی لەبەردەرگاوە بڕۆیشتایە و سەلامی بکردایە و ئەحواڵی بپرسیایە ئەم بەفرسەتی دەزانی و باسی هەقی بۆ دەکرد ... ئەم

ڕووداوه دکتۆر ( عبدالرحمن السميط) گێراویەتیەوە کەبەرپرسی لیژنەی موسڵمانانی ئەفریقیایە .ل ١٢٣ المعجزة المتجددة.

٦ ـ قوتابیەکی زانکۆ لەبەرتانیا کە بەئەسڵ سودانیە ، دایك و باوکی دەبات بۆ لانەی پەککەوتووەکان بۆ چارەسەر و سەرپەرشتیکردن و ، خۆشی زۆربەی کات لەلایان دەبێ و بەدەوروخولیاندا دێت و خزمەتیان دەکات ، هەموو ئەو پیروپەککەوتانەی تری ئەو شوێنە کە ئەمەیان بینی لایان سەیر بوو ، بۆیە پرسیاریان کرد لێی کە تۆ بۆچی ئاوایت ؟ ئەویش پێی وتن : من ئاینەکەم ئاوا فەرمانی پێداوم لەخزمەتیانابم و بەم کارە خوا لەخۆم رازی دەکەم !

ئەوانیش کەباشترین منالیان ئەوەیە کەلەجەژنی سەری ساڵدا یان لە بۆنەیەکدا چەپکێ گوڵ یان نامەیەك بنێرێ ، لەبەر سەرقاڵی و گوێ پێنەدان ، ئەم مەسەلەیە وای لێکردن کە هەر هەموویان بەیەکەوە لەسەردەستی ئەو لاوە سۆدانیەدا موسڵمان بـبن . ( رۆژنامەی المسلمون ژمارە (٦٩٦) ساڵی ١٩٩٨ والمعجزة المتجددة ل ١٤٩ )

بەڕاستی کەسەیری پیرو پەککەوتەی رۆژئاوا دەکەین و ئەم جۆرە باسانە دەبیستین ، ئنجا باشتر تێدەگەین ، کە بۆچی ئیسلام ئەوەندە گرنگی بەخێزان داوە و هەوڵ دەدات شیرازەی نەبچڕێ ...تاهەم منال لەسایەی نازی دایك و باوك و خێزاندا بەدڵ و دەروونێکی ئاسوودە و ئارامەوە نەش و نما بکا و ، هەم دواتریش دایك و باوك لەژێر باڵی منالەکانیانا باقی ژیانیان بەخۆشی بگوزەرێنن ، ئیسلام نەك هەر لەدنیادا بەڵکو لەئاخیرەتیشدا گرنگی بەخێزان و ئەندامانی داوە ، ئەوەش بەوەی کە منالی چاك سەدەقەی بەردەوامن و چی خێر و چاکەو دوعایە بکەن بەباوك و دایکیان دەگات و ، هەروەها لەبەهەشتیشا ئەگەر دایك و باوکێك پلەوپایەیەکی بەرزیان هەبێ و منالەکانیان نەگەیشتبنە ئەو پلەیە یە، ئەوا خوای گەورە لەبەر دڵی دایك و باوکەکە بۆ ئەوەی لەیەك دانەبڕێن ، منالەکانیش دەباتە پلەوپایە و جێگای ئەوانەوە ، قورئان ئەم مژدە خۆشە بەدایك و باوکەکان دەدات و دەفەرموێ ﴿ والذين امنوا واتبعتهم ذريتهم بايمان الحقنا بهم ذريتهم وما التناهم من عملهم من شيء كل امري بما كسب رهين ﴾ الطور : ٢١ واتە : جا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و نەوەکانیشیان بەئیمان و باوەڕەوە شوێنیان کەوتوون، ئەوانە لەبەهەشتدا پێك شاد دەکەینەوە ، تا کامەرانی و خۆشیان زیاتر بێت ، وە نەبێت

ئەوانەی پلەی بەرزیان دەستکەوتووە دایان بەزێنین ، چونکە ئێمە پاداشتی کردەوەی کەس کە مناکەینەوە ، لەکاتێکدا هەرکەسە بارمتەی کردەوەی خۆیەتی .

٧ ـ هەندێ لەوتورك و یۆغۆسلافیانەی کەچوونەتە کەنەداو ژنی کەنەدیان هێناوە توانیویانە خێزانەکانیان والێ بکەن قەناعەت بکەن بەئیسلام و بەدڵ وەریبگرن ، بەم هەوڵ و تێکۆشانەی ئەوان و جالیەی ئیسلامی کەنەدا ، حەوت رۆژنامە و گۆڤاری ئیسلامی دەردەکرێ و گەورەیی و مەزنی ئیسلام بۆ خەڵکی روون دەکەنەوە .... ئەم خزمەت و رێ رۆشن کردنەوەیەش هاتۆتە بەر و لەچەند مانگێکدا (٧٠) کەسی کەنەدی موسڵمان بوونی خۆیان راگەیاندووە ( رۆژنامەی المسلمون ٣٦٢ ساڵی ١٩٩٢) .

٨ ـ لەکۆماری (بنین) لەچەند مانگێکدا سێسەد کەس موسڵمان بوون بەهۆی یەکێ لەبانگخوازەکانی ئەو کۆمارەوە کە دەرچووی زانکۆی (ئیمام محمد بن سعود) ە و بەردەوام لەهەوڵدایە بۆ گەیاندنی بانگەوازی خوا بەو هاوولاتیانەی خۆیان کەنەشارەزان بەدوا پەیامی خوایی (رۆژنامەی المسلمون ژمارە (٤٥٩) ساڵی ١٩٩٣).

<u>تێبینی :</u>

دیارە ئەم ئامار و دەنگ و باسانە نزیکەی دەساڵ بەسەریاندا تێپەڕبوون و بەدڵنیایی‌یەوە ئێستا ئیسلام زۆر لەوکاتە زیاتر چۆتە پێشەوە و خێراتر بلاو دەبێتەوە ، چونکە ئەو (٣٠٠) کەسەی ساڵی (١٩٩٣) ئەگەر لەساڵێکدا تێکڕا یەکی یەك کەسیان رێنمایی کردبێ ئەوا لەساڵی ( ١٩٩٤)دا بوون بە شەسەد ، وە ئەگەر ئەو شەسەدەش هەرکەسە و دەستی یەك کەسی گرتبێ لەساڵی ( ١٩٩٥) دا بوون بە (١٢٠٠) کەس ... ئیتر بەوشێوەیە ژمارەکان چەند قات دەبنەوە ساڵ لەدوای ساڵ ... ئەمەش بەرەو هاتنە دی مژدەی پێغەمبەرمان دەبات ﷺ کە دەفەرموێت ( ليبلغن هذا الامر ما بلغ الليل والنهار ولايترك الله بيت مدر ولا وبر الا أدخله الله في هذا الدين بعز عزيز أو بذل ذليل عزاً يعز الله دين الاسلام وذلا يذل الله به الكفر ) مسلم

واتە : بەدڵنیایی‌یەوە ئیسلامەتی دەگاتە هەموو ئەوشوێنانەی کەشەوو رۆژ دەیگاتێ وبەهەموو دنیادا بلاودەبێتەوە ، هیچ ماڵێکی لادێ و شارنامێنێ ئەم ئاینەی نەگاتێ ، بەعیززەتی عەزیز ، یان زەلیلی زەلیل ، عیزەتێك کە خوا ئیسلامی پێ پایەدار و عەزیز دەکات ، وە زەلیلیەك کە خوا کافرانی پێ ریسوا و سەرشۆڕ و زەلیل دەکات ( ل ٥٨ بەشی یەکەم / بەهاری دلان ) .

٩ ـ لەساڵی ١٩٩٥ دا واتە پاش نزیکەی دوو هەزار ساڵ لەلەدایك بوونی عیسی سەلامی خوا لێبێ و پاش (١٤١٨) ساڵ لەهیجرەتی حەزرەت یەکەم منارەی مزگەوت لەشاری ڕۆما پایتەختی ئیتاڵیا بەرزکرایەوە ... تا لەو بنکەی خێر و بەرەکەتەوە نووری ئیمان بلاّوبکرێتەوە و ببێ بە ( حجە) بەسەر جیهان بەگشتی و خەڵکی ئەو شارەوە بەتایبەتی .

مزگەوتەکەی شاری ڕۆما لەجوانترین و قەشەنگترین گەڕەکی شاردا دروستکرا ، کە ئەویش گەڕەکی (باریولی) یە ، کە نزیکەی دە کیلۆمەتر دوورە لە(فاتیکان)ەوە ، جا هەر ئەوەندەی خەڵکی هەوای ئازادی هەڵمژی ، ملیۆنێ موسڵمان ، بوونی خۆیان ڕاگەیاند لەئیتاڵیادا هەرچەند زۆر کەس و لایەن دژایەتی ئەم پڕۆژەیەیان کرد و ویستیان ئاستەنگی زۆر بهێننە ڕێی کەچی خوا بەفەزڵی خۆی ئاواتەکەیانی نەهێنایەدی ...لەگەڵ ئەوەدا کە موسڵمانان هەموو دەوروبەری مزگەوتەکەیان کردووە بەباخ و باخات و گوڵ و گوڵزار و گەڕەکەکەش بۆ خۆی لەپاکترین ناوچەکانی شارە ، کەچی هەروەك دوژمنایەتی و ڕقە بەرایەتیەك شارەوانی ڕۆما ویستی لەدووری (١٥٠) مەتر لەمزگەوتەکەوە ، کۆگای خۆڵ و خاشاك دابنێ و تیایا کۆی بکاتەوە ، خوا کردی لەئەنجامدا ئەمەش سەری نەگرت .

بەرزبوونەوەی یەکەم منارە لەشاری ڕۆمادا ، ئاواتی دێرینەی موسڵمانان بو ، ( هەرچەندە لەئیتاڵیادا سێسەد و پەنجا مزگەوت هەبوو تا کۆتایی ساڵانی نەوەدەکان ) ، چونکە ئەوە بەشارەتی هاتنە دی مژدەی حەزرەتە ﷺ کە ئیسلام دەگاتە ئیتاڵیا و ناوچەرگەی قەلاّی ڕۆمەکان .

بانگی ئیسلام لە بڵند گۆی مزگەوتی ڕۆماوە بەرزبۆوە ، لەکاتێکدا پاپا یوحەنا جیهانی ئاگادار دەکردەوە لەوەی کە مارکس بۆشاییەکی گەورەی بەجێهێشتووە بەرووخانی شیوعیەت و ، (محمد) خەریکە ئەو بۆشاییە پڕدەکاتەوە ...

بەڵێ ...(محمد) ﷺ و ئاینەکەی نەك هەر بۆشایی ڕووسیای پڕکردەوە بەڵکو گەیشتە نزیك فاتیکان و لەماوەیەکی کەمدا زیاتر لە ( ٥٠٠) گاوری کاثولیکی ئیسلام بوونی خۆیان ڕاگەیاند ( ل ١٤٠ المعجزة المتجددة ) بۆیە کەنیسەی کاثولیکی شاری (تورنتو) ڕایگەیاند لەڕاپۆرتێکدا کە (ئیسلام یەکەم تەحەددایە کەرووبەڕووی کەنیسەی کاثولیکی دەبێتەوە) دیارە لەبەر خێرایی بلاّوبوونەوەی لەناو خەڵکدا...(هەمان سەرچاوە )

## ( ٢٦ ) پیاوێکی هیندی

پیاوێکی هیندی ڕوودەکاتە وڵاتی سعودیە بۆ کارکردن و (شێخ محمد فراج) جاروبار قسەی بۆدەکات و کابرا بەبیانووی ئەوەی گوایە ماڵ و منداڵ و کەس و کاری کێشەی بۆ دروست دەکەن ، موسڵمان نابێت .

پاش ماوەیەك دێت بۆ مزگەوت بۆ لای شێخ محمد و دەیەوێ موسڵمان بێت ، لەوکاتەدا شێخ محمد سەرقاڵی قوتابیەکانی دەبێت و ناشزانێ کە هیندیەکە بۆ ئەو مەبەستە هاتۆتە ئەو ناوە ، بۆیە شێخ محمد پاش تەواوکردنی دەرسەکانی لەگەڵ قوتابیەکانیدا دەڕوات و هیچ لەم ناپرسێتەوە .

کابرای هیندی کە ئەمەی بینی خۆی پێنەگیرا و گریا و هەر لای دەرگای مزگەوتەکە مایەوە ، تالاوێکی دانیشتووی گەڕەك بەلایا ڕۆیشت و بینی دەگری پرسیاری لێکرد چیت لێقەوماوە ؟ وتی : هاتم موسڵمان بم و نازانم چی بکەم ؟ ئەویش لەگەڵیا ڕۆیشتەوە وفێری کرد کە چۆن خۆی بشوا و شایەتمان بێنێ و دەستنوێژ بشوات ... کات دەمە و ئێوارەبوو ، کابرا گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی و ئەو شەوە فریا نەکەوت نوێژێ بکا و سوجدەیەك بۆ خوابات مرد و بەموسڵمانی سەری نایەوە ! بۆبەیانی ئەو لاوە ئەم هەواڵەی دا بەشێخ محمد لەمزگەوت ، ئەویش زۆری پێناخۆش بوو کەلەمەبەستی هاتنی هیندیەکە حاڵی نەبووە و نەیتوانیوە هاوکاری بکات بۆ موسڵمان بوون ...

شێخ محمد و چەند کەسێکی ئەهلی مزگەوت چوون بۆ سەردانی هیندیەکە لەشوێنی مانەوەی‌دا ، هاوەڵەکانی پێیان وت : قوربان ئەمشەو ئەوپیاوە مرد و ئێستاش لاشەکەی لەسەلاجەی خەستەخانەدایە ...ئەویش یەکسەر لەگەڵ چەند موسڵمانێکدا چوون بۆ خەستەخانە تەرمەکەی وەربگرنەوە ، پێیان نەدانەوە ، چونکە هەواڵیان ناردبوو بۆ کەس وکاری کەبێن تەرمەکەی بەرنەوە! خێرا شێخ محمد پەیوەندی کرد بەموفتی وڵاتەوە (عبدالعزیز بن باز) و مەسەلەکەی تێگەیاند ، ئەویش فەرمانی دەرکرد کە تەرمەکەی نەدرێتەوە بەکەس و کاری بیسوتێنن ، بەڵکو بدرێتەوە بەموسڵمانان و لەقەبرسانی موسڵماناندا بنێژرێ ...(هەمان سەرچاوە)

ئەو ڕۆژە هەینی بوو ، شێخ محمد لەوتاری هەینی‌دا باسی دەست و بردکردنی کرد لەتەوبەکردن و کاری چاکەدا ، چونکە تەنها خوا دەزانێ وەك ئەو هیندیە هەریەکەمان چەندمان ماوە ﴿ أولم يتفكروا ما بصاحبهم من جنة ان هو الا نذير مبين، أولم ينظروا في

ملكوت السماوات والارض وما خلق الله من شيء وأن عسى أن يكون قد اقترب أجلهم ، فبأي حديث بعده يؤمنون ﴾ الاعراف : ١٨٥ .واته : باشه ، ئەوە ئەو خەڵکە بیریان نەکردۆتەوە لەگوفتار و رەفتاری محمد(ﷺ) کە ئەو هاوەڵەیان هیچ نیشانەیەکی شێتی پێوە نیە ، بەڵکو ئەو بەڕێزە هیچ شتێك نیە مەگەر ئەوەی کەبێدارکەرەوەیەکی ئاشکرایە ...ئایا بۆ سەرنجیان نەداوە لەو هەموو دەسەڵاتە گەورەیەی خوا لەئاسمانەکان و زەویدا و ئەو هەمووشتانەی کەخوا بەدی هێناون ؟ بۆ ئەوەندە بێئاگان ، خۆ بەراستی نزیك بۆتەوە ئاکامیان ، هاکە هات و بردنی و کۆتایی پێ‌هێنان ، جا بەچ گوفتارێکی‌تر لەدوای قورئان باوەڕ دەهێنن ؟

پاش نوێژ ئامادەبووان نوێژیان لەسەرکرد و لەقەبرسانی موسڵمانان ناشتیان .

( ئەمەش هەروەك مەسەلەی موسڵمان بوونی شوانە رەشە حەبەشیەکەی زەمانی حەزرەتە ﷺ کەلەپێش فەتحی خەیبەردا موسڵمان بوو ، ئەویش بەوەی کەلە جوولەکەکانی پرسی بۆچی ئاوا شپرزنو خۆتان ئامادە دەکەن وتیان نیازی شەڕمانە لەگەڵ کەسیکدا کە خۆی بە پێغەمبەر دەزانێ ، پاشان لەدەرەوەی قەلاکە مەڕەکانی برد بەرەو لای موسڵمانانو ، لەسەر دەستی حەزرەتدا موسڵمان بوو ، ئنجا نەیدەزانی چی لەمەڕوماڵاتەکە بکات کە ئەمانەتی خەڵکی بوون لەلای ، حەزرەتیش فەرموی : لەسەر خوا روویان بکەرە قەلاکەو خۆیان ملی رێ دەگرن ، هەروا بوومەڕوماڵاتەکە چوونەوە بەرەو ناوقەلاکەو بەرەولای خاوەنەکەیان و ئەمیش پاش موسڵمان بوون ، فریانەکەوت تاقە سوجدەیەك بۆ خوا ببات و نوێژێك بکات ، هەرزوو شەهید بوو ، بەهەشتی بۆ خۆی مسۆگەر کرد ) . حەزرەت(ص) بە هاوەڵانی فەرموو﴿ بەڕاستی خوا رێزی لەم بەندەیە گرت و هێنای بەرەو خێر ،وا بینیم دوو حۆری لە ژوور سەرین ویەك سوجدەشی بۆ خوا نەبردووە ﴾السیرە النبویە -الندوی- ل٣١٥ .

## ( ٢٧ ) عبدالرحمن بارکر

عبدالرحمن بارکر کەنەدی‌یە و مامۆستای زمانی (اوردو) ە لەزانکۆی (مجل) لەکەنەدا ، لەسەرداوای سەرۆکی کۆمەڵەکانی مژدەدان بەئیسلام ، کەوتە باس کردنی سەرگوزشتەی موسڵمان بوونی بۆ ئامادەبووان و وتی:

من لە منالیدا هەستم دەکرد کە رۆژئاوا ماددیەتی تیا بلاوبۆتەوە و گاورەکان گرنگی نادەن بەئاین و ، لەگەڵ ئەوەدا کە باوکم کابرایەکی بی‌دین بوو ، بەلام من ئەگەڕام بەدوای

هەق و راستیدا و کەوتمە دیراسەتی ( مقارنـة الادیـان) و ، لەبەرئـەوەش کـە ئیسـلام بەتیرۆریست و دواکەوتوویی لەراگەیاندنـەکاندا بـاس دەکـرا لـەلامان زۆر گوێـم پێنـەدا لەسـەرەتادا و کـەچی سـەرەنجامیش هـەر لای ئیسـلام گیرسـامەوە . رۆژێـك قوتابیـەکی کۆمۆنیستی ناسـیاوم لـە (لکنـهوء)پـێی وتم : ( ئەگـەر دەتـەوێت پیـاوێك ببینـی کەلەجیهاندا لەهەمووکەس زیاتر پابەندە بەئاینەوە ، وەرە ئەو پیاوە باوکمە با بچین بۆ لای ) ... منیش چووم لەگەڵیدا و باوکیم بینی کە پیاوێکی رەنگ نورانی بـوو ، کەوتینـە گفت وگۆ لەگەڵیدا ودوایی قورئانێکیدامێ کەبەزمانی ئینگلیزی ماناکەی لێك درابۆوە .

رۆژێك بەشتەکانمدا دەگـەڕام ئـەم قورئانـە هاتـەوە بـەرچاوم و چونکـە پـەڕاوی تـرم لەبەردەستا نـەبوو ، کەوتمـە خوێندنـەوەی چـەند لاپەڕەیـەکی و بـەجۆرێك سـەرنجیان راکێشام و کاریان تێکردم کەزانیم ئیسلام راستەو، هەقە بەبێ دواکەوتن موسڵمان ببم ... ئیتر هەر لەشاری ( لکنـهوء )لەسـەر دەستی ئەو پیاوە نوورانییەدا موسڵمان بـووم ...بەڕاسـتی خـەڵکی رۆژئـاوا لەموسـڵمانانەوە سـەیری ئیسـلام دەکـەن و کـەم و کـوڕی موسڵمانان دەدەنە پاڵ ئیسلام کە ئەمەش راست نیە و ئەم ئاینە پیرۆزە هەرچیچاك بێت ئەوە دەڵێ و موسڵمانان بۆ خۆیان پابەندی تەواو نین بەفەرمان و رێنماییەکانیەوە . جا بۆیە هـەق وایـە موسـڵمانان بـەچاکی رەفتاربکـەن و ئیسـلام بـەجوانی بخەنـە بـەرچاوی خەڵکی ، بەتایبەت ئەوانەی کە دەچنە رۆژئاوا هەق وایـە بەشێك لـەکاتیان تەرخان بکـەن بۆ ناساندنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام .(ئنتەرنێت / المسلمون الجدد ) .

## ( ٢٨ ) رکس ئەنگرام

ئـەمیش وەك ئـەوانیتر باسـی موسـڵمان بوونـی خـۆی دەکـات و دەڵێـت : مـن لـە (ئوسکوتلەندە) لـەدایك بـووم و باوك دایکم ئینگلیزن . باوکم نـەبینوە چونکـە لەشـەڕی ( البویـر) لەسـاڵی( ١٩٠٠) دا کوژرابـوو ، مـن ئەوکاتـە منـداڵ بـووم ، ژیـانێکی ئاسـایی دەژیاین هەتا جەنگی جیهانی یەکەم ، لەساڵی ١٩١٤ دا چوومە خزمەتی سەربازییەوە و بـەدەریادا بـەرەو فەرەنسا کەوتمـەڕێ و لەچـەند شـەڕێکدا بەشـداریم کـرد کـە بەڕاسـتی دۆزەخێك بوو ئاسان نەبوو کەس تیا هەڵکات .

دوای چـوار سـاڵ لـەو دۆزەخـە ، دایکـم مـردو ، سێخوکیشـم لەوشـەڕەدا کـوژران ، ئەمەش زۆر بێتاقەت و بێزاری کردم و کەوتمە گەڕان بەهیندو یابان و چین دا و خـەریکی لێکۆڵینەوەی زمانەکان و ئاینەکان بووم .

کاتێکیش هاتمە سوریا و فێری زمانی عەرەبی بووم و چەند جار قورئانم خوێندەوە و لەماناکانی وردبوومەوە ، ڕۆحم پێی شادبوو ، دڵم گەشایەوە ، وام لێهات کەنەتوانم ڕۆژ بوێری بکەم و نەیخوێنم . لەساڵی سیەکاندا چووم بۆ ئەسکەندەریە و لەوێوە چووم بۆ (دەمەنهوور) ولەوێ لەگوێ ئاوێك لەباخێکدا خەوم لێکەوت و لەخەومدا نوورێکم بینی لەزەوییەوە بەرزبۆوە بۆ ئاسمان و پاشان لەئاسماندا کۆبووەوە ونوسرا (الاسلام) ...ئیتر خەبەرم بۆوە ، لەوساتەوە ئیسلام هەموو دڵ و دەروونمی پڕکرد و وام لێهات کەبیربکەمەوە لەموسڵمان بوون و هەستم کرد بەدڵنیایی و هێمنی ...

لەو ڕێگاو بانەدا کەدەڕۆیشتم بەلای هەر جووتیارێکداسەلامیان لێدەکردم و بەگەرمی خوڵقیان دەکردم بۆ ئەوەی لابدەم لەلایان و میوانیان بم . لەخۆمم دەپرسی ، باشە من کابرایەکی ڕۆژئاوایی و ئەوان ڕۆژهەڵاتی کەلەهەمووشتێکدا جیاوازم لێیان ، بۆچی ڕێزم لێدەگرن و خزمەتم دەکەن ؟ باشە خۆ ئەگەر لەڕۆژئاوا بەلای هەر جووتیارێکدا بڕۆی گوێت پێنادا و ئەوڕێز و میوانداری یە نیە لەلایان ، ئەم خەیاڵاتانەم هەبوو ، بەدوای وەڵامیاندا دەگەڕام ، بۆم دەرکەوت کە ئایینی ئیسلامە ئەو خەڵکەی گەیاندۆتە ئەو پلەوپایەبەرزە کۆمەڵایەتیە ، جارێکی تریش هەمان خەوم بینیەوە ، دڵنیابووم کەخوا ئیسلامی بۆ هەڵبژاردووم و زۆرشادمان بووم و هەستم بەنیعمەتی ئیمان و خۆشی باوەڕکرد .

بەراستی من چەند ساڵێك دیراسەتی ئیسلامم کرد ، بەڵام تا بەتەواوی دڵم نەیچەشت و تەواو دڵنیا نەبووم موسڵمان بوونی خۆمم ڕانەگەیاند ... جا کەمنیش موسڵمان بووم بۆ ئەوەبوو کەلە هەراو هوریای ژیان و سەگەردانی ڕزگارم بێت و نەبمە کۆیلەی ئەو دنیایەی کە زۆر لە خەڵکی دەیپەرستن ... موسڵمان بووم بۆئەوەی هەست و هۆش و دڵ و ژیریم ڕزگار بکەم لەتیاچوون .

بیرمە جارێك کارم دەکرد لەوێنە گرتنی فلیمێکدا و، لە (مشهد)ێکا پیاوێکی عەرەب دەبوو لەسەر منارەیەکی بەرز بانگ بدات ، بەراستی بانگەکە لەناخەوە هەژاندمی ، پاشان بانگم کردە نوسینگەکەم و زۆر پرسیارم لەبارەی ئیسلامەوە لێکرد و دوای ئەوە موسڵمان بووم و ، لەگەڵیدا نوێژم کرد ...

ئنجا هەستم کرد کە کارکردنم لە(هولیود) دا ناگونجێ لەگەڵ بیروباوەڕو ئاینەکەمدا بۆیە پاش بیرکردنەوەیەکی زۆر کەخەوی لەچاوما نەهێشتبوو ، وە شەو تا درەنگ پێوەی

دەتلامەوە ، بڕیارمدا کە زۆر نوێژبکەم و داوا لەخوا بکەم کە هیدایەتم بدات بۆ هەرچی چاکە و جێی ڕەزامەندیەتی .... سوپاس بۆ خوا ، خۆم یەکلایی کردەوە و بەیەکجاری وازم لەوبوارە هێنا و خۆم تەرخان کرد بۆ ئیسلام .

ئەمڕۆ من کوڕی ئیسلامم و لەهەموو ڕۆژێکی ژیانم زیاتر بەختەوەرم ، هەرچەندە ، من ڕۆژئاواییم و جل و بەرگی ڕۆژئاوایی دەپۆشم ، بەلاَم وەك موسڵمانێك دڵشادم و شانازی دەکەم بەو ئیسلامەی کە تەواوترین ئاینی ئاسمانی‌یە و خوای گەورە بۆ ڕزگارکردنی هەموو بەرەی ئادەمی ناردوویەتی .( هەمان سەرچاوەی پێشوو) .

## ( ٢٩ ) ئەفسەرێکی ئافرەتی ئەمریکی

لەجەنگی دوەمی کەنداودا ، جەنراڵ (شوارزکوف) لێپرسراوی یەکەمی جەنگەکە بوو ، یەك لیوای تەواو پاسەوانیان دەکرد و هیچ حسابێکی بۆ کەس نەدەکرد ، تا بینە قاقای لەخۆبایی بوون بوو ، هەرگوڵێك ئەوبیکردایە بەسێ گوڵ حساب بوو ! تەنانەت ئەمیر ﴿ خالد بن سولتان ﴾ غیرەی لێدەکرد و ، ئەم دەتووت میوانە وشوارزکوفیش خاوەن ماڵ ! ڕۆژێك پیاوێکی پاکستانی هات بۆ لای چاوی پێبکەوێت ، سێ سەعات لە پرسگە داینا چاوەڕێ بکات ...ئەفسەرێکی ئافرەتی ئەمریکی کەلەلای شوارزکوف بوو لێی پرسی بۆچی ئاوا مامەڵەی ئەو کابرایە ئەکەیت و سێ‌سەعاتە داتناوە و دەسی دەسی پێدەکەیت و ناتەوێ بیبینی ...ئایا تۆ مانای ئینسانیەتت لانیە ؟ ئەویش لەوەلاَمدا وتی : ( ئەوکابرایە موسڵمانە و ئەمەوێ سووکایەتی پێ بکەم ) ! ئافرەتەکە وتی : دەی من لەسەرووتر شکات ئەکەم ! دواتر ئافرەتەکە خۆی ناساند بەوکابرا پاکستانی‌یە و تێی گەیاند کەبگەڕێتەوە، چونکە (شوارز کوف) نایەوێ بیبینێ و سووکایەتی پێدەکات ... پیاوەکەش سوپاسی کرد و ناونیشانی خۆیدایە ...ئافرەتەکە سەردانی ماڵ و منداڵ و خێزانی کابرا پاکستانی‌یەکەی کرد ، ئەوانیش زۆر ڕێزیان لێگرت و باسی ئیسلامیان بۆ کرد و چەند پەڕاوێکیشیان دایە ...سەرەنجام پاش لێکۆڵینەوەیەکی ورد لەبارەی ئیسلامەوە ، ئافرەتەکە چوو بۆ نووسینگەی (جالیات) و موسڵمان بوو ، خۆی داپۆشی‌و کاتێك بەسەرپۆشەوە چوو بۆسەرکارەکەی ، سەرزەنشتیان کرد و هەڕەشەی فەسڵکردنیان لێکرد ، ئەویش ڕازی نەبوو واز لەئیسلام بێنێ و لەم پێناوەدا پلەوپایە و کارەکەی کرد بەقوربانی بەرنامەی خوا ...

لەولاتی سعودیە داوایان لێکرد کەوتارێك بدات بۆ پزیشکە ئافرەتەکان لەهۆڵی خەستەخانەدا ...پزیشکەکانیش زۆر بەپەرۆشەوە لەهۆڵەکەدا کۆبوونەوە و چاوەڕێی ئەم میوانەیان دەکرد ...چالەبەرئەوەی دەیانزانی هۆڵەکە هەمووی ئافرەتە و میوانەکەش هەر ئافرەتە ، خۆیان کردەوە و سەرپۆشەکانیان لابرد و هەموو بنێشت لەدەمیانا ! تەواو ئیسراحەتی خۆیان وەرگرتبوو !!

کاتێکیان زانی ئافرەتێکی تەواو داپۆشراو لەلایەن ئافرەتێکیترەوە بەچەند وتەیەك پێشکەش بەئامادەبووان کرا ...تا ئەویش پاش ئەو پێناسەکردنە وتارەکەی بدات ...هیچیان بڕوایان نەدەکرد ئەو ئافرەتە تەواو داپۆشراوە ئەفسەرێکی ئەمریکی بێت !...بەهەرحاڵ کەوتە وتاردان و باسی ئەزموونی خۆی و هۆی موسڵمان بوونی ، لەناوەندی قسەکانیشدا ئامادەبووانی تەزاند بەوەی کەوتی : ( سوپاس بۆ خوا کە ئیسلامم لەئێوەوە وەرنەگرت و تەنها لەپەڕاوەوە ئیسلامم وەرگرت ) . کە ئەمەش وەك هەورە بروسکە دای بەڕووی پزیشکەکاندا کەبەناو موسڵمانن ، سابەڵکو بەخۆیاندا بچنەوە و چاکتر پابەند بن بەئیسلامەوە و کاربکەن بۆ بەرنامەکەی ... بەراستی چاکیان وتووە ( نرخی زێڕ لای زەرەنگەرە ) ، بەڕاستی ئەوانەی دوورن لەبەرنامەی خودا و داخ ئەبن بەنەفامی سەردەم و پاشان دێن بەرەو ئیسلام ، ئائەوانە قەدری ئەم ئاینە دەزانن ، نەك ئەو موسڵمانانەی کەبە ( تەسکەرە) موسڵمانن ! ( هەمان سەرچاوەی پێشوو ) .

## ( ٣٠ ) جونثان بیرت

جونثان کوری ( جۆن بیرت) ی بەڕێوەبەری گشتی دەزگای (بی بی‌سی) بەریتانی یەو موسڵمان بووە و ناوی خۆی گۆڕیوە بۆ (یحیی)...

جۆنثان لەپێشووی هاویندا سوربوو لەسەر ئەوەی کەلەکتێبخانەیەکی ئیسلامیدا کاربکات و بەمەش ئەکەوتە دانوستان و گفتوگۆ لەگەڵ ئەوانەی کە هاتوچۆی ئەم کتێبخانەیەیان دەکرد ... لەگەڵ ئەوەدا کە چەند ساڵێکە (جونثان) موسڵمان بووە زۆر حەزی دەکرد کەلەڕێی ئەم کارەیەوە خزمەت بەبانگەوازی ئیسلامی بکات لەم کتێبخانەیەدا کەلە ساڵی ( ١٩٩٧) داکرابووەوە .

هەر لەوساڵەشدا بوو کە ئافرەتێکی هیندی هێنا بەناوی (فوزیە بورا) و بەیەکەوە سەردانی سوریا و ئەردەن و قودسی ڕۆژهەڵاتیان کرد ، بەمەبەستی زیاتر شارەزابوون لەپاشماوە دێرینەکانی ئیسلام .

(جونثــان) گرنگـی بـەئایین نەئـەدا لەسـەرەتای ژیانیـەوە ، ئـەوەی رێــڕەوی گـۆڕی هـاوەڵێکی قوتـابی موسـڵمان بـوو لـەزانکۆی مانشسـتری بـەریتانیا کـەتیای‌دا مێـژووی سـەردەم و زانسـتی رامیاریـان دەخوێنـد .لـەنیوەی دووەمـی دوا سـاڵی خوێندنــدا ، (جونثـان) وازی لـەو بەشە هێنا چونکە بێزاربوو لەوانـەکان و راگـری بەشـەکە ... ئنجا رۆیشت بەرەو بەشـی ( مقارنـة الادیـان) لەپـەیمانگای ( دراسـات الشـرقیة و الافریقیـة) لەلەندەن و لەوێدا سەرکەوتنی باشی بەدەست هێنا ، چونکە حەزی لەبابەتەکان بوو ... پاش تەواو کردنی خوێندنی لە ( بنکەیەکی ئیسلامی) کەوتە کارکردن ، بۆئەوەی بتوانێ خـەریکی بانگەوازکردن بێت کە فەرمانی خوایە ودەفەرموێت : ﴿ ادع الـی سـبیل ربــك بالحكمة والموعظة الحسنة وجادلهم بالتي هي أحسـن ﴾ وە هـەروەها داوای حەزرەتیشە ﷺ لەموسڵمانان کە دەفەرموێ : ( بلغوا عني ولو اية ) (هەمان سەرچاوەی پێشوو) .

## (٣١) جمایما

(جمایما) کچـی ملیۆنـەری جوولەکـەی بـەریتانی (گولـد سمیـث) ە پـاش لێکۆڵینـەوەی وردی قورئـان موسـڵمان بـوو ، وە پـاش سـێ مـانگ شـووی کـرد بەیاریکـەری جیـهانی (کریکیت) (عمران خان) ی پاکستانی ، هۆکانی راگەیاندنی بەریتانی کـەزانیان موسڵمان بـووە کەوتنـە پڕوپاگـەندەکردن بـۆی و وتیـان (جمایمــا) ی تەمــەن (٢١) ســاڵ هێشــتا هەرزەکارە و ئەمەی لەسادەیی و سەرشێتی‌یەوە کردووە .

(جمایما) ش هیچ گوێی نەدا بە تیری ژەهـراوی ناحـەزان و سوربوو لەسـەر ئیمـان و باوەڕەکەی و لەگەڵ مێردەکەی‌دا چوو لەشاری لاهور نیشتەجێبوو ...(جمایما) دەڵێت : من لەساڵی ( ١٩٩٤) ەوە لـەقورئان ورد دەبوومـەوە و پـەڕاوی (محمـد اسـد) و (علـی عزت بیگوفیتش) م دەخوێندەوە و بەدڵ داوام لەخوا دەكرد کە رێنماییم بکات و دەستم بگرێت بەرەو خێر ...خوای گەورە بەمیهرەبانی خۆی رێنمایی کردم و لەساڵی ١٩٩٥دا موسڵمان بووم ، کە ئەویش ئاسانە و تەنها بەوتنی ( اشهد ان لا اله الا الله وان محمـدا رسـول اللـه) مرۆڤ دەبێت بەموسڵمان . بەڕاستی لەئیسلامدا ئەوپەڕی رێز بۆ ئـافرەت دانـراوە و هیچ کۆت و زنجیرێك نەکراوەتـە دەســت و قـاچی هــەروەك ناحـەزان لەرۆژهــەلات و رۆژئـاوادا بــلاوی دەکەنــەوە...هەرچــەندە هــەندێ لەموســڵمانان بەنــەزانی لەهـــەندێ کۆمــەڵگای ئیسلامیدا بەناهەق ئافرەتیان چەوساندۆتەوە و ستەمیان لێکردووە .

مـن ئەمـەم بەئاشـكرا بینـی لەخوشـكەكانی مێردەكـەمدا ، كـە یـەكێكیان دەرچــووی پـەیمانگای زانسـتی ئـابووری و سیاسـی سـەر بـەزانكۆی (لـەندەن) ەو فەرمانبــەرێكی گەورەیە لەرێكخراوی نەتەوە یەكـگرتووەكان لەنیویورك . خوشـكێكی تـری ماجسـتێری هەیە لە (ادارة الاعمـال) دا ، خوشكێكی تریشی پزیشكی نوژدارە و لەخەسـتەخانەی لاهور كاردەكات ... باشە ئەمانە كوا كۆت و پێوەندكراون ، هەموویان موسڵمانی چاكن و پلەو پایەیەی بەرزیشیان بەدەست هێناوە .

بەراستی ئازادی ئەوەنیە كە ئافرەت بتوانێ بەشەو بچێتە یانەكان و مەی بخواتەوە و لاشە و جەستەی خۆی رابنوێنێ بۆچاو پیس و دڵ پیسەكان ...

جا بەڕاستی نەبوونی ئەم ئازادیە رووكەشە وادەخاتە بەرچاو كە ئافرەتی موسڵمان ئازادی نەبێت ، كەلەراستیشدا وانیە و ئەو جۆرە شتانەش هیچ جۆرێك ئافرەت بەختەوەر ناكـەن .جـا ئەگـەر دەڵێـن شـووكردن (مغـامرە) یـە ئـەوا مـن (مغامرەیـەكی مضمـون)و مسۆگەرم كردووە ، كەشووم كردووە بە(عمران خان) چونكە لای موسڵمانان رێژەی تەڵاق زۆر كەمترە لەچاو رۆژئاوادا و منیش دەمـەوێت بەهـەموو جۆرێك خـۆم بگونجێنم لەگەڵ ژیانی (لاهور)دا .... زۆركەس دەترسان لەوەی كەسەركەوتوو نەبم لەم هەنگاوەمدا بەڵام لەسایەی خواوە ئێستا هەست بەبەختیاری و دڵنیایی تـەواو دەكـەم لەژیانمدا .( عمـران خان) سەرگەرمی كاری سیاسیە لەپارتی (العدالة) دا و ئێستاش كوڕ و كچێكمان هەیە و منیـش لەهـەوڵدام لـەرێی ئاهـەنگی خێرخوازییـەوە پـارە كۆبكەمـەوە بـۆ یارمـەتی خەستەخانەی عمـران خـان بـۆ چـارە سـەری شـێرپەنجە لـە شـاری لاهـور .( هـەمان سەرچاوەی پێشوو) .

## ( ٣٢ ) نیكولاس انیلكا

یاریكەری فەرەنسی و یاریكەری ریاڵ مەدریدی ئیسپانی (نیكـۆلاس انیلكا) بەدوای ئاسـوودەیی رۆحیـدا دەگـەڕێ و سـەرگەرمی لێكۆڵینـەوەی ئیسـلامە بۆئـەوەی لـەپاش دڵنیـایی تـەواو موسـڵمان بێـت .(نیكـۆلاس انیلكـا) كـە هـێرش بـەرێكی فەرەنسـییە و ( فەریقی ریـال مـەدریدیی ئیسپانی) بە(٢٣)ملیـۆن جونەیـهی ئیسـتەرلینی رێكـەوتوون لەگەڵیا كەیاریان بۆ بكات ، ئێستا دیراسەی شەریعەتی ئیسلامی دەكات و ئاواتە خـوازە ببێتە موسڵمانێكی چاك و بەتەواوی پابەندی ئیسلام بێت .( نیكۆلاس انیلكا) دەڵێـت : موسـڵمان بـوونم مەسـەلەیەكی تایبەتـە بـەخۆم و درێـژەی ئەوباسـە هـەر لای خـۆم

دەمێنێتـەوە و ، حـەزیش دەکـەم بزانــن کەژمارەیــەکی زۆر لەیاریکــەرە فەڕەنســی‌یەکان کەتەمەنیان لـە(۲۱) سـاڵ کـەمترە ، هـەموویان بەیەکـەوە سـەرگەرمی لێکۆڵینـەوەی وردی ئیسلامن و بەتەمان لـەداهاتوودا موسڵمان ببن ، لەبەرئەوەی کە ئیسلام تاقە رزگارکەرە بۆیان لەم دنیای ماددیات و جەنجاڵەدا کە مرۆڤی تووشـی دڵـەراوکێ و نائارامی کـردووە ( هەمان سەرچاوە)

## ( ۳۳ ) کریس جاکسون

( کریس جاکسون) یاریکەرێکی باسکەی ئەمریکی‌یە و موسڵمان بوو و نـاوی خـۆی گۆڕی بۆ ( محمود عبدالرؤوف) ...(کریس) وەك دەیەها هەزار ئەمریکی رەش پێست کە روویـان کردۆتـە ئیسـلام لـەم چـەند سـاڵەدا ، بەشـانازیی‌یەوە موسـڵمان بوونــی خــۆی راگەیاند لەساڵی ۱۹۹۱دا ، لەبەرئەوەی کە ئیسلام ئاینی یەکسانی و دادپەروەری‌یە و ، رازی نیە بەچەوسانەوە و ستەمکردن و جیاوازی ناکـات لـەنێوان خەڵکی‌دا لەسـەربنەمای رەنـگ و زمـان و ...هتـد ئیسلام هـەر لەسـەرەتاوە بەیـەك چاو سەیری بیـلالی حەبەشــی و صوهەیبی رۆمی و باقی هاوەڵانی کـردو هـەموو وەك بـرا بـەبێ جیاوازی بەیەکەوە ژیـان .لەمانگی سێی ساڵی ۱۹۹٦دا ( محمود عبدالـرؤوف) رازی نـەبوو لـەگۆڕەپانی یاریـسدا بوەستێ لەژێر ئاڵای ئەمریکی‌دا بۆ سروودی نیشتمانی و ، وتی ئەم ئاڵایە نیشانەی زوڵم و ستەم و چەوساندنەوەیە لەجیهاندا *

بەهۆی ئەم هەڵوێستەیەوە ، یەکێتی باسکەی نیشتمانی ئەمریکی سزایاندا بەوەی کە رایـان گـرت لـەیاریکردن ، کەبەمـەش بـۆ هەریاری‌یـەك نزیکـەی( ۳۱۷۰۷) دۆلار زیـانی لێدەکەوێت ، کە دەستکەوتی ساڵانەی دەگاتە ( ٦ر۲) ملیـۆن دۆلار ...(محمـود) بـێ باکە لەو زیانە گەورەیە و سوورە لەسەر هەڵوێستەکەی خۆی ، هەرچـەندە هـەندێ لـەهاوەڵانی لۆمــەی دەکــەن و هەندێکی‌تریشــیان ئــاواتی پــێ‌دەخــوازن، وەك (لافونســو) ی یاریکــەری باسکەی تیپی ( نیجتس) ی ئەمریکی کە دەڵێ : ( خۆزگە ئەوەندەی محمود عبدالرؤوف دڵسۆزە بۆ ئاینەکەی ئێمەش ئەوەندە دڵسۆزیمان هەبوایە بۆ ئاینەکەمان کە بەناو ئێمە گاورین ! ) . (هەمان سەرچاوە ) .

---

* ئەمریکا تەنها لەڤیەتنام دا نزیکەی سێ ملیۆن کەسیان کوشت و بۆمبی ئەتۆمیان دا بەسەر یابان دا وبە سەدان هەزارکەسیان قڕکرد .

## ( ٣٤ ) كريستوفر

رۆژنامەی ﴿ الراية القطرية ﴾ لە ساڵی ١٩٩٧ دا ، لەژێر سەردێڕی گەورەترین زانای ئابووری لە جیهاندا موسڵمان دەبێت ، دەڵێت :پێش چەند ڕۆژێك زانای ئابووری بەریتانی ﴿ كریستۆفر شامونت ﴾ موسڵمان بوو و ناوی خۆی گۆڕی بۆ (احمد) ، وەلە بارەی خۆیەوە دەڵێت : ئەوەی بەدوایدا دەگەڕام لە ئیسلامدا دۆزیمەوە و، بەڕاستی هەرچی گرفتێك بۆ ئادەمیزاد پێش بێت چارەسەرەكەی لە ئیسلامدا دەدۆزیتەوە .بەڕاستی ئیسلام ئاخاوتن لەگەڵ عەقڵدا دەكات و دەیخاتە سەر ڕێی ڕاستو، بەختەوەری دنیاو ئاخیرەتی بۆ دەستەبەر دەكات ، وەبۆم دەركەوتووە كە ئیسلام هۆكارەكانی پێشكەوتنی شارستانیو سەركەوتنی زانستی تیایە ، بەلاَم بەداخەوە موسڵمانان سستن و دوور لە ڕێنمایی ئایینەكەیان دەژین ، كەئەمەش وای كردوە گەلانی تر پێشیان بكەون ، كەلەمەشدا پێچەوانەی پێشینانن كەهەمیشە یەكەم بوون لە گرتنە بەری ڕێگای شارستانیو پێشكەوتن لە هەموو بوارەكانی زانستو ئابووریو كۆمەلاَیەتیدا ....(مستقبل الاسلام خارج ارضه ـمحمد الغزالی )

## ( ٣٥ ) ئەكتەرێك

ئەو ئەكتەرەی كە دەوری محمد علی كلای بینی لە فلیمی ژیانی كلای‌دا لەئەنجامی كاریگەری ئیسلامەوە لەسەری موسڵمان بوو...

## دواوتە

فروستادەی جیهانەكەم ... پێغەمبەرم ..

هەوارگەی ڕێی تاوسانم ... ئەی ڕێبەرم ...

ئەمڕۆ ژیان هەروەك جاران ... سەرەتای ڕێ ... یەكەم هەنگاوی كاروان ... هاوەلاَنت بێبەش كران لەخوانی ژیان ... لەتەرزی ئاسایی تەمەن ... لەڕامانی گەشت و چەمەن ...

ئەی پێشەوام ... لوتكەی چیام...یادت بەخێر تاڤگەی زولاَڵ

شەپۆلی دەریای موحیبەت ، سلاَو لەسەحەری شەماڵ ...

هەناسەكەم ...جاران سومەییە و خەنسا و كاروانی پاكیزەكانی بالاَپۆشی ، خۆیان بەهوردوی شوێن هەنگاوی تۆ ئەزانی ... ئەمڕۆش هەروا ... لەئەڵمانیا هەشت هەزار

ئافرەتی روسوور ... سەرپۆش بەسەر...لەکۆمەڵەی (خوشکانی موحەممەد) دا خۆیان بەمرواری کۆشکی تۆ ئەزانن ... خۆیان بەدڵۆپی بارانی میهرەبانی تۆ ئەزانن ...

ئەی فەخری سەرگرۆی جیهان ، بارانی کەژانی ساکۆ سلاو لەنمەی میهرەبان ...

ئەی ستوودەی بەختیاری ... ئەی پێغەمبەر ..

ئەی رزگار کەری گرۆی بەشەر..ئەوسا کەپێشەوا عەلی..منداڵبوو...فرۆبوو هێشتا کاڵبوو...میوەی بەهەشت بوو...جوان بوو.. سەردەستەی هوردوی لاوان بوو... ئەمڕۆش هەر لەئەڵمانیا ... رەواڵێکی پاك و جوان ...دوانزە ساڵان ... لەکارێزی زولاڵتان تینووشکێنی بڕوابوو ...هاتە ناو ئەڵقەی ئیمان و بەزەنگی تەلەفۆنێك بەمامۆستاکەی باوکی وت : ـ بەڵێ قوربان منیش عاشق بەرێگای خوام... ئەخوازم قبوڵم بکەن بە شاگردی ئە م مەدرەسە و، بەمیوانێکی بانگنە کراو...

پیری خواناس لەزەنگ راما ... زرنگەی شادی دێتە گوێ...ئەم منالە بەم ناوەختە بەرەو کوێ ئەکەوێتە رێ ؟! بۆیە هێمن هەروەك پروشەی بەفری شادی وتەکانیدابارانە سەر رۆحی پاکیزەی ئەو منداڵە خوێن شیرینە :

- رۆڵە بەندی جگەرەکەم ...هێشتا زووە ...وامەزانە دوا قۆناغە و ئێمە گەیشتووینە مەنزڵ... بەڵکو زۆر دوورتر بڕوانە ... تەمەنت کەمی رۆشتووە و هێشتا زۆرترینی ماوە .

ـ مامۆستاکەم لێم ببوورە کاتێ پێشەوا عەلی وەك ئێستای من منالْ بوو عاشق بەئایینی خوابوو وەك پەپوولە بوویە پەروانەی شەمچرای ئەم ئایینە ، کەس رێی لێگرت ... پێغەمبەر ناردیەوە بۆماڵ... پێیووت بوەستە ئەی منالْ ؟!

پیری خواناس کە ئەم لافاوی عیشقەی دی (ئیدی وەستا ) وشەیەکی پێ نەوترا بێجگە لەپیرۆزبایی هیچیتری لێ نەبیسترا [1].

---

[1] المعجزة المتجددة ل ١١١

## سەرچاوەکان


١ـ المعجزة المتجددة / ابي عبدالرحمن صالح اليافعي / الطبعة الاولى
٢ـ جريدة المسلمون .
٣ـ جريدة الوطن .
٤ ـ الشرق / ژمارە /٣٥٨٦ /١٩٩٨ .
٥ ـ لماذا أسلمنا / عبدالحميد السحيباني .
٦ ـ جريدة العكاظ / ساڵی ٢٠٠٠ / ژمارە / ١٢٢٠٠
٨ ـ ثمرة الفضيلة / كيف اسلمت هذه المرأة النرويجية / احمد عبدالرحمن الصويان .
٩ ـ مجلة الاسرة /١٤١٩/٦٦ / رمضان ، و ژمارە ٨٥/ ١٤٢١ هـ
١٠ ـ مجلة النور /٧٩ /١٩٩٧ .
١١ ـ تۆڕی ئینتەرنێت ـ مواقعی ئیسلامی .
١٢ـمستقبل الاسلام خارج ارضه ـمحمد الغزالی
١٣ـ السيرة النبوية / ابو حسن الندوي .


## پێڕست

## پێشەکی

سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ خوای پەروەردگاری جیهان و درود و سەلامیش لەسەرگیانی سەرداری پێغەمبەران و یارو یاوەرو شوێنکەوتوان...

(بەهاری دڵان) لەسای نزاکەی حەزرەتدا ﷺ درێژە بەچەند بەشێکی تری دەدات و دەخوازێت کەخزمەتێ بە خوێنەران و دوا پەیامی پیرۆزی خوایی بکات... لەم بەشی چوارەمەدا لەچەند تەوەرەیەك دواوین:

**یەکەم:** نیعمەتی عەقڵ و ژیری و بیرکردنەوەو وردبوونەوە لەبوونەوەرو قورئان و ژیان نامەی پێغەمبەر ﷺ...

**دووەم:** قورئان ئەو پەیامەیە کە خۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەلەلایەن خواوە هاتووە، هەرچەند خوای گەورە خۆی شایەتی دەدات لەسەر ڕاستێتی و تەواوێتی و مەلائیکەتانی و زانا بەویژدانەکانیش بەهەمان شێوە شایەتی بۆ دەدەن.

**سێیەم:** وردبوونەوە لەلایەنێك لەژیاننامەی پربەرەکەتی حەزرەت کە ئەویش لایەنی ڕەحمەت و نارەحەتیەکانی ژیان و فرمێسکە یاقووتی یەکانێتی.

**چوارەم:** چەند نموونەیەك لە فرمێسکی هاوەڵان و شوێن کەوتوان و بانگخوازان و باسی ئاتاجی زۆرمان بەو فرمێسکانە کەلە ترسی خوابن و گوناهمانی پێ بشۆرێنەوە.

**پێنجەم:** ڕێبوارانی ڕێ و یادەوەرییان و ئامۆژگارییان بۆ چوون بەرەو سەرکەوتن و سەرفرازی لەدنیاو قیامەتدا.

**شەشەم:** چمکێك لەفێڵ و تەڵەکەو سیخوڕی دوژمنان و پیلانی نەبڕاوەیان بۆ بەرگرتن لەبڵاوبوونەوەی پەیامی خوایی بەسەرتاسەری جیهاندا.

**حەوتەم:** ئەونەوەیەی دەستی پەروەردگار دەیچێنێ، دەستی ئادەمیزاد ناتوانێ بیدروێتەوەو قەلاچۆی بکات و...! تێگەیشتن لەقەدەری خوا لەناردنی پێغەمبەران و پشتگیری بانگخوازاندا...

**هەشتەم:** چەند نموونەیەك لەسەر هەوڵ و خەباتی پیاوان و ئافرەتان، کە ماندوونەناسانە لێبڕان بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خواو ڕزگارکردنی خەڵکانی خوا لەنەفامی و تاریکاییەکان بەرەو نوورو هیدایەتو بەهەشتی بەرینی هەتا هەتایی. کە ئەوانەش بەڵگەن لەسەر ئەوەی بەردەوام تاقیامەت دەستەوتاقمی هەق دەمێنن و لەسەر هەق و ڕاستی سووردەبن، حەزرەت ﷺ دەفەرموێ: ( لا تزال طائفة من أمتي قائمة بامر الله

، لايضرهم من خذلهم ولا من خالفهم حتى يأتي أمر الله ،وهم ظاهرون على الناس) بخاري ..

**له رەوشتی بەرزی ئیسلامە کە ئەبێ بەرێزەوە بڕوانینە هەوڵ وکۆششی بڕواداران وکاری کەس بەکەم نەزانینوسوود لە ئەزموونی چاکیان وەرگرین ودوعای خێریان بۆ بکەین هەروەك قورئان فێرمان دەکاتو دەفەرموێت** ﴿ والذين جاؤا من بعدهم يقولون ربنا اغفر لنا ولاخواننا الذين سبقونا بالايمان ولا تجعل في قلوبنا غلا للذين امنوا ربنا انك رؤوف رحيم ﴾ الحشر ١٠ **..بۆیە ئێمەش لەم بەهارەدا نموونەمان هێناوە لە کۆنو نوێ، لە کوردو عەرەب و بیانی ولە رابوونی نوێ و ئەزموونی پڕخێری شێخ عیساو شێخ موساوکاك ئەحمەدی شێخ وهەرکەسێك کە بۆ ئەم ئایینە بەردێکی نابێتە سەر بەردێك . بەو هیوایەی کەزیاتر شارەزا بین وهەوڵبدەین وخوا لە خۆمان رازی بکەین فەرموون لەگەڵ بابەتەکانی ئەم بەشەدا :**

## (١) نیعمەتی عەقڵو ژیری

**خوای گەورە نیعمەتی عەقڵیداوە بەمرۆڤ و دەفەرموێت:**﴿ قل هو الذي أنشاكم وجعل لكم السمع والابصار والافئدة، قليلاً ماتشكرون ﴾ الملك٢٣ **واتە: پێیان بڵێ خوایە کە گوێو چاوودڵو(عەقڵی) داوەپێتان، کەچی کەمتان شوکرانە بژێرو سوپاسگوزارن.**

**هەروەها دەفەرموێت:**﴿ ولا تقف ماليس لك به علم، ان السمع والبصر والفؤاد كل اولئك كان عنه مسؤولاً﴾ الاسراء: ٣٦ **واتە: لەشتێك مەدوێو شوێنی شتێك مەکەوە کەزانستو زانیاریت دەربارەی نیە، چونکە بەراستی گوێو چاوو دڵو (عەقڵ) هەر هەمووی‌مرۆڤ بەرپرسیارە لەبەرامبەریانەوە.**

**هەروەك چۆن چاو پێویستی بەڕووناکی‌یە بۆ ئەوەی شتەکان بەچاکی ببینێ، هەرواش عەقڵ پێویستی بەهیدایەتی بەرنامەی خوایە کەرێنمایی بکاتو رووناکی بخاتە سەر شتەکان...هەر بۆیە قورئانیش باس لەنووری هیدایەت دەکاو خەڵکی لەتاریکایی‌یەکانی کوفرو گومڕایی‌یەوە دەبات بەرەو هیدایەتو رووناکی** ﴿ كتاب أنزلناه اليك لتخرج الناس من الظلمات الى النور ﴾ ابراهيم: ١ .

**رۆژێك لاوێك بەخەلیفە عومەر دەڵێ: باشە ئێوە کاتی خۆی عەقڵتان نەبوو، وادەچوون بتو داروبەردتان دەپەرستو لەخورما خوایەکتان بۆخۆتان دروست دەکردو کە برسیتان دەبوو دەتان خوارد؟**

**حەزرەتی عومەریش فەرمووی: بەڵێ عەقڵمان هەبوو، بەلأم هیدایەتمان نەبوو!**

**کەسێ خوا هیدایەتی نەدات لەکوێ هیدایەت دەهێنێ؟!**

**قورئان دەفەرموێت:** ﴿ومن لم يجعل الله له نوراً فما لــه مـن نـور﴾ النـور/٤٠ **واتە: کەسێك خوا نووری نەداتیٚوریٚی بۆ رۆشن نەکاتەوەو هیدایەتی نەدات، لـەکوێ دەتوانـێ نووری هیدایەت بەدەست بهێنێ؟!هـەروەها دەفەرموێت:** ﴿ افرأيـت مـن اتخـذ الـه هـواه واضله الله على علم وختم على سمعه وقلبه وجعل على بصره غشاوة فمن يهديه من بعد الله أفلا تذكرون﴾ الجاثية/٢٣ .

**واتە: هەواڵم بدەرێ ئایا ئەوکەسەی کەویستو ئارەزووی خۆی کردۆتە خوای خۆی؟! بـەهۆی ئەوەوە خـواش گومڕای کردووە کەزانیویـەتی شـایانی ئەوەیـە، لەئـەنجامی بـەد هەڵوێستی خۆیداو مۆری ناوە بەگوێو دڵو ژیـریداو پەردەشـی هێناوە بەسـەر چاویدا ، جا ئیتر کیٚهەیە جگە لەخوا هیدایەتو ڕێنموونی بکات، ئایا بیرناکەنەوە؟!**

**جا ئەوانەش کەدڵو ژیـریو چاوو گوێیـان بـەچاکی بـەکارناهێنن، وەکـو ئاژەڵ وانو بگرە گومڕاتریشن** ﴿لهم قلوب لا يفقهون بها ولــهم أعيـن لايبصـرون بـها ولـهم اذان لا يسمعون بها اولئك كالانعام بل هم أضل ﴾ الاعراف/٤٦..

## بۆچی بیرناکەنەوە؟!

**قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:** ﴿ يعلمون ظاهراً من الحياة الدنيـا وهـم عـن الاخـرة هـم غافلون، اولم يتفكروا في انفسهم ما خلق الله السماوات والارض وما بينـهما الا بـالحق وأجل مسمى ﴾ الروم/٨ **واتە: هەر ڕواڵەت لەژیانی دنیا بەدی دەکەنو، لەبەرامبەریشەوە بیٚئاگان لەرۆژی دواییو قیامەت. ئایا ئـەوە لـەناخی خۆیـاندا بیریٚکیـان نەکردۆتـەوە، کە خوا ئاسمانو زەوی وهـەرچی لەنێوانیاندا هەیـە تەنـها بەهـەق بـۆ ئەجـەلێکی دیـاریکراو نەبێت دروستی نەکردوون؟ لەڕاستـی دا زۆربـەی خـەڵکی بیٚباوەڕن بەگەیشتنە خزمـەتی پەروەردگاریان.هەروەها دەفەرموێت:** ﴿ وهو الذي يحي ويميت وله اختلاف الليل والنهار افــلا تعقلــون ﴾ المؤمنــون :٨٠ **واتـە: خواوەنـدە کـە دەژێنـێو دەمرێنـێو شـەوو ڕۆژ بەدوای‌یەکدا دێنێ، نابێ عەقڵیان بخەنەکار ؟!**

﴿ انَّ في خلق السموات والارض واختلاف الليل والنهار لايات لاولي الالبـاب ﴾ ال عمـران: ١٩٠ **واتە: بەڕاسـتی لەبەدیـهێنانی ئاسمانـەکانو زەویو هـاتنی شـەووڕۆژدا بەڵگەو نیشانەو ئایەتی زۆر هەیە بۆ خاوەن ژیریو فامیدەکان.**

هەروەها قۆناغەکان ژیان ، لاوازی لەمناڵیداو ئەوپەڕی توانا لەلاوێتیداو جارێکیتر لاوازی لەپیریدا، جێی بیرکردنەوەیە بۆ ژیرەکان ﴿ ومن نعمره ننکسه في الخلق افلا تعقلون ﴾ یس واتە: هەرچی تەمەنی بدەینیو پیربێ، لاوازی دەکەین نابێ بیربکەنەوە؟!

**پێیان بڵێ:**

﴿ قل لوشاء الله ماتلوته عليكم ولا ادراكم به فقد لبثت فيكم عُمُراً من قبله افلا تعقلون ﴾ یونس/١٦ پێیان بڵێ: ئەگەر خوا بیویستایە، قورئانم بەسەردا نەدەخوێندنەوەو، خوایش ئاگاداری نەدەکردن پێی، چونکە بەڕاستی ئاشکرایە کەمن تەمەنێکی دوورو درێژم لەناوتانا بەسەر بردووە پێش هاتنی قورئان، کەواتە بۆچی عەقڵو بیروهۆشتان ناخەنەکار، کەسێکی نەخوێندەوار تاتەمەنی چل ساڵی هیچ نەڵێت، بەمەرجێك ناوبانگی دەرکردبێت بەڕاستگۆییو دەستو داوێن پاکی، کەچی لەوتەمەنە بەدواوە ئەم قورئانە رێکوپێکە رابگەیەنێت، ئایا ڕەوانیە هەرکەس دەیبیسێت خێرا بڕوا بهێنێ بەو خوایەی کەناردوویەتیو ئەوکەسەش کەبۆی ڕەوانەکراوە؟ هەروەها : ﴿ قل : انما أعظكم بواحدة، أن تقوموا لله مثنى وفرادى ثم تتفكروا ما بصاحبكم من جنة، ان هو الا نذير لكم بين يدي عذاب شديد ﴾ سبأ :٤٦ واتە: پێیان بڵێ: بەڕاستی من یەك ئامۆژگاری ئێوە دەکەم ، کە بۆ خواو لەبەرخوا، دووقۆڵی یان بەتەنهایی هەڵوێستەبکەنو پاشان بیربکەنەوە ( لەم قورئانە، لەم بەرنامەیە ، لەم پێغەمبەرە) ئەم هاوەڵەی ئێوە(محمد) شێت نیە، بەڵکو تەنها ترسێنەرێکی ئێوەیەو هیچی تر ، پێش ئەوەی سزایەکی سەخت ڕووبەڕووتان ببێتەوە...

**هەروەها** : ﴿ قل ما سألتكم عليه من اجر فهو لكم، ان اجري الا على الله وهو على كل شيء شهيد، قل ان ربي يقذف بالحق علام الغيوب، قل جاء الحق وما يبديء الباطل وما يعيد ﴾ سبأ/٤٩ پێیان بڵێ: هەرچی پاداشتو کرێیەکم داواکردووە هەر بۆخۆتان ، من پاداشتم تەنها لەسەر خوایە ، ئەو خوایەش شایەتە بەسەر هەمووشتێکەوە.ئەی(محمد) ﷺ پێیان بڵێ: بەڕاستی من پەروەردگارم سەرەنجام حەق سەردەخات بەسەر ناحەقداو بەڕاستی ئەو زاتە شارەزاو زانایەکی بێسنوورە بە نهێنی شاراوەکان .

هەروەها بڵێ: هەقو راستی هاتو ناهەق ئیتر دەرناکەوێت. نەدەتوانێت دەست پێبکاتەوە ، نەدەتوانێت بگەڕێتەوە دۆخی جارانی...

بەڵێ ... عەقڵو ژیریتان بخەنەکار، قورئان هەڵبەستراو نیە، هۆنراوەنیە پەخشان نیە، جادوونیە...هتد، پێش ئەوەی لەدۆزەخدا بڵێن: ئەگەر گوێمان بگرتایە ، یان عەقڵمان

هەبوایە دووچاری ئەم ڕۆژە سەختە نەدەبووین ﴿ وقالوا لو كنا نسمع أو نعقل ما كنا في أصحاب السعير ، فاعترفوا بذنبهم فسحقاً لأصحاب السعير ﴾ الملك/١١.

## (٢) قورئانی پیرۆز هۆنراوەنیە !

لەو ڕۆژەی ئەم ڕاستیە هاتووە بۆ بەرەی ئادەمی ، دەستەیەك بەناهەق و ناڕەوا دژایەتی دەكەن و پڕوپاگەندەی بۆ بلاّودەكەنەوە، قورئانیش وەلاّمی ئەو ناهەقیانە دەداتەوەو پووچەڵیان دەكاتەوە... دوژمنان دەیان وت: قورئان هۆنراوەیەو (محمد) هۆنیویەتیەوە، لەكاتێكدا كەدنیا دیدەو شارەزاكانیانو زۆری تریش دەیان زانی وانیەو لەناوخۆیاندا ئەم ڕاستیەشیان دەدركان..

(عتبەی كوڕی ربیعە) بەقوڕەیشی‌یەكانی وت: (من گوێم لەشتێك بووە كە هەرگیز هاوشێوەیم نەبیستووە، بەخوا نەجادووەو نەهۆنراوەیەو نەقسەی كاهینەكانە... كوڕ گەلی قوڕەیش، بەقسەم بكەن و وازی لیّ بهێنن، بەخوا ئەوەی كەمن لێم بیست ئەبێتە دەنگوباسێكی گەورە ) ...ئەمە لەسەردەمی كۆنداو لەتازەشدا ئەوە ڕۆژهەلاّتناسی فەڕەنسی دكتۆر مادریش، كە هەردوو وەزارەتی دەرەوەو مەعاریفی فەڕەنسی داوایان لێكرد كە قورئان وەربگێڕێتە سەر زمانەكەیان، ئەویش بەكارەكە هەستاو لە پێشەكی‌یەكەی‌دا كەلەساڵی ١٩٢٦زدا دەرچووە دەڵێ: ( شێوازی قورئان دیارەكە لەخواوەیە، لەڕاستیشدا زۆر لەنووسەرە گوماندارەكان لەئەنجامدا ملیان بۆداو كەوتنە ژێر كاریگەرەكەیەوە...

ئەو كاریگەرەی كە هەیەتی لەسەر سێسەد ملیۆن موسڵمان كە بەچوار قوڕنەی دنیادا بلاّوبوونەتەوە...مژدەدەرە بیانیەكان یەك دەنگن لەسەرئەوەی كە كاریگەری ئەم قورئانە ئەوەندە زۆرە لەسەر شوێن كەوتووەكانی كەتەنانەت نەسەلماوە كە تاقە موسڵمانێك پاشگەزبووبێتەوە لەئاینەكەی !

ئەم قورئانە كەوەك پەخشانێكی زۆر جوانە ، كاریگەرێكی زۆر قوڵی لەسەر دەروونی گوێگرەكەی هەیە، ئەگەر لەعەرەبی تێبگات... بۆیە ڕەنجێكی بێهوودەیە كەكەسێك هەوڵ بدات ئەو كاریگەرە جوانەی داڕشتنەكەی كەوێنەی ئەوە نەبیستراوە بگۆڕێ بەزمانێكی دیكە، بەتایبەت زمانی فەڕەنسی كەبەر تەنگەو ناتوانرێ ئەوەی لەهەست و سۆزدایە پیّی دەرببڕێت )...

هەروەها لەم سەردەمەشدا ئەدیبی لوبنانی (مارون عبود) بەویژدانەوە دانی نا بە ئیعجازی قورئانداو خۆشەویستیو ڕێزی خۆی دەربڕی بۆ حەزرەت ﷺ و کوڕەکەشی ناونا(محمد)...

ئەدیبی گەورەی مەسیحیش(ابراهیم الیازجی) نەیتوانی خۆی لادا لەباسی گەورەییو ئیعجازی قورئان...

هەروەها ئەدیبی شاعیر( نقولا حنا) قورئانی خوێندەوەو گەیشتە ئەو یەقینەی کە قورئان پەڕاوێکی موعجیزەی خواییەو لەهەموو موعجیزەکان گەورەترەو هەتا هەتاییەو ، سەرەنجام موسڵمان بوو، وە دەڵێ: قورئانم خوێند سەرسامی کردم، قووڵ بوومەوە کەمەندکێشی کردم، ئنجا دووبارە خوێندمەوە ، ئیمانم هێنا... ئیمانم هێنا بەقورئانی گەورەی خواییو بەونێرراوەی کە گەیاندی، پێغەمبەری بەڕێزی عەرەبی ، من لەگاورێتیەکەمەوە باوەڕم هەبوو بەخوا، بەهۆی قورئانەوە باوەڕەکەم بەخوا گەورەتربوو، جا چۆن ئیمان نەهێنم لەکاتێکدا موعجیزەی قورئان لەبەردەستمایەو سەیری دەکەمو هەستی پێدەکەم لەهەموو کاتێکدا... قورئان موعجیزەیە زیاتر لەموعجیزەکانیتر، موعجیزەیەکی خواییە خۆی بەڵگەیە لەسەر خۆی، یەکی لەکەس نەکەوتووە کە باسی بکاتو پیاهەڵبداتو مژدەی پێبدات ) ...ل ٢٤٤ (اسلوب القران الكريم بين الهداية والاعجاز البياني) د. عمر باحاذق .

## خوا شایەتی بۆ ئەم قورئانە ئەدات:

قورئانی پیرۆز بەحەزرەت ﷺ دەفەرموێ کەبڵێ: ﴿قل أي شيء أكبر شهادة ، قل الله شهيد بيني وبينكم واوحي الي هذا القران لأنذركم به ومَن بلغ﴾ الانعام : ١٩ واتە: پێیان بڵێ: چ شتێك گەورەترین شایەتیە؟ بڵێ: خواوەند شایەتە لەنێوان منو ئێوەداو شایەتیم بۆدەدات، وە ئەم قورئانەی بەسرووش بۆ ناردووم تا ئینزارتان بکەمو ئەوانەش کەدوای من پێیان رادەگەیەنرێت...

خوای گەورەی باڵادەستو ئاگادار بەنهێنییەکانی بوونەوەر لەبارەی قورئانەوە دەفەرموێت: ﴿فلا أقسم بما تبصرون ومالا تبصرون انه لقول رسول كريم ، وما هو بقول شاعر قليلا ما تؤمنون ، ولا بقول كاهن قليلا ماتذكرون ، تنزيل من رب العالمين ، ولو تقول علينا بعض الاقاويل ، لأخذنا منه باليمين ، ثم لقطعنا منه الوتين ، فما منكم من أحد عنه حاجزين﴾ الحاقة : ٤٧ واتە: سوێند بەوانەی کە ئەیانبینن ، وە بەوانەی کەنایان بینن، ئەم قورئانە فەرموودەی ڕەوانەکراوێکی گەورەیە، وەقسەی شاعیر نیە ،

کەچی زۆر کەم بڕوا ئەهێنن؛ وەقسەی کاهین نیە ، کەچی زۆر کەم بیردەکەنەوە ! ئەم قورئانە نێرراوەتەخوارەوە لەپەروەردگاری جیهانیانەوە ، جا ئەگەر ( محمد) هەندێ وتەی بەدەم ئێمەوە هەڵبەستایە ئێمە بەدەستی خۆمان تۆڵەمان لێ ئەسەندو ، پاشان ڕەگی گیانیمان ئەبڕی، وە کەس نەئەبوو لەئێوە کە بکەوێتە نێوانمانەوەو سزاکەمانی لێ دووربخاتەوە...

﴿ وانه لتذكرة للمتقين ، وانا لنعلم أن منكم مكذبين ، وانه لحسرة على الكافرين وانه لحق اليقين ، فسبح باسم ربك العظيم ﴾ الحاقة: ٥٢ واتە: ئەم قورئانە بێگومان پەندو ئامۆژگاریو یادەوەرییە بۆ پارێزکاران، وە ئێمە ئەزانین کە هەندێکتان بڕوا بە قورئان ناکەن، کە ئەمەش ئەبێتە مایەی خەمو خەفەتو داخو پەشیمانی بۆیان، وەبەڕاستی قورئان ڕاستو دروستە، کەواتە ئەی پێغەمبەر تۆش هەمیشە یادی پەروەردگاری گەورەی خۆت بکەو سوپاسو ستایشی بکە.

## ئەگەر قورئان ڕاست نەبێت هیچ شتێك ڕاست نیە !

چۆن ئەگونجێ پێغەمبەرێتی پێغەمبەر ﷺ درۆبێ، تاقە مرۆڤێکی هەژاری، بێکەسی، نەخوێندەواری ، جیهان نەدیدەی پێگەیشتوو لەناو گەلێکی پەستی، بت پەرستی، بێویلی، بێرەوشتو خووی نەخوێندەوارا، بانگی مەردوم بکات بۆ خواناسین، وە بەملیۆنەهاو بلیۆنەها مەردوم بەدەنگییەوە بچن، وە ئاینێکی جیهانی بهێنێ لەماوەی بیستو سێ ساڵدا ، وە دەوڵەتێکی ئیسلامی دامەزرێنێ، ئنجا لەپاش حەفتا ساڵ بەدرێژی بڵاوبێتەوە لە (جاوە)و (فلپین)ەوە تالێواری دەریای ئەتڵەسی، وەبەپانی لە(قازان)ەوە تا(سەیلان)....وە گەلێکی ئیسلام ڕێك بخا لەتیرەو هۆزو نەتەوەی ئەو ناوچە گەورەیە، وە سەدو پەنجا تا دووسەد نەتەوایەتی بتوێنێتەوە لەبۆتەی ئیسلامەتیدا، وە ئەمانە بکات بەبرا، وەجیاوازی هەڵگرێ لەناویانا، وەقەڵاو کۆشکێکی گەورەیان بۆ دروست بکات، وە دەستوورو شەریعەتێکی وای بۆ دانابن کەمایەی ژیانی هەردوو جیهانیان بێ، وە ئەمە یەکەمجاربێ لەمێژووی ئادەمیدا کەپێغەمبەرێك هاتبێو توانیبێتی ئادەمی یەکخا بەهەموو تیرەو هۆزو نەتەوەیەکییەوە، وەتاکو تەنیایی خوا بەو ڕەنگەی کە قورئان ئەفەرموێ بڵاویبکاتەوە لەناویانا.

جگە لەوەی کەنامەیەکی بەرزی زانستی وەك قورئانیشی هێنابێ، وە دەرگای زانینی لەکۆمەڵی ئادەمی کردبێتەوە، وە قوتابخانەیەکی ئیسلامەتی دانابێ، وە بەملیۆن

پێشـــەواو زانــای لێدەرچووبــێ، وە بەملیۆنـــەها پـــەڕاویان دانــابێ لەهـــەموو جـــۆرە زانیاری‌یەکدا، کەنامەخانەکانی رۆژهەلاتو رۆژئاوا ئەمڕۆ بەدەست نووسەکانی ئەوانەوە شانازی دەکەن...

هـەروەك تۆمـاس کار لایل لـە(الابطـال)دا دەڵـێ: ئەگـەر ئەمـەی پێغەمبـەر کردوویـەتی بناغـەی لەسـەر درۆبـێ، ئەوکاتـە ئـەبێ جیـهانیش بناغـەی لەسـەر درۆبــێ، وەهــەرچی لەجیهانایـە بـەخۆرومانگو ئەسـتێرەو زەویی‌یـەوە هـــەمووی درۆ بێــت، وە هـــەمووی رێشکەوپێشکەی چاوبێ...ل١١٠ تەفسیری خاڵ / جزمی تبارك.

بەڵێ... ئاسمانەکان و زەوی بەهەقو مەبەست دروستکراونو لەسەربناغەی درۆنین: ﴿ الم تر أن الله خلق السموات والارض بالحق ﴾ ابراهیم /٢٠. واتە : ئایا نابینی کە خوا ئاسمانەکانو زەوی بەهەقو راستی دروستکردووە...

جا هـەروەك ئەوانەی بەهـەق دروسـتکردووە، هـەرواش پێغەمبـەرێکی بەهـەق نـاردووە ﴿ یا ایها الناس قد جاءکم الرسول بالحق من ربکـم ﴾ ال عمـران /١٧٠ ﴿ انـا ارسـلناك بالحق بشیراً ونذیراً ﴾ البقرة/ ١١٩ ، وە ئەم قورئانەشی هەر بەهەق ناردووە ﴿ ذلك بأن الله نزل الکتاب بالحق ﴾ البقرة / ١٧٦ ، هەروەها ﴿ وبالحق أنزلنـاه وبـالحق نـزل ومـا ارسلناك الا مبشراً ونذیراً ﴾ الاسراء / ١٠٥ ، واتە: بەهەق قورئانمان ناردووەو هەقیشی لەگـەڵ خـۆی هێنـاوە، وەتۆمـان نـەناردووە مەگـەر بـەمژدە دەرو ترسـێنەر نـەبێت، ( ل١٨٥ لەخزمەت قورئاندا . نووسەر) .

کەواتـە... عـەقڵتان بخەنە کارو دڵنیـابن، هـەرچی لـەم بوونەوەردایـە بەهـەق دروسـت بووەو پێغەمبەرانیش بەهەق هاتوونو حەزرەتیش ﷺ دوا پەیامبەری هەقی خوایە.

### حەزرەت ﷺ شاعیر نیە !

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿ وما علمناه الشعر وما ینبغي له ، ان هو الا ذکر وقران مبین، لینذر من کان حیاً ویحق القول علی الکافرین ﴾ یس /٧٠

واتە: محەمدمان فێری هۆنـراوە نـەکردووەو نـاگونجێ بۆی هۆنـراوەش بڵـێ، بەراستی ئەوەی بۆمان ناردووە یادخەرەوەو قورئانێکی روونو ئاشکرایە ، تا ترسێنەر بێت بۆ دڵ زیندوانو، بەهۆی شوێن نەکەوتنیشیەوە ببێتە مایەی سزا بۆ کافران...

دیـارە لـــەدنیادا شـــاعیرەکان بەئـــەزموونی زۆردا دەڕۆنو وردە وردە لەقوتابخانـــەی ژیانەوە فێردەبنو هەوڵ دەدەن هۆنـراوە لـەدوای هۆنـراوە وشـەی بـەپێزترو مانـای جوانتر

بهێنن، بەپێچەوانەی حەزرەتەوە ﷺ کە تا تەمەنی چل ساڵی هیچ شتێکی نەوتووەو پاشانیش یەکەم ئایەتو دواهەمین ئایەت لەیەك پلەی بەلاغەتو ڕەوان بێژی و جوانیدان، زیاتر لەوەش بەیەکجار هەموو سوورەتی(انعام) دابەزیوەتە سەریو لەدڵیدا جێگیرکراوەو بەهاوەڵانی فەرمووە... قورئان خۆی ئاماژە بۆ ئەمە دەکاتو دەفەرموێ :

﴿ واذا تتلى عليهم اياتنا بينات قال الذين لا يرجون لقاءنا ائت بقران غير هذا أو بدله، قل ما يكون لي أن ابدله من تلقاء نفسي ، ان اتبع الا ما يوحى اليَّ اني أخاف ان عصيت ربي عذاب يوم عظيم ، قل لوشاء الله ما تلوته عليكم ولا ادراكم به ، فقد لبثت فيكم عُمراً من قبله افلا تعقلون ﴾ يونس/١٦ واتە: ئەگەر ئایەتە ڕوونو دیارەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێت، ئەوانەی کەنایەنەوێو حەزناکەن بەئێمەبگەنەوە، دەڵێن: قورئانێکی تر بهێنە، یان بیگۆڕە ، پێیان بڵێ: بۆ من نەهاتووە کە بیگۆڕم لەخۆمەوە، من شوێنکەوتەی ئەوەم کە بۆم دێت بەسروش، بەڕاستی من دەترسم لەسزای ڕۆژی دوایی ئەگەر نافەرمانی پەروەردگارم بکەم، پێیان بڵێ: ئەگەر خوا بیویستایە بۆم نەدەخوێندنو ئاگادارم نەدەکردن لێی، خۆ من لەپێشتردا تەمەنێك لەناوتاندا ژیاوم، ژیربنو بیرێك بکەنەوە.

بەڵێ ئەم قورئانە سروشەو بۆ هیدایەتو چاکسازی هاتووە ﴿ ان اريد الا الاصلاح ما استطعت ، وما توفيقي الا بالله ﴾ هود/٨٨.

ڕۆژهەڵاتناسێك دەڵێ: هیچ کاتێك چاکسازی زەحمەت نەبووە بەهێندەی زەمانی (محمد) ، لەگەڵ ئەوەشدا توانی لەبیستو سێ ساڵدا ئەو هەموو چاکسازیو گۆڕانکارییە بکات.

### قورئانو زمانی عەرەبی :

زمانی ئینگلیزی نزیکەی بیست هەزار ڕەگ(جذر)ی هەیە کەیەکی نزیکەی دوانزە (اشتقاق)ی بۆ دەکرێو بەمەش نزیکەی دووسەدو چل هەزار وشە دروست دەبێت... بەڵام لەزمانی عەرەبیدا کە دەوڵەمەندترە نزیکەی پەنجا هەزار ڕەگ هەیەو یەکی نزیکەی چل (اشتقاق)ی بۆ دەکرێتو بەمەش نزیکەی دوو ملیۆن وشە دروست دەبێت، قورئانی پیرۆز نزیکەی یەك لەسەر چلی ئەو وشانەی وەرگرتووەو زۆربە وردی بەکاری هێناون، بەجۆرێك کە هەر وشەیە لەجێی تایبەتی خۆیدایەو هیچی تر جێی ناگرێتەوە...

لێکۆڵەرەوان دەڵێن هەموو پیتێك ئەوەندە بەدیقەت بەکارهاتووە، تەنانەت تاقە پیتێك زیادە نیە، بۆیە ئەگەر پیتەکانی سوورەتی (نوح) بژمێرین، دەبینین (٩٥٠) پیتە، کە دەکاتە تەمەنی حەزرەتی(نوح) سەلامی خوای لێبێت .

ئەمە بێجگە لەوەی کە قورئان باس‌و خواسی زانستی وای تێدایە کە لەم سەدانەی دواییدا دۆزراونەتەوە، بۆنموونە (موسوعەی بەریتانی) تەنها باس لە بەشی سەرزەوی شاخەکان دەکات، چونکە زانست تەنها ئەوەندەی دۆزیبووەوە تا ئەو رۆژەی ئەو مەوسوعەیە نووسرابوو، بەلاّم قورئانێکی پێش چواردە سەدە لەمەوبەر کە باسی شاخ دەکات باسی بەشی ناو زەوی شاخ دەکات‌و دەفەرموێت: ﴿ والجبال اوتاداً ﴾ النبأ/ واتە: شاخەکانمان وەك مێخ داکوتاوە، کەلە راستیشدا هەروایە، شاخی ئیڤرست(٩کم) بەرزە لەسەر رووی زەوی‌یەوە و لە ناو زەویشدا بەقووڵی نزیکەی (١٣٥کم) چۆتە خوارەوە، کەبەمەش وەك مێخ وایە کەداکوتراوە بەزەویداو مایەی هاوسەنگی زەوی‌یەو لەنگەری گرتووە هەروەك قورئان دەفەرموێت: ﴿ والجبال ارساها ﴾ الذاريات : ٣٢ هەروەها دەفەرموێت: ﴿ خلق السماوات بغير عمد ترونها والقى في الارض رواسي أن تميد بكم ﴾ لقمان /١٠ واتە : خوای پەروەردگار ئاسمانەکانی بەدیهێناوە و رایگرتووە بەبێ کۆڵەکە هەروەك دەبینن، وە لەزەوی‌دا شاخەکانی داناوە بۆ هاوسەنگی.

( لەفەرموودەشدا جەختکراوەتەوە سەر ئەم مانایە کە دەفەرموێ: عندما خلق الله الارض جعل تميد فأرساها بالجبال ) او كما قال ...

قورئانی پیرۆز پەروەردەیە بۆ پێگەیاندنی مرۆڤێکی بەرەوشتی دەم‌و دەست‌و داوێن پاك‌و، لەهەموو شتێکدا رێنمایی دەکات‌و رێ‌و شوێنی بۆ دادەنێ، تەنانەت لەرۆیشتنیشدا ﴿ وعباد الرحمن الذين يمشون على الارض هوناً، واذا خاطبهم الجاهلون قالوا سلاماً ﴾ الفرقان/ ٦٣﴿ ولا تمش في الارض مرحاً ﴾ الاسراء/٣٧

مرۆڤێك کە هەقی هەموو لایەنەکانی ژیان‌و هەموو کەسێك بدات حەزرەت ﷺ دەفەرموێت: ( اعطوا كل ذي حق حقه )...

جا ئەگەربێین هەر لەکۆنەوە تا ئەمرۆ سەیری بەرهەمی شاعیران‌و ئەدیبان بکەین، کێ هەیە توانیبێتی بەرنامەیەکی تێروتەسەلی ژیان بهێنێت، ئەوە شاعیرەکانی زەمانی نەفامی ، ئەوەیان کە زۆر داهێنانی کردبێ، رەنگە هۆنراوەیەك یان چەند هۆنراوەیەکی جوانی وتبێ‌و وەك رێزلێنان‌و شانازی‌یەك بەدیواری کەعبەدا هەڵواسرابێ؟! کە ئەوانەش ئەگەر بیانخوێنینەوە بەئاشکرا دیارن کەزادەی بیری مرۆڤن ، وە ئەگەر سەیری شاعیرە پایە بەرزەکانی ئەم سەردەمەش بکەین هەربەهەمان شێوەیە ! ..

## ( ٣ ) هیچێکی تازە لەژێر تیشکی خۆردا نیە !

لەسەد هەزار هۆنراوەدا یەکێکی نەبێ هەمووی هەر وتنەوەی قسەی ئەمو ئەوە، لیژنەیەکی گەورە لەسەدەها پیاوی زاناو داناو زمانزانو رۆشنبیر پێکهات بۆ پشکنینی دیوانی هۆنراوەو نووسراوی رۆژهەلاتی ناوەڕاست، سەیریان کرد لەهەموو دیوانی (متنبی)دا تاقە پێنج هۆنراوەی زادەی بیری خۆیەتیو کەس پێش ئەو نەیووتووە ، لەهەموو نووسراوەکانی(جاحظ) یشدا کە نزیکەی سەد نوسراوی هەیە ، تەنها یەك قسەی دۆزرایەوە کەزادەی بیری خۆیەتی کەدەڵێ: مێرووله‌کە زەخیرەی زستانی ئەخاتو گەنم کۆدەکاتەوە ، بۆیە دەنکەکانی دوولەت دەکات تا بۆگەن نەبێت، چونکە ئەگەر وای لێنەکات شین دەبنەوەو بەکاری خواردن نایەن، لەپاش ماوەیەك لەیۆنان ئەم قسەیەیان لەپەڕاوێکی یۆنانیدا دۆزیەوە.

شێخ عەبدوڵلای بەیتوشی کوردی، کەلەزمانیعەرەبیدا زۆر لەمتنبی زاناترەو چوارپێنج هەزار دێڕ هۆنراوەی بەجێهێشتووەو ئەوەندەشی ون بووە، لەتاقە شەش هۆنراوەیدا ئەڵێ: ئەمانە زادەی بیری خۆمنو کەس پێش من نەیووتووە...هەروەها موفتی زەهاوی تاقە چوار هۆنراوەی زادەی بیری خۆیەتی...

**مەولەوی لەلوتکەدایە :**

مەولەوی یەکێکە لەو شاعیرانەی کەداهێنانی زۆریکردووە لەهۆنراوەکانیداو زۆر هۆنراوەی هەیە کەکەس پێشی نەکەوتووە، وەك ئەم چەند هۆنراوەیە :

**یەکەم :**

باڵەخانەی چەم دیوانەکەی تۆن
بانەناو وەخاك ئاسانەکەی تۆن
تکەش عاجزکەردخەیاڵت تێشدا
ئازیز بۆ جاریٚ پابنیٚ پێشدا

واتە: چاوەکانم بەسەرمەوەیە و، سەریشم وەك باڵەخانەوایە بۆ جەستەم، ئنجا ئەم باڵەخانەی چاوانەم دیوەخانی تۆیە، کەتەماشات دەکەم وێنەکەت لەناو بیلبیلەی چاومدا نەقش ئەبەستێ، وەچاوم دەبێ بەدیوەخانی وێنەکەی تۆ ، ئەوەش ئاشکرایە کە گڵەبانی ئەو دیوەخانە لەخاکی بەر دەرگاکەی تۆیە، بەڵام بەداخەوە دیوەخانەکەت بەهۆی فرمێسکی زۆرمەوە هەمیشە دڵۆپەدەکات، وە ئەو دڵۆپەیە خەیاڵەکەی ئێوەی

وەرسکردووە، کەواتە چی ئەبیٚ ، ئەی خۆشەویست ئەگەر جارێك پیٚ بنێیت بەو جێگا دلۆپەیەدا کەبانی چاومە تا بوەستێتەوە، وە چاوەکانم ئەوەندە تکەنەکەن ، چونکە بەوپیٚ پیانانە دەردی دووریم سارێژ دەبێتو گریانەکەم کەم ئەبێتەوە... فەرهاد میرزای مامی ناصر الدین شا کەشاعیرو وێژەرێکی زۆر بەرزبووە، بەئیشی دەولەت دەچیٚ بۆ هەورامانی ئەودیو، وە ئەچێتە دێیەکەی مەولەوی، جا کەمەولەوی دەچیٚ بۆلایو لەدوورەوە دەردەکەوێت ، پیٚی دەڵێن: ئەوە مەولەوی هات، ئەویش دەڵیٚ : خاوەنی باڵەخانەی چەم ، ئەڵێن: بەڵیٚ، ئەویش دەچیٚ بەپیریەوەو بەرێزەوە لەلای سەرەوە دای ئەنیٚو ئەکەونە گفتوگۆ...

**دووەم** :

هەر لەزادەی بیری مەولەوییە کەلەتەمەنی پەنجاساڵیدا دەڵیٚ:

خەم بیم یانی های پێم مەدۆ خەبەر

چە دەرگای هستی تەشریف بەرەوبەر

واتە: کۆم بوومەتەوە ، ئەم کۆم بوونەوەیەم بەزمانی حاڵ پێم ئەڵیٚ : فەرموو مەولەوی لەدەرگای ژیانو دنیاوە بچۆ دەرەوە بۆ قیامەت ، جا چونکە دەرگای دنیا پەستو نزمە ، پێویست بەسەردانەواندنو خۆ کۆم کردنەوە دەکات...

**سێیەم:**

لەتەمەنی شەست ساڵیدا باسی حاڵی خۆی دەکات و دەڵێت:

پوسی تەپڵی گۆش نم کێشان کەم کەم

ئەم سەر ئەوسەرەن دووربینیەکەی چەم

واتە: پێستی تەپڵی گوێم لەبەر پیری کەم کەم شێی کێشاوەو دەنگی نەماوەو گوێم گران بووە، چاویشم کزبووەو شتی نزیك بەگران ئەبینیٚ، وەك دووربینەکەی چاوم هەڵگەڕابێتەوەو پاش پێش تەماشای پیٚ بکەم وایە...

**چوارەم** :

لەتەمەنی حەفتا ساڵیدا باسی قۆناغێکی تری پیرییەکەی دەکاتو دەڵێت:

پێشانی مەیلەش بەزانوو بەردەن

تعظیمی جەناب پیریمیش کەردەن

واتە: ناوچەوانم رووی کردۆتە ئەژنۆم، وە لەڕۆینا وەختە لەیەك بدەن، چونکە چووە بەپیر پیریمەوە، وە ئەیەوێ تعظیمي جەنابی پیریم بکات، وەك یەکێك کەبەپیر پیاوێکی زۆر گەورەوە بچێت، چۆن خۆی بۆ دادەنەوێنێ ئەمیش وایە...

**پێنجەم** :

لەنزیك هەشتا ساڵیو لەدوا قۆناغی ژیانیدا دەڵێ:

پیری حەلقەسان خەم پەنەم وەردەن

پەی دەرگای عەدەم ئامادەم کەردەن

واتە: پیری لەدوا قۆناغی ژیانما بەجۆرێك چەماندومێتیەوە، وەك حەلقەی دەرگای لێکردووم، وادیارە ئەیەوێ بم کا بەحەلقەو دام کوتێ بەدەروازەی عەدەمدا کە مردنە...

بەڵێ...ئەم زانا پایە بەرزە داهێنانی کردووە، ئەوەتە چەندەها هۆنراوەی هەیە کە لەلوتکەدایە، بەڵام ئایا ئەوەی مەولەوی هێناویەتی بەشێوەیەکی گشتی هەر لەبارەی خۆشەویستەکەیو بیروڕاو ئاینەکەیو جوانی سرووشتو..هتد، نەبووە؟ ئەمە لەکاتێکدا کە قوتابی قوتابخانەی قورئان بووەو بەفەخرو شانازییەوە باسی قورئانو ئاینەکەی دەکات... بەکورتی ئەوەی ئادەمیزاد دەیڵێ ئەگەر زادەی بیری خۆشی بێتو لاسایی ئەمو ئەویش نەبێت، هەردیارە پێوەی کەکارێکی سادەیەو بەچاکی جێ دەستی مرۆڤی پێوەدیارە ! ..

**گۆرانو داهێنانەکانی:**

شاعیری ناودارو خاوەن دیوانی کورد، گۆران، بەزمانێکی کوردی پاراو زۆر شارەزایانەو زۆر بەدیقەت وشەی کوردی بەکارهێناوەو چەندەها هۆنراوەی نەخشاندووە، کەنیشانەی دەست ڕەنگینیو وەستایەتییە لەکارەکەیدا، بۆ نموونە، کە یەکێ لەمناڵەکانی دەمرێ دەگرێو هیچ هۆنراوەیەکی بۆنایەت، بەڵام کە هیوای کوڕی دەمرێ لەجیاتی گریان شاکارێکی نەخشاندووە کە بۆ بێکەسی شاعیری دەخوێنێتەوە، ئەوەندە بێکەس بەلایەوە جوان دەبێ دەڵێ: دڵم نەهات بڵێم خۆزگە منداڵێکی تریشت بمردایە تا هۆنراوەیەکی تری ئاوات بووتایە !

هۆنراوەکەش بەناوی ( لەسەرەمەرگی هیوادا) لە ل٩٣ ی دیوانەکەیدایە کە دەڵێ:

**رۆڵەی تاقانەم ، هیوای ژیانم**

**ئەستێرە گەشی بەری بەیانم**

رۆژی نەورۆزی پرشنگ زێرینم
تریفەی سپی مانگی هاوینم
شنەی شەماڵی کەلی بەهارم
لەرەی ئاونگی مێرگی ئاودارم
جریوەو جـووکەی شـادیی هێلانەم
شەوبۆی پەخشانی ئەم گشت هەردانەم
خونچەی پشکوتوی باغی جوانیم
رۆڵەی شیرینم ئەی گیانی گیانم !
توخوا بەو جووتە چاوە شینانە
ئاخر نیگاتە تێر بۆم بڕوانە !
با بە کلۆڵـــی بـەرۆڵە رۆیی
کەدانیشتم کز وەختی بێ‌تۆیی
بەیادی دووگۆم دوو گۆمی بێ‌ بن
کە هۆگریان بوو ماسی رۆحی من
هۆن هۆن فرمێسکم بڕژێتە داوێن
فرمێسکی تاسەر جەرگ‌و دڵ تاوێن
هیوا ئەو لێوەی بەزەردەخەنە
گزنگی رۆژی گولانـــی منە
بۆ زەردەخەنەی ئێستا تێ‌ ئازێ؟
بۆ لەژێر هەوری مەرگا ئەلەرزێ ؟
هەی هاوار، هەی داد هیوای شیرینم
گیان ئەدەی، ئەمری، ئیتر ناتبینم !
ئیتر ..ئاخ ئیتر...ناتبینم هەرگیز
لەخەوا نەبێ‌ شەو شەوی پایز
جار جار وەك بەرقی ئاو بۆ زۆر تینوو
دێیت‌و ئاشکێنی تاسـەو ئارەزوو!
سابۆم بڕوانە تێر بەو چاوانە

رۆڵە مردنە فرمێسك بارانە

هیوا رۆڵە ڕۆ، کۆرپەم رۆڵە ڕۆ

ئەو کوڵمە ئاڵە نەرمو نۆڵە ڕۆ

ئەو قژە زەردە ئەو چاوانە ڕۆ !

ئەو نەغمەی ( دایە )و( بابە ) جوانە ڕۆ!

تا دەممان لەگۆ ئەکەوێ وەك تۆ :

هیوای دایە ڕۆ! هیوای بابە ڕۆ!

هەروەها گۆران لە(گەشتەکەی‌دا بۆ هەورامان ) لەباسی(بەیان)دا دەڵێ:

( الله اکبر! ) مەلا بانگانە

تاریكو لێلی بەری بەیانە

مانگی بەجێ‌ماو لەسەفەری شەو

زەردە لەترسی قاسپە قاسپی کەو

ئەستێرەی مەغریب وەك قەترەی ئەمەل

کزکز ئەتکێتە ناو بەفری سەرکەل!

لەرێی ئەوبەری شاخ دەنگی زەنگ دێ

لەشوێنی ڕاوکەر تەقەی تفەنگ دێ !

وا بەتەواوی دنیا رووناکە،

هەرسیحری رووتە سروشت ئێستاکە !

لە درەخت ئەدا شنەی بای سەحەر :

جمو جووڵیەتی چەشنی سەودای سەر!

لەسەر جۆگەی ئاش قازو مراوی

چاومرێی رۆژن هەڵبێنێ چاوی

بەلام تا خوڵقی ئەکا چێشتەنگاو

نایەتە ناودێ پرشنگی هەتاو...

گۆران لەبارەی (مزگەوت) لەهەمان گەشتی‌دا دەڵێ:

بنچینەی مزگەوت نیشتۆتە ناوچەم

ڕووبەڕەو قیبلە، پشت لەجەهەنەم!
مزگەوتی کاتی چێشتەنگاوی چۆڵ:
وەك مردوو کفنی بێدەنگی بەکۆڵ!
سوورە چناری لق و پۆپ درێژ
سێبەر ئەکا بۆ خەوی بەردە نوێژ!
جارجار ئیمامی تەنیای گۆشەی حەوز!
سەرسنگ ماچ ئەکا ریشی بە وەنەوز!
کەسێك بانگ ئەدا، ئەشلەقێنێ گۆم،
ئیمام هەڵدەستێ، دار بەدەست، پشت کۆم!
تاتەواو ئەبێ (الله اکبر)
پەنگ ئەخواتەوە لافاوی نوێژکەر
نوێژ بەتاڵ ئەبێ، جەماعەت بڵاو
چەند پیرێك ئەبن بەخڵتەی لافاو:
سوچێك گەرم ئەکەن بەڕازی جوانی
ئاخ بەبا ئەدەن بۆ دنیای فانی!
ل١٣٢ دیوانی گۆران

بەڵێ هەر هۆنراوەیەکی گۆران دەگرێت زۆر جوان بەوشەی کوردی ڕەسەن تابلۆی هەمەڕەنگت بۆ دەنەخشێنێ، بەڵام دیارە بواری شیعرو باسەکانی هەرچەند زۆر ناوازەو جوانیش بن زادەی بیری مرۆڤن و جیاوازن لەپەراوی لەوێنە نەبووی قورئان کە خوا لەبارەیەوە دەفەرموێ: ﴿لكن الله يشهد بما أنزل اليك، أنزله بعلمه ، والملائكة يشهدون، وكفى بالله شهيداً﴾ النساء/١٦٦

واتە: ئەگەر ئەو خەڵکە باوەڕت پێناکەن، خوا خۆی شایەتە لەسەر ئەوەی کەڕەوانەی کردووە بۆت ، دڵنیابە کەلەسەر بنچینەی زانستی خۆی رەوانەی کردووە ، فریشتەکانیش شایەتی دەدەن لەسەر ئەوە هەرچەندە خوا خۆی بەسە بۆ ئەو شایەتیە (ل٤٦٠ لەخزمەت قورئاندا . نووسەر).

## (٤) فرمێسکە یاقوتیەکان

### فرمێسکی پێغەمبەر ﷺ

حەزرەت ﷺ لەنەوەی دوو سەربڕاوەکەیە ، (اسماعیل) سەلامی خوای لێبێت وە (عبدالله)ی باوکی... کاتێك خوای گەورە حەزرەتی ئیبراهیمی تاقی کردەوە( سەلامی خوای لێبێت) کە بۆ خوا کوڕی جگەر گۆشەی سەر ببڕیّو لەتاقیکردنەوەکەدا سەرکەوت خوای گەورە بەرانێکی بۆ نارد کە بیکا بەقوربانیو ئیسماعیل سەلامی خوای لێبێت رزگاری بوو...

هەروەها(عبدالمطلب) یش لەبەرئەوەی کوڕی وای نەبوو پشتی بگرنو دەوری قەرەباڵغ بکەن ، نەزری کرد کە ئەگەر خوا دەکوڕی بداتیّ یەکێکیان بکا بە قوربانی، (یان ئەگەر خوا یارمەتیدا و شوێنی بیری زەمزەمی دۆزیەوە یەکیّ لەکوڕەکانی بکا بەقوربانی)... بەهەرحاڵ کاتێك مەبەستەکانی هاتنە دی ، دەبوو نەزرەکەی جیّبەجیّبکات، بۆیە تیروپشکی کرد بۆ کوڕەکانیو (عبدالله) ی کوڕە بچووکی زێدە خۆشەویست دەرچوو، ناچار تەگبیریان بۆ کرد کەناوی عبدالله و (١٠) حوشتر تیروپشکی بۆ بکات ، هەرجارە و کە( عبدالله) دەربچوایە (١٠) حوشتری تر زیاد بکات ، تاگەیشتە نزیکەی سەد حوشتر ئنجا ناوی عبدالله دەرنەچوو بەمەش رزگاری بوو لەسەر بڕینو بە (ذبیح)ناوبانگی دەکرد وەك حەزرەتی ئیسماعیل.

لەبیستو پێنجساڵی دا ژنیان بۆ عبدالله هێنا، پاش ماوەیەکی کەم چوو بۆ بازرگانی لەشامولەمەدینە نەخۆش کەوتو لەوێش گیانی سپارد و لەوکاتەدا حەزرەت ﷺ لەسکی دایکیابوو...

کاتێك لەدایك بوو ئەبولەهەب لەخۆشیا (ثویبە)ی خزمەتکارو جاریەی ئازادکرد، کە مژدەکەی بۆ هێنا... پاش حەوت رۆژ باپیری نانو خوانێکی دروستکردو ناوی نا (محمد)و کە هۆی ناونانەکەیان لیّ پرسی وتی: ئەمەویّ کەلەزەویو ئاسماندا سوپاسکراوبێت...هەندێکیش دەڵێن: کەبەخەو بەدایکی وتراوە کەناوی بنێت (محمد)... وەکە لەدایك بوو باپیری تەوافی کەعبەی پیرۆزی پیّکرد.

ئنجا ژنانی لادیّ هاتنو حەزرەت ﷺ بەر حەلیمەی سەعدیە کەوت لەبەرئەوەی بیّباوك بوو، وەکەسیان نەیاندەویست بیبەنو دایەنی بکەن... بەڵام حەزرەت ﷺ لەوساتەوە چووە باوەشی حەلیمەی سەعدیەوە بوو بەخێرو بەرەکەت بۆیان...ئەو مەمکانەی کەشیری

تیانەبوو بەشی منالەکەی خۆی، ئەوەندە زیادی کرد کەمنالەکەی خۆشیو حەزرەتیش ﷺ تێر بکات.

گوێدرێژەکەیان کەلەم سەر نەدەڕۆیو دوادەکەوت، لەوسەر کە گەڕانەوە پێشی هەمووانی ئەدایەوە، کە ئەمەش لای هەمووان سەیر بوو .

ئەو لادێو دەرودەشتە وشكو برنگەی خێڵی (حەلیمەی سەعدیە) پاش هاتنی حەزرەت بووە ناوچەیەکی پڕ فەڕو بەرەکەتو تەنانەت شیری حوشترو مەڕو مالاتەکەشیان بەئاشکرا بەرەکەتی پێوەدیاربوو...

بۆیە پاش دوو ساڵ بەنا بەدڵی هێنایانەوەو حەزیان دەکرد کەجارێ لێیان نەسێنرێتەوە، دایکیشی لەترسی نەخۆشیو وەبای مەککە ناردیەوە لەگەڵیاندا، لەچوار ساڵیدا لەبەرئەوەی کە مەلائیکەت دابەزینو سنگی پیرۆزیان شەق کردو دڵو سینەیان بۆشتو، برا شیرییەکەی ئاگای لێ بوو وە بۆ حەلیمەی گێڕایەوە ، ترسانو ناچار هێنایانەوە بۆ لای دایکیو مەسەلەکەیان بۆ گێڕایەوە ، ئەویش دڵنیای کردنو وتی: کوڕی من شەیتان ڕێی نیە بچێ بەلایدا...

لەشەش ساڵیدا لەگەڵ دایکیو (ام ایمن)دا چوون بۆ سەردانی خاڵوانی لەمەدینەو سەردانی گۆڕی باوکی... لەگەڕانەوەدا لەدێی (الابواء) کە ٢٣ میل دوورە لەمەدینەوە، دایکی نەخۆش دەکەوێو وەفات دەکات...

ابو نعیم لە (الزهری) ئەویش لە ( ئەسمای کچی رهم) ئەویش لەدایکیەوە دەگێڕێتەوە کەوتوویەتی : ئامینەم بینی لەو نەخۆشیەیدا کە تیامرد ، (محمد) لە ژوور سەری بوو، ئامینە سەیری محمدی کردو وتی: كل حي ميت، وكل جديد بال، وكل كثير يفنى، وأنا ميتة وذكري باق، وقد تركت خيراً وولدت طهراً...

واتە: هەموو زیندوویەك دەمرێو هەموو تازەیەك کۆن دەبێو هەموو زۆرێك تەواو دەبێت، من دەمرمو ناوبانگم و یادەوەریم دەمێنێ، بەراستی خێر لەدوای خۆم بەجێ دەهێڵمو پاكو(طاهر)ێکم بووە...ل١٦٠ محمد رسول الله د.محمد صادق عرجون.

ئنجا بەدڵشکاویو فرمێسکی زۆرەوە هاتەوە(مەککە)و لەلای باپیری بوو کە لەسەر بەڕەکەی لای خۆیەوە دای دەناو زیاتر لەهەموو منالەکانی ڕێزی لێدەگرت، جاکە ئەیانویست دووری بخەنەوە دەیووت: دعوا ابني فو الله ان لە لشأناً ...واز لەکوڕەکەم بهێنن بەخوا پلەوپایەیەکی بەرزی دەبێت.

لەهەشتساڵیشدا (عبدالمطلب)مرد ، ام ایمن دەڵێ: حەزرەتم بینی ﷺ کەلەژوور سەری باپیری بوو دەگریا... ئنجا ئەبوتاڵیب سەرپەرشتی دەکرد...(ل ١٦٣ هەمان سەرچاوە).

پاشان شوانێتی کرد بۆ مەڕومالاَت دارەکانی خەڵکی مەککە...ئنجا لەتەمەنی (٢٥) ساڵیدا (خەدیجە) داوای لێکرد کەبچێ بۆ بازرگانی بۆی لەشام و دووجار بەقازانجی زۆرەوە کارەکەی بۆ ئەنجامداو ئەو غولامەی کەلەگەڵی دەنارد زۆر بەچاکی وەسفی حەزرەتی بۆکردﷺ ، ئەویش حەزی کرد کەبچێتە داوایی‌و شووی پێ‌بکات... بەڵێ...چووە داوای‌و شووی پێکرد، خەدیجە کە ئافرەتێکی دنیا دیدەبوو وەلەناو مەککەدا بە(الطاهرة)بەناوبانگ بوو، هەرچی هەبوو کردی بەقوربانی حەزرەت‌و باشترین پاڵپشت بوو بۆی، بەمانگ دەچوو لە ئەشکەوتی (حراء)دەمایەوە ، ئەمیش خزمەتی ماڵ‌و منداڵی خۆی‌دەکردو خواردنی بۆ دەبردو جاروبار بۆ ماوەیەکیش لای دەمایەوە... تاگەیشتە ئەوپلەیەی کە رۆژێك حەزرەتی ، جوبرائیل بەحەزرەتی فەرموو: وا خەدیجە بەخواردنەوە بەڕێوەیە دێت بۆ لات ، سەلامی من‌و خوای گەورەی پێ‌بگەیەنەو مژدەی بەری بە کۆشکێکی هێمن‌و ئاسوودە لەدوور و گەوهەر لەبەهەشتدا ...

خەدیجە پێشتر دووشووی‌کردبوو، شاژنێکی دینیادیدەو بازرگان‌و وریابوولەپیاو چاك تێگەیشتبوو ، بۆیە زۆر قەدری حەزرەتی دەگرت‌و بەهەموو جۆرێك دڵنەوایی دەکرد...کاتێك حەزرەت لەئەشکەوتی (حراء)وەحی بۆهات و بەشپرزەیی و ناڕەحەتی‌یەوە گەڕایەوەو رووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: دەترسم تووشی شتێکی خراپ بووبم ( أي خديجة : مالي ؟ لقد خشيت على نفسي ) ئەویش دڵنەوایی کردو فەرمووی: ( كلا والله لن يخزيك الله ابداً ، انك لتصدق الحديث، وتصل الرحم ، وتحمل الكلَّ ، وتكسب المعدوم و تقري الضيف ،وتعين على نوائب الحق، وتؤدي الامانة ...) ل ٣٠٧ هەمان سەرچاوە . شایانی باسەمامۆستایەکی مێژوو لەزانکۆیەکی ئەمریکی کە ئەمەی خوێندەوە موسڵمان بوو و وتی: پیاوێك ناتوانێ پانزە ساڵ لەژیانی هاوسەرێتیدا (تمثيل)بکات بۆ ژنەکەی، وە هەرچی بکات هەر حەقیقەتی دەردەکەوێت، جا ئەم وەسفانەی خەدیجە دیارە کە(محمد) ﷺ چەند رەوشت بەرز بووەو دیارە ئەوەش رەوشتی پێغەمبەرانە) ...

**گریانی حەزرەت بۆ دووشت بوو: یەکەم: بەسۆزیو میهرەبانییەکەی بەرامبەر مردنی منالو دۆستو خۆشەویستانی...دووەم: لەترسی خواو قورسی باری ئەمانەتو خەمی زۆری بۆ موسڵمانان ...حەزرەت** (رؤوف رحيم)و(**حريص**)**بوو لەسەر موسڵمانان هەروەك قورئان وەسفی دەكات دەفەرموێ** : ﴿لقد جاءكم رسول من أنفسكم عزيز عليه ماعنتم حريص عليكم بالمؤمنين رؤوف رحيم﴾ التوبة : ١٢٨ .

## چەند نموونەیەك لە گریانی حەزرەت :

**یەکەم/ کە خەدیجەو مامی وەفاتیکرد ساڵەکەی ناونا ساڵی خەمباری ئەبێ چی گریابێ بەتایبەت کەلەچڵەپۆپەی وەفاداریدا بوو بۆ هاوسەرەکەی ئەو هاوسەرەی کە هەمیشە بەخێر یادی دەکردەوەو تەنانەت دڵی دەکرایەوە بەهاوەڵەکانی...**

**دووەم/ کچێکی دەنێرێت بەدوایاو دەڵێ: با بێت سەرمان لێ بدات منالەکەم گیان دەدات ئەویش بۆیناکرێ بچێتو سەلامی بۆ دەنێرێو فەرمانی پێ ئەدات کە ئارام بگرێ...کچەکەی دەنێرێتەوە بەدوایاو سوێندی دەدات کەبچێت ئەویش لەگەڵ سعدی کوری عبادەو معاذ دادەچێو منالەکەی دەخەنە باوەشەوە کە گیان ئەداتو حەزرەتیش ﷺ هۆن هۆن فرمێسك دەرێژێت، سەعد وتی: ئەمە چییە ئەی پێغەمەری خوا؟**

**ئەویش فەرمووی:** ( هذه رحمة جعلها الله في قلوب عباده، وانما يرحم الله من عباده الرحماء ) بخاري .

**سێیەم/ کاتێك کچەکەی لەگیانەلادابوو، حەزرەت باوەشی پیاکردو لەباوەشی باوکیا گیانی سپاردو ، حەزرەت گریا بۆی** / نسائي .

**چوارەم/ کاتێك ئیبراهیمی کوری لەگیانەلادا بوو حەزرەت گریا، عبدالرحمن کوری عەوف فەرمووی: وانت يا رسول الله؟ تۆش دەگریت ئەی پێغەمبەری خوا ؟ ئەویش فەرمووی:** ( **يا بن عوف** ! انها رحمة) **ئنجا فەرموی** ( ان العين تدمع ، والقلب يحزن ولا نقول الا ما يرضي ربنا، وانا بفراقك يا ابراهيم لمحزونون ) بخاري .

**پێنجەم/ کاتێ (سعدی کوری عوبادە) ی هاوەڵی لەگیانەلادابوو وە حەزرەت ﷺ سەردانی کرد، گریا بۆی و ئەوانەی لەوێدابوون هەموو دەستیان کرد بە گریان.**

**شەشەم/ کاتێك حەزرەت ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دوعاکەی حەزرەتی (ئیبراهیم)ە** ﴿رب انهنّ اضللن كثيراً من الناس فمن تبعني فانه مني ومن عصاني فانك غفور رحيم﴾ ابراهيم/٣٦ **وە ئەو ئایەتەی کە عیسا** ( **سەلامی خوای لێبێت) دەفەرموێ**:﴿ان تعذبهم فانهم عبادك وان تغفر لهم فانك انت العزيز الحكيم﴾ المائدة/١١٨ .

ئنجا حەزرەت ﷺ دەستی بەرزکردەوەو بەگریانــەوە کەوتـە دوعـا کـردن و فـەرمووی: ( اللهم ! امتي امتي ) .

خوای گەورە بەجوبرائیلی فـەرمـوو: بـڕۆ بـۆ لای محمـد، کـە پـەروەردگار باشتریش دەزانیٚ، پرسیاری لیٚبکە بۆچی دەگری؟

کە جوبرەئیل هات پرسیاری لیٚکرد، حەزرەت فەرمووی : بـۆ پاشـە ڕۆژی ئوممـەتم دەگریم و خوا خۆی باشتر دەزانیٚ...

خوای گەورە فەرمووی: ئەی جوبرائیل ! بڕۆ بۆ لای محمدو پـیٚی بلـیٚ: ئیٚمە ڕازیـت دەکەین لە ئوممەتەکەتداو دڵت ناشکیٚنین . مسلم

حەوتـەم/ کـاتیٚ حـەزرەت نویٚژیدەکـردو قورئـانی دەخویٚنـد هـاوەڵان گـویٚیـان لـەقوڵپی گریانی بوو لەسنگیدا ، هـەروەها کـە عبـدالله ی کوڕی مەسـعود قورئـانی بـۆ خویٚنـد کـە گەیشتە ئایەتەی ﴿ فكيف اذا جئنا من كل امـة بشـهيد وجئنـا بـك علـى هـؤلاء شـهيداً ﴾ النساء. سەیری کرد دەگری! / مسلم

هەشـتەم/ حـەزرەت ﷺ دەفـەرمویٚ: ( ئیزنم لەپـەروەردگار وەرگـرت کەسـەردانی قـەبری دایکـم بکـەم، ئـیزنی دام و سـەردانم کـرد، ئیٚوەش سـەربدەن لەسـەر قـەبران مردنتـان بـیر دەخاتەوە )..لەسەر قەبری دایکیحەزرەت ﷺ زۆر گریاو هاوەڵانیش گریان ( مسلم) .

نۆیــەم/ کـاتیٚك کەلـە غـەزای مۆتـەدا زەیـدو جەعفـەرو عــەبدوڵڵای کـوڕ ی ڕەواحـە شـەهیدکران و ئـەم لەمەدینــەوە هـەواڵیدا بـەهاوەڵان ، بینیـان حـەزرەت دەگــری و ئنجـا فەرمووی ئەوە (سيف من سيوف الله) ئالاٚکەی گرتە دەست و سەرکەوتن .

دەیەم/ عوسمانی کوری مظعون وەفاتی کرد حەزرەت ناوچەوانی ماچ کردو گریا.

یانزەیەم/ حەزرەت ﷺ ڕۆژیٚك بە مەعازی کوری جەبەلی فەرموو: بەخوا ئـەی مـەعاز مـن تـۆم خـۆش دەویٚـت، بیرت نـەچیٚ دوای نویٚژەکـانت بلـیٚ: ( اللـهم اعنــي علــى ذكـرك وشكرك وحسن عبادتك).

جا ئـەو ڕۆژەی کـە مـەعازی نـارد بـۆ یەمـەن و خواحـافیزی لیٚکـرد ، باوەشـی پیـاکردو فەرمووی: ڕەنگە ئیتر نەتبینمەوە و هەردووکیان زۆر گریان!

دوانزەهەم/ حەزرەت بۆ شەهید بوونی حەمزە زۆر بە کوڵ گریاو خەمبار بوو بۆی...

**دووچاوی فرمێسك ڕێژ :**

**لەگەڵ ئەو هەموو فرمێسکەدا کە حەزرەت ﷺ هۆن هۆن بەچاوەکانیا هاتوونەتە خوارەوە بەهۆی بەڵاو موسیبەتو ناڕەحەتیەکانی ژیانەوە، دوعای دەکرد کە(** اللهم ارزقني عينين هطالتين تشفيان القلب بذروف الدمع من خشيتك قبل أن تصير الدموع دماً ).( رواه الطبراني) .

**واتە: خوایە دووچاوی فرمێسك ڕێژم پێببەخشە، کەدڵ سارێژ بکەن بەفرمێسك لەترسی تۆ، پێش ئەوەی فرمێسکەکان ببنە خوێن...**

**ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کە ئەو لەهەمووان زیاتر لەخوا دەترساو لەهەموانیش زیاتر خوای دەناسیو، بەهاوەڵانی دەفەرموو (** لو تعلمون ما أعلم لضحكتم قليلاً ولبكيتم كثيراً ).

**حەزرەت ﷺ هەرگیز بەقاقا پێنەکەنیوە ، بەڵام هەمیشە زەردەخەنە لەسەر دوولێوی موبارەکی بووە، چونکە قاقا لێدانو پێکەنینی زۆر بەبێیادی خوا دەبێتە مایەی دڵڕەقی ، لەلایەکی تریشەوە زەردەخەنە بەشینەوە وەکو خێر بەشینەوە وایە (** لا تحقرن من المعروف شيئاً ولو أن تلق أخاك بوجه طلق) **واتە: چاکە بەکەم مەزانن هەرچەند کەمیش بێت، تەنانەت ئەگەر بەڕووی خۆشو زەردەخەنەوە بەبراکەت بگەیت.**

## (٥) گریان لەترسی خوا

**گریان لەترسی خوا کەشتی ڕزگاربوونە لەنقووم بون لەدەریای گوناهو سەرپێچی، حەزرەت ﷺ کەپێشەوای پێغەمبەرانو دواهەمین فروستادەی جیهانە دەفەرموێ: (** انا اخوفكم لله) بخاري ، **وە دەفەرموێ: (** والله اني لأخشاكم لله واتقاكم ) البخاري **پرسیارکرا لە(ابن عباس) لەبارەی ئەوانەی کەلەخوا دەترسن، وتی: دڵیان بەترس خۆشەو چاویانیش فرمێسك ڕێژەو دەشڵێن: چۆن دڵخۆشکەین؟! مردن وا لەدوامانەوەو گۆڕ والەپێشمانەوەو قیامەت وا دەمانەو، ڕێگامان وا بەسەر دۆزەخەوەو لەبەردەم خوادایە وەستانمان ؟**

**جا براینە فرمێسك پێویستە بۆ شۆردنەوەی گوناهەکان هەروەك اقبال دەڵێ:**

أنا كالشمع دموعي غسلي

في انائي الليلي اذكي شعلي

**بیریشمان نەچێ کە یەکێ لەوحەوت کۆمەڵەی کە لەژێر سێبەری عەرشی خوادا حەشر دەکرێن (** رجل ذكر الله خالياً ففاضت عيناه) **وە هەروەها (** عين بكت من خشية الله) **دۆزەخ نایسوتێنێ ، واتە ئەو کەسە ناچێتە دۆزەخەوە...**

## فرمێسکی پیاوباشان

**خوای گەورە لەبارەی ئەوانەی کەلەترسی ئەو فرمێسك دەرێژن دەفەرموێ:** ﴿ قل امنوا به او لاتؤمنوا ان الذين اوتوا العلم من قبله اذا يتلى عليهم يَخِرّون للاذقان سجداً ويقولون سبحان ربنا ان كان وعد ربنا لمفعولا ويخرون للاذقان يبكون ويزيدهم خشوعاً ﴾ الاسراء /١٠٩ .**واتە: پێیان بڵێ ئەی خوانەناسان باوەڕ بەقورئان بهێنن یان باوەڕی پێ نەهێنن ، بەدەست خۆتانەو ئەمڕۆ سەر بەستن ، بەڵام بزانن بەراستی ئەوانەی پێشتر زانیاریان پێدراوە، لەئەهلی کیتاب کاتێك قورئان بەسەریاندا دەخوێندرێتەوە، خۆیان پێناگیرێ خێرا سەری رێزو نەوازشی بۆ دادەنەوێنن و سوژدە بۆ خوا دەبەن...وە دەڵێن: پاکیو بێگەردی بۆ پەروەردگارمانە ، بەراستی بەڵێنی پەروەردگارمان هەردێتە دی ، ( بەسەرخستنی ئیمانداران لەدنیاداو سەرفرازیان لەقیامەتدا).**

**ئەوانە سوژدەو کڕنووش دەبەنو دەگرین و ئەسرینی خۆشەویستی بۆ پەروەردگار لەچاوانیان دەبارێت، فرمێسکی ئیمانو شادی هەڵدەوەرێننو تادێت زیاتر ملکەچو فەرمانبەرداری دڵ پڕ لەئیمان دەبن ...**

**هەروەها دەفەرموێت:** ﴿ اولئك الذين انعم الله عليهم من النبيين من ذرية ادم وممن حملنا مع نوح ومن ذرية ابراهيم واسرائيل وممن هدينا واجتبينا اذا تتلى عليهم ايات الرحمان خروا سجداً وبكيا﴾ مريم/ ٥٨ **واتە : ئائەوانە کەسانێکن کەخوای گەورە نازونیعمەتی بەسەردا رشتوون لەپێغەمبەران، لەنەوەی ئادەمو ئەوانەش کەلەکەشتیەکەدا لەگەڵ نوحدا سوارمان کردنو لەنەوەی ئیبراهیمو یەعقوبو لەوانەی کەهیدایەتمان داونو هەڵمان بژاردوون، ئەوانە هەرکاتێك ئایەتەکانی خوای میهرەبانیان بەسەردا بخوێنرێتەوە، بەپەلە سوژدە دەبەنو ئەسرین لەدیدەیان دەبارێت، لەسۆزو خۆشەویستی پەروەردگاریان دڵانیپڕ لەنوروو ئیمانیان دەکوڵێنو دەگرین...**

**بەڵام لەدوای ئەوان کەسانێك لەنەوەکانیان بوونە جێنشین** ﴿ فخلف من بعدهم خلف ﴾ **کەنوێژەکانیان بەزایەداو شوێنی ئارەزووەکانی نەفسیان کەوتن، ئەوانە تووشی گومڕایو سەرگەردانیو سزادەبن لەدنیاو قیامەت** ﴿ اضاعوا الصلاة واتبعوا الشهوات فسوف يلقون غياً ﴾ **مەگەر ئەوانەی کە پەشیمان دەبنەوەو باوەڕی دامەزراودەهێنن و کاروکردەوەی چاك ئەنجام دەدەن، ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوەو هیچ جۆرەستەمێکیان لێناکرێت** ﴿ الا من تاب وامن وعمل صالحاً فاولئك يدخلون الجنة ولا يظلمون شيئاً ﴾ مريم/٦٠ .

ئەبو هورەیرە لەحەزرەتەوە ﷺ ریوایەتی کردووە ( لا یلج النار رجل بکی من خشیة الله حتى یعود اللبن في الضرع ، ولا یجتمع غبار في سبیل الله ودخان جهنم ) ترمذي واتە: ناچێتە دۆزەخەوە کەسێك گریابێ لەترسی خوا تاوەکو شیر نەچێتەوە ناوگوان (دیارە ئەمەش ئەستەمە کەواتە هەرگیز ناچنە دۆزەخەوە، بزانە ئەم فرمێسکە چ کاریگەریەکی هەیە !) .هەروەها تۆزوخۆڵی جیهادو دووکەڵی ئاگری دۆزەخ لەسەر کەسێکی تێکۆشەر کۆنابنەوە ! ..

لەفەرموودەیەکی دیکەشدا هاتووە ( عینان لا تمسهما النار : عین بکت من خشیة الله وعین باتت تحرس في سبیل الله ) ترمذي، واتە : دووچاو ئاگر نایان سوتێنێ، چاوێك گریابێ لەترسیخواوەچاوێك ئێشکی گرتبێ لەرێی خوادا.

بەڵێ... ئەوە رێبازی پێغەمبەران و شاگردەکانیانە ، بە فرمێسك خۆیان دەشۆنەوەو پلەوپایەی بەرز بەدەست دەهێننو خوای گەورە لەخۆیان رازی دەکەن بەتایبەت لەکاتی (سەحەر)دا...

داود پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەربێت) پرسیاری لەجوبرائیل کرد، چ کاتێکی شەو چاکترەو خێری زیاترە ؟ ئەویش فەرمووی: ئەی داود نازانم بەلام ئەوەندە هەیە کە عەرشی خوا دەهەژێ و دەلەرێتەوە لەسەحەردا ...( عن الحریري قال : بلغنا أن داود علیه السلام سأل جبریل فقال : أي اللیل أفضل ؟ قال : یاداود ما ادري الا أن العرش یهتز من السحر ) رواه بخاري ومسلم وابوداود والنسائي وابن ماجه واحمد.

## کچم مەگری !

کاتێك کەخەدیجەی هاوسەرو خۆشەویستی وەفاتیکردو مامی پاڵپشتو خەمخۆری دنیای بەجێهێشت ،کافران زیاتر کەوتنە ئازاردانی حەزرەت ﷺ و هاوەڵە بەرێزەکانی، رۆژێك خۆڵیان کرد بەسەر فەخری عالەمدا ، کە گەڕایەوە کچەکەی بۆی پاکردەوەو زۆر خەمی خواردو گریا ، حەزرەت ﷺ دڵنەوایی کردو فەرمووی ( یا بنیة لاتبکي ان الله مانع اباك ) کچی خۆم مەگری بەراستی خوا باوکت دەپارێزێ !

## فرمێسکی هاوەڵان :

لەغەزای تەبوکدا حەوت کەسی هەژار لەیاریدەدەران هاتنە خزمەت حەزرەت بۆ ئەوەی پێداویستی جەنگیان بداتیو بەشداری بکەن ، ئەویش لەبەرئەوەی هیچی لەبەردەستا نەبوو، نەیتوانی هاوکاریان بکات، ئەوانیش بەدڵشکاوی و بەچاوی پڕ ئەسرینەوە

گەرانەوەو زۆر خەمبار بوون کەنەدارن‌و دەست کورتن‌و ناتوانن ماڵ‌و سامان ببەخشن‌و کەل‌و پەلی جەنگ بۆ خۆیان ئامادەبکەن، ئەم هیممەت بەرزانە، ئەوەندە هەڵوێستەکەیان جوانە، خوای گەورە وەك وانەیەك بۆ موسڵمانانی تۆماركردوە لەقورئانداو دەفەرموێت: ﴿لیس علی الضعفاء ولا علی الذین لایجدون ماینفقون حرجٌ اذا نصحوا لله ورسوله، ما علی المحسنین من سبیل، والله غفور رحیم﴾ التوبة :٩١ واتە: لاوازو نەخۆش‌و ئەوانەش کەخەرجی‌یان دەست ناکەوێت، هیچ گوناهو گلەییەکیان لەسەر نیە لەبەشداری نەکردنی غەزادا، کاتێك دڵسۆز بن بۆ خواو پێغەمبەرەکەی ، لەسەر ئەو چاکە خوازو پاکانە هیچ جۆرە گلەیی‌و رەخنەیەك نیە ، خوای گەورە لێخۆش بووەو میهرەبانیشە ﴿ولا علی الذین اذا ما اتوك لتحملهم قلت لا اجد ما احملكم علیه تولوا واعینهم تفیض من الدمع حزناً الا یجدوا ما ینفقون﴾ التوبة /٩٢ واتە: هەروەها گلەیی‌و رەخنە نیە لەسەر ئەوکەسانەی کەدێن بۆ لای تۆ بۆ ئەوەی وولآخی سواریان بۆ پەیدا بکەیت وبێن بۆ جیهاد، تۆش دەڵێیت : هیچ شك نابەم تا بتاندەمێ بۆ سواری (ئیتر بەنائومێدی) گەرانەوەو چاویان فرمێسکی لێدەرژاو، لەخەفەتدا ئەسرینی لێهەڵئەقولا، چونکە هیچ شك نابەن بیبەخشنو خەرجی بکەن لەپێناوی خواداو خۆیانی پێئامادە بکەن بۆ جیهاد ...

## فرمێسکی یاریدەدەران :

پاش غەزای حونەین ، حەزرەت ﷺ دەستکەوتەکانی دابەش کرد بەسەر قورەیشیەکان‌و هۆزە عەرەبەکانی تردا بۆ ئەوەی زیاتر دڵیان راکێشێ بەرەو ئیسلام و بەشی یاریدەدەرانی نەدا، بەمەش یاریدەدەران دڵگران بوون‌و ویتە ویت کەوتە ناویانەوە ! ..

سەعدی کوری عبادە هاتە لای حەزرەت ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو کۆمەڵە لەیاریدەدەران شتێ لەدڵیانا دروست بووە بەرامبەرت، بەهۆی ئەوەی کە هەرچییت دەست کەوت دابەشت کرد بەسەر قەومەکەی خۆتداو بەشی زۆر گەورەشتدا بەهۆزە عەرەبەکان‌و، یاریدەدەران هیچیان پێنەبرا لێی ! ..

حەزرەت ﷺ فەرمووی: ئەی تۆ ئەڵێی چی ئەی سەعد ؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا منیش یەکێکم لەگەلەکەم ... حەزرەت ﷺ فەرمووی: گەلەکەت کۆبکەرەوە بۆم لەو گۆرەپانەدا... ئەویش چوو کۆی کردنەوە و حەزرەت ﷺ هات‌و سوپاس‌و ستایشی خوای کردو فەرمووی : ( ئەی کورگەلی ئەنصار، قسەیەکم لەبارەتانەوە پێگەیشتۆتەوەو

گلەیی‌یەك كەلەدەروونتاندا هەستان پیّكردووە...باشە من نەهاتمە ناوتان سەرلێشێواوو سەرگەردان بوون، خوا رێنمایی كردن‌و، هەژاربوون خوا دەوڵەمەندی كردن‌و دوژمنی یەكتری بوون‌و خودا دڵتانی یەك خست؟ وتیان: بەڵیّ وایە، خواو پێغەمبەرەكەی منەتو فەزڵیان زۆرترە .

ئنجا فەرمووی: ئایا ئێوەش وەڵامم نادەنەوە؟ وتیان: بەچی وەڵامت بدەینەوە؟ بۆ خواو پێغەمبەرەكەیەتی هەموو منەت‌و فەزڵێك ! فەرمووی: بەخوا ئەگەر بتانەویّ دەڵێن ، راستیش دەكەن‌و بڕواشتان پیّدەكرێت، دەتوانن بڵێن: تۆش كەبڕوایان پیّنەدەكردی، بڕوامان پیّهێنای‌و ، كەس پشتی نەدەگرتی‌و، ئێمە سەرمانخستی‌و ، دەربەدەر بووی دالّدەمان دای‌و، هەژاربووی هاوكاریمان كردی ، ئەریّ كوڕگەلی یاریدەدەران بەهەندیّ شتی بیّ نرخی دنیایی كەدام بەكۆمەڵێك بۆ دڵراگرتنیان تا موسڵمان ببن شت لەدڵتاندا دروست بوو؟ لەكاتێكدا من ئێوەم دایە دەست ئیمان‌و ئیسلامەتیەكەتان، ئایا ئێوە رازی نابن ئەی كۆمەڵی ئەنصار كە خەڵكی حوشترو بزن بەرنەوەو ، ئێوەش بە (رسول الله)ەوە بگەڕێنەوە؟

بەوخوایەی گیانی محمدی بەدەستە ، ئەگەر هیجرەت نەبوایە من یەكێك دەبووم لە(انصار)، وە ئەگەر هەموو خەڵكی بچنە دۆڵێكەوەو ، (انصار)یش بچنە دۆڵێكەوە، من دەچمە لای (انصار)( خوایە رەحم بكە بە (انصار) وە بەنەوەی ئەنصار وە بەنەوەی نەوەی ئەنصار ) ... هەموو ئەنصارەكان ئەوەندە گریان كەڕیشیان تەڕبوو، وەوتیان: ئێمە رازین كە (رسول الله) بەشی ئێمە بێت..

### فرمێسكی ئەبوبەكر :

ئەبوبەكر تاقانەیە لەئوممەتدا لەخواناسی‌و خزمەت بەئاینی خوادا، حەزرەت ﷺ لەدوا رۆژەكانی تەمەنی موبارەكی پڕ خێرو بەرەكەتیا ، رۆژێك هەستی بەلەش سووكی‌كردو بۆدواجار چووە سەر مینبەرو وتاری بۆ هاوەڵان داو فەرمووی: بەندەیەك خوا سەرپشكی كردووە لەنێوان مانەوە لەدنیاداو گەڕانەوە بۆ لای خۆی، ئەویش لای خوای هەڵبژارد، كەس لەمەبەستی حەزرەت تیّ نەگەیشت تەنها ئەبوبەكر نەبێت كەزانی حەزرەت باسی ئەجەلی خۆی دەكات‌و بەجیّیان دەهێڵیّ، بۆیە هەستایە سەرپیّ‌و بەقوڵپی گریانەوە فەرمووی: خۆم‌و دایك‌و باوكم بەفیدات بین ئەی پێغەمبەری خوا ! هاوەڵان لایان سەیر بوو، ئاخۆ هیچ بووە ، ئەبوبەكر بۆ وادەكا ؟!

حەزرەتیش وتەکانی بڕی و کەوتە وەسفی ئەبوبەکرو فەرمووی: هەرکەسێ چاکەیەکی لەگەڵ کردبین، هەقمان بۆ کردۆتەوە ، تەنها ئەبوبەکر نەبێت خوایە ڕەحم بە ئەبوبەکر بکە، خوایە لێی خۆش ببە ... ئنجا فەرمووی : هەموو ئەو دەرگایانەی لەماڵەکانەوە دێنە ناو مزگەوت بادابخرێن، تەنها دەرگاکەی ئەبوبەکر نەبێت...( شایانی باسەکە لەمزگەوتی حەزرەت ﷺ لە مەدینە ڕووەو قیبلە لەپێشەوە دانیشی بەدەستە ڕاستدا سەیر بکە دەبینی دەرگاکە تا ئێستا نەگیراوە لەبەر فەرموودەکەی حەزرەت ﷺ و لەسەریشی نووسراوە ( خوخة ابي بكر) واتە ئەو دەرگایەی کە ئەبوبەکر لێوەی هاتۆتە ناو مزگەوتەوە )...

ڕۆژێك ئەبوبەکر قسەیەکی ڕەق بە ڕەبیعەی ئەسلەمی دەڵێ و ، هەر زوو پەشیمان دەبێتەوەو دەڵێ: ڕەبیعە قسەکەم پێ بڵێرەوە! بۆئەوەی ببێ بەهەق...ئەویش: ڕازی نابێ پێی بڵێتەوە! ئەبوبەکریش دەڵێ: ئاخر لای حەزرەت ﷺ شکاتت لێدەکەم...ئەویش دەڵێ: هەرگیز ئەو قسەیەت پێناڵێمەوە !

ئەبوبەکر دەڕوات بۆ لای حەزرەت و ﷺ ڕەبعیەش بەدوایدا، خزمانی ڕەبیعە دەیبینن ، دەڵێن ئەوەچییە ؟ ئەویش مەسەلەکەیان بۆ دەگێڕێتەوە ، ئەوانیش دەڵێن: خوارەحمی پێ بکات، لەسەرچی شکاتت لێدەکات، ئەوهێشتا ئەوەی وتووە کەوتوویەتی؟! ڕەبیعەش دەڵێ: بێدەنگ بن ، ئەوە ئەبوبەکرە ! خوا لەبارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ثاني اثنين اذ هما في الغار﴾ التوبة : ٤٠ بەقوربانە بڕۆن لاچن نەك ئاوڕ بداتەوەو بتانبینێ و وابزانێ گەلە کۆمەکیتان کردووە لەدژی ئەو و تووڕەببێ و ، حەزرەتیش ﷺ لەبەرتووڕەبوونەکەی ئەو تووڕەببێ و پاشان خوای گەورەش تووڕەببێ لەبەر تووڕەبوونەکەی ئەوان و لێم زویر ببێ و ڕەبیعە تیابچێ!

پاشان بەتەنیا ڕۆی بەدوای ئەبوبەکردا تا گەیشتنە لای حەزرەت ﷺ و ئەبوبەکر بۆی گێڕایەوە ، حەزرەتیش ﷺ سەری هەڵبڕی و بەڕەبیعەی فەرموو: چیتە ڕەبیعە، چیت هەیە لەگەڵ ئەبوبەکردا؟

ڕەبیعە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو قسەیەکی پێوتووم و پێم ناخۆش بوو، ئنجا وتی پێم بڵێرەوە بۆئەوەی هەق بەهەق بێت، منیش ڕازی نەبووم ! حەزرەت ﷺ فەرمووی: چاکت کرد ئەی ڕەبیعە، پێی مەڵێرەوە ، بەڵکو بڵێ خوالێت خۆش بێت ئەی ئەبوبەکر..

ڕەبیعەش وتی: خوالێت خۆش بێت ئەی ئەبوبەکر ....ئەبوبەکریش بەگریانەوە هەستاو ڕۆیشت...

## عومەر ئەچی بۆ ماڵی ئەبوبەکر

پاش تەواو بوونی جەنگی هەڵگەڕاوەکان عومەر چوو بۆلای ئەبوبەکر سەیری کرد دەگری، جا هەر کە عومەری بینی داوێنیگرتو وتی: من کارم بەفەرمانڕەواییتان نییە! عومەر نەیهێشت قسەکانی تەواو بکات وتی: باشە چارە چییە؟ بەخوا نایەڵین وازبێنیتو وازت لێناهێنین !

رۆژێك حەزرەتی عومەر دوای کۆچی ئەبوبەکر دەچێ بۆ ماڵیانو لە (اسماء)ی ژنی ئەبوبەکر دەپرسێت، ئاخۆ حاڵی ئەبوبەکر چۆن بوو لەخواپەرستییەکەیدا؟ ئەویش وتی: کاتێك( سەحەر) دەهات هەڵدەستاو دەستنوێژی دەشتو نوێژی دەکرد ...پاشان نوێژی دەکردو قورئانی دەخوێندو دەگریاو ...سوجدەی دەبردوو دەگریا...دوعای دەکردو دەگریا...

حەزرەتی عومەر گریاو فەرمووی: ئەمە لەکوێ بەمن دەکرێ؟!

## فرمێسکی حەزرەتی عومەر :

عومەر ئەو مرۆڤە پایە بەرزە بڕوادارەیە کە حەزرەت لەبارەیەوە دەفەرموێ: ( ان الشیطان لیخاف منك یا عمر) واتە : شەیتان لێت دەترسێت ..وە دەیفەرموو: عومەر ئەگەر بەدۆڵێکدا بڕوات شەیتان بەدۆڵێکی تردا دەڕوات ، هەروەها هیچ (عبقری)یەکم نەدیوە شان بدات لەشانی عومەر .

لەدەوری مەدینە نزیکەی (٤٠٠) دەمی گڕکان هەیەو لەزەمانی عومەردا یەکێیان تەقیەوە، عومەر لەدوورەوە ئاماژەی بۆ کردو فەرمووی: هێوربەرەوە ئەگینا مەدینە بەجێ دەهێڵم...دەڵێن خوای گەورە بەفەزڵی خۆی گڕکانەکەی هێورکردەوە !

رۆژێك حەزرەتی عومەر (ئەبو موسای ئەشعەری) بانگ کرد بەدەنگە خۆشەکەی قورئانی بۆ بخوێنیو پیی وت: پەروەردگارمان بیربخەرەوە ، ( ئەبو مووسا)ش قورئانی دەخوێندو عومەریش هۆن هۆن فرمێسك بەچاوانیا ڕێچکەیان دەبەست !

زۆر جار عومەر لەرێگاوبانی مەدینەدا دەستی منالێکی دەگرتو بەچاوی پڕ ئەسرینەوە دەیووت: کوڕم دوعام بۆ بکە تۆ هێشتا گوناهت نەکردووە .

حەزرەتی عومەر لەترسی بارگرانیو بەر پرسیارێتی هاواریدەکرد و دەیووت: خۆزگە دایکی عومەر، عومەری نەبوایە !

ڕۆژێك كە حەزرەتی عومەر لەگەڵ ئەبو مووسای ئەشعەریدا دانیشتبوو ، پێی وت: ئەبو مووسا حەزدەكەیت، هەرچیمان كردووە لەموسڵمانەتی لەگەڵ (رسول الله) داو كۆچكردنمان لەگەڵیاو، شەهادەتمانو زانیاریمان، هەمووی بدرێتەوە بەسەرمانا، بەرامبەر بەوەی سەربەسەر لێی دەرچین ؟!

ئەبو مووسا وتی: ( نەبەخوا ئەی عومەر، ئێمە تێكۆشاینو نوێژمان كردو بەرۆژوبووینو ، كاری چاكی زۆرمان كردو خەڵكێكی زۆر لەسەردەستمانا موسڵمان بوو، ئێمە چاوەڕێی ئەو پاداشتەین ) .

عومەر بەچاوی پڕ فرمێسكەوە وتی : ( بەوخوایەی گیانی عومەری بەدەستە، من حەزدەكەم هەمووی بدرێتەوە بەسەرماو تەنها سەر بەسەر لێی دەرچم )...

جارێكی دیكە حەزرەتی عومەر بەگریانەوە بە عبدالرحمانی كوری عەوف دەڵێ: ئەی عبدالرحمان، ئەوەندە نەرمیم لەگەڵ خەڵكدا نواند ئەترسم خوا لێم بپرسێتەوە ، وە ئەوەندەش توندوو تیژبووم لەگەڵیانا هەردەترسم خوا لێم بپرسێتەوە ، خوا ئاگادارە من لەوان زۆر زیاتر لەخوا دەترسم، نازانم چارەم چیە ؟!

عبدالرحمانیش وتی: ( افٍ لهم من بعدك) ئای بۆ حاڵیان لەدوای تۆ !

بەڵێ...خەلیفە عومەر دەرگای پۆڵایینو بەربەست بوو لەبەردەم لافاوی فیتنەو ئاژاوەدا، كەشەهیدكرا ، ئەو دەرگایە والأبوو ، تا ئێستاش فیتنە هەر بەردەوامە...

## فرمێسكەكانی حەزرەتی عوسمانو حەزرەتی عەلی:

ئەمانیش وەك دوو هاوەڵەكەی تریان، هەریەكەیان خاوەنی دووچاوی فرمێسك ڕێژ بوون، لەقوتابخانەكەی حەزرەتدا دڵناسكیو پارێزگاری فێربووبوون...

حەزرەتی عوسمان لەسەر هەموو گۆڕێك شیوەنی خۆی دەكردو ، دەیفەرموو ئەمە یەكەم مەنزڵگامانە، نازانین ئاخۆ دوای ئەوە بەرەو كوێ دەچین!

حەزرەتی عەلیش بەهەمان شێوە لەكاتێكدا شەودەهاتو دنیا كشو مات دەبوو لەمیحرابەكەیدا دەگریاو بە (یارب ، یارب) دەپاڕایەوە... ئنجا دەیووت: ئەی دونیا ( الي تغررت ، اليَّ تشوقت، هيهات هيهات، غرّي غيري، فعمرك قصير، ومحبسك حقير، وخطرك عسير، اه ، اه ، اه من قلة الزاد وبُعد السفر ووحشة الطريق )

## فرمێسکی موسڵمانێکی پاڵەوان:

عەبدوڵڵای کوڕی حوزافە، لەلایەن ڕۆمەکانەوە بەدیلگیرا ، لەبەرئەوەی سوارچاکێکی زۆرقارەمان بوو، قەیسەری ڕۆم تەماعی زۆری خستە بەردەم بەمەرجێ واز لە ئیسلام بهێنێ، ئەویش وتی: بەخوا ئەگەر هەموو موڵکەکەتم بدەیتێ لەئاینەکەم پاشگەز نابمەوەو ناپاکی بەرامبەر خەلیفەکەم ناکەمو واز لەڕێبازی (محمد) ناهێنم.

ئەویش وتی: سزات ئەدەین قورسترین سزا، عەبدوڵلا وتی: جا ئێوە لاشەیەکی لەناوچوو سزا ئەدەنو ڕۆح و گیان تەنها بەدەست خودایە.

قەیسەر فەرمانی دا کە هەڵی واسنو تیر بارانی بکەن بۆ ئەوەی بترسێتو پەشیمان ببێتەوە... هەرچییانکرد سوودی نەبوو ..دواییتر ، فەرمانیدا کە مەنجەڵێکی زۆر گەورەی پڕئاوی لەکوڵ بهێننو عەبدوڵڵای تێبخەن، کەمەنجەڵە گەورەکەیان هێناو عەبدوڵڵایان بەدەستو پێ بەستراوی بەرەولای برد، عەبدوڵلا گریا، قەیسەر وایزانی لەترسا دەگری، بۆیە کەپرسیاری هۆی گریانەکەی لێکرد وتی: بۆ ئەوە دەگریم کەتەنها یەك ڕۆحم هەیە ، حەزم دەکرد سەد گیانم هەبوایەو هەموویەك لەدوای یەك لەپێناوی خوادا دەرچوونایە...

پاشان بەندیانکردو ئافرەتێکی زۆر جوانیان لادانا، بۆئەوەی تووشی فیتنەی بکەن، لەوتاقیکردنەوەیەشدا دەرچوو، ئنجا گۆشتی بەرازو عارەقیان بۆدانا سێ ڕۆژ بەبرسیەتی مایەوەو نەچوو بەلایدا...

ئنجا قەیسەر بانگیکردو وتی: سەرم ماچ بکە بەرەڵات دەکەم، وتی: برادەرەکانیشم ؟ وتی: بەڵێ ...( عەبدوڵلا) هەستاو سەری ماچ کرد..کە گەڕایەوە مەدینە لەگەڵ دیلە ئازادکراوەکانیترداو ئەمەی بەگریانەوە بۆ خەلیفە عومەر گێڕایەوە، حەزرەتی عومەر هەستا سەری ماچ کردو فەرمووی: هەقە لەسەر هەموو موسڵمانێ سەری عەبدوڵڵای کوڕی حوزافە ماچ بکات... هەموو یارانی حەزرەت ﷺ کە لەوێ بوون هەستانو یەك یەك سەریان ماچ کرد...

## فرمێسکی ئەبو جەندەل :

خەریك بوو حەزرەت ﷺ پەیمانی ڕێکەوتنی حودەیبیە مۆربکات لەگەڵ کافرەکاندا، کەیەکێ لەبەندەکانی ئەوەبوو ئەگەرکەسێك لەقوڕەیش هات موسڵمان بوو بیگێڕنەوە بۆ مەککەو ئەوەش کە موسڵمانەو کافر دەبێو دەچێتەوە ناو قوڕەیش نەگێڕدرێتەوە

...لەوکاتەدا (ابو جندل) کە کوڕی (سهیل کوری عەمر) بوو گەیشتە لای موسڵمانان کەلەمەککەوە رای کردبوو، قورەیشیەکان وتیان دەیبەینەوە، حەزرەتیش بۆ ئەوەی شەڕهەڵنەگیرسێتەوە فەرمووی قەیناکە بیبەنەوە ! ئالێرەدا (ئەبو جەندەل) بەدڵی شکاوو چاوی پڕ لەئەسرینەوە وتی: موسڵمانینە ئەم گێڕنەوە بۆ لای کافران، لەکاتێکدا من بە موسڵمانی هاتووم بۆ لاتان ، نابینن چی سزادراوم ،ئەوە جێگاکانی دیارن بەلاشەمەوە؟!

حەزرەت ﷺ کەدوورتر دەیڕوانیو فراوانتر بیری دەکردەوە، فەرمووی: ئارام بگرە... خوا چارەیەکت بۆ دەدۆزێتەوەو رزگارت دەکات... بەڕاستی دیمەنێکی دڵتەزێنە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەبوجەندەل لەڕقا لەئایین وەرنەگەڕاو فەرمانبەرو گوێڕایەڵی حەزرەت بوو ﷺ...تاوەکو هەروەك حەزرەت ﷺ فەرمووی: فرسەتی بۆ هەڵکەوتو لەگەڵ چەندەها موسڵمانی چەوساوەی مەککەدا کەڕایان دەکرد نەدەهاتنە مەدینەو لەو شاخو چیاو دەشتە ریێان لەقافڵەی قورەیش دەگرتو کێشەیان بۆ دەنانەوە... تا قورەیشیەکان بەناچاری هاتنە لای حەزرەت ﷺ کە ئەو کەسانە وەربگریو ئیتر رێیان پێنەگرنو زیانیان لێنەدەن..

## فرمێسکی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز :

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بەپێنجەم خەلیفەی راشدین دائەنرێتو توانی لەنزیکەی دووساڵی ماوەی حوکمەکەیدا دادپەروەری بچەسپێنیو ، موسڵمانان ئاسوودە بکات...رۆژێك (فاطمة)ی هاوسەری دەیبینێ بەکوڵ دەگری ! لێی دەپرسێ چی قەوماوە وا دەگریت؟ ئەویش وتی: ئای بۆ تۆ فاتیمە من بوومەتە کار بەدەستی ئەم ئوممەتەو ، ئێستا بیردەکەمەوە لەهەژاری برسیو نەخۆشی بێچارەو داماوی بێجلو بەرگو هەتیووی بێنەواو ستەملێکراوی بێدەسەلاتو غەریبو دیلو پیاوی پیرو بێوەژنی تەنهاو کەسانی هەژاری خاوەن منالی زۆرو هاوشێوەکانیان لەسەرتاسەری قەڵەمڕەوی یەکەمدا، ئنجا من چاك دەزانم کە خوا لەبارەی هەموو ئەوانەوە موحاسەبەم دەکات رۆژی قیامەتو حەزرەتیش ﷺ لەجیاتی هەموویان یەخەم دەگرێت... منیش دەترسم نەتوانم وەڵام بدەمەوەو هیچ حوججەیەکم نەبێت ! جا من بۆ ئەوە شیوەن دەکەم !...

## فرمێسك شاردنەوە!

حەسەنی بەصری دەڵێت: ئەگەر پیاوباشێك لەکۆڕێکدا دڵی پڕببێتو نەتوانێ خۆی بگرێت ئەوا لەترسی ئەوەی کە تووشی رووپامایی بێ کۆڕەکە بەجێ دەهێڵێ.

ئیبن الجوزی دەڵێ: (ابن سیرین) بەرۆژ رووخۆش و دەم بەپێکەنین بوو لەناو خەڵکدا، بەشەویش فرمێسکی بەندایەتی بۆ خوا دەڕشت، هەر ئەتووت خەڵکی شارێکی کوشتووەو بۆ گوناهەکانی دەگری .

( قاسم کوری‌محمد) دەڵێ؛ ئێمە لەگەڵ (ابن مبارك) دا زۆر گەشتمان دەکرد، زۆرجار بەدڵمدا دەهات، باشە ئەم پیاوە هەروەك ئێمە نوێژدەکات و بەرۆژوو دەبێت و حەج دەکات و تێدەکۆشێ، ئاخر بەچی واناوداروو پایەبەرز بووە ؟ تا رۆژێك لەماڵێك بووین بۆنان خواردن چراکەیان تێکچوو کوژایەوە ، کە چاکیان کردەوە فرمێسکم بینی بەچاوی (ابن مبارك)ەوە... ئنجا تێگەیشتم کە ئەو پیاوە لەئێمە زیاتر لەخواو لەرۆژی دوایی دەترسیێو بەوەش ئاوا چۆتە پێشەوە، هەرئەوەندە چراکە کوژایەوەو تاریکی داهات، یادی قەبرو قیامەت فرمێسکی هێنا بەچاوانیدا...

بەڵێ قیامەت ئەو رۆژەیە کە ( ابی حازم ) یشی هێنایە گریان، کەڵێیان پرسی وتی: ئەم ئایەتەم دەخوێندەوە کاری تێکردم ﴿ وبدا لهم من الله ما لم یکونوا یحتسبون ﴾ الزمر /٤٧ واتە: شتانێکی وایان بۆ پێش دێت لەخواوەو شتی وادەبینن کە هەرگیز حسابیان بۆ نەکردووەو بەخەیاڵیاندا نەهاتووە !

## ئەڵێی دۆزەخ تەنها بۆ ئەو تاوی سەندووە؟!

لۆمەی (یزید الرقاشی) کرا لەسەر فرمێسکەکانی و پێیان وت: چییە دەڵێی دۆزەخ هەر بۆ تۆ دروست کراوە؟ ئەویش وتی: جا بۆ وانیە ؟! ئەی دۆزەخ بۆ من و هاوەڵانی من و ئینس و جن دروست نەکراوە؟ ئەی نەتانخوێندۆتەوە لەقورئاندا کە دەفەرموێ: ﴿ سنفرغ لکم أیها الثقلان ، فبأي الاء ربکما تکذبان، یا معشر الجن والانس ان استطعتم ان تنفذوا من أقطار السماوات والارض فانفذوا لاتنفذون الا بسلطان ، فبأي الاء ربکما تکذبان ﴾ الرحمان/ ٣٤ .

حەسەنی بەسریش دەگریاو دەتووت بەتەنها دۆزەخ بۆ ئەو دروستکراوە، لێی پرسرا بۆ فرمێسکت وشك ناکات، وتی: دەترسم خوا بمخاتە دۆزەخەوەو هیچ منی لا مەبەست نەبێو گوێم پێنەدات !

ئنجا دەیووت : ئاخر دەترسم خوابەیەکێ لەگوناهەکانم لێم بڕەنجێو بفەرموێ: بڕۆ من لێت خۆش نابم ...

**ڕۆژێك كه ئاویان بۆ هێنا ڕۆژووەكەی بشكێنێ ، بەچاوی پڕ لەئەسرینەوە وتی: داوای كافرانی دۆزەخم كەوتەوە یاد كه دەڵێن : ﴿** ان افیضوا علینا من الماء **﴾ وەلأمیشیان دەدرێتەوە ﴿** ان الله حرمهما علی الكافرین **﴾** الاعراف/ ٥٠ .

**هارونە ڕەشیدیش كەساڵێك جیهادی دەكردو ساڵێكیش دەچوو بۆ حەج لەسەرە مەرگیدا گریاو وتی:** ( وا سوأتاه من رسول الله) **ئای لەو حەیا چوونەمان كەدەگەینەوە بەحەزرەت ﷺ !**

## تەرازوووی فرمێسك :

**فرمێسك بۆشتنەوەی گوناهو پاكردنەوەی دڵو دەروونە ، ڕاستێتی ئەو فرمێسكەش بەوە دەردەكەوێ ، كه كارو كردەوەی ئەو كەسە بكێشرێ ئەگەر چاك بوو چاكەو وەگەرنا دەدرێتەوە بەسەرخاوەنەكەیدا... ئاشكرایە تیمساحیش فرمێسك دەرێژێ، بەلأم ئاخۆ فرمێسكەكانی شفاعەتی بۆ دەكەن و كارو كردەوەی جوان دەكەن...؟؟!**

**دەڵێن ڕاوچییەك كۆمەڵێ چۆلەكە لەڕۆژێكی ساردو سەرماو زریاندا ڕاودەكاتو یەك یەك ملیان هەڵدەكێشیو فڕیان ئەداتە توورەكەیەكەوە بەهۆی ساردو سەرماو ڕەشەباشەوە ئاو بەچاویا دێتە خوارەوە !**

**چۆلەكەیەك بەوی‌تریان دەڵێ: سەیركە چەندە دڵی نەرمە و چەند بەسۆزو میهرەبانە،ئەوەتا بۆمان دەگری ... ئەوی تریش لەوەلأما پێی دەڵێ: سەیری فرمێسكی چاوی مەكە سەیری ئیشی دەستی بكە !**

**پیاوێك لای قازییەك دانیشتبوو شكاتكەرێك هات دەگریا ، پیاوەكە دڵی بۆی جولأو بەقازییەكەی وت: وا ئەزانم ئەم پیاوە ڕاستدەكاتو ستەمی زۆری لێكراوە!؟ ئەویش لەئەزموونی خۆیەوە پێی وت: برا پەلەمەكە لەحوكمەكەتدا، تۆنازانی براكانی(یوسف)یش كەتنەكەیان كردو بەگریانەوە هاتنەوە لای باوكیان...**

**هەر لەم سەردەمەشدا ئەتاتورك كەكەس نازانێ باوكی كێیە ؟ هات خۆی لەموسڵمانان كرد بە ئەولیا ، تاكارەكانی بۆ چووە سەرو پاشان ئەوكارەی بە ئیسلام كرد كەمەگەر هەر حەرامزادەی وەك ئەو كردبێتی!**

**ئەم تاوانبارە چەندەهای پێهەڵخەڵەتا ، تەنانەت ئەحمەد شەوقی شاعیر ، هۆنراوەیەكی لەسەر هۆنیەوەو ئاواتی خواست كه خالیدێكی تورك بیو جێی خالیدی عەرەب بگرێتەوە !**

## فرمێسکی بەننا :

(بەننا) قوتابی بوو لە(دار العلوم) زۆر بیری کردەوە لەحاڵی موسڵمانانو لە چۆنیەتی چارەسەرکردنی ، چووە لای کۆمەڵێ زاناو کەمێکیان وەڵامیان دایەوەو بڕیاریاندا کەبەیەکەوە بچن بۆ لای( ئەحمەد باشا تەیمور) ، کاتێ چوونەماڵەوە بۆلای، زۆر بەجوانی پێشوازی کردنو هەمووانی دەناسی تەنها ئەم لاوە تازە پێگەیشتووە نەبێت، کە (بەننا) بوو...

کاتێك لەجیاتی ئەوانیش کەوتە قسەو ، وەك کۆستکەوتوو جەرگ سوتاوێك کەوتە باسی حاڵی خراپی موسڵمانان خۆی پێنەگیراو گریا ، ئامادەبوانیش هەموو گریانو سەرەنجام بڕیاریاندا بۆ بەرگری لەئاینی پیرۆزی ئیسلام لەبەرامبەر هێرشی نارەوای ناحەزاندا گۆڤارێك دەربکەن بەناوی( الفتح )و سەرنووسەرێتی گۆڤارەکەیان سپارد بەنووسەری گەورە ( محب الدين الخطيب ) .

(بەننا) لەوتەیەکیدا دەڵێ: ( بڕوام پێ بکەن برایان ، لەداخو خەمدا دڵم توایەوەو بۆ حاڵی موسڵمانان کە جار لەدوای جار تووشی بەڵاو ناڕەحەتی دەبن، ویستم ناڕەزایی دەربڕم ، بەڵام بۆکێ؟ هەرچی سەرم هێناو سەرم برد کەس نیە لەگەڵانی دوورو نزیك میهرەبان بن لەگەڵمان، هەمووی کۆتو پێوەند لەجوولەی خستوون... ئەوە زۆرکاری تێکردمو گریام ، وە ئەگەر ئەو تۆزە هیوایە نەبێ کە موسڵمانان هەستنەوەو فریای خۆیان بکەونو یەك بگرن ، بەراستی مردن چاکترە لە ژیانی زیللەتو ریسوایی ) .

ئەم فرمێسکانە بردی بەرەو کارکردنو هەوڵدان بۆ هۆشیارکردنەوەی موسڵمانانو وتی: (ها انا) ئەوەمنم ، وەرن با کۆببینەوە لەسەر خێر ، لەسەر هەوڵو تێکۆشان بۆ ئیسلام ، نزیکەی بیست ساڵ هەوڵیدا بێ سرەوتن، لەگەڵ ئەو هەموو سەرقاڵییەیدا، توانی سەردانی چوار هەزار شارو شارۆچکەو گوندبکاتو بانگی خواییان پێ بگەیەنێ، نەك هەر لەمیسر بەڵکو هەر لەژیانی خۆیدا توانی بانگەواز بگەیەنێتە وڵاتانی تریش ، بەویستی خوا ئەو بەشەهیدی سەری نایەوەو بانگەوازەکەشی لەگەڵ ئەو هەموو کۆسپەی کەبەردەوام دەهێنرێتە ریێ، توانی لەزیاتر لەحەفتا دەوڵەتدا رەگ داکوتێو هۆشیارییەکی وا بخوڵقێنێ کە ( ان شاء الله) پاشە رۆژ بۆ ئیسلامە...

## هەوڵو تێکۆشان سەر لەنوێ بۆ ئیسلام !

(بەننا) خۆی تێکۆشەرو لێبڕاو بوو بۆ خوا، نوێکەرەوە بوو، بانگی خوایی دایەوە بەگوێی مەردوومدا... ڕۆژێك لەبەردەم هەزاران کەسدا وتی: من ئەمڕۆ نەهاتووم وەك (خطیب) ێك کەوتارتان بۆ بدەم بەڵکو وەك (خـاطب) ێك هاتووم کە خوازبێنی سەروماڵتان بکەم بۆ بەرنامەکەی خوا چونکە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ان الله اشترى من المؤمنين انفسهم واموالهم بأن لهم الجنة ﴾ تا ﴿ وذلك هو الفوز العظيم ﴾ التوبة : ١١١

جارێکی‌تر لەبەردەم نزیکەی چل هەزار کەسدا لەشاری (طنطا)وتاری‌داو باسی (صناعة الموت)ی کرد، کە چۆن زۆرکەس هەیە نازانێ چۆن بمرێت‌و، خۆی دەفرۆشێ بەشتێکی کەم‌و بێنرخ...جالەبەرئەوەی زۆر لەشوێنکەوتووانی ڕێبازی شاذلی لەوێدا بوون ، نموونەی هێنایەوە بەدوعاکەی شێخ ( ابي الحسن الشاذلي) کە دەڵێ: اللهم ارزقنا الموتة المطهرة ، ئنجا وتی : دەزانن ( الموتة المطـهرة ) چی‌یە ؟ دەستی بەرزکردەوەو هێنای بەملی خۆی‌داو ، پاشان وتی: شەهید بوون ئەو مردنە پاککەرەوەیەیە ، کەخوا بەهۆیەوە لەهەموو گوناهەکان خۆش دەبێ .

ئەم وتانەی (بەننا) هەروەك کارەبا خەڵکەکەی گرت‌و رای چڵەکاندن‌و فرمێسکی پەشیمانی پێ ڕشتنو ، وانەیەکی وایان وەرگرت کە سەرو ماڵیان ببەخشن بەخوا... پەراوی ( دموع في ساحة الدعوة) محمود المنير.

## فرمێسکی کاك ئەحمەدی شێخ :

حاجی کاك ئەحمەدی شێخ ساڵی ١٧٩٣ز لەشاری سلێمانی لەدایك بووەو لەساڵی ١٨٨٧ز هەرلەوێ لەتەمەنی (٩٤) ساڵی‌دا کۆچی‌دوایی کردووە ( گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد/ بەرگی یەکەم/ بەشی یەکەم) .

ئەم زاتە دەڵێن حەزرەت ﷺ لەخەودا مژدە بەدایکی ئەداو هەر لەخەویشدا بۆی ناو ئەنێ (کاك ئەحمەد)...

بەڵێ... بەقەدەری خوا کاك ئەحمەد لەگۆڕەپانی ئیسلامەتی‌و خواناسی‌دا لەسلێمانی سەری هەڵداو بووە کەسایەتیەکی جیهانی‌و بانگخوازێکی مەزن بۆ گەیاندنی پەیامی خوایی...

مەکتوبانی کاك ئەحمەد کەرەنگە ژمارەیان (٩٩) مەکتوب بێت، بەڵگەن لەسەر پایە بەرزی ئەم زانا خواناسە ، جا لەمەکتوبی (ئەسەفییات ـ خەمەگەورەکان) دا کەباسی باری

کۆمەڵایەتی نزیکەی سەدو پەنجا ساڵ لەمەوبەری کوردستان دەکات دەڵێت : (بۆم سەلماوە کە گەورە پیاوانی ئەم سەردەمە هەرکەسە قسەیەکیان رووبەڕوو بکاتەوە با بۆ سوودی خۆشیان بێت، ئەگەر باس لەدەرخستنی عەیبو کەمو کورتیەکان بێت، ئەوا خێرا دڵیان دەڕەنجێتو دڵ پیس دەکەن .هەر بۆیە زۆرجار دڵسۆزانو خەمخۆران هەڵوێستیان نەبووەو بێدەنگ بوون، بەڵام من هەردەم گوێنادەمە ئەو زیانەی رووبەڕووم دەبێتەوەو دڵ شکاندنی ئەو پیاوە بەرزانە بەباشتر دەزانم ، ئەگەرچی چەندەها جار گوتوومەو ئێستاش جارێکیتر دەڵێم: تاوەکو ئەوئەرکەی لەسەرشانمە هێندەی توانای خۆم جێبەجێی بکەم . لەریوایەتێکدا هاتووە کەلەئاخری زەماندا بەهۆی زۆری داغو مەخابنەکانەوە ( یذوب قلب المؤمن )واتە: دڵی مرۆڤی خاوەن باوەڕ دەتوێتەوە، بۆیە بۆ مەبەستی خۆ قوتارکردن لەم حاڵەتەو بەمەبەستی پراکتیزەکردنی دڵسۆزیمو بۆ ئارامی دڵو دەروونم ، چونکە شکات کردنو دەربڕینی ئەوەی کەلەناخدا هەیە دەبێتە هۆی سووك بوونی خەمو خەفەت ، هەندێك لەداغو خەمە بێ کۆتاییەکانم دەخەمە بەردەستتان).

ئنجا کاك ئەحمەد بەدرێژی دەکەوێتە باسی خەمەکانی بۆ نموونە دەڵێ:

( زۆر جار گەورە پیاوان لەکارێکدا تەنها چاویان لەسوودێکی کەمەو ئیتر (سلبیات)ی ئەوە لێك نادەنەوە کەلەوانەیە بەهۆی ئەوکارەوە موسڵمانان تووشی سەدان زیان ببن) .

( ئێستا رۆژ بەرۆژ بەرەو خراپتر دەڕۆینو کارگەیشتۆتە ئەوە کە ئەگەر لەتوانامدا بوایە سەری خۆم هەڵدەگرت ، لەترسی _ مما لایطاق من سنن المرسلین _ واتە ئەو سزایەی کە خوا دەینێرێ بۆ ئەوانەی کەبەگوێی بەرنامەی پێغەمبەران ناکەنو کەسیش ناتوانێ بەرگەی بگرێت ) .

( جێگای داخە بەلامەوە کە ئەوانەی خواپەرستو پارێزکارن لەلای سەرکردەکانەوە بەرێزنینو قسەیان ناڕوات ، بەڵام ئەوانەی کەماستاوچیەتیو مامەحەمەییان بۆ دەکەن هەمیشە لەریزی پێشەوەو لەسەرووی خۆیانەوە بەعەیززەتەوە سەیریان دەکەن هەروەك لەفەرموودەدا هاتووە ( یذلون من أعزه الله ویعزون من أذله الله).

(یەکێکیتر لەو داخە گەورانەی کە زۆر دڵم ئازاردەدات ئەوەیە کەداوێن پیسیو شەراب خواردنەوەو نوێژنەکردنو دزیو چەتەییو کوشتو کوشتار گەیشتۆتە ئاستێك کەبەئاشکرا خەشمو قینی خوای گەورە دەبارێن بەسەرماندا).

پاش هەڵڕشتنی خەمو داخەکانی، کاك ئەحمەد کۆتایی بەمەکتوبەکەی دێنیۆ دەڵێ:
( براکان ئەگەر ڕۆژێك لەڕۆژان پێویستمان بەباران هەبوو وخوای گەورە بۆی باراندین، ئەوا بزانن کە هۆکەی قبووڵ بوونی دوعای پیاوچاکێکی خوایە، ئەگینا ئێمە شایەنی هەموو سزایەکین جا سەلامی خوا لەسەر ئەوەبێت کەدوای هیدایەت دەکەویۆ خۆی دەپارێزێ لەخراپەو تیاچوون، وەدەگری لەخەمو خەفەتی بانگەوازو حاڵی خراپی خەڵکدا )...( پاشان خۆی دەستی کرد بەگریان ) .
بەڵێ... کاك ئەحمەدی بانگخواز لەترسی باری مەسئوولیەتو قورسی ئەدای ئەمانەتو ناحاڵیەتی خەڵكو دوور لەخواییان گریاو فرمێسك هۆن هۆن بەچاوەکانیو بەسەر کوڵمو ریشیدا هاتنە خوارەوە !
( پرۆژەی مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شێخ بەدەستەوەیەو بەندە ئامادەی کردووەو کاك لهۆن قادریش لەفارسیەوە دەیکات بەکوردی ، بەمەش هەموو مەکتووبەکانی کاك ئەحمەد دەکرێنە کوردی، کە مامۆستا ملا عبدالکریم تەنها (٥٠) مەکتوبی وەرگێڕاوە ، داواش دەکەین هەرکەس شتێکی لەبارەی کاك ئەحمەدەوە لایە بۆمان بنێرێ ) .

## ( ٦ ) ڕێبوارانی ڕێ!

ژیان گەشتێکەو هەموو ڕێبوارین، شاعیرەکان بەهۆنراوە یادەوەری یان تۆمارکردووە، جائیتر ئەگەر ئەزموونی ژیان بێت یان تۆمارکردنی ئەو دیمەنانە بێت کەلەو ڕێگەیەدا دیویانە، هەیانە زۆر بەوەستایانە بەوشەی جوان تابلۆی جوانی نەخشاندووەو هەشە لەپەراوێکدا چی بەچاك زانیوە تۆماری کردووە...هی واش هەیە لەرێی ئامۆژگارییەوە ئەزموونی خۆی بەخەڵکی وتووەو ...هەندێکی تریش خەڵکانی دەوروبەریان ژیاننامەیان بۆ نووسیونەتەوەو ... زۆر خەڵکیش هەروا دێنەدنیاوەو هەرواش لێی دەردەچن بەبێ ئەوەی کە هیچ لەبارەیانەوە بزانرێت!

### گۆران و گەشتەکەی:

گۆران گەشتێك دەکات بۆ قەرەداغو زۆر شاعیرانەو لێزانانە، تۆماری ئەو دیمەنو تابلۆیانە دەکات کەدیونیو ئەمەش بۆ خۆی خزمەتێکە بەوێژەو ئەدەبی کوردیو خوێنەر پاش چەندەها ساڵ، بەخوێندنەوەی ئەو هۆنراوەیە هەروەك گۆران وێنەکان دێنەوە بەرچاویو تاموچێژی خۆی لێوەردەگرێت، بۆ نموونە کەدەڵێت:

عاسمانی شین و ئەستێرەکانی
پێدەکەنین بۆ بەری بەیانی
گلۆپەکانی سەرجادەو کۆلان
زمرد هەلگەڕابوون، کزکز ئەسوتان
دمرژا لەسەردا کزەی بەیان
ئەیلەرانەوە کولە و پەردەکان
شاری پەنجەرەو دەرگا داخستوو
وەك یەك گیاندارو بێگیان تیانووستوو
*     *   *

رۆژ رمێك بەرزبوو، دا پەڕینە چەم
ئاوشین، مەرمزە سەوزو گوڵ بەدەم
عەکسی سەوزایی رووی پڕ لەرەی ئاو
تیا ئەشکایەوە پرشنگی هەتاو!
ڕەنگ رەنگ پەپوولە ئەفڕی زەلاو زەل
گا کناچەی پۆڕ، گاجریوەی مەل
هەوای پڕشنەی چەمی ئەلەرزان
پێی ئەهاتە جۆش کوورەی شادیی گیان!
لەژوورمانەوە پردێکی رووخاو
سێبەری کرکی ئەکرد بۆ پەنگاو!
شارە مێروولەی ناوپەنگاوی قووڵ :
پۆل پۆل ماسی بوو ئەیکرد جم و جووڵ!
ئامانە مل چەم سوار لەشوێن سوار
شلپ و هووڕکەوتە ناو تەنکاوی بوار
ولاخ رووی ئاوی دەکرد سمکاری
ئەپڕژا بارانی دوڕو مرواری!          (دیوانی گۆران)

**هەموو لەگەشتداین :**

(ابن القیم) دەڵێ: ( خەڵکی لەوساتە وەختەوەی کەدروست بوون گەشتیارن ، ژێر دەزانێ کە ئەم گەشتە ناڕەحەتی‌و مەترسی تێدایەو، مەحاڵە بەتەمای خۆشی‌و چێژوەرگرتن‌و پشوودان بێت، دیارە ئەم شتانە لەدوای کۆتایی هاتنی گەشتەکە بەدەست دێن ) الفوائد

لەم گەشتەدا هەیە ئامانجی دروست بوونی نازانێ‌و نافامێ بەرەو کوێ مل ئەنێ و کوێرانە پەل ئەکوتێ ! شاعیری سەردەم( الیا ابو ماضي) لەجیاتی ئەو دەستەوتاقمە دەڵێت:

جئت لا أعلم من أين ؟ ولكني اتيت

ولقد ابصرت قدامي طريقاً فمشيت

وسأبقي سائراً شئت هذا ام ابيت

كيف جئت ؟ كيف ابصرت طريقي ؟ لست ادري

**هاتووم ، نازانم لەکوێوە؟ بەڵام هاتووم**

**لەبەر پێی خۆمەوە ڕێگایەکم بینی ڕۆیشتم**

**بەردەوامیش بمەوێ یان نەمەوێ دەڕۆم**

**چۆن هاتم ؟ چۆن ڕێم بینی ؟ ...نازانم**

بەراستی ئەمە ئەو تاریکایی‌و گومڕایی‌یە کە قورئان باسی دەکات، ئەگەر کەسێك خوا نوورو ڕووناکی‌و هیدایەتی نەداتێ ئاخر لەکوێوە بەدەستی دەهێنێت ؟!

**نوورو تاریکی‌یەکان :**

ڕێبوارانی ڕێ کاتێك گوێ نادەنە سەرقافڵەچی‌و کاروانی هەق، ڕێون دەکەن‌و لەدەشتی کاکی بەکاکی‌دا تینوو برسی دەبن، لەدوورەوە (سراب) تراویلکە دەبینن‌و دڵی پێخۆش دەکەن، وادەزانن ئاوە، کاتێك بەهەر حاڵێك دەگەنە لای سەیر دەکەن خەڵەتاون و هیچ نیە !.

﴿ والذين كفروا اعمالهم كسراب بقيعة يحسبه الظمان ماء ، حتى اذا جاءه لم يجده شيئاً ، ووجد الله عنده فوفاه حسابه ، والله سريع الحساب ﴾ النور ٣٩ .

واتە: ئەوانەی کە ڕێبازی کوفریان گرتۆتە بەر، کردەوەکانیان وەك تراویلکە وایە لەبیابانێکدا، کەسێکی تینوو وابزانێت ئاوە، بەهەزار ناڕەحەتی‌و تالوکە بیەوێ بگاتە لای ، کاتێ گەیشتە لای دەبینێت هیچ نیە، ئەوساش کاتێك بەخۆی دەزانێت ژیانی کۆتایەو

قیامەت بەرپابووە، خوایش ئامادەیە لەلایداوبەگوێرەی کردەوەی لێی دەپرسێتەوە ، وەخوا بەخێرایی لێپرسینەوە ئەنجام ئەدات.

بۆ زیاتر تێگەیشتن لەشەوی یەلدای ئەو تاریکی ئەموستەچاوەیان قورئان نموونەیەکی تریان بۆ دێنێتەوەو هەر بەدوای ئەو ئایەتەدا دەفەرموێ :

﴿ او كظلمات في بحر لجي يغشاه موج من فوقه موج من فوقه سحاب، ظلمات بعضها فوق بعض اذا اخرج يده لم يكد يراها ومن لم يجعل الله له نوراً فما له من نور﴾ النور/ ٤٠ واتە: یاخود کردەوەیان وەك چەندەها تاریکایی‌وایە کەلەناو دەریایەکی قوڵدا شەپۆل لەسەر شەپۆل بدات بەسەریدا، لەسەروشیەوە هەورێکی تاریك هەبێت، تاریکیەکان چین لەسەر چین نیشتبن، ئالەم کاتەدا کە:

١) دەریاکە زۆر قووڵەو تا قووڵتریش بێت رووناکی نایگاتیو تاریکتر دەبێت .

٢) شەپۆلێك لەناو دەریاکەدا بەری رووناکی بگرێ.

٣) شەپۆلێك لەسەر ڕووی ئاوی دەریاکەدا بەری رووناکی بگرێ .

٤) لەسەرووی هەموویانەوە هەوریش بەری خۆری گرتبێ.

بەڵێ...ئەم هەموو تاریکایی‌یە لەسەریەك بێت و کەسێك لەناو ئەم قووڵایی دەریایەدا لە ( ژێر دەریایی‌یەك )دا بێت دەستی دەربهێنێ دەستی خۆی نابینێ !

جادیارە کەسێ دەستی خۆی نەبینێ ئەوا رێی خۆیو دەوروپشتی نابینێ، واتە ناتوانێ بجووڵێ ، مەگەر کوێرانە پەل بکوتێ !

جا ئالێرەدا ئەگەر خوا نوور رووناکی نەدات بەم کەسە ، نوورو رووناکی بەهیچ جۆرێك لەهیچ شوێنێکەوە دەست ناکەوێ !

### ( ٧ ) حاڵی رۆژئاواو ئەورووپا !

ئەوانەی لەم گەشتەی ژیاندا ، رووناکەنە بەرنامەی خواو نابنە بەندەی راستەقینەی خوا، بیانەوێو نەیانەوێ، بزانن یان نەزانن دەبنە بەندەی هەواو ئارەزوو ، وە دەکەونە مادده پەرستی...

قورئان دەفەرموێ: ﴿ افرأيت من اتخذ الهه هواه وأضله الله على علم وختم على سمعه وقلبه وجعل على بصره غشاوة فمن يهديه من بعد الله أفلا تذكرون، وقالوا ماهي الا حياتنا الدنيا نموت ونحيا وما يهلكنا الا الدهر ومالهم بذلك من علم ان هم الا يظنون ﴾ الجاثية/٢٤ واتە: ئایا نابینی ئەوکەسەی کەویستو ئارەزووی خۆی کردۆتە خوای

خۆی؟! بەهۆی ئەوەوە خواش گومڕای کردووە کەزانیوویەتی شایانی ئەوەیە، لەئەنجامی بەد هەڵوێستی خۆیدا مۆری ناوە بە گوێو دڵیاو پەردەشی هێناوە بەسەر چاویدا. جا ئیتر کێهەیە جگە لەخوا هیدایەتو ڕێنموویی بکات، ئایا بیرناکەنەوەو ئامۆژگاری وەرناگرن.

خوانەناسان دەیانوت: ژیان تەنها ئەم ژیانی دنیایەیە، دەمرینو دەژینو هەر ڕۆژگارو زەمانەیە کە دەمان مرێنێو هیچی تر! جا ئەوانە وەنەبێت لەسەر بنچینەی هیچ جۆرە زانستیو زانیارییەك ئەوە بڵێن، بەڵکو تەنها پشت بەگومانو دوودڵی دەبەستن.

هەروەها لەسوورەتی( الفرقان )ئایەتی ٤٤/ دەفەرموێت: ﴿ أرأيت من اتخذ الهـه هـواه أفانت تكون عليه وكيلا ، ام تحسب أن أكثرهم يسمعون أو يعقلون ، ان هم الا كالانعام بل هم أضل سبيلا ﴾ واتە : ئایا نابینی ئەوکەسەی کە ئارەزووی خۆی کردۆتە خوای خۆی ؟ ئایا تۆ دەتوانیت ئەوانە بپارێزیت لەلادانو سەرکەشی؟ ئایا وادەزانیت زۆربەی ئەوانە دەبیستن، یان دەفامن ، ئەوانە وەکو ماڵاتنو بگرە لەوانیش سەرگەردانترو گومڕاترن !

پێغەمبەریش ﷺ لەبارەی مادده پەرستانەوە دەفەرموێ: ﴿تعس عبدالدينار تعس عبدالدرهم ...﴾ بخاري

واتە: سەرگەردانو پەرێشان و بەدبەختە بەندەی دینارو بەندەی درهەم !

ئەم مادده پەرستیەی کەلەلای خوانەناسان دەیبینین ، ڕاستی ئەم فەرموودانە دەسەلمێنن ، ئەوە ئەوروپا کەساڵانە زیاتر لە حەوت سەد هەزار ئافرەت بازرگانی پێوەدەکرێو لەم بازرگانییە ناڕەوایەوە نزیکەی (٧) ملیار دۆلار دەست کەوتیان دەبێت! مەگەر هەر خوا بۆ خۆ بزانێ بەدبەختیو چارەڕەشیو داماوی ئەو ئافرەتانە بەدەست تۆڕەکانی مافیاو گورگە ئادەمییەکانەوە !

بەهەزارەها چیرۆکی جەرگ بڕ دەگێڕنەوە و مووی سەر ڕاست دەبێتەوەو موچڕکە دێت بەگیاندا ! جا کەدێنە سەرباسی (ماف) یش هیچیان نەهێشتۆتەوەو گوایە لەسەر ئازاردانی گیانەوەرێك دێنە مەیدانو کۆمەڵەکانی پاراستنی گیانەوەران ڕاست دەبنەوە!

زانایانو بیریارانی ڕۆژئاواش زەنگی مەترسی ناوبەناو لێدەدەنو دەڵێن کورگەلینە ، کاروابڕوات واین لەقەراخی کەندەڵانی تیاچووندا...

پەڕاوێك بەناوی (امـة فـي خطـر) باسی گەندەڵیو خراپی پرۆسەی خوێندنو تێکەڵاوی کوڕانو کچانی ئەمریکا دەکاتو بەرپرسانیان ئاگاداردەکاتەوە کە فریای میللەت بکەون... بۆیە سەرۆك (بۆش) پرۆژەی جیاکردنەوەی کوڕو کچی لەخوێندندا

ئەمساڵ خستە بەردەم کۆنگرێسی ئەمریکی، کە تاوتووێ بکرێو وابڕیارە کوڕ بەجیاو کچ بەجیا بخوێنێ، وەبەنیازن ئەو قوتابخانانەی کەتێکەڵاوین زیاتر لەلایەن دەوڵەتەوە هاوکاری بکرێن! (تۆڕی ئینتەرنێت ـ پێگە ئیسلامییەکان).

هەرچەندە لەئەڵمانیاش هەمان نیازیان هەیەو هەنگاویشیان بۆ ناوە ، کەچی بەداخەوە تووتییەکانی وڵاتە بەناو ئیسلامییەکان، تازە بەتەمان بەرەو ئەو کەندەڵان و نەگبەتی تێکەڵکردنە هەنگاوی بێخێریان بنێن !

ڕەنگە ناهەقیشیان نەبێت کوردواتەنی( دەنگی دەهۆڵ لەدوور خۆشە !) (شایانی باسیشە کە(١٦٧) قەشەی ئەمریکی لەم ماوەیەدا لەکارەکانیان دەرکران لەسەر کاری بەدڕەوشتی لەگەڵ منالدا ! کە ئەمەش نیشانەی شیرازە بچڕان و نەمانی بەها کۆمەڵایەتیە بەرزەکانە لەو کۆمەڵگایەدا ! ) تۆڕی ئینتەرنێت.

## ( ٨ ) مەکۆی سەرکەوتن!

دیارە سەرکەوتن و سەرفرازی دنیاو قیامەت ئاواتی هەموو مرۆڤێکی ژیرە، جا بەرەو ئەو سەرکەوتن و سەرفرازییە ئەوە چەند ڕێنمایو ئامۆژگارییەك ، یەکەم بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ خۆتدا ، دووەمیش بۆمامەڵەو هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ خەڵکیدا :

یەکەم/ چەند ئامۆژگارییەک بۆ نەفسی خۆت :

* بزانە کە بڕواداری چوست و چالاك و بەهێز لای خوا پایەبەرزترو لەپێشترە لە بڕواداری دەستەوسان، حەزرەت دەفەرموێ: ( المؤمن القوي خير واحب الى الله من المؤمن الضعيف ) مسلم.

*بزانە ئەو کارەی کەدەیکەیت ئەوەندەی قبووڵە لای خوا کە بەپێی شەرع بێت و بەئیخلاسەوە بەئەنجام گەیەنرابێ، چونکە هەرکارێك بۆ خوا نەبێ وەرناگیرێو هەرشتێکیش بەپێی شەرع نەبێ دەدرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا...

بزانە تا خۆت نەناسی لەخەڵکیتر تێناگەی ، هەروەك زاهیدی حەکیم (سمنون) دەڵێ: ( من تفرس في نفسه فعرفها، صحت له الفراسة في غيره وأحكمها ) الرقائق / الراشد .

* خەیاڵت و بیرکردنەوەت بافراوان بێت و تەنها لەبەردەم یەك چارەسەردا دۆشدا مەمێنە، چونکە ئەوەی هەوڵ بدات خوای گەورە چەندەها چارەسەرو ڕێگای دەخاتە بەردەست و زۆر دەرگای لێدەکاتەوە، ئەگەر ئەمیان نەبێ دەتوانێ لەویتریانەوە بچێتە ژوورەوە ! ﴿ والذين جاهدوا فينا لنهدينهم سبلنا ﴾ دیارە یەك ( سبيل) نیە بەڵکو (سُبُلَ)کە کۆیە!

هەندێ سیاسەتمەدار لەبارەی هەندێ لەموسڵمانەکانەوە دەڵێن: ئەگەر دەرگاشیان لێبگیرێ لەپەنجەرەوە دێنە ژوورەوە ...منیش ئەڵێم ئەگەر پەنجەرەشیان لێبگرن پشت بەخوا وەك (کاسپەر) ی پاڵەوانی ئەفلام کارتۆن لەدیوارەوە دەچنە ژوورەوە !

خەیاڵ‌وبیکردنەوە گرنگەو سەرەتایە بۆ بنیاتنان‌و بەرەوپێش چوون، ئیسپانی‌یەکان لەروانگەی ئەزموونی خۆیانەوە پێت ئەڵێن: ( اذا لم تبن قلاعك في الهواء فلن تبنيها في مكان اخر) . واتە: ئەگەر کۆشك‌و قەڵاکەت لەهەوادا بەخەیاڵ دروست نەکەیت، ناتوانی لەسەر زەوی‌و لەواقیعدا دروستی بکەیت.

* حیکمەت ونبووی موسڵمانەو لەهەر کوێ بیدۆزێتەوە خۆی بەخاوەنی دەزانێ، پێت گران نەبێ کەقسەی هەق لەهەر کەسێکەوە بێت وەری گریت.

(ئەبو حەنیفە) منداڵێکی بینی قوڕەکاری دەکرد، پێ‌ی وت: وریابە نەکەویتە ئەو قوڕەوە، ئەویش وتی: تۆ ئاگاداری خۆت بە نەکەوی، چونکە کەوتنی عالم کەوتنی عالەمە! ئەمە کاری کردە سەر (ئەبو حەنیفە)و وای لێهات دوای مانگێك لێکۆڵینەوەو تاوتوێ‌کردن لەگەڵ قوتابیەکانی‌دا ئنجا فتوایەکی دەردەکرد!

* بەردەوامی‌و کۆڵنەدان زامنی سەرکەوتنن، ئەدیسۆن پاش هەزار جار تاقیکردنەوە، لەهەزارویەکدا سەرکەوت! ئەمە بێجگە لەوەی کە گوێ‌ی نەئەدا بەنەیارو ناحەزەکانی کەلە رۆژنامەکاندا دەیان وت: ئەدیسۆن شێتە !

هینری فۆردیش پێنج جار ئیفلاسی کرد، پاش ئەو هەموو مەسرەفە ئنجا سەرکەوت لەدروستکردنی یەکەم ئۆتۆمبیلدا !

*بزانە ژیان بەگشتی‌و ئیسلامەتی بەتایبەتی زۆرلایەنی هەیەو نابێ تەنها لەیەك گۆشەوە سەیری بکەیت، ئەگینا بەهەڵەدا دەچیت، زۆرکەس هەیە تەنها لایەکی گرتووەو هەموو خەڵکانی‌تر بەگومڕاو سەر لێشێواو دادەنێ کە ئەمەش زیادەڕەوی‌یەو عەقڵو ژیری وانالێن!

هاوسەنگیش لەکارەکانداو هەق پێدانی هەموو لایەنەکان فەرمایشتی حەزرەتە ﷺ کەدەفەرموێ ( اعطوا كل ذي حق حقه) ...

* لەخۆت تێ‌بگە، لەکوێوە هاتووی، بۆ کوێ دەچی، لەبەرچی هاتووی، وەڵامەکانی ئەم سێ‌پرسیارە گرنگن، کە ئەم وەڵامانەت دەست کەوت، ئامانجی خۆت لەژیاندا دیاری‌بکەو ئنجا بەپێ‌ی بەرنامەو بەبەرچاو روونی هەوڵ بدەو بزانە خوا دەست نانێ

**بەرووی هەوڵی کەسەوە** ﴿كُلاً نُمِدُّ هؤلاء وهؤلاء من عطاء ربك وما كان عطاء ربك محظوراً﴾ الاسراء /٢٠ **واتە: ئێمە هەرکەسێ هەوڵبدات، لەبەخششی پەروەردگارت دەیدەنێ، بێگومان بەخششی پەروەردگارت سنووردارو قەدەغەکراونیە لەدنیادا بۆ کەس!**

*__بزانە ئەگەر هەوڵو گەڕانو گەشتو غەریبایەتی نەبێ مرۆڤ پێناگات، وە ئەگەر ئاو نەڕواو بوەستێ بۆگەن دەکات، وە ئەگەر شێر لەبێشە نەیەتە دەرەوە راوی نێچیری بۆ ناکرێت، وە ئەگەر تیر کەوان بەجێ نەهێڵێ نیشانە ناپێکێ ، وە ئەگەر خۆریش بوەستایە، عەرەبو عەجەم لێی بێزاردەبوون! ئەمەش هۆنراوەکەی شافیعی‌یە کەدەڵێ:__

مافي المقام لذي عقل وذي ادب

من راحة فدع الاوطان و اغترب

سافر تجد عوضاً عمن تفارقه

وانصب فان لذيذ العيش في النصب

اني رأيت وقوف الماء يُفسده

ان ساح طاب وان لم يجر لم يطب

والاسد لولا فراق الغاب ما افترست

والسهم لولا فراق القوس لم يصب

والشمس لو وقفت في الفلك دائمة

لملها الناس من عجم و من عرب

**بەڵێ ... شافیعی بەم بیروبۆچوونەوە لەشانزە ساڵی‌دا توانی(فتوا) بداتو سوودبەخەڵکی بگەیەنێ!**

* **پاشان بزانە کەهەرکارێك کاتێکی تایبەت بەخۆی هەیە، خوای گەورە ئیشی شەوی ناوێ لەرۆژداو ، ئیشی رۆژی ناوێ لەشەودا ، هەروەك حەزرەتی ئەبوبەکر ئامۆژگاری حەزرەتی عومەری کردو وتی:** ( اعلم أن لله عملاً في الليل لا يقبله في النهار ، وأن لله عملاً في النهار لايقبله في الليل )...

*مصطفى صادق الرافعي دەڵێ: ( من الخطأ الكبير أن تنظم الحياة من حولك وتترك الفوضى في قلبك ) **واتە: لەهەڵە گەورەکانە ئەگەر بتەوێ ژیان لەدەوروبەرت رێك بخەیتو لەناودڵیشتدا** (فوضى) **وشپرزەیی‌و نارێكو پێکی هەبێت، واتە لەدڵو نەفسی خۆتەوە دەست پێ بکەو بزانە** ( ان الله لا يغير مابقوم حتى يغيروا ما بأنفسهم) الرعد .

* **سەروماڵو ناموسی موسڵمانان حەرامنو غەیبەتیش حەرامە، بشزانە کەمانای غەیبەت ئەوەیە کەسێك کەموکوڕی‌یەکی هەبێو تۆلە شوێنێکدا باسی بکەی کە سوودی نەبێ بۆ چاك بوونی‌و بتەوێ بیشکێنی‌و ناوی بزڕێنی، خۆ ئەگەر ئەوکەمو کوڕی‌یەی**

تیانەبوو، وە تۆ لەسەر قسەی ئەمو ئەو وتت ئەوا بوختانت کردووە ! ئنجا چاکیش بزانە کەغەیبەتی کۆمەڵو لایەنو ڕێکخراو گوناهەکەی گەورەترە چونکە کەسانێکی زیاتر دەگرێتەوە...

**دووەم/ چەند ئامۆژگارییەك بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکدا:**

* بەتەمای کەس مەبە (معصوم) بێت، ئەوەی کە تۆ مامەڵەی لەگەڵدا دەکەیت مرۆڤەو مەلائیکەت نیە، بشزانە کەکەسی وا هەیە کەمو کوڕییەکانی دەکرێت بەقوربانی چاکییەکانی..

* خوای گەورە دوو گوێو دەمێکی داویتیٚ، دوو قەسە ببیستە ئنجا قسەیەك بکە، کە مرۆڤ کەمی وت ، هەڵەش کەم دەکاتو ئەگەر دەم بهێڵێ سەر سەلامەتە ! هەرچیش زۆری وت چاکیش دەڵێو خراپیش دەڵێ.

دەڵێن: زۆر کەس کە حەز دەکات بچێ بۆ لای پزیشك بۆئەوەیە کە پزیشکەکە گوێی بۆ بگرێت ! جا ئەگەر تۆش پزیشکی نەخۆشیەکانی دڵو دەرونیت چۆن دەبێت گوێ نەگریت ...

ڕۆژێك (عطاء بن ابي رباح)گوێی شلکردبوو بۆ لاوێك هەردەتووت یەکەمجارە ئەوقسانە دەبیستێ، هاوەڵەکانی لایان سەیربوو... ئەویش پێی وتن: ( بەخوا ئەوەی ئەو وتی پێش ئەوەی ئەو لەدایك بێت من دەیزانم ) بەڵام دیارە گوێگرتنیش هونەرێکەو هەموو کەس نایزانێ...

* چینییەکان دەڵێن: ئەوەی لەبەردەمتایە تێی ناگەی هەتا بەپێڵاوەکەیەوە هەزار هەنگاو نەڕۆیت ...واتە خۆت بخەرە جێی ئەوو چاك حاڵو وەزعی تێبگە پێش ئەوەی هیچ بڕیارێك بدەیت...

* دەڵێن: هەموو خەڵکی یەك جۆر جلوبەرگیان بۆ نابێو یەك جۆر پێڵاو لەپێناکەن... بۆیە ئەبێ هەر کەسەو بەزمانی خۆی قسەی لەگەڵ بکرێ، ئەوەی بۆ فلان باشە ڕەنگە بۆ یەکێکی تر ببێتە مایەی فیتنە !

حەزرەت ﷺ دەفەرموێ: ( خاطبوا الناس على قدر عقولهم ) واتە: هەرکەسەو بەپێی عەقڵی خۆی قسەی لەگەڵ بکەن، دەتانەوێ بێباوەڕیان بکەن بەخواو پێغەمبەر ؟! .

* لەژیاندا بەگشتیو لەکاری بەکۆمەڵدا بەتایبەتی تواناکان یەکتری تەواو دەکەن، ئەوەتە حەزرەت ﷺ لەبارەی هاوەڵانیەوە دەفەرموێت: ( ارحم امتي بأمتي ابوبكر، واشدهم في امر الله عمر ، واصدقهم حياء عثمان، واقرأهم لكتاب الله أبَي بن كعب ، وافرضهم

زيد بن ثابت ، وأعلمهم بالحلال والحرام معاذ بن جبل ، ولكل أمة امين وامين هذه الامة ابو عبيدة) الترمذي ٣٧٩١ واحمد ١٢٤٩٣ .

**واتە: میهرەبانترینی ئوممەتم بۆ ئوممەتم ئەبوبەکرو توندترینیشیان لەفەرمانی خوادا عومەرەو، بەحەیاترینیان عوسمانەو ، قورئان خوێن ترینیان ئوبەی کوڕی کەعبەو ، زاناترینیان لەفەرزەکاندا زەیدی کوڕی سابتەو، شارەزاترینیان لەحەلاڵو حەرامدا مەعازی کوری جەبەلەو هەموو گەلێکیش ئەمینێکی هەیەو ئەمینی ئەم ئوممەتە ئەبو عوبەیدەیە )...**

**بەڵێ... هەمووان هاوەڵی پایەبەرزی حەزرەتن ﷺ ، بەلاّم هەریەکەیان لەبوارێکدا زیاتر پسپۆڕەو ،زانستو زانینیش رزقەو، خوا هەریەکەو بەجۆرێك رزقی ئەدات... بۆیە هەرچی بەخۆت دەکرێ بیکەو، کاری کەسیش بەکەم مەزانە، چونکە** ﴿ لا يكلف الله نفساً الا وسعها﴾ ، **کێ دەڵێ ئەوەی تۆ بەجۆرێك سەیری دەکەی تواناکانی هەر ئەوەندە نیەو خوای گەورە ڕەنگە لەوە زیاتری لێ نەوێت ؟!**

* ( نسيبه المطوع ) **ی نووسەری کوەیتی دەڵێ: ئێمە دەسەلاّتمان نیە بەسەر عەقڵی خەڵکیداو، هەر ئەوەندەمان بۆ هەیە لەدەرگای دڵو عەقڵیان بدەین زۆر بەلەسەرخۆییو بەئەدەبەوە، جارەنگە هەر لێمان نەکەنەوە، یان ڕەنگە لێمان بکەنەوەو فەرموومان لێنەکەنو میوانداریمان نەکەنو نەتوانین قەناعەتیان پێ بهێنین !** ( صناعة النجاح) د. طارق السويدان و فيصل باشراحيل .

* **داد پەروەربە لەگەڵ بەرامبەردا ئەگەر حەزیشی پێنەکەیتو چارەشیت نەوێ، چونکە خوای گەورە ، فەرمانی داوە بەدادپەروەرییو پاشان فەرمانی داوە بەنوێژ ... هەروەك دەفەرموێ** ﴿ قل : امر ربي بالقسط واقيموا وجوهكم عند كل مسجد وادعوه مخلصين له الدين ، كما بدأكم تعودون ﴾ الاعراف : ٢٩

**زەیدی کوری خەتتاب برای حەزرەتی عومەر، لەگەڵ کۆمەڵێك دەشتەکیدا رۆیشت فێری ئیسلامەتیان بکات لەرێگا لێی هەڵگەڕانەوەو شەهیدیان کرد، ئەمەش برینێکی قووڵی لەدەروونی حەزرەتی عومەردا دروست کرد ، پاش ماوەیەك ئەوانە موسڵمان بوونەوەو کاتێك هاتنە لای حەزرەتی عومەرو ئەویش قسەی بۆ دەکردن ، سەیری ئەوەی نەدەکرد کە بکوژی براکەی بوو، وەلەبەرئەوەی موسڵمان بووبووەوە نەی دەتوانی هیچ بکات بەرامبەری ...کابراش هەستی پێکرد کەچ تاوانێکی کردووەوچەندە حەزرەتی عومەریش بێتاقە لێی، بۆیە پرسیاری لە عومەر کرد، کەمن بەوکارەم دیارە زۆر ئازارم**

داوی؟، ئەویش وتی: بەڵێ، وتی: باشە ئەوە وادەکات کەهەقی خۆمم نەدەیتێ...وتی: نەخێر ...کابراش وتی: دە ئیتر قەیدی ناکات خۆشت نەوێم، مادام هەق و مافم پارێزرابێ! بەراستی ئەمە لوتکەی دادپەروەریی‌یە کەدنیا بەخۆیەوە نەبینیوە مەگەر لەسەردەستی ئیسلامدا...کە پەندو وانەیە بۆ هەموو موسڵمانێك کە هەقی هەموو خاوەن هەقێك بدەن .

## ( ٩ ) تیشکێ لەسەر پیلانی دوژمنان

بۆسنەوهرسك وشیشان و کۆسۆفۆو کشمیرو فەلەستینو کوردستانەکەی خۆشمانو دەیەها شوێنی‌تریش هەریەکەو بەدەست ستەمکارێکەوە ناڵاندوویەتی‌و رۆژئاوا ملۆزمێکی بۆ داناوە کەپشتگیری ماددی‌و مەعنەویان دەکات یان هەر هیچ نەبێ گوێی خۆی ئەخەوێنێ لێیان !

بەدەیان هەزار موسڵمان جینۆسایدکران ، لەدوای نەمانی خەلافەتی عوسمانی‌یەوە تا ئەمڕۆ نۆجار قەسابخانە بۆ موسڵمانانی بەلقان دانراوە! بۆ ئەوەی ڕق‌و قینی پەنگ خواردوویان بە موسڵمانان برێژن، لەزەمانی تیتۆدا کە جوولەکەبوو، وەحوکمی یوغۆسلافیای کرد، نزیکەی حەوت سەدو پەنجا هەزار موسڵمان کوژران...

لەکاتی جیابوونەوەی هیندو پاکستاندا، لەکۆچی موسڵماناندا بۆ پاکستان بە ملیۆن موسڵمان بەناهەق کوژران پاش ئەوەی کەهندستان رایگەیاندبوو دەستیان بۆ درێژ ناکات لەساڵی ١٩٤٧زدا.

لە کوردستانیش داخی سەلاحەدینیان بەم گەلە ستەم دیدەیە ڕشت‌و بەدەیان هەزاریان زیندە بەچاڵ کرد... ئەو سەلاحەدینەی کەشەست شارەزای جوولەکە کۆبوونەوەو بەتێروتەسەلی لەماوەیەکی درێژدا لێکۆڵینەوەی زۆریان کرد لەسەر سەردەمی سەلاحەدین‌و هۆکارەکانی سەرکەوتنی‌و نەهێشتنی دووبارە بوونەوەی ئەو ئەزموونە مەزنە [1].

---

[1] ئەوەندە لەناوی سەلاحەدین بێ‌تاقەتن، بەرپرسە جولەکەکان دەڵێن: هەتا ناوی سەلاحەدین بمێنێ لەسەردەمی وتاربێژی سەر مینبەرەکانداو ، هەتا ناوی سەلاحەدین بنرێ لەجادەو کۆڵانەکان‌و هەتا بەفەخرەوە باسبکرێ، ئێمە ناتوانین ئاشتی بکەین لەگەڵ عەرەبدا ! تەنانەت بێزاریان دەربڕیووە لە تابلۆیەکی (حطین) کەلەهۆڵی پێشوازی سەرۆکی سوریادایە !!

دیاره رق و قینی دوژمنان بەردەوامەو قورئان تۆماری کردووە بۆمان و دەفەرموێ: ﴿ولن ترضى عنك اليهود ولا النصارى حتى تتبع ملتهم﴾ البقرة / ١٢٠ واتە: هەرگیز جوولەکەو گاورەکان لێتان رازی نابن، هەتا شوێن بەرنامەو ئاینەکەیان نەکەون.

هەروەها ﴿ولايزالون يقاتلونكم حتى يردوكم عن دينكم ان استطاعوا﴾ البقرة /٢١٧ واتە: بەردەوام دژتان دەجەنگن هەتا واتان لێبکەن لەدین و ئاینتان پاشگەز ببنەوە ئەگەر بۆیان بکرێت.

لەسوورەتی تۆبەشدا دەفەرموێ: ﴿لا يرقبون في مؤمن الا ولا ذمة﴾ التوبة: ١٠ واتە: کافران لەدژایەتیاندا بەرامبەر موسڵمانان ، سنووری خزمایەتی و پەیمان رەچاو ناکەن و ناپارێزن.

(ولفرد کانتول سمیث) لەپەڕاوەکەیدا ( الاسلام في التاريخ الحديث) دا دەڵێ: ( تا کارل مارکس و شیوعیەت پەیدابوو، (محمد) تاقە تەحەددای راستەقینە بوو ، کەرووبەڕووی شارستانیەتی رۆژئاوا ببێتەوە لەهەموو مێژوویدا ... وە بەڕاستی زۆر گرنگە کە یادمان بێ ئەو تەحەددایە چەندە راستەقینە بوو ، وە چەندە هەڕەشەیەکی ترسناك بوو لەهەندێ کاتدا... ) ( ئەم قسەیە لەکاتێکدا دەکات کەهێشتا شیوعیەت وەك ئەمڕۆ نەڕوخابوو، لەوپەڕی هێزو توانادابوو! نووسەر)

بەڕاستی ئیسلام هێرشێکی راستەوخۆ بوو لەهەردوو مەیدانی جەنگ و بیروباوەڕدا، وە زۆر بەهێزو کاریگەربوو، مەسیحیەت بەیەکجار خۆشترین ناوچەی ئیمبراتۆریەتی رۆمانی لەدەستدا و هێزە تازەکە گرتیە دەست خۆی!

وە لەوەدابوو کە هەموو ئیمبراتۆریەتەکەش بەیەکجاری خۆی پێ‌رانەگیری‌و تیابچێت! ئەوەبوو لەساڵی ١٤٥٣زدا قسطنطنية گیراو لەساڵی (١٥٢٩)ز یشدا موسڵمانان ئابلۆقەی (ڤیەننا)یاندا... وەجارێکی تریش موسڵمانان کشانە ناو ئەوروپاوەو لەدەرگایان دانەوە لەساڵی (١٦٨٣ز)دا، بەراستی ئیسلام نیوەی جیهانی مەسیحی داگیرکردو، وەتەنها ئیسلامیش بوو توانی بەدەیەها ملیۆن گاور بەرەو رێبازو بەرنامەکەی (دروس من محنة البوسنة والهرسك ( محمد قطب) .

بەڵێ ئەوروپا سوودی زۆری وەرگرت لەزانست و زانیاری موسڵمانانو ئەو (المنهج التجريبي في البحث العلمي)یەی کە موسڵمانان دایانمەزراند، ئەوروپا بردی بۆخۆی و پەرەی پێدا، تاگەیشتە ئەوەی کە لەسەرەتای سەدەی شانزەدا ئەوروپا خەریك بوو ئیسلام وەرگرێ، بەڵام کەنیسەو پاپا هەوڵی بێ وچانیان دا بۆ ئەوەی نەهێڵن ئیسلام

لەئــەوروپادا بلاْوبێتــەوە ( کــە ئەمــەش قســـەی مێژوونووســـی بـــەریتانی (ویلـــز)ە لەپەڕاوەکەیدا (معالم تاريخ الانسانية) کە عبدالعزیز توفیق کردوویەتی بەعەرەبی) .

لەساڵی (١٤٩٢) ز غرناطــة بەدەســت موســڵمانەوە نــەماو لــە ( ئــەندەلوس) کەوتنــە قەتڵو عامی موسڵمانانو لەو زەمانەدا کە تەنها لەناوشاردا چەند گەرماوێکی گەورەی گشتی هەبو، موسڵمانان لەماڵەکانی خۆیاندا گەرماویان دروستکردبوو، جا کە دەگەڕان بەدوایی موسڵماناندا هەرماڵێك گەرماوی هەبوایە دەیانگرت وسزایان دەداو دەیانزانی موسڵمانە !

## یادەوەری سیخوڕێك !

مستر همفر لەیادەوەریەکانیدا دەڵــێ: ( لەســاڵی ١٧١٠ز وەزارەتــی مســتعمرات ناردیانم بۆ میسرو عێراقو تارانو حیجازو ئاستانە (استنبول)، تاوەکو زانیاری تەواو کۆبکەمەوە بۆ پارچە پارچەکردنی موسڵمانانو دەست گرتن بەسەر وڵاتی ئیسلامدا، لەهەمان کاتیشدا لەگەڵ مندا نۆکەسیتر بۆ هەمان مبەست لەلایەن وەزارەتەوە نێردران بۆ ناو وڵاتی موسڵمانان.

وەزارەت پـــارەی تـــەواوی بـــۆ دابینکردیـــن لەگـــەڵ نەخشـــەی تایبـــەتو نـــاوی کاربەدەستانو زانایانو سەرۆك عەشیرەتەکان...

هـەرگیز بـیرم نـاچێت قسـەی سـکرتێری وەزارەت، کـەخواحافیزی کردیـن بـەناوی حەزرەتی(مەسیح)ە وە، وتی: ( پاشە ڕۆژو ئایندەی وڵاتەکەمان دەوەستێتە سەر هـەوڵو کۆششو سەرکەوتنی ئێوە ، بۆیە هەموو تواناکانتان بخەنە کار بۆ سەرکەوتن...).

لەلەندەن فێری زمانی عەرەبیو زمانی فارسیکرامو لە ئاستانەش (استنبول) دەبوو بەچاکی فێری تورکی ببم ، بەجۆرێك کەکەس گومانم لێنەکات کەبیانیم..

پاش گەشتێکی نارەحەتو زەحمەت بەدەریادا گەیشتمە (ئاستانە) و ناوی خۆم کرد بە (محمد) و دەچووم بۆ مزگەوتەکانو، زۆر سەرسام بووم بە نـیزامو پـاكو تـەمیزیو گوێڕایەڵی موسڵمانان، لەدڵی خۆمدا وتم: باشە ئێمە بۆ دژایەتی ئەم مرۆڤانە دەکەین؟ وە هـەوڵ دەدەین پارچـە پارچـەیان بکـەینو نیعمەتـەکانیان لێ بسـێنین ؟! ئـاخۆ حـەزرەتی مەسیح ئاوای پێوتووین؟

هەرزوو لەم خەیاڵاتەم گەڕامەوەو تەوبەم کرد لەم بیرکردنەوە شەیتانیەمو خۆمم گورج کردەوەو بڕیارمدا تا دوا دڵۆپی پێکەکەم بخۆمەوە !

له (ئاستانه) چووم بۆ لای پیاوێکی پیر کەناوی (محمد افندی) بوو، ئەوپیاوە مرۆڤێکی ئەوەندە چاکبوو، کە من شتی وام نەدیوە لەچاکترین پیاوی ئاینی خۆمان...هەر ئەوەندە وتم من کەسم نیەو هاتووم لەمەرکەزی ئیسلام دین‌و دنیام دەست کەوێت، هیچ لێپێچنەوەی لەگەڵ نەکردم‌و پرسیاری ئەسڵ‌و فەسڵمی نەکردو زۆر جوان پێشوازی کردم‌و هات بەدەنگمەوەو وتی: ئێمە پێویستە لەسەرمان کەرێزت بگرین لەبەرئەوەی:

یەکەم : تۆموسڵمانیت و موسڵمانانیش بران..

دووەم : تۆ میوانیت‌و پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: رێزی میوان بگرن.

سێیەم: تۆ هاتووی زانست فێرببی‌و ئیسلامیش جەختی‌کردۆتەسەر رێزگرتنی ئەوانەی کەدوای زانست‌و زانین دەکەون .

چوارەم: تۆ دەتەوێت کاسپی بکەیت‌و کاسبیش خۆشەویستی‌خوایە .

جا بەڕاستی من زۆر سەرسام بووم بەم قسانە، لەدڵی خۆمدا وتم: خۆزگە مەسیحیەکان لەم راستیانە تێبگەیشتنایە ، بەڵام لاشم سەیربوو، چۆن ئیسلام بەم بەرزی‌یەوە تووشی لاوازی دێ لەسەر دەستی ئەو کاربەدەستە لووت بەرز و ئەو زانا نەفامانەوە کەلەژیان حاڵی نەبوون !

پاش دووساڵ گەڕامەوە لەندەن‌و راپۆرتی خۆمدا بەوەزارەت، ئنجا جارێکی‌تر ناردیانمەوە و ئامۆژگاریان کردم کە ئەمجارە دووکارم هەیە .

یەکەم/ خاڵی لاوازیی لای موسڵمانان بدۆزمەوە، تا بتوانریٚ لێوەی بچینە ژوورەوەو هەڵیان وەشێنین..

دووەم/ ئەگەر خاڵی لاوازیم هەست پیٚکرد، هەرخۆم بکەومەکار بۆ ئاژاوە نانەوەو شیرازە پچڕاندنی موسڵمانان.

لەلەندەن شەش مانگ مامەوە تا ناردیانم بۆ عێراق وە ئامۆژگاریان کردم‌و پیٚیان وتم: هەر لەزەمانی قابیل‌و هابیلەوە کێشمەکێش‌و جیاوازی و دووبەرەکی هەیە لەناو بەرەی ئادەمیزادا و هەرواش دەبیٚ تاحەزرەتی مەسیح دەگەڕێتەوە، جا بۆیە دەبێت ئەو نیزاعاتانە بدۆزیتەوە لەناو موسڵمانانداو دەست بخەیتە سەر ئەو گڕکانەی کە ئامادەیە بۆ تەقینەوە، وە ئەگەر توانیشت بیتەقێنیتەوە ئەوە خزمەتێکی گەورە بەحکومەتی بەریتانیا دەکەیت، ئێمەی بەریتانی ناتوانین بەرەفاهیەت بژین بەبیٚ نانەوەی ئاژاوە لەمستعمراتەکاندا، وە هەروەها ناتوانین سوڵتانی عوسمانی تێك بشكێنین ، مەگەر

بەهۆی ئاژاوەو فیتنەنانەوە لەنێوان رەعیەتەکەیدا ...جا ئەگەر واش نەکەین ئوممەتێکی کەم چۆن دەتوانێ زاڵ ببێ بەسەر ئوممەتێکی گەورەدا؟

زۆر هەوڵبدەو تێبکۆشە ئەو کەلێنە بدۆزیتەوە و لێوەی بچیتە ژوورێ، وەبشزانە دەسەلاتی فارسو دەسەلاتی تورك لاوازبوون ، هەر ئەوەندەت لەسەرە کە گەلەکانیان هان بدەیت دژبە حکومەتەکانیان...جا ئەگەر قسەیان یەك نەبوو، وەهێزیان پەرت بوو، دەتوانین بەئاسانی داگیریان بکەین و بیانکەینە (مستعمره)ی خۆمان...) (گۆڤاری المجتمع ژمارە ١٤٨٥، ١٤٨٦)..

هەروەها لەساڵی ١٩٠٧دا (بەریتانیا) داوای لە (اللورد بترمان)کرد کەراپۆرتی خۆی بدات لەسەر موسڵمانان، ئەویش دیراسەی حاڵی موسڵمانانی کردو لەراپۆرتێکدا وتی ( موسڵمانان گەلێکن لەپانتاییەکی بەرفراواندا لە(محیط)ەوە بۆ (خلیج)و یەك زمانیان هەیە و زەوییەکەیان یەك پارچەیەو پەیڕەوی یەك ئاینیش دەکەن و یەك رابردوویان هەیەو یەك ئاوات و ئامانجیشیان هەیە، هەرچەندە ئەمڕۆ لەبەردەستمانان و لەچنگماندان، بەلام خەریکە خۆی رائەپسکێنێ، ئاخۆ چیمان بەسەر بێ ئەگەر ئەو (عملاق)ە هۆشیار بێتەوە، ئنجا پێویستە لەسەرمان کەپەیوەندی ئەو موسڵمانانە بپچڕین و دەوڵەتێکی نامۆ لەناویانا دروست بکەین، کە دۆستی ئێمەبێت و دوژمنی ناوچەکەبێت و، هەروەك درك و داڵ بچەقێتە گیانی ئەو(عملاق)ە ئەگەر ویستی هەستێتەوە )( ل ٥٨ دروس من محنة البوسنة و الهرسك )

ئەوەبوو لەساڵی (١٩٤٨)دا دەوڵەتی جوولەکەیان دامەزراندو تا ئێستاش گەورەترین کێشەی هەموو رۆژهەلاتی ناوەڕاستە !

گەلانی ناوچەکە دژ بە داگیرکەران راپەڕین و بەملیۆنەها شەهید درا، بەلام کاتێك لەولاتە ئیسلامییەکان دەرچوون کەکارەکانیان دایە دەست کەسانێك کەلەژێر فەرمانی خۆیاندابوون و پەیمانیان لێوەرگرتبوون و بەهەر دەپەنجەکە پێیان مۆرکردبوون کەنەهێڵن ئیسلامەتی سەرهەڵبداتەوەو جارێکیتر باسی پەیڕەوی شەریعەت و حوکمی ئیسلامی بکرێت.

تەنانەت کەرابوونی ئیسلامی لەرێی دەنگدانەوە زۆرترین دەنگی بەدەستهێنا ئەزمونەکەیان هەڵوەشاندەوەو فەرەنسا وتی/ ئەگەر حکومەتی ئیسلامی لەجەزائیردا دابمەزرێ ئەوا سوپای فەرەنسی جەزائیر داگیردەکاتەوە! ( ل ٦٧ دروس من محنة البوسنة و الهرسك) .

**پەڕاوی (خلف الحصار) :**

ئێستاش دەزگای تایبەت هەیە بۆ لێکۆڵینەوەی حاڵی موسوڵمانان و پیلان دانان بۆیان، یەکێ لەو دەزگایانە پێکهاتووە لە دووهەزار ئەندامی چالاك کەبەردەوام لەکاردان بۆ دیراسەی موسڵمانان و رۆژهەلاتی ناوەڕاست، دوانیان کەدوو ساڵ لە(قاهیرە)مانەوە بۆ لێکۆڵینەوەی تایبەتی خۆیان لەسەر حاڵی ولاتە ئیسلامی‌یەکان و رابوونی ئیسلامی، پەڕاوێکیان دەرکرد بەزمانی ئینگلیزی بەناوی (خلف الحصار) کەتیایدا دەڵێن:

( ئیسلام کوفرەو نابێ رێ بدەین حوکم بکات لەهیچ شوێنێکدا، جائیتر ئەگەر بۆ ئەو مەبەستەش پێ‌بنێین بەهەموو ئەو(مبادی)انەی کەباسی دەکەینو بڕوامان پێیانە)..(واتە: ئەوەندە دیموکراتیان پێ باشە تا ئیسلام نەیەتە سەرحوکم، ئەگەر لەرێی سندوقەکانی دەنگدانەوە هات ئەوە دەبێ دیموکراتیەت پێشێل بکرێو رێ بگیرێ!، یان مافی مرۆڤ ئەوەندە مەبەستیانە کەپەیوەندی بەغەیری موسڵمانەوە بێت، بەلاًم بۆ موسڵمان سەروماڵیشی نەمێنێ، ئەوا قەیدی ناکاتو باسی( مافی مرۆڤ) لەئارادا نامێنێ، هەروەك گوێیان ئاخنرابێو چاویان کوێربێ لەئاستیا!).

هەروەها لەنوسراوەکەیاندا دەڵێن: ( ئێمە دەوڵەتی جوولەکەمان دامەزراند بەپیاوانی خۆمان و چەك و ماڵ و سامانمان، وە لەهەموو جەنگەکانیشدا رۆژئاوا ئامادەبوون و هیچ سەرۆکێکی رۆژئاوایی نیە بتوانێ پشتی جوولەکە نەگرێت).

دیسان لە(بەشی دەیەمی) پەڕاوەکەیاندا دەڵێن: ( کێشەی‌زیادبوونی موسڵمانانیش لەرۆژئاوا دەبێ چارەسەربکرێت و رێی لێبگیرێت...چونکە ئەوان (منطق)یان پێیەو ئەگەر بهێڵین بەم شێوەیە بڕوات، وا ئیسلام دەسەلاًت پەیدا دەکات)...

جایەکێ لەو دوو نووسەرە، (گراهام فۆلەر)ەو جێگری پێشووی موخابەراتی‌ئەمریکی‌یە...پاش ئەوەی کچەکەی ( کەسەرقاڵی دیراساتی سیاسییە) کتێبەکەی باوکی دەخوێنێتەوە، وای لێدێ بگەڕێ بەدوای ئەو ئیسلامەدا کە ئاوا دژایەتی دەکرێت و پلانی بۆ دادەنرێت، سەرەنجام گەورەیی و پوختی و بەرزی ئیسلام کەمەندکێشی دەکات و موسڵمان دەبێت، جا ئەمیش کاردەکاتە سەر باوکی و زۆر بیرو بۆچوونی بۆ گۆڕیوە، تەنانەت باوکی لەوتارێکی‌دا لەرۆژنامەیەکی ئەمریکی‌دا باس لەهەق خوراوی موسڵمانان دەکات و دەڵێت ئەگەر ئەمریکا بیەوێت گەورەیی خۆی بپارێزێ ئەبێ مافی موسڵمانان پێشێل نەکات و هەق بدات پێیان و کێشەکانیان

چارەسەریکات...( سبحان مقلب القلوب ومحول الاحوال !) ( وتاری: حوار مفتوح حول الاعجاز العلمی . د زغلول النجار).

## ئەوەی ویستیان کردیان !

بۆ ئەوەی مەبەستەکانیان بهێننەدی لەبەرگرتن لەئیسلامو موسڵمانان لەجیهانی ئیسلامیی و لەرۆژئاواشدا، پیلانی تەقینەوەکانی ئەمریکا دارێژرا، کەبەهۆیەوە توانرا باسی دنیا ببێتە مەسەلەی تیرۆرو بەناوی نەهێشتنی دێوەزمەی تیرۆریشەوە، بێلایەنی نەماوە یان دەبێ لەگەڵیان بی ، یان بە(دژ) حسابت بۆ دەکەن !

لەئەمریکا(٣٠٠) دەزگای خێرخوازی موسڵمانان (تجمید)کراون ! هەرلەوێ ماوەیەك لەمەوبەر سێهەزار موسڵمان گیرانو لێپێچینەوەیان لەگەڵداکردنو، کێیان بوێ دەیگرن بەبێ هیچ تۆمەتێك !

لەولاتە ئیسلامییەکانیشدا فشاری زۆریان بۆ سەرکردە گوێ لەمستەکانی خۆیان هێناوە، کەبەرنامەی خوێندن بگۆڕن (بۆنموونە زانکۆی ئیمان لەیەمەن دابخەنو ...هتد).

ئەمە لەکاتێکدا کە نووسەری جولەکەی ئەمریکی( ناعوم شاموسکی) دەڵێت: ئەم تەقینەوانە ئەمریکا خۆی ئاگاداریبووەو دەستی خۆیانی تیایە، وە دەڵێ: بەڵگەشم ئەوەیە، کەدەزگای موخابەراتی ئەمریکی لەزەمانی(کندی)دا پیلانێکی لەم جۆرەیان دانا بۆئەوەی گێچەڵ بە (کوبا) بکەن... هاتنە لای سەرۆك(جون کندی)و باسی پیلانەکەیان بۆکرد، کە گوایە ئەگەر رەزامەندی بفەرموێ، چەند پەناهەندەیەکی (کوبی) لەفڕۆکەیەکدا دائەنێنو دەیدەن بەباڵەخانەیەکداو بەمەش بیانوو دروست دەبێت بۆ لێدانی(کوبا)... سەرۆك (کندی) پرسیاریکرد نزیکەی چەند کەس دەکوژرێ لەو تەقینەوانەدا ؟ وتیان : رەنگە هەزارو پێنج سەد کەسێك ببنە قوربانی کارەساتەکە؟ سەرۆکیش لەبەرئەوەی ئەسڵزادەبوو رازی نەبوو بەپیلانەکەو بەو جۆرە نەخشە کەمایەوە، تا لەکاتو ساتی دیاریکراوی لەباردا بەکاریان هێناو جەنگی جیهانی سێیەمیان پێهەڵگیرساند !!

## بەڵگەی نوێ دەردەکەون :

رووداوەکان هەرچۆنێك بنو هەرکەس بووبێت، گرنگ ئەوەیە کەسانی تریش قسەیان هەیەو چاك وایە قسەی هیچ لایەك فەرامۆش نەکرێت... بۆنموونە: بەرپرسێکی پێشووی پۆلیسی ویلایەتی(لوس ئەنجلۆس)ی ئەمریکا، حکومەتی وڵاتەکەی تاوانبارکرد

بەتێوەگلانی لەجێبەجێکردنی هێرشەکانی ١١ی ئەیلول بۆ سەر ناوەندی بازرگانی جیهانی.

لەوتارێکدا کەلەزانکۆی(بورتلاند)دابووی کە رۆژنامەی (ریرجار)ی زانکۆ رێکیخستبو ، مایك روبەرت ئەفسەری پێشووی پۆلیسی (لوس ئەنجلوس) چەند بەڵگەنامەیەکی پەیوەندار بە هێرشەکانی ١١ی ئەیلولی خستە روو، زۆر شتی سەیری باسکرد، کە ئەوە دەسەلمێنن رووداوەکانی سێشەممەی (رەش) بەئاگاداری واشنتۆن خۆی ئامادەکراو هینری کیسنجەر وەزیری دەرەوەی پێشووی ئەمریکا کەجوولەکەیە ، عەقڵی رێکخەری ئەوهێرشانەیە.هەروەها رۆبەرت لەوتارەکەیدا کەدوو سەعاتو نیوی خایاند بوو، چەند نەخشەیەکی ئاسیای ناوەراستی خستە روو، کەبەئاشکرا ئەوەی روونکردەوە، کەجەنگی ئێستای ئەفغانستان لای کەمی پێش چوار ساڵ نەخشەی بۆ کێشراوە.

هەروەها پرسیاریکرد: چۆن دەبێ سەرۆکی دەزگای سیخوڕی پاکستان کەپۆستەکەی خۆی بەرەزامەندی (CIA) وەرگرتووە بە(تلکس) حەواڵەیەك بەبڕی سەد هەزار دۆلار بنێرێت بۆ (محمد عەتا) کە تاوانبارکراوە بەو رووداوانە؟!

هەروەها جەختی لەسەرئەوە کردەوە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو بەریتانیا پێش رووداوانی هێرشەکان، هێزی خۆیان لەوناوچانەدا بلاوکردۆتەوە، وەئیدارەی بۆش فەرمانی کردووە بەنووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی کە لێکۆڵینەوە لەدووکەس لەخزمانی (ئوسامە بن لادن) راگرێت، کە لەنزیك سەرۆکایەتی وەکالەتی ئیستخباراتی ئەمریکاوە دەژین.

لەو وتارەدا کە کۆی وتارەکە رێکخراوی (ئیسلام فۆبیا) بلاوی کردەوە، (کەپشتگیری لەمافی موسڵمانەکانی خۆرئاوا دەکات) رۆبەرت زیاتر لە(٤٠) وێنەو بەڵگەنامەی پیشان داوە، ئەوە دەسەلمێنن کەحکومەتی ئەمریکا دەستی هەیە لەهێرشەکانداو پێشتر ئاگای لێبووە، تا ئەو رادەیەی کە دیمەنەکانی پیشاندا هەموو هەڵچوونو زۆریشیان گریان.

شایانی باسە مایك رۆبەرت، تەمەنی ٤٩ ساڵەو هەڵگری پلەی شەرەفە لەزانستە سیاسیەکاندا لەزانکۆی کالیفۆرنیا، بەلام پەیوەندی کردووە بەپۆلیسی (لۆس ئەنجلوس)ەوە، لەپێش دەرچوونیشیەوە هەر لەوێکاری کردووە، ئنجا بووە بەئەفسەر لەساڵی ١٩٧٣داو لەماوەی پێنج ساڵیشدا (١٣) سوپاسو ئافەرینی وەرگرتووە ( گۆڤاری المجتمع/ ١٤٨٤) و یەکگرتوو /٣٨٨ .

## ( ١٠ ) خوای گەورە باگخوازان دەپارێزێ

**ئێوە دەیڕوێنن یان ئێمە؟!**

**قورئـانی پـیرۆز چەندراسـتیەك دەخاتـە بـەرچاوی ئـادەمیزاد لەشـێوەی پرسـیارداو خۆشی وەلاّم دەداتەوەو دەفەرموێت لەسورەتی (الواقعه ئایەتی٥٧ ـ ٧٤):**

﴿ نحن خلقناكم فلولا تصدقون ﴾ **ئێمە دروستمان كردون، دەی بۆچی بڕواناكەن .**

﴿ افرأيتم ماتمنون  أأنتم تخلقونـه أم نحـن الخـالقون ﴾ **جا نـابینن ئـەو مەنیـیەی كە دایدەنێن؟ ( كەلەم سەردەمەدا هـەندێك لەنهێنیـیە زانستـیـیەكانی ئاشكرابووە، كە چۆن لەملیۆنـەهادا بەویستـی خـوا یـەك دانـەی یـەك دەگرێـت لەگەڵ هێلكۆكەیـەكدا لـەناو ڕەحـم دا). ئایا ئێوە دروستی دەكەن یان ئێمە بەدیهێنەرین ؟!**

﴿ نحن قدرنا بينكم الموت وما نحن بمسبوقين ، على أن نبدل أمثالكم وننشأكم في مالا تعلمـون﴾ **ئێمـە نەخشـەی مردنمان لـەنێوانتاندا بڕیارداوە، كەس دەسەلاّتی پێش ئێمـە نەكەوتووەو بێ توانـاش نین ، كەلەشوێنی ئێـوە نـەوەی تـر بهێنین و بیخـەینـە شوێنتان، یاخود سەرلەنوێ لەرێگەیەكەوە كەنایزانن دروستان بكەینەوە .**

﴿ ولقد علمتم النشأة الاولى فلولا تذكرون ﴾ **سوێند بەخوا خۆ ئەوەتە بوونی سەرەتاو یەكەمجارتان زانیوە ، كەواتە بۆچی یادەوەری وەرناگرن وبیرناكەنەوە؟!**

﴿ أفرأيتم ماتحرثون ، أأنتم تزرعونه أم نحن  الزارعـون ﴾ **ئایا سەرنجیان داوە لـەو زەویەی كە دەیكێڵن و دەیچێنن؟ ئایا ئێوە دەیڕوێنن، یان هەر ئێمەین ڕوێنەرو بەرهەم هێنەر؟**

﴿ لونشاء لجعلناه حطاماً فظلتم تفكهون ، انا لمغرمون بل نحن  محرومـون ﴾ **ئنجا ئەگەر بمانویستایە دەمانكردە چیلكەو چەواڵی بێخێر، ئەوسا دەستان دەكرد بەقسـەی بێهـودە، وەبەخـەفـەتو پـەژارەوە دەڵێـن: بەراسـتـی زیـانـی چاكمـان كـردو قـەرزاربووین لەسەری و ڕەنجەڕۆو بێ بەهرە خۆمان.**

﴿ أفرأيتم الماء الذي تشربون ، أأنتم أنزلتموه مـن المـزن أم نحـن المـنزلون ﴾ **ئـەی سەرنجی ئـەو ئاوە نـادەن كەرۆژانـە چەند جار دەیخۆنـەوە ( لـەكوێوەهات، كێ دروسـتی كرد، لەچی دروست بوو) ئایا ئێوە باراندووتانە لەهەورەكانەوە یان ئێمە دەیبارێنین ؟**

﴿ لونشاء جعلناه اجاجاً فلولا تشكرون ﴾ **ئەگەر بمانویستایە ئەو ئاوەمان دەكردە ئاوێكی تاڵ و سوێر، جا ئایا بۆ سوپاسگوزاری ناكەن.**

﴿ افرأيتم النار التي تورون ، أأنتم أنشأتم شجرتها أم نحن المنشؤن ﴾ ئايا سەرنجی ئەو ئاگرە نادەن کە دەیکەنەوە ، ئایا ئێوە دارەکەیتان دروستکردووە یان ئێمە بەدیهێنەرین ؟

﴿ نحن جعلناها تذكرة ومتاعاً للمقوين﴾ هەر ئێمە کردوومانەتە هۆی ئەوەی کەیاد خەرەوەبێت ( نیعمەتەکانی خواتان بیربخاتەوەوەو ئاگری دۆزەخیش بێتەوە یاددتان) ، هەروەها کردومانە بەهۆی سوودو کەڵك بۆ گەشتیارانو خەڵکی...﴿ فسبح باسم ربك العظيم ﴾ جا کەواتە سوپاو ستایشی پەروەردگاری گەورەو بەدەسەلاّت بکە...

﴿ سبحان ربي العظيم ﴾ بەراستی پەروەردگارا هیچ شتێك نیە لەم بوونەوەرەدا کە تۆ ئاگاداری نەبیتو بتوانیٚ بەربەرەکانیٚی تۆبکات، قەزاو قەدەری تۆ بۆ هەموانەو هەرچی تۆ مەبەستت بێت ئەوەدێتە دی، خۆ ئەگەر لغاویش شل بکەیت بۆ کەسانێك ، کاتییەو، حیکمەتەو کە گرتەوە دەیکەیتە پەندی زەمانە..

**مەشخەڵدارانی ڕێی هەق:**

(دکتۆر مستەفا سوباعی) لەپەڕاوی( هكذا علمتني الحياة) دا دەڵیٚ: ( ئەو نەوەیەی دەستی خوا بیچێنیٚ دەستی مرۆڤ ناتوانیٚ بیدورێتەوە !).

بەڕاستی هەروایە، قورئان دەفەرموێت ﴿ وممن خلقنا امة يهدون بالحق وبه يعدلون﴾ الاعراف / ١٨١ واتە: لەدروستکراوانی ئێمەدا هەمیشە کۆمەڵەکەسانێك هەن کەلەسەر هەقو راستینو دەیگەیەنن بەبەرەی ئادەمیو بەوە راستیان دەکەنەوە لەلادانو سەرکەشی.

هەروەك ناردنی پێغەمبەران سەلامی خوایان لیٚبیٚ بەقەدەری خوایە، هەرواش بەقەدەری خوا هەموو سەری سەد ساڵێك نوێکەرەوە دێنو ئەم پەیامە سەر لەنویٚ ئەدەنەوە بەگویٚی خەڵکیدا، هەروەك حەزرەت ﷺ دەفەرمویٚ: ( ان الله يبعث لهذه الامة على رأس كل مائة سنة من يجدد لها دينها) (ئەبوداود گێڕاویەتیەوە) ئەوە لاپەڕەکانی مێژوو ، هەر لەدوای خولەفای راشیدینەوە (عمری کوری عەبدولعەزیز و حەسەنی بەصریو عەبدولقادری گەیلانیو...هتد، یان ئەوە عمادالدين زنکیو نورالدين زنکی و صلاح الدين، یان ئەوە ، نوورسیو مەودودیو پێشەوا بەننا) کەهەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کەبێشەلاّنی ئیسلامەتی بیٚشێر نابێت !

جا ئەگەر سەیری ژیاننامەی هەریەکە لەوانە بکەین، بەئاشکرا قەدەری خێری پەروەردگار دەبینین کە چۆن دەستی پێیانەوە بووەو لەکاتی پێویستدا ناردوونی بۆ ناو ئوممەت تاکاری چاکسازی خۆیان ئەنجام بدەن...

حەزرەت لەفەرموودەیەکیتردا کە(ابن حبان)و (ابن ماجەو ئەحمەد) گێڕاویانەتەوە دەفەرموێت ( لایزال الله یغرس في هذا الدین غرساً یستعملهم في طاعته ) واتە: بەردەوام خوای گەورە کەسانێك دەهێنێت بۆ ئەم ئاینە کەبەکاریان دەهێنێ لەفەرمانبەری خۆیداو ( لەبانگەوازدا)...

دیارە ئەمە تانزیك هاتنی قیامەت بەردەوام دەبێت کە ئیتر لەوکاتەدا خوای گەورە ئەهلی خێرو چاکە دەباتەوە بۆ خۆیو خراپەکارانیش ئەهوالو ناڕەحەتی قیامەتیان بەسەردادێت. حەزرەت ﷺ دەفەرموێت: ( لا تقوم الساعةُ حتی یأخذ اللهُ شریطته (أي: اهل الخیر) من أهل الارض فیبقی فیها عجاجة (أي الغوغاء والاراذل) لایعرفون معروفاً ولاینکرون منکراً ) ئیمام ئەحمەد .

هەروەها لە صحیح مسلم دا دەفەرموێ : ( لا تقوم الساعة الا علی شرار الخلق ).

## چەند نموونەیەکی پرشنگدار:

یەکەم/ صلاح الدین ساوابوو کەلەگەڵ باوکیو مامیو خێزانەکەیاندا، خۆیان حەشاردابوو، وەدەیانویست لەترسی کوشتن دەربازبن، سەلاحەدینی ساوا لەبرسا دەگریا، خەریك بوو ئاشکرابنو بکەونە دەست دوژمن، باوکی دەستی خستە سەردەمی بێدەنگی بکات، لەوەدابوو بخنکێ ، مامی لەدەستی سەندو خستیە سندوقێکەوە، تا گوێیان لەدەنگی نەبێ !

بەهەموو حسابێك دەبووایە بمردایە، کەچی قەدەری خوا هێشتیەوە! لەشەڕەکاندا لەزۆر شوێندا رووبەرووی مەرگی راستەقینە بووەوەو خواپاراستی ، هەروەك خۆی لەنامەیەکدا باسی دەکات کەپاش شکانی لەشەڕی (الرملە)دا ناردی بۆ خەلیفە لەبەغداو تیایدا باسی شکاندنەکەو بەدیل گیرانی هەندێكو رزگاربوونی خۆی دەکات کە زۆر بەناڕەحەتی دەگاتەوە میسر، پاشان لەدوایی نامەکەیدا دەڵێ: ( لقد اشرفنا علی الهلاك غیر مرة وما أنجانا الا الله لأمر یریده هو سبحانه) .

واتە: لەچەندەها جێگادا رووبەڕووی مەرگی راستەقینە بوومەوەو، خەریك بوو تیابچم، وەتەنها خوا بۆ خۆی رزگاری کردم بۆشتێك کە خۆی دەیەوێ...

بەڵێ ... لەراستیدا قەدەری خوا هەڵیگرتبوو بۆ ڕزگارکردنی قودس ...

دووەم/ لەسەرەتای سەدەی حەوتەمی کۆچیدا ( قطب الدین کوری محمدی مدنی) کە نیشتەجێی مەدینەبوو، لەخەودا داوای لێکرا کەبچێ بۆ وڵاتی هیندستانو کاری ئەو لەوێیە... بەڵێ ئەمە قەدەری خوابوو، بۆ ئەوەی کە ئەم پیاوە بەرزە خواناسە بانگخوازە خۆیو نەوەکانی ئەم بانگە بەرزو پیرۆزە بەخەڵکی هیندستان رابگەیەننو تا ئەمڕۆش ئەو بنەماڵەیە بەدەیەهای وەك( ابو الحسن الندوی) یان لێسەوز بووەو بەرهەمی خێریان داوە .

باووباپیران وبنەماڵەی (مودودی)یش دەڵێن هەر بەهەمان شێوەبوون لەمەککەو مەدینەوە چونەتە هیندستانو بوونە مەشخەڵداری خێر لەو وڵاتەدا کە ئەمەش بەئاشکرا قەدەرمان تێدەگەیەنێ ! ( ل ٥٢٦ لەخزمەت قورئاندا ـ نووسەر).

سێیەم/ نوورسی بەرەحمەت بێت قەدەری خوا لەکاتی پێویستدا لەتورکیا خستیە گۆرەپانی هەوڵو خەباتەوە، ئەوکەلێنی بێباوەڕییەی کەدروست بوو لەئەنجامی رووخانی خەلافەتی ئیسلامییەوە لەسەر دەستی دوژمناندا ، ئەم کەوتە پڕکردنەوەیو بەتاقی تەنها ( بەفەزڵی خوا) جێدەستی خۆی نەخشاند... چەند جار ویستیان دەرمان خواردی بکەن، پەت پەتی دنیایان پێکرد، دەربەدەری دنیایان پێچەشت، خوا پاراستیو بووە پێشەواو سەرمەشقی بڕواداران... پێیان دەوت: بۆ کۆچ ناکەی بۆ وڵاتێکی تری ئیسلامیو لەو دەردەسەرییە رزگارت بێ، دەیفەرموو: قەدەری من ئەوەیە کەلە تورکیادا خەبات بکەم ...

چوارەم/ پێشەوا بەنناش دەبوو کەرۆڵی خۆی ببینێ ، قەدەری خوا هێنایو چەندجار لەتیاچوونی راستەقینە پاراستیو کە کارەکانیشی تەواو بوو شەهیدی کرد بەنسیبی ...

باوکی لەدوای شەهید بوونی دەڵێ: کوڕی خۆم ... بەیانییەکیان کەلە نوێژ هاتمەوە مارێکم دی لەژوور سەرت، ئەبڵەق بوومو هیچم بۆ نەکرا تەنها چەند دوعاو نزایەك نەبێ، خوای گەورە هات بەهانامەوەو مارەکە کشایەوەو زیانی پێنەگەیاندی...

جگەر گۆشەم...کاتێك سەقفی خانووەکەمان رووخا بەسەر خۆتو براکەتدا ، قادرمەکە بەقەدەری خوا گرتیەوەو توانیمان سەقفەکە هەڵگرینو بەسەلامەتی دەرتان بهێنین ...

بەنگی جەرگم ..کاتێك کە منالبوویت و سەگەل شوێنت کەوتن و کەوتیتە ئاوی رووباری نیلەوەو کاتەکەش کاتی هەستان و زیادبوون و لا فاوی نیل بوو، شەپۆلی ئاوەکە لای دایت و لەقەارغەوە ژنێك تۆی گرتەوەو رزگاری کردیت...

وا ئەمڕۆش ئەتبینم کەبەدەستی ئەژدەهاو ماری ئادەمی، وا سەرتاپات بەخوێنی خۆت سوربووەو بەرەوکاروانی شەهیدان بەرێکەوتووی...( لەپەراوی فقه الواقع/ کۆمەڵێ وتاری بلاونەکراوەی بەننا) ەوە وەرگیراوە.

هەروەها جارێك هاوەڵێکی لەبەرئەوەی ئەم زیرەك بوو دەیەوێت زیانی پێبگەیەنێ، کاتێك لەژێر درەختێکدا پاش سەعی کردن خەوی لێدەکەوێت، بەسواری پاسکیلەوە دێت و دەیەوێت شوشەیە (تێزاب) بکا بەدەموچاویدا، بەقەدەری خوا دەستی دەلەرزێو شیرزە دەبێو تێزابەکە بەردەموچاوی (بەننا)ناکەوێت...

پێنجەم/ (شێخ عیساو شێخ موسای بەرزنجی) کوڕی (بابا عەلی هەمەدانی) ن کەپیاوێکی زاناو خواناس بووە، لەساڵی ٦٧٣ی کۆچیدا وەفات دەکاو لەدێی (خەتلان) دەینێژن.

شێخ عیساو شێخ موسایش پاش کۆچی باوکیان، بەهیوای حەج و زیارەتی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ رێگای حیجاز دەگرنە بەر ، پاش تەواوکردنی مەناسیکی حەج، بەرێگای کوردستاندا ئەگەڕێنەوە تابچنەوە بەرەو هەمەدان . لەرێگایاندا لە(بەرزنجە) لائەدەن و ئەمێننەوە بۆ پشوودانو حەسانەوە . ئەگێڕنەوە کەلەشەودا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەچێتە خەوی شێخ مووساوە فەرمانی پێئەدات کەلەبەرزنجە بمێننەوەو مەگەڕێنەوە بۆ هەمەدانو ، هەر لەخەوەکەشدا جێی مزگەوتێکی بۆ دیاری دەکات...جالەبەیانیدا بەناونیشان شوێنی مزگەوتەکە ئەدۆزنەوەو بڕیار ئەدەن بەهاوکاری خەڵکەکە لەوشوێنەدا مزگەوتێك دروست بکەن..

ئەبو سعودی موفتی ئەستەمبوڵ لەنامیلکەی ( روضة الجنان )دا ئەڵێ: ( کاتێ ناوبانگی شێخ مووساو شێخ عیسای برای بلاوبۆوە ، خەڵکانێکی زۆر لە دەوریان کۆبوونەوەو لەهەمەوولایەکەوە دەهاتن بۆ لایان و دەبوونە موریدو مەنسوبیان، جالەوکاتەدا کە مەزهەبی شیعەی نوصەیری لەوناوچانەدا بلاوبوو ژمارەیەکی زۆریان وازیان هێناو هاتنە سەر مەزهەبی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ...

هەر لەو سەردەمەشدا مستەفا خانی نوصەیری فەرمانداری ناوچەی شارەزوور بوو ( جاران شارەزوور بەناوچەیەکی زۆر گەورەتر دەوترا ) ، ئاژاوەچی و پیاوخراپان کەوتنە فیتنەیی و دووبەرەکی‌نانەوە، هاتنە لای مستەفا خانو پێیان وت: ئەگەر کار ئاوا بڕوات ئەوا ئەو دووشێخە دەبنە دەسەڵاتداری ناوچەکە ...

ئەویش لەتاو دەسەڵاتو قەڵەمڕەوی خۆی بەنهێنی بەپیلانێك چوارپیاوی ناردو شێخ مووسایان شەهیدکرد لەساڵی ٦٩٦کۆچی‌داو هەر لەبەرزنجە بەخاك سپێردرا..

(خوای گەورەش مانگێکی نەخایاند کە مستەفا خان و دەستەو دایرەکەی لەسەردەستی سوپایەکدا کە هاتنە سەریان تەفرو توناکردو پاداشتی ستەمکاری خۆی وەرگرت).

لەپاش شێخ مووسا کەبراگەورە بوو، شێخ عیسا ئاڵای ئیمان و ئیسلامەتی هەڵگرت و کەوتە هەوڵ و تێکۆشانو خزمەتکردنی موسڵمانان، وەلەبەر ئەوەی هاوسەری نەبوو، فاتمە خانی براژنی مارەکردو خوای گەورە دوانزە کوڕی پێبەخشین، وەك(سید صادق) لەناوچەی سیدصادق و ( میری سوور)) کەلەدێی میری سووردا بووەو، شێخ عەباس کەلە نزیك سلێمانی لەدێی (وڵوبە) نێژراوە.

ئەگێڕنەوە کە زۆرجار شێخ عیسا پاش خەوتنان هەتاوەکو بەرەبەیان خەریکی خواپەرستی بووەو شەو زۆرکەم خەوتووە، وە هەمیشە بەخەڵکی دەوت: خەڵکینە پێغەمبەری خوا لەگەڵ ئەو هەموو گەورەیی و پایەبەرزیەی‌دا کەچی ڕۆژی حەفتاجار زیاتر داوای لێخۆش بوونی لەخوا ئەکرد ، هەروەها دەیووت: خەڵکینە هەموو گوناهێ بەگەورە بزانن هەرچەند بچووکیش بێت، وەچاکەتان بەکەم بزانن هەرچەندە زۆریش بێت.

مەلا داودی خەلیفەی ئەڵێ: ( ڕۆژێك لەخزمەت شێخ عیسادا بووم و سەردانی چەند دێیەکی ناوچەی شارەزوورمان ئەکرد ، لەیەکێ لەدێکاندا پیاوو ژنی نامەحرەم تێکەڵ بووبوونو ڕەش بەڵەك هەڵئەپەڕین ...بۆیە منیش زۆر ناڕەحەت بووم و بەشێخم وت: بەڵکو دوعابکەی لەو کۆمەڵە هەوا پەرستە کە خوا لەناویان بەرێ، ئەویش وتی: نا، دوعای خێریان بۆ دەکەین بەڵکو خوای گەورە هیدایەتیان بدات ) .

شێخ هیدایەتی حەسەن ئاوایی ئەڵێ: ( گەلێ جار بەچاوی خۆم دیومە، کەشێخ عیسا بەکۆڵی خۆی ئاردی بردووە بۆ ماڵی هەتیوو داماوو هەژارو گەلێ جاریش چیلکەو داری کۆ ئەکردەوەو ئەیدا بەهەژاران).

شێخ عیسا زانابووەو هەموو ڕۆژێك دوای نیوەڕۆ وانەی وتۆتەوە بەقوتابیەکانیو دوای عەسرانیش قورئانی خوێندووەو زۆربەی شەویش شەونوێژی کردووە، تا لەساڵی ٧٥٤ کۆچیدا ، لەدێی بەرزنجە وەفاتی کردو هەرلەوێش بەخاك سپێردرا...

( بەراستی لەم باسەوە بەچاکی قەدەری خوا تێدەگەین کە چۆن ئەو دووزانایەی لەکاتی زۆر پێویستی دا هێنایە ناوچەی بەرفراوانی ئەوسای شارەزوورو توانیان بیروڕای چەوتی خەڵکی ڕاستبکەنەوەو برای گەورەش لەپێناوی بانگەوازدا شەهید ببێ )

( بنەماڵەی زانیاران/ مامۆستا مەلا عبدول کەریمی مودەریس).

## (١١) قورئانی پیرۆزو باسی قەدەر!

لەقورئانی پیرۆزدا لەژیاننامەی پڕبەرەکەتو رەنجو ماندووبوونی پێغەمبەرانەوە خوای گەورە قەدەری خۆیمان تێدەگەیەنێ، ئەوەتا بەحەزرەتی مووسا دەفەرموێت : ﴿ونريد أن نمن على الذين استضعفوا في الارض ونجعلهم أئمة ونجعلهم الوارثين، ونمكن لهم في الارض ونُري فرعون وهامان وجنودهما منهم ماكانوا يحذرون ﴾القصص/٦.

لێرەدا قەدەری خوا باس دەکات کە چۆن خوای گەورە ویستی فەزڵو بەخششی خۆی برێژێنێ بەسەر چەوساوەکانی بەنی ئیسرائیلداو رزگاریان بکاتو بۆ ئەوەش حەزرەتی مووسای بۆ ناردن سەلامی خوای لێبێ. فیرعەونیش نێرینەی بەنی ئیسرائیلی نەهێشت تا ئەو منالە چاوگەشە نەبێتو تەختو تاراجی نەشێوێ...کەچی خوای گەورە کارێکیکرد کە فیرعەون دوژمنەکەی خۆی و ئەوەی لێی دەترسا بەدەستی خۆی بۆ لەناوبردنی خۆی گەورەی بکات !!

هەروەها قورئان لەتۆمارکردنی ڕووداوەکانی غەزاکانی حەزرەتدا ﷺ مەبەستی پەروەردەی موسڵمانانو تێگەیشتنیانە لەقەدەری خوا...

جا ئەگەر لەگەورەیی بانگەوازو بەرزی ئەم ئاینەو قەدەری خوا تێبگەین بەچاکی ئەوا زۆر چوستو چالاکانە تواناکانمان دەخەینەکارو هەوڵی بێوچان ئەدەین بۆ بەرنامەکەی خوا و، هەمیشە لەیادمان دەبێت ئەوەی چاك بێت خوا ئەوەمان بۆ دەکات، هەروەك بەحەزرەت ﷺ دەفەرموێ : ﴿قل لن يصيبنا الا ما كتب الله لنا ﴾ ( التوبة /٥١) واتە ئێمە هیچمان تووش نابێت مەگەر ئەو قەدەرە خێرەی کەخوا بۆی نووسیوین ، تەنانەت لەتەعبیرەکەدا (علینا)ی نەفەرمووە، واتە شتێکی قورسو گرانبێتو بیدات بەسەرمانا ...

بەڵکو بۆ ئێمەی دەنووسیێو لەدنیادابێت یان لەقیامەتدا ئەو قەدەرە هەر خێرە بۆمان...چونکە ﴿ هو مولانا وعلى الله فليتوكل المؤمنون ﴾ التوبة/ ٥١ بەراستی خواوەند یارمەتیدەرو سەرخەری ئێمەیەو ، دەبا بڕوادارانیش هەرپشت بەو خوایە ببەستن.

عەبدولقادری گەیلانیش بەرەحمەت بێت ئامۆژگاریمان دەکاتو دەڵێت: ﴿ يا غلام نم تحت ميزاب القدر متوسداً بالصبر متقلداً بالموافقة عابداً بانتظار الفَرَج﴾ الفتح الرباني ـ عبدالقادر الكيلاني واتە: ئەی غولام بنوو لەژێر پلوسکەی بارانی قەدەری خواداو سەرینی ئارام گرتن بخەرە ژێر سەرتو رازی بەو دڵنیابە لەقەدەری خواو چاوەڕوانی سەرفرازی بە کە ئەو چاوەڕوانی کردنەش هەر عیبادەتە .( ل ١٢٠ بەرچاو روونی / نووسەر ).

ئەوەش مەولەوی یەکەی خۆمانە کەلەپلەیەکی ئیمانی بەرزدایەو چاك لەم مەسەلەی قەدەرە تێگەیشتووەو بەدڵنیاییەوە دەڵێت:

خەم خەفەت مەینەت عەشقی پڕ لەخوێن

هەر کامێکیان دێن، بابێن بەخێربێن

تێگەیشتن لەمەسەلەی قەزاوقەدەرو بالاّ دەستی خوای گەورە وادەکات کە بانگخوازانو خەباتکاران بیّترس بچنە مەیدانی هەولّو کۆششەوەو لەهیچ سلّ نەکەنەوەو زۆر بەئاسانی گیانیان لەسەر دەستیان دانێنو بڵێن خوایە ئەوە ئەو ئەمانەتی گیانەی پێتداوین بەشەهید بوون لێمان وەرگرە و ئێمە حەزدەکەین نەك جاریّ بەڵکو چەندەها جار لەپێناوی تۆدا شەهید بکرێین...

ئەمەش چەند نموونەیەکە لەسەر گیانفیداییی باوەڕداران :

## یەکەم/ بانگخوازێکی ئەفریقیا :

(احمد ساموری توری) ئەو پاڵەوانە موسڵمانە هۆشیارەیە کە پاش موسڵمان بوونی، کەوتە هەولّو خەباتو بلاّوکردنەوەی ئیسلام لەناو هۆزە بت پەرستەکانی خوارووی سنغالو غامبیاو قەراخی رووباری نەیجەر ، وە لەوناوچانەدا ئوممەتێکی موسڵمانی دروستکرد.

پێشەوا ئەحمەد ساموورىو هاوەلاّنی دژی داگیرکارە فەرەنسییەکان وەستانەوەو لەماوەی شەش ساڵدا نەیانهێشت سەرکردەی فەرەنسی (ارسيناد) بستیّ بێتە پێشەوە، هەرچەند سەرکردەی پێش ئەویش کۆلۆنیل (برنی دی بوری) یش هیچ سەرکەوتنێکی بەدەست نەهێنابوو لەناوچەکەدا...

بۆیە کەزانیان لەگۆڕەپانی جەنگدا هیچیان پێناکرێ، کوڕی پێشەوایان رفاندو ویستیان بەوە ساردی بکەنەوە لەجیهادکردن، ئەویش جوابی بۆ ناردن و وتی: کوڕەکەی من زیاتر نیە لەهەر موسڵمانێك کەبەخۆڕایی وبێشەرمانە دەیان کوژن، وە ئەگەر وادەزانن بەگرتنی کوڕەکەم جەنگ لەنێوانماندا تەواو دەبێت، ئەوە هەڵەن...

ئنجا کەزانیان هیچیان بۆ ناکرێ بەرامبەری کوڕەکەیان نقومی دنیاو ماددە کردو ناردیان بۆ فەرەنسا، بۆ ئەوەی بەچاکی مێشکی داشۆرن..

ئنجا هێنایانەوەو داوایان لێکرد کە قەناعەت بەباوکی بکات کە بیکەن بەپاشای ناوچەکە لەژێر چاودێری بیانیەکانداو پاشان کوڕەکەشی (ولی عهد)ی بێت...

جا کوڕی خیانەتکاری کەوتە هەوڵ و کۆشش و کۆکردنەوەی خەڵکی نەفس نزم وکارکردن بۆ خزمەتی بیانی یەکان...کەباوکیشی ئەمەی زانی حوکمی لەسێدارەدانی بۆ کوڕەکەی خۆی دەرکردو لەبەرچاوی خەڵکی کوڕەکەی هەڵواسی، بۆئەوەی وانەو پەند بێت بۆ هەموو ئەوانەی کەنیازیان پیسبوو دەیانویست ببنە پیاوی بیانیەکان. ل ٣٩ (الثبات) د. محمد بن حسن بن عقيل.

جا دوژمنان چاك دەزانن کە موسڵمانی راست و هۆشیاریان بۆ ناکرێت و جێیان نابێتەوە لەسەرخاکی ئیسلام، بۆیە بڕیاریان داوە کە بۆ تاقە ساتێکیش بوارنەدەن موسڵمانان بێنە سەرحوکم و بەهەموو جۆرێك دژی بوەستنەوە!

## دووەم/ لەیادەوەری یەکانی عباس السیسی:

عباس السيسي یەکێکە لەوبرایانەی کەبەوەفا بوو بۆ ئەو عەهدوپەیمانەی دابووی بەپێشەوا(بەننا) ، لەخۆشی و ناخۆشیدا، لەئازادی و لەبەندیخانەدا، سەربازبوو، گوێڕایەڵ بوو، دڵنیابوو لەحیکمەتی سەرکردایەتی و سەرکەوتنی بانگەوازی خوا، لەپەڕاوی (في قافلە الاخوان المسلمين) دا کەتا ئێستا چوار بەشی دەرچووە، باسی یادەوەری یەکانی دەکات و دەڵێت: لەساڵی ١٩٥٤دا دەستگیرکرام، لەئەنجامی رووداوی (المنشية) کە شانۆگەری یەکی درۆو فێڵ و تەڵەکەبوو پیاوەکانی عبدالناصر رێکیان خستبوو، ئەویش بریتی بوو لەوەی کەلەکاتی وتارداندا لەناو جەماوەردا یەکێ تەقە لەدوورەوە بکات لەعبدالناصر بەمەش لەلایەك جەماوەر عبدالناصریان لا گەورەببێت و ببێتە خۆشەویستیان و لەلایەکی دیکەشەوە بیکەن بەخەتای برایان و بیانوویەك بێت بۆ رەشکردنیان لەبەرچاوی خەڵکی و پاشان بۆ گرتن و کوشتنو دەربەدەرکردنیان.

بەڵێ... هەر لەرێوە پڕ شەقیان کردمو سەریان تاشیمو بەتانیەکیان دامیۆ لەژوورێکدا فڕێیان دام...

لەسەر ژوورەکەمەوە ژوورێك هەبوو کەبرایەکیان تازە دەهێنا، لەسەر کورسی‌یەك رایان دەگرتو بەگوریسێك ناو قەدیان دەبەستەوەو پاشان کورسی‌یەکەیان لادەبردو براکە بەئاسمانەوە دەمایەوەو هیچ نەدەبوو دەستی پێوەبگرێ، ئنجا دەرشایەوەو سەرباقی ئەوەش هەر بەو ئاسمانەوە فەلاقە دەکراو تەنانەت پەراسوویان دەشکاندو پرسیاری وایان لێدەکرد کە هەرگیز بەخەیاڵیدا نەهاتوونو داوای وەلامیشیان دەکرد، ئیتر کەلێی بێهیوا دەبوون، دەیان کردەوەو دەیان برد بۆ ژوورێك و لەوێدا بەندیان دەکرد، تاجارێکی‌تر نۆبەی فەلاقەکردنی دەهاتەوە ...

**ئەوانەی لەژێر سزادا دەمردن:**

جەندرمەکانی حکومەت دەرۆیشتن لەنزیك شوێنی کارکردن، یان ماڵی برایەك دەوەستانو بەقسەی خۆش بانگیان دەکرد تاناو ئەو ئوتومبیلەی کەلەگەڵیان بوو، بەناوی ئەوەی لەبنکەی پۆلیس بانگ کراوە، تەنها پێنج دەقیقەیەو بەرەلای دەکەن، ئیتر هەرئەوەندە دەچووە ئوتومبیلەکەیانەوە چاویان دەبەستەوەو دەیان برد بۆ تاریکایی‌یەکانی بەندیخانە... جالەوێ ئەگەر لەژێر سزادا گیانی دەرچوایە، ئەوا ناویان دەکوژانەوە، یان ئەو لاپەڕەیەیان دەدڕاند کەناوی تیا تۆمارکرابوو، بۆئەوەی کەس نەزانێ، یان لە رۆژنامەدا بلاویان دەکردەوەو کە ئەو فلان کەسە لەدەست پاسەوانەکەی رای کردووەو حکومەت بەدوایدا دەگەڕێت، ئنجا بۆ زیاتر سەرلێشێواندنی کەس‌وکارەکەی دەچوون ماڵی خزمەکانیان دەپشکنیو زۆرجاریش باوكو براکەیان بۆ ماوەیەك دەگرت...کابرای مردووشیان بەشەو دەبرد لەچیای (المقطم)دەیان کرد بەژێر خۆڵەوە... لەسەرەتاوە هەندێ بڕوای دەکرد بەلام دوایی‌کە ئەم دەنگو باسانە زۆر بوو، خەڵکی بۆیان دەرکەوت کە حکومەت درۆدەکاتو ئەوەی ناوی بلاوکراوەتەوە کە گوایە رای کردووە لەژێر سزادا گیانی لەدەستداوەو مەگەر خواش بزانێ لەچ شوێنێکدا نێژراوە ...

**سزادان:**

کەبرایەك دەستگیردەکرا، هەر لەدەرگای بەندیخانە دەهات بەم دیودا، شەقیان تێهەڵ دەدا تا شل کوت دەبوو، ئەمە بێجگە لەجنێوو قسەی ناشیرین، پاشان ئەگەر ریشی

هەبوایە، زۆریان لێدەکرد کەدەبێ بەدەستی خۆی مووەکانی ریشی هەڵکەنێ...یان بۆیان دەسوتاندو قاقا پێدەکەنین.

لەوەش سەیرتر جاری وا هەبوو سەرتاشێکی خۆیانیان دەهێناو لایەکی ریش و سمێڵی و برۆیەکی دەتاشی بۆ برایەك، بۆ ئەوەی زیاتر سوکایەتی پێبکەن و پێی پێبکەنن ! ئێمەش هیچمان دەسەلات نەبوو هەر مەگەر ئەوەندە بڵێین ﴿ ان تسخروا منا فانا نسخر منكم كما تسخرون ﴾ هود /٣٨ و ﴿ انا كفيناك المستهزئين ﴾ الحجر/٩٥.

مەگەر خوا بزانێ چیمان خەفەت خوارد! مامۆستایەکی دەرچووی ئەزهەریان دەهێناو عەمامەو تەربوشەکەی سەریان دا ئەگرت و شەق شەقێنیان پێدەکرد لەوناوەدا...

زۆر لەوانە کەبووبوونە (جلاد) و سزای موسڵمانانیان دەدا کەسانی دڵ رەق و بێبەزەیی بوون، لەبرایەکیان دەپرسی، تۆ پێش ئەوەی دەستگیربکرێیت مووچەت چەند بووە، ئەگەر بیوتایە (٣٠) جونەیە ئەوا (٣٠) قامچی لێدەدرا، وە ئەگەر بیوتایە (٦٠) جونەیە ئەوا(٦٠) قامچی لێدەدرا !!

جارێك لەبرایەکیان پرسی ئیشت چییە وتی: ( دکتۆرام هەیە لەهەندەسە)دا ، هەقی ئەوە دووقات سزایاندا...چونکە هەموو فاشل بوون لەژیانداو هیچ لەژیان حاڵی نەبوون، داخی خۆیان بەو کۆمەڵە خاوەن بڕوانامانەیە دەرشت ، هەروەك قەرزی باوکیان بەسەریەوە بێت؟!!

براش هەبوو خۆی پێنەدەگیراو دەستەو یەخە شەڕی لەگەڵ دەکردن، دیارە پاش ماوەیەکی کەم لەبەرئەوەی ئەوان زۆر بوون نیوە مردوویان دەکرد، جارێك یەکێ لەوبرایانە کەلێیان هەڵگەڕایەوەو دەستی لێکردنەوە، بەهۆی خزمێکیەوە، بەرەڵایانکرد، بەڵام تا چەند رۆژێك هێشتیانەوە تابرینەکانی سارێژ ببێ و نەزانرێ چی بەو داماوانە دەکرێ!

## لەناو زیندان:

ژووری واهەبوو هەموو دیوارەکانی بۆیەی رەش کرابوو، بەجۆرێك تاریك دەبوو ، هەردەت وت شەوەزەنگە، ئەوەی دەخرایە ناوی نەیدەزانی شەوو رۆژ چییەو کات کامەیە ! جا لەبەرئەوەی بۆ چەندەها رۆژ تیا دەمایەوە ئەگەر هەرکاتێك بهاتایەتە رووناکییەوە، چاوی زیانی لێدەکەوت !!

لەناو زیندانیشدا کێشەی دەست بەئاوگەیاندن، کێشەیەکی گەورەبوو هەمووی چەند ئاودەستێك هەبوو، دەبوایە دوو هەزارکەس لەماوەیەکی کەمدا دەستیان بەئاو بگەیاندایە ، زۆر لەبراکان تووشی مایەسیری بوون، ئاو نەبوو خۆیانی پیْپاك بکەنەوە، ناچار بەتەیەموم نوێژیان دەکرد، ئەگەر کەسیْ دوابکەوتایەو زۆری پێبچوایە فەلاقەدەکرا!

زۆرجار براکانیان ناچاردەکرد کە ئاودەستەکان بەدەست پاك بکەنەوە، کە زۆریان گیرابوون ، یان زۆر یان لێدەکردن کەپاشەڕۆی ئەو سەگانەی کەتێیان بەردەدان بەدەست کۆبکەنەوە!! بەمەش زۆر لەبراکان تووشی نەخۆشی پێست بوون...

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا شەونوێژیان دەکردو (مـأثورات)یان دەخوێندو وانەیان بەیەکتری دەوتەوەو قورئانیان لەبەردەکرد!!

## سروودی بەیانیان!!

ئەو هەموو برایە لەبەیانیاندا بەریز دەوەستێنران، بەپیْیەتیو بەرووتو ڕەجاڵی لەگۆڕەپانی بەندیخانەدا، بەڕێوەبەری بەندیخانەو ئەفسەرە ڕەزا تاڵەکان دەهاتنو ئەیان قیڕاند بەسەرماندا، پاشان بەدەنگی (ئوم کلثـوم)سروودی( یـا جمـال یـا مثـال الوطنيـة ، أجمل أعيادنا المصرية، بنجاتك يوم المنشـية ) یان بۆلێدەداین (واتە: ئەی جەمال ئەیَ نموونەی نیشتمان پەروەری ، خۆشترین جەژنی میسرمان، ڕزگاربوونت بوو لەڕۆژی المنشیە)دا، جادەبوایە براکانو رابەری گشتیش بیانووتایەتەوە لەگەڵیا! بەجۆرێك کە رابەر نیشارەت بکات بۆ براکان وەك ئاواز دانەرەکان!! ئەوەی دەمی نەکرایەتەوەو نەیوتایەتەوە واوەیلا بەحاڵی!!

دوای ئەو سروودە ، دەبوایە مامۆستای پێشەوا لەپێشەوەو براکانیش بەدوایدا رایان بکردایە بۆماوەی یەك دوو سەعات، ئەوەی بکەوتایە یان نەیتوانیایە ئەیاندایە بەر قامچیو شەق...

سزاکان لەتوانا بەدەربوون، ڕۆژێك(ملازم اول الطيار) حاج محمد الشناوی بە(احمد شعبان)ی وت کەبرایەکی پۆلیس بوو دەستگیرکرابوو، برام خۆت ڕاگرە ، لەبیرتە ئێمە پەیمانو بەیعەتماندا لەسەر مردن لەرێی خوادا، ئەویش کەلەدوا پلەی ماندوویيو شەکەتیدابوو وتی: بەڵیْ من بەیعەتمدا لەسەر مردن ، نەك لەسەر تەعزیب دان؟!

## کێچو ئەسپیْ:

ناخۆشیو نارەحەتی بەندیخانە هەر سزادانو دووری کەسوکارنەبوو، بەڵکو زیاد لەوهەموو سزاوئەشکەنجەیە، سەروپیش تاشین بەگوێزانی کولو نینۆك کردنو خۆشتن کێشەی گەورەمان بوو...

کێچو ئەسپێش لەو ژوورە نسرمە پرشیێەدا تەنگی پێ هەڵچنیبووینو ژیانی لێتاڵ کردبووین...بۆیە بیرمان کردەوە لە رێگا چارەیەك، تا خەیاڵمان بۆ ئەوەچوو کەلەبەرزی دوومەتردا دیواری ژوورەکە سابوونی لێبدەین بەوەش کێچەکان نەیان دەتوانی سەربکەونە سەرەوەو دەکەوتنە سەر زەوی و ئێمەش لەناومان دەبردن...هەرگیز ئەو رەحمەتەی خواشم لەیاد ناچێت کەچۆلەکە لەپەنجەرە بچکۆلەکەی ژوورەکەمانەوە دەهاتە ژوورەوەو کێچەکانی دەخوارد کە خوێنی ئێمەیان دەمژی ...

**سێیەم/ شەهید محمد الصوابی :**

سالْ : کۆتایی ١٩٥٤ز ، مانگ / دیسمبر .

شوێن: ماڵی شێخ حسنێن مخلوف ، موفتی میسر .

کات: پاش نان خواردنی نیوەڕۆ، کاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆ، لەدەرگادرا خزمەتکاری ماڵەکە چوو بۆ کردنەوەی دەرگا...پاشان هاتەوە بەشێخ حسنینی وت: قوربان گەنجێکی ریشداری جلو بەرگ شڕە، دەیەوێ چاوی پێت بکەوێت...

شێخ دەڵێ: لام سەیر بوو، وامدەزانی رێبوارە ، گەنجەکە هاتە ژوورەوەو لەسەرەتادا پێشوازیم نەکردو، خزمەتکارەکەمان خواردنی بۆ ئامادەکردو ئەویش زۆرچاك خواردی، لەوەدەچوو ماوەیەکی زۆربێت نانی نەخواردبێ...پاش نان خواردن گومانم برد کە بڕوات، کەچی نەڕۆیشت و سووربوو لەسەر ئەوەی بیبینم ! ناچار چووم بۆلای وتم : رەنگە هەژاربێو خێرو سەدەقەیەکی بوێ...کەچی خۆی پێناساندم ...کەناوی (محمد الصوابی الدیب)ە و قوتابیێە لەکۆلیجی شەریعەت لەزانکۆی ئەزهەر ، پاشان کەوتی لەفیداکارەکانی (برایان)ە کە لەشەڕی فەلەستیندا بەشداریان کردووە، لەرزم لێهاتو هەمووگیانم نیشتە سەر عەرەق، چونکە لەوکاتەدا( برایان) یانی گرتنو سزادان و بەندکردنو دادگایی کردن...گەنجەکە بەلەسەرخۆیی پێی وتم: یا شێخ من لەتەنگانەدام، و پێویستم بەتۆیە فریام بکەوی، من فەرمانی گرتنم دەرچووەو ماوەیەکی زۆرە ، نزیکەی مانگێکە لەچۆڵەوانیو سەر قەبرانەکاندا بەرۆژ خۆم دەشارمەوەو بەشەویش دەگەڕێم پاروویەك نانم دەست بکەوێ بیخۆم...بێتاقەت بووم لەژیانی ناو مردووانو قەبرسان،

دەمەویٚ لەگەڵ زیندووواندا بژیم، جا ئیتر نازانم قبوڵم دەکەی؟ شێخ وتی: سەرسامبووم‌و ئاگام لەخۆم نەمابوو، لەوەدا هاتمەوە کەوتی: رات چی‌یە ئایا قبووڵم دەکەی.

منیش مۆڵەتم لێخواست‌و چووم بۆلای دکتۆر علی کوڕم‌و زەینەبی کچم ، هەستیان بەشپرزەیم کردو وتیان: ها بابە چی بوو...چی روویداوە، مەسەلەکەم بۆ گێڕانەوەو وتیشم : ئەو راست دەکات ، ئەوراست دەکات...ئنجا وتم: من دڵنیام کە ئەو لەئاسایش‌و پۆلیس نیە هاتبێ تاقیمان بکاتەوە و تووشمان بکات، من دڵنیام کەراست دەکات‌و ، ناتوانم دەست بنێم بەروویەوە لەکاتێکدا ئەوهانای بۆ ئێمە هێناوە...بەلاّم ئەوەی دوو دڵی کردووم ئەگەر حکومەت بزانیٚ خراپمان پێدەکات ، چونکە ئەوەی (برا)یەك داڵدە بدات پانزە ساڵ بە (اشغال شاقە)ەوە بەند دەکرێت..

دکتۆری کوڕم وتی: چی ئیسلامەتی‌یە ئەوەبکە، خواپشت‌و پەنامانە !

لەگەڵ کوڕەکەمدا چووین بۆلای (محمد)و وتم: وا قایل بووین کەداڵدەت بدەین، ئەویش دڵی خۆش بوو، رەنگ‌و رووی گەشایەوە، بەجۆرێك کە هەرگیز ئەو رەنگو رووەی ئەو رۆژەیم لەبەرچاو لاناچیٚ!

ئنجا دکتۆر عەلی کوڕم پیٚی وت: بەلاّم ئیتر دەبیٚ کەسایەتی خۆت بگۆڕی چونکە ناوچەکەمانو دەوروبەرمان پۆلیس و سەربازی زۆری لێیە ، رێکەوتین کە دایبنێین بەسکرتێری خۆم‌و ناوم نا (صادق افندی)...

بۆ رۆژی دوایی ریشی تاشی‌و جلوبەرگی نویٚی لەبەرکردو وەك سکرتێر ئەجولاّیەوەو کەس بەم نهێنی‌یەی نەدەزانی تەنها چوار کەس نەبیٚ، من‌و کوڕەکەم‌و کچەکەم‌و بووکەکەم کە (دکتۆرە سعاد) بوو کچی (حسن هضیبي)رابەری دووەمی برایان.

پلانەکەمان زۆر سەرکەوتوو بوو، (صادق افندی) دەورەکەی زۆر باش دەبینی ، تەنانەت ئەفسەرو پۆلیس دەهاتن بۆ لام بۆ ( فەتوا) ئەو پێشوازی دەکردن‌و هیچ نەدەشڵەژاو زۆر ئاسایی بوو...

پاش هەشت مانگ لەهاوینی ساڵی ١٩٥٥دا (صادق افندی) پیٚی وتم: یا شێخ دەمەویٚ بچم بۆ (سعوودیە) لەویٚ کاربکەم‌و، پیاوێکی عێراقی پەیمانی‌داومەتیٚ لەسەرکەشتی لەریٚی (السویس)ەوە دەربازم بکات...

منیش دوودڵ بووم لەوکارەو هەرچیم کرد دڵم نەیگرت و زۆر هەوڵمدا ساردی بکەمەوەو نەڕوات سوودی نەبوو...

پـاش ماوەیـەك بـەجیٚی هیٚشـتینو وتـی: هەرئـەوەندە گەیشـتمە شـویٚنی خـۆم لـە(سعوودیە) بررووسکەیەکتان بۆ دەکەم...منیش هـەواڵم نـارد بـۆ شـیٚخ (محمـد سـرور الصبان) لەسعوودیە کەراویٚژکاری مەلیك سعود بوو کە ئەگەر ئەو ناسیاوەمان هاتە لات کاری بۆ ئاسان بکە...

مـانگیٚك بەسـەر رۆیشـتنەکەیدا تیٚپـەڕی و دەنگـی نـەبوو، ئیٚمـەش زۆر ترسـاین ، بەتایبەت کە بووکەکەم (دکتۆرە سعاد) گویٚی لەرادیۆی لەندەن بوو کەوتبووی دووکەس لە(برا) یان لەسەرکەشتی (السویس) گیراون...دڵنیابووم کەیەکیٚکیان (محمد)ە..

پاش ماوەیـەك (دکتـۆرە سـعاد) چوو بۆ سەردانی باوکی لەبەندیخانە ، لەپڕ چـاوی بــە(محمد) دەکـــەویٚت بەدەست جەللادەکانەوە ...کەگەڕایەوە وتی تازە تیاچووین، (محمد) گیراوەو لەژیٚر سزادا کەکەس بەرگەی ناگریٚ ناومان دەڵیٚو تیادەچین.

چەند ڕۆژ تیٚپەڕیو (محمد) کەعیٚراقیەك بـەگرتی دابوو، بەرگەی سزاو ئازاری زۆری گرتو چی هەڵیانواسیو ئوتوی گەرمیان بەلەشـیا هیٚنـا نـاوی نـەوتین...بەڕاسـتی مـن هـەرگیز لەوبڕوایـەدا نەبووم ئـەوەندە بەجەرگو خۆگربیٚو گیانی خۆی بکا بە قوربـانی پاراستنی ئیٚمە، بەڕاستی بەوەفا بوو بەڕاستی ئەوەیە پەروەردەی ئیسلام.

بەڵیٚ... لەژیٚر سزادا بڕبڕەی پشتیان شکاندو هەمووگیانیان برینداركرد، ستەمکاران تەنها پرسیاریٚکیان لیٚدەکرد، تۆ لەکویٚ بویت؟! ئەویش هیچ وەڵامی نەئەدانەوەو راستی پیٚنەدەوتن، تا لەژیٚر ئازارو ئەشکەنجەدا شەهید بوو...

شیٚخ حەسـەنەین بـەردەوام دەبـیٚ لەسـەر قسـەکانیو دەڵـیٚ: ( ئەگـەر پەروەردەکـەی شەهید محمـد الصوابی ، پـەروەردەی (برایـان) بیٚـت، منیش دەنگم دەخەمە پاڵ دەنگی زانایانی ئەزهەر کـەڕیٚبدریٚ بەبرایان و مۆڵـەتیان بـدریٚ کاربکەن،چونکە پەروەردەکەیان چاکترین پەروەردەیە...)

## (١٢) چمکیٚك لە هەوڵو کۆششی ئافرەتـان

حەزرەتی عومەر دەفەرمویٚ: ( ئیٚمە لەجاهلیەتدا ئافرەتمـان بەهیچ نـەدەزانی ، کاتیٚك ئیسلام هاتو خواوەند باسی کردن، ئیتر بەوەزانیمانو تیٚگەیشتین کەهەقیان لەسەرمانە)

(بوخاری)

لەزەمانی نەفامیدا ئافرەت ماف خوراوو چەوساوە بوو، فەرمایشتە پیرۆزەکانی قورئانو حەزرەت ﷺ بوونە هۆی ئازادبوونی راستەقینەی مرۆڤ بەگشتیو ئافرەتیش بەتایبەتی...

قورئان دەفەرمویٚ: ﴿یا ایها الناس انا خلقناکم من ذکر وانثی وجعلناکم شعوباً وقبائل لتعارفوا ، ان اکرمکم عند الله اتقاکم ﴾ الحجرات: ١٣ واتە خەڵکینە ئێمە ئێوەمان دروستکردووە لەنێرومێیەك وە کردمانن بەگەلو هۆزی جیاواز تایەکتری بناسن، بەراستی چاکترینتان لای خوا پارێزکار ترینتانە.

حەزرەتیش دەفەرموێت: ( انما النساء شقائق الرجال) ابوداود/ بەراستی ئافرەتان خوشكو هاوشانی پیاوانن.

ئایینی ئیسلام هەقی میراتیو بوونی پارەوماڵو سامانی داوە بەئافرەت هەروەك دەفەرمویٚ: ﴿للرجال نصیب مما ترك الوالدان والاقربون وللنساء نصیب مما ترك الوالدان والاقربون مما قلَّ منه أو کثر نصیباً مفروضاً﴾ النساء: ٧ واتە: پیاوان بەشیان هەیە لەوشتانەدا کەباوكو دایكو خزمان بەمیراتی لەدوایان بەجیٚ دەمێنێت، هەروەها ئافرەتانیش بەشیان هەیە لەوشتانەدا کەبەمیراتی لەباوكو دایكو خزمان بەجیٚ دەمێنێت ، کەمو زۆری بەشی هەرکەسێك دیاری کراوەو دەبێت بیدرێتیٚ...

ئافرەتان لەزەمانی حەزرەتدا ﷺ بەشداریان دەکرد لەنوێژی بەکۆمەڵو لەفێربوون لەکۆڕی تایبەتی حەزرەت ﷺداو لەبەشداریکردن لە (جیهاد)داو لەبەخشینی ماڵو ساماندا، ( کاتێك کەهاندەدران لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ بەخشینی ماڵو سامان زۆربەی ئەوانەی کەخێریان دەکرد ئافرەت بوون ) (مسلم گێڕاویەتیەوە ) .

فەرماندان بەچاکەو جڵەوگیریش لەخراپە ئەرکی سەرشانی پیاوو ئافرەتە قورئان دەفەرموێت: ﴿والمؤمنون والمؤمنات بعضهم أولیاء بعض یامرون بالمعروف وینهون عن المنکر ...﴾ التوبة : ٧١

شایانی باسە یەکەم کەس کە بڕوای بەحەزرەت ﷺ هێنا خەدیجەی هاوسەری بوو، وەیەکەم کەس کەشەهیدکرا لەئیسلامدا ئافرەتێك بوو، کەناوی (سمیه) و، دایکی عماری کوری یاسربوو !

**یەکەم/ (مەیسونە) پیاوان هەڵدەنێ لەسەر جیهاد :**

لەساڵی (٦٠٦) ی کۆچی‌دا ئافرەتێك بەناوی (مەیسونە) لەدیمەشق چاوەڕێی دەنگ‌و باسی چوار براکەی بوو کەلەجیهادی خاچپەرستان بوون پاش ماوەیەك دەنگ‌و باس هات کە هەر چواریان شەهید بوون... لەگەڵ ئەم کۆست کەوتن‌و موسیبەتە گەورەیەدا ئەم ئافرەتە بیری کردەوە لەگەڵ دەستە خوشکەکانی‌دا کارێك بکەن وورەی رووخاوی موسڵمان بەرزبکەنەوە و غیرەت‌و حەماسەتیان بجوڵێنن بۆ رووبەڕووبوونەوەی خاچپەرستە داگیر کەرەکان.

ئەم ئافرەتە ژیرە خواناسە هانی دەستە خوشکانی‌دا کەسەدەها ئافرەت بوون کەپرچی خۆیان ببڕن، بەڵێ... هەموو پرچی خۆیان بڕی‌و نزیکەی سێ‌سەد پارچە گوریسیان لێدروستکردو ناردیان بۆ (سبط ابن الجوزي)کەوتارخوێنی مزگەوتی ئەمەوی‌بوو لەدیمەشق، وتیان: با موجاهیدان ، کەل‌و پەل‌و شتومەکی جیهادیان بەو پرچانەی ئێمە ببەستن، وەك بەشداریەکمان لەجیهاددا ، کاتێك ئیمام چووە سەردوانگە ، چەند پرچێك بەدەستیەوە بوو، بەگریانەوە کەوتە وتاردانو وتی:

ئەی ئەوانەی کە ئاینەکەیان فەرمانی جیهادی داوەپێیان، تادنیا فەتح کەن‌و ئێستا دانیشتوون‌و دوژمن خاکیانی داگیر کردووە !

ئەی ئەوانەی کەباووباپیریان سەروماڵیان دانا لەپێناوی ئاینەکەیاندا ...چیتانە ، بۆچی ئاینەکەتان لەیادکردووە ودانیشتوون‌و دینی‌خوا سەرناخەن، ئای بۆ ئێوە، ئەوە ئازارتان نادات کە دوژمنی خواو دوژمنی ئێوە خاکتان داگیربکات لەکاتێکدا ئێوە گەورەی دنیابوون...

ئەوەی بەدەستیەوە بوو بەرزی‌کردەوەو ئنجا وتی: دەزانن ئەمانە لەچی دروستکراون، ئافرەتان لەپرچی خۆیان دروستیان کردون تا قودسی پێ رزگاربکەن...دەی ئەگەر ئێوە بۆ جیهاد بەکاری ناهێنن بیکەن بەپرچ بۆ خۆتان‌و ئنجا هەڵی دانە ناویانەوە... بەم وتارە ئاگرینەو بەم کردارەی وتارخوێن، هەموو خەڵکەکە هاواریان لێ‌بەرزبۆوەو زۆرگریان بۆ حاڵی خراپ‌و سستی‌و کەمتەرخەمیان، بۆیە دوایی کۆمەڵ کۆمەڵ‌و دەستە دەستە رێکەوتنو سوپایەکی چاکیان پێکەوەناو هێرشیان بردەسەر (نابلس)و (تەرابلس)و سەرکەوتنی باشیان بە دەست هێنا بەسەر خاچپەرستەکانی ئەو ناوچەیەدا .( مواقف لخريجي مدرسة القران) د.عمادالين خليل.

**دووەم/ (بنان الطنطاوي) شەهیدو نامەکەی :**

(بنان) کچی زانای پایەبەرز (علی طنطاوي)یەو هاوسەری (عصام عطار) بوو کە ماوەیەك بەرپرسی برایانی سوریابوو، لەولاتی خۆیان ئاوارەبوون و لەرۆژئاوا نیشتەجیٚ بوون، لەویٚش (مخابرات)ی ولاتەکەی بەدوایانەوە بوون و دیاربوو نیازی تیرۆرکردنیان هەیە... بۆیە ( بنان) نامەیەك بۆ میٚردەکەی وەك یادەوەرییەك دەنووسیٚ کەتیایدا دەلیٚ:

( چەند حەزدەکەم (عصام) کە ئەمەش بەشیٚکە لەلاوازیم وەك بەشەریٚك کە پیٚش مردنمان بگەریٚینەوە بۆ دیمەشق و پاشماوەی ژیانمان لەویٚ بەسەر بەرین ئەگەر لەژیاندا بەشمان مابیٚت... وە کە مردیشین لەویٚ لای خزمان و خۆشەویستانی پیٚش خۆمان لەخاکی (دحداح) یا( باب الصغیر)دا بمان نیٚژن ...

بەلاٚم وام بۆ دەرئەکەویٚ ، کە مردن بەدوامانەوەیە لەهەموو کات و شویٚنیٚکدا . رەنگە ئیٚمە لەغەریبایەتی بمانیٚژن، هەروەك چۆن لەغەریبایەتیدا ژیاین، دوور لەکەس و کارونیشتمان. داوات لیٚدەکەم (عصام) ، ئەگەر لەم غەریبییەدا مردم، داوا لەدایك و باوك و براکانم و کەس وکارم بکە لیٚم خۆشبن، لەوەی کەزوخاویان خواردووە لەم ماوەی حەڤدە سالی رابردووەدا بەهۆی دەربەدەری و غەریبیمانەوە...وە پیٚیان بلیٚ ئەوەی کە خۆتیش باش دەیزانی، کەمن هەرگیز پەشیمان نیم لەسەر ئەم ریٚگەیەی لەگەلٚ تۆدا گرتوومەتەبەر ، وە کەمن بەختەوەرم زۆرترین بەختەوەری بەو ناڕەحەتیانەی کەلەگەلٚ تۆدا لەریٚی خوادا هاتۆتە ریٚمان...

تۆش ئەی(عصام) پەیمانم بدەریٚ ، ئەگەر تاوانباران کوشتیانم ، خەم و خەفەت لاوازت نەکاو ، بەردەوام بیت لەسەر هەولٚ و خەبات ، هەروەك چۆن لەوەوبەر بەهەموو تواناتەوە خەریك بوویت و هەولٚت داوە...

وەمنیش پەیمانت ئەدەمیٚ ئەگەر خواشەهادەتیدا بەتۆ کەلەسەر ئەم ریٚگایە بەردەوام بم ، ریٚگای مەزنی ئیسلامەتی ...تا دەگەینە یەکیٚك لەدوو پیرۆزییەکە ...شەهادەت یان سەرکەوتن و وە کەگەیشتینەوە بەخواش لیٚمان رازی بیٚت ...

بەلیٚ قەدەری خوا وابوو کە (بنان) پیٚشتر شەهید بیٚت و (عصام) یش لەسەرعەهدو پەیمانی هەولٚ و خەباتی بیٚوچان بۆ خوا بەردەوام بیٚت . (المرأة في موكب الدعوة) مصطفى الطحان.

## دواوته

لـەم گەشـتەدا وتمـان ،قورئـان دوا پـەیامی خوایـە بۆبـەرەی ئـادەمیو هـەر کـەس بەویژدانــەوە و بیٚدەمــار گــیری لیٚــیورد بیٚتــەوە ، بــۆی دەردەکــەویٚت کــە هــەرچی پڕوپاگەندەیەکی بۆکراوە لەکۆن ونویٚدا هەرهەمووی ناهەقن ودوورن لە ڕاستیەوە .

لەلاپـەڕەکانی پیٚشـووداولەبەرگەکانی پیٚشتریشـدا نموونـەمان باسـکرد لەسـەر ئـەو کەسانەو ، لەم دوا وتەیەشدا ، باسی کەسایەتی ناوداری ئـەمریکی دەکـەین کەلـەم چەند ڕۆژەی ڕابردوودا موسڵمان بووە ،کەئەویش دکتۆر ( اسبر ابراهیم شاهیٚن )ە ....

دکتۆری ناوبراو کەسایەتیەکی دیاری ئەمریکایەو پەیوەندی دۆستانەی هەیە لەگەڵ سەرۆکەکانی ئەمریکاداو بەیەکیٚ لەو زانا ناودارانە دائەنریٚت کە خاوەن ( انجازات )ن و ، لەگەڵ ئـەوەدا کـەوتاری زۆرو پـەڕاوی زانستی هـەیـە ، بیٚژەریٚکی وریایـەو زۆربلیمەتـە لـە قسـە کردنو ئاخـاوتن داو خـەلاٚتی (رواد الخطابـــة العالميـــة ) یوەرگرتـووە..هـەروەها چەندەها خەلاٚت و ویسامی تریشی وەرگرتووە لە سەرۆك ڕۆنـاڵد ریگـان وسـەرۆك بۆشی باوك و ئەمیر محمد بن فهد عبدالعزيزی سعودی و....هتد ..

دکتـۆر اسـبر ئیٚسـتا ڕاویٚژکاری نیٚو دەوڵەتییـە وسـەرۆکی پـەیمانگای نیٚـو دەوڵـەتی تەکنولۆجییـە (ای ای تـی ای ) یـە لـە ئـەمریکاو، لـە سـاڵی ١٩٣٧ دا لـە لوبنـان لـە دایـك بووەو لەسەر ئایینی مەسیحی بوو، لەساڵی ١٩٥٧دا دەچیٚتە ئەمریکاو لەگەڵ کارکردندا دەخویٚنیٚـت ، دووسـاڵ لـە زانکـۆی تکسـاس لـە (ئوسـتن)و دواتـر لـە زانکـۆی ویلایـەتی (اوکلاهوما ) بکالوریوس دەهیٚنیٚ لە بەشی (الهندسه الکیمیاویه ) دا و،پاشان لە زانکۆی (اریزونا) لە توسون ماجستر دیٚنیٚ و دوای ئەوەش دکتۆرا لەزانکۆی تینیسی لەنوکسفیل دەهیٚنیٚ ...لەشەش زانکۆی ئەمریکیدا ماموٚستا بووەو لە زانکۆی سعودیەو جزائیر یشدا کاری کردووەو چەندەها پەڕاوو وتـاری هەیـە لـە بـواری (هەندەسـەی غـازو ووزەو ژینگـەو پیشەسازی پترۆکیمیاویات )دا.

دکتـۆر لـە بـارەی موسـڵمان بوونیـەوە دەڵیٚـت :مـن لـە منـاڵیـەوە ئیسـلامم خـۆش ویستووەو مەیلم هەبووە بۆی و،لە هەموو قۆناغـەکانی خویٚندنمـدا ولـەو هـەموو شتانەی کە خویٚندوومەتەوە گەیشتمە ئەو بڕوایەی کە ئیسلام ئایینیٚکی مەزنەو لە نیوە دورگـەی عەرەبەوە سەری هەڵداوە تا لە هەموو جیهاندا بلاٚوبیٚتەوە ....

هاوەڵە موسڵمانەکانم هەمیشە بە ڕەوشت و خووی بەرزیان کاریان تێکردووم بە تایبەت (دکتۆر ناصر ئیبراهیم رشید ) کەماوەی سی وسێ ساڵە دۆستایەتیمان هەیە ...بە راستی ئیسلام ئایینێکی واقیعیە و بانگەشە دەکات بۆ داد پەروەری و رەحمەت وڕێزی مرۆڤ...

بەراستی تەمەن رادەبووریۆ ئێمەش دەڕۆین و زۆری تەمەنمان رۆیشتووەو کەمی ماوە .. جا دووساڵ لە مەوبەر تووشی شێر پەنجەی پەنکریاس بووم کە زۆر کەم نەشتەر گەری یەکەی سەرکەوتوودەبێت ..

لەخەستەخانەیەکی ئەمریکا ئەو شەوەی کەنیاز بوو نەشتەرگەریم بۆبکەن زۆر لە هاوەڵانم پەیوەندیان پێوەکردم و دوعای خێرو سەلامەتیان بۆکردم و تەنانەت هەندێکیان وتیان لە حەرەمی مەککەدا دوعایان بۆ کردووم...

ئەو شەوە گوێم گرت لە قورئان بەدەنگی عبدالباسط کەزۆر چێژم لێوەرگرت و، ئەوەندەهەستم بە دڵنیایی‌وگیانێکی ئارام کرد، هەر ئەو کاتە بڕیارمدا موسلمانببم...پاش سەرکەوتنی نەشتەرگەرییەکەش حەزم کرد ئەم مانگی حوزەیرانە بەڕەسمی موسڵمان بوونی خۆم لەلانکەی ئیسلامەتی ، لەپایتەختی ولاتی سعودیە لە ( شاری ریاض ) دا رابگەیەنم ..

جاهەرچەند من پەیوەندیم بە گەورە بەر پرسانی ئەمریکاوە هەیە ئەم موسڵمان بوونەی منیش لەم بارو زروفەدا وەك تەحەدایەك وایە ، بەلأم من لە کەس ناترسم و بە قەناعەتی تەواوە موسڵمان بووم ...

دیارە خەڵکی تیروتوانجم لێدەدەن ، بەلأم من گوێی پێنادەم ، بۆ مەسەلەی خێزانەکەشم ، بەتایبەت کەهاوسەرەکەم ئەمریکی یە ، حەزدەکەم وەك من بە قەناعەتی تەواوە ئەوانیش موسڵمان بن ..

بۆمەسەلەی ئەو هەموودژایەتی‌و پروپاگەندەیەی بۆئیسلام دەکرێت لەرۆژئاواو ئەمریکا ،بەلای منەوە دەگەرێتەوە بۆدەسەلأتی جوولەکە بەسەر بەرپرسانو هۆکارەکانی راگەیاندندا ، ئەمەش پێویستی دەکات لەسەر موسڵمانان کەزیاتر هەوڵ بدەن بۆ روونکردنەوەی ئیسلامو بەرپەرچ دانەوەی ناحەزان . وەمن دڵنیاشم لەوەی کەهیچ دژایەتیەك نییە لەنێوان مەسیحیەت وئیسلامداو ئەوانەش کە ئەو ناکۆکی یە دروست دەکەن نەفام و ناحاڵین یان ناحەزو دوژمنن ..(الشرق الاوسط ٢٠٠٢/٦/٢٣)

زۆر لەزاناو بیریارەکان پێشبینی ئەوە دەکەن کەئەم سەدەیە سەدەی ئیسلامەو خەڵکیش لە هەر چوار قورنەی دنیاوە پۆل پۆل دێن بەرەو ئەم ئایینە ، ڕووداووپێش هاتەکانیش ئەوەیان لێ دەخوێنرێتەوە...لەخوا دەپارێینەوە کەچاومان گەش بکاتەوە بەبینینی سەربەرزی موسڵمانان وسەرکەوتنی ئیسلام ...

ناوەڕۆك

**سەرچاوەکان** ١ ـ اسلوب القران الكريم بين الهداية والاعجاز البياني / دعمر باحاذق


٢ – **تەفسیری خاڵ/ جزمی تبارك / شێخ محمدی خاڵ**

٣ ـ **ناڵەی دەروون/ بەرگی دووەم/ شێخ محمدی خاڵ**

٤ ـ **لەخزمەت قورئاندا ـ نووسەر**

٥ ـ **دیوانی گۆران**

٦ ـ **محمد رسول الله ﷺ ـ د.محمد صادق عرجون / ج١**

٧ـ **دموع** في ساحة الدعوة (محمود سمير المنير )

٨– **مەکتووباتی کاك ئەحمەدی شێخ**

٩ ـ **تۆڕی ئینتەرنێت پێگە ئیسلامییەکان**

١٠ـ صناعة النجاح / د . طارق السويدان وفيصل باشراحيل

١١ ـ دروس من محنة البوسنة والهرسك / محمد قطب

١٢ ـ مجلة المجتمع ١٤٨٥ ، ١٤٨٦ ، ١٤٨٤

١٣ – **وتاری** / حوار مفتوح حول الاعجاز العلمي . د. زغلول النجار

١٤ – **ڕۆژنامەی یەکگرتوو /٣٣٨**

١٥ـ هكذا علمتني الحياة / د. مصطفى السباعي .

١٦ ـ فقه الواقع – **کۆمەڵێ وتاری بلاوکراوەی بەننا.**

١٧ـ **بنەماڵەی زانیاران / مەلا عەبدولکەریمی مودەریس**

١٨ـ **بەرچاو ڕوونی / نووسەر**

١٩ـ الثبات / د. محمد بن حسن بن عقيل

٢٠ ـ موسوعة الشهداء / عبدالحليم الكناني

٢١ـ حديث الدعوة / عبدالحليم الكناني

٢٢ ـ مواقف لخرجي مدرسة القران / د. عماد الدين خليل

٢٣ ـ المرأة في موكب الدعوة / مصطفى الطحان

٢٤ ـ الرقائق / محمد احمد الراشد

## پێشەکی

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای پەروەردگار و دروودو سەلامی نەبڕاوەش لەسەر گیانی پاکی سەرداری پێغەمبەران و یار و یاوەر و شوێنکەوتوان .

بەرگی پێنجەمی بەهاری دڵان ئەمجارەش بە هەندێ باس و خواسی ئیمانییەوە دێتەوە خزمەت خوێنەرانی ، بەو هیوایەی دڵەکانیان لە هەمیشە بەهارێکدا بژی و خۆیان نەزر کەن بۆ خزمەتی بەرنامەکەی خوا ..

بابەتەکانی ئەم بەرگەش چەند تەوەرەیەکە :

( ١ ) تێگەیشتن لە زانیاری بێسنووری پەروەردگار و پەیڕەوی کردنی بەرنامەکەی ، کە هەمووی بەرژەوەندی مرۆڤی تیایە و، لە دنیا و قیامەتدا پێی ئاسوودە دەبێت .

( ٢ ) تیشك خستنە سەر چەند نموونەیەکی ئیعجازی قورئان و سوننەت .

( ٣ ) چەند نموونەیەك لە شایەتیدانی هەقی زاناو ناودارە بیانییەکان لە بارەی گەورەیی و پایە بەرزی ئیسلامەوە .

( ٤ ) ساتێك لەگەڵ ئەوانەی کە بێدەنگ بۆ خوا کار دەکەن .

( ٥ ) بەخۆداچوونەوە و تازەکردنەوەی ئیمان .

( ٦ ) نامە و ئاگادارییەکانی پەروەردگار بۆ ڕێنمایی کردن و هیدایەتی مرۆڤ و چەند نموونەیەك .

( ٧ ) میراتی پێغەمبەران و زانینی قەدری ئەو میراتیە و هەوڵدان بۆ پاراستنی و، گەیاندنی بۆ دەستی کەسانێ کە شایستەی بن .

( ٨ ) هەوڵی بێوچان بۆ گەیاندنی پەیامی خوا .

( ٩ ) بێهیوا نەبوون و گەش بینی بەردەوام ، هەر چەند زوڵم و ستەم بکرێ بەرامبەر بانگخوازان .

## ئێوە باشتر دەزانن یان خوا ؟

**زانینی خوا بێکۆتاییە :**

زانینی خوای گەورە بێکۆتاییە و ، قورئانی پیرۆز بۆ ئەوەی لە مێشکی مرۆڤی نزیك بکاتەوە ، بە وشە تابلۆیەك دەنەخشێنێ ، کە لێکی دەدەیتەوە هەر دەبێتەوە بە ناکۆتایی .. بۆ نموونە دەفەرموێت :

﴿ قُلْ إِنِّي عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّي وَكَذَّبْتُمْ بِهِ مَا عِنْدِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِ إِنْ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلَّهِ يَقُصُّ الْحَقَّ وَهُوَ خَيْرُ الْفَاصِلِينَ (٥٧) قُلْ لَوْ أَنَّ عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِ لَقُضِيَ الأَمْرُ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِالظَّالِمِينَ (٥٨) وَعِنْدَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِنْ وَرَقَةٍ إِلاَّ يَعْلَمُهَا وَلاَ حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الأَرْضِ وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُبِينٍ (٥٩) ﴾ الأنعام

واتە : پێیان بڵێ : من زۆر دڵنیام و ، بە بەڵگەوە پەروەردگارم دەناسم و دەیپەرستم ، کەچی ئێوە باوەڕتان پێی نیە ، ئەوەی ئێوە پەلەتانە بۆتان پێش بێت لە تۆڵە و سزای خوایی بەدەست من نیە و لای من نیە ، حوکم و فەرمانڕەوایی هەمووشت هەر بەدەست

خوایە ، ئەو زاتە راستییەکان دەخاتە روو ، چاکترین جیاکەرەوەشە لە نێوان هەق و ناهەق دا ..
و پێیان بڵێ : ئەگەر بەراستی ئەوەی ئێوە پەلەتانە لە پێشهاتنی سزای خوایی بەدەست من بوایە ، ئەوکاتە هەمووشت لە نێوانماندا کۆتایی دەهات و لەناودەچوون ، خواش هەمیشە زاناترە بەستەمکاران
( ئینجا دەیەوێ باسی زانینی بێ کۆتایی پەروەردگار بکات تا بڕوادار دڵنیا بێت لەدانایی و کاردروستی یەکەی و دەفەرموێ : ) .
کلیلی هەموو شاراوەکان و زانینی هەموو نهێنیەکان بەدەست خوایە و هەر لای ئەوە ، کەس نایزانێت جگە لەو زاتە ، هەرچی لەسەر وشکانی‌یە لە گیاندار و بێ‌گیان و زیندەوەرانی وردو درشت لە سەر زەوی و لەناو خاکدا خوا پێی دەزانێت ، هەروەها هەرچی لە دەریاکانیشدا هەیە ئاگای لێیەتی و هیچ گەڵایەك ناکەوێتە خوارەوە خوا پێی نەزانێت ، هەروەها دەنکێك یان تۆوێك لەتاریکاییەکانی زەویدانیە، وە هەروەها هیچ تەڕو وشکێك نیە لەخوا پەنهان بێت و لە ( لوح المحفـــوظ )دا ، یاخود لە دۆسیەو دەزگای تایبەتدا تۆمار نەکرابێت .
٢)﴿ قُلْ : لَوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَنْ تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا﴾ ( الكهف : ١٠٩) واتە : پێیان بڵێ ئەگەر دەریا هەموو مرەکەب بێت و زانست و زانیاری پەروەردگارمی پێ بنوسرایە ، دەریا تەواو دەبوو پێش ئەوەی زانست و زانیاری پەروەردگارم تەواو ببێت ، ئەگەر چەندەها ئەوەندەی تر دەریاش بهێنن و بیکەنە مرەکەب زانیاری ئەو تەواو نابێت ، چونکە زانست و زانیاری پەروەردگار کۆتایی نایەو بێ سنورە ..
٣ ) ﴿ وَلَوْ أَنَّمَا فِي الأَرْضِ مِنْ شَجَرَةٍ أَقْلامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِنْ بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَا نَفِدَتْ كَلِمَـــاتُ اللهِ إِنَّ اللهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ ( لقمـان : ٢٧ ) واتە : ئەگەر هەرچی درەخت هەیە لەزەویدا ببنە پێنوس ، دەریاش چەندەیە ببێتە حەوت ئەوەندەو ببێتە مرەکەب و زانست و نهێنی دروستکراوەکانی خوا بنووسنەوە ، ئەوە هێشتا زانست و زانیاری و فەرمانەکانی خوا تەواو نابێت ، بەراستی خوای گەورە بەدەسەڵات و دانایە .

**زانینی مرۆڤ سنووردارە :**

مرۆڤ کە لەدایك دەبێت هیچ نازانێت و بەویستی خوا وردە وردە شت فێر دەبێت ، بەوەی کە هۆکارەکانی فێربوونی داوەتێ ، وەك گوێ و چاوودڵ ، هەروەك دەفەرموێت ﴿وَاللهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لا تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمْ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالأَفْئِـــدَةَ لَعَلَّكُـــمْ تَشْكُرُونَ﴾( النحل : ٧٨ ). واتە: خوا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێناوە بێ ئەوەی هیچ شتێك بزانن ، ئینجا دەزگای بیستن و بینین و تێگەیشتنی پێ‌داون ، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن ..
خوای گەورەیە مرۆڤ بە زانست و زانین پایەبەرز دەکات بەڵام خۆی لە هەموو زانایەك زاناترە ، هەروەك دەفەرموێ ﴿نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَنْ نَشَاءُ وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ ﴾ ( يوسـف ٧٦ )

.واته : پلەو پایەی هەرکەس بمانەوێت بەرزی دەکەینەوە ، وە خوا لە هەموو خاوەن زانینێك زاناترە ..

ئەمەش بۆ ئەوەی کە هەمیشە داوای زیاد بوونی زانست و زانیاری لە خوا بکەین ( وَقل رَبِّي زِدنِي عِلما ) ..

## خوا باشتان دەناسێ

١ ) قورئان دەفەرموێت ﴿ رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ إِنْ يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِنْ يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلا * وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ النَّبِيِّينَ عَلَى بَعْضٍ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا * ﴾ ( الأسراء : ٥٤ ، ٥٥ )

واتە : پەروەردگارتان چاکتان دەناسێت ، خۆ ئەگەر بیەوێت رەحمتان پێ دەکات کاتێك رێی چاکە دەگرنەبەر ، یان ئەگەر بیەوێت سزاتان دەدات کاتێك رێبازی خراپە دەگرنە بەر ، وە ئێمە تۆمان بۆ ئەوە نەناردووە کە چاودێرو پارێزەری ئەوان بیت ، تا ئەوان بەناچاری باوەڕبهێنن ، پەروەردگارتان چاك دەزانێت بەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدایە ، بێگومان ئێمە فەزڵی هەندێ لە پێغەمبەرانمان داوە بەسەر هەندێکیاندا و داودیش پەڕاوی زەبوورمان داوەتێ .

٢ ) ﴿ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُمْ مِنْ الأَرْضِ وَإِذْ أَنْتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ فَلا تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ اتَّقَى ﴾( النجم : ٣٢ ) .

واتە : خواوەند چاکتان دەناسێت ، لە کاتێکدا ئێوەی لە زەویدا دروستکردووە و ، لەوکاتەشدا ئێوە کۆرپەلەی بچووك بوون لە سکی دایکتاندا ، کەواتە خۆتان بە چاك مەزانن و (تەزکیەی خۆتان مەکەن ) ، هەر خوا خۆی دەزانێت کێ بەراستی تەقوای هەیە و پارێزکارە .

٣ ) ﴿ وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللهِ وَلَئِنْ جَاءَ نَصْرٌ مِنْ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمْ أَوَلَيْسَ اللهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ الْعَالَمِينَ * وَلَيَعْلَمَنَّ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْمُنَافِقِينَ ﴾ ( العنكبوت : ١٠ ، ١١ ) .

واتە : هەندێك لە خەڵكی هەن دەڵێن : باوەڕمان بەخوا هێناوە ، جا کاتێك یەکێك لەوانە لە پێناوی خوادا ئازار درا ، وا دەزانێت سزاو ئەشکەنجەی خەڵکی وەك هی خودایە و لە دین وەردەگەڕێ ، بەراستی ئەگەر پەروەردگارت سەرکەوتنێکی بەخشی ، دووڕووەکان بەگەرمی دەڵێن : خۆ ئێمەش بێگومان هاوکارتان بووین ، مەگەر خوا خۆی نازانێت هەرچی هەیە لە دڵ و دەروونی هەموو خەڵکی جیهاندا ..سوێند بێت ، خوا ئاگادارە بەوانەی باوەڕیان هێناوە ، هەروەها بەوانەش کە دووڕوون ..

٤ ) ﴿ وَإِنْ تَجْهَرْ بِالْقَوْلِ فَإِنَّهُ يَعْلَمُ السِّرَّ وَأَخْفَى﴾ ( طه / ٧ ) .

واتە : ئەگەر بە ئاشکرا قسە بکەیت ، ئەوە بێگومان ئەو زاتە نهێنی و لە نهێنیش نهێنی تر دەزانێت . ( دیارە نهێنی ئەوەیە کە لە نێوان دووکەسدا شتێك بەنهێنی باسکرێ و بوترێ ، لەوەش نهێنی تر ئەوەیە کە لە دڵی یەك کەسدا بێ‌و وەك ( خاطرة ) و خەیاڵێك

بێت بەمێشکیدا ، دەی خوا هەموو حاڵەتەکان دەزانێ و هیچی لێ ناشاردرێتەوە و هیچی لێون نابێت ) .

٥ ) ﴿ أَلا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ﴾ ( الملك : ١٤ ) .

واتە : مەگەر خوا نازانێت کێی دروستکردووە و چۆنی دروستکردووە ، لەکاتێکدا ئەو زاتە وردکارو بەسۆزو بە ئاگایە ..

**خوای پەروەردگار بێ هاوەڵ و بێ شەریکە :**

کافرەکان هاوەڵ و شەریکیان بۆ خوا بڕیار دەدا و دەیانپەرستن ، خوای پەروەردگاریش هۆشیاریان دەکاتەوە بەوەی کە دەفەرموێ : کوا ئەو هاوەڵ و شەریکانە ، دەی ناویان بێنن ، قابیلە هەبن و خوانەزانێ ؟! ئێوە لە خۆتانەوە چۆن بڕیاری ئاوا دەدەن ؟! قورئان دەفەرموێت :

١ ) ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللهِ مَا لا يَضُرُّهُمْ وَلا يَنْفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَؤُلاءِ شُفَعَاؤُنَا عِنْدَ اللهِ قُلْ أَتُنَبِّئُونَ اللهَ بِمَالا يَعْلَمُ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الأَرْضِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ ( يونس : ١٨ ) .

واتە : بێ باوەڕان و خوانەناسان شتێك دەپەرستن لە جیاتی خوا نەزیانیان پێدەگەیەنێت و نە قازانج ، دەشڵێن : ئائەو بت و شتانە تکاکارمانن لای خوا ، پێیان بڵێ ئەی ( محمد ﷺ ) : باشە ئایا ئێوە خوا ئاگادار دەکەنەوە بە شتێك کە لە ئاسمانەکان و لەزەویدا هەبێت و خوا نەیزانێت ؟! پاك و بێگەردەو بەرزوبڵندە و دوورە لەوەی کە نەفامان دەیکەن بەهاوەڵی .

٢ ) ﴿ أَفَمَنْ هُوَ قَائِمٌ عَلَى كُلِّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ وَجَعَلُوا للهِ شُرَكَاءَ قُلْ سَمُّوهُمْ أَمْ تُنَبِّئُونَهُ بِمَا لا يَعْلَمُ فِي الأَرْضِ أَمْ بِظَاهِرٍ مِنَ الْقَوْلِ بَلْ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا مَكْرُهُمْ وَصُدُّوا عَنِ السَّبِيلِ وَمَنْ يُضْلِلِ اللهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ ﴾ ( الرعد ٣٣ ) .واتە : ئایا ئەو زاتەی کەسەرپەرشتیاری کارو کردەوەی هەموو کەسێکەو دەزانێت چیان کردووە ، وەکو پەرستراووبتەکانی تر وایە کە خەڵکی هاناو هاواری بۆ دەبەن ؟ لەگەڵ گەورەیی و باڵادەستی ئەو پەروەردگارەدا نەفامان هاوەڵیان بۆ خوا بڕیارداوە ، تۆش بڵێ : ئادەی ناوی ئەو بت و هاوەڵانەم بۆ بنێن کە لەجیاتی خوا دەیانپەرستن ؟ یاخود بەهەموو عەقڵێکتانەوە دەتانەوێت خوا ئاگادار بکەنەوە بە شتێك کە ئەو زاتە نایزانێت لەزەویدا ؟! یان هەر دەتانەوێت ئاگاداری بکەنەوە بە قسەی سەرزارەکیتان ، نەخێر راستی هەر ئەوەیە کە فێڵ و پیلانی ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون بۆیان رازێنراوەتەوە و لە رێبازی راست وێڵ کراون ، جا هەرکەس بەهۆی کاروکردەوەی خراپییەوە رێبازی خوا ون بکات ، ئیتر کەس نیە هیدایەتی بدات ..

**وەیل بۆ ئەوانەی درۆ دەکەن بەدەم خواوە !**

تەورات و ئینجیل بۆ کاتێکی دیاری کراو هاتن و رۆڵی خۆیان بینی و پاشان دەستکاری کران ، لەلایەن ئەو کەسانەی کە دەیان نوسینەوە و لەلایەن زاناکانیانەوە ، قورئان لەبارەیانەوە دەفەرموێت ﴿ فَوَيْلٌ لِلَّذِينَ يَكْتُبُونَ الْكِتَابَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَذَا مِنْ عِنْدِ

اللهِ لِيَشْتَرُوا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلا فَوَيْلٌ لَهُمْ مِمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَهُمْ مِمَّا يَكْسِبُونَ ﴾ ( البقـرة : ٧٩ ) .
واته : وەیل بۆ ئەوکەسانەی کە پەڕاو دەنوسن بە دەستی خۆیان و پاشان دەڵێن : ئائەمە لەلایەن خواوەیە ، تا کەمێك لە ماڵی دنیا بەدەست بهێنن ، جا وەیل بۆ ئەو دەست و قەڵەمانەی کەشتی وا دەنووسن و وەیل بۆ ئەوکەسانەی کە کەسابەتی ئاوا دەکەن ..
قورئانی پیرۆز کە لەلایەن خواوە نێردراوەتە خوارەوە ، ئەوەی پێویست بێ لەوشتانەی کە ئەهلی کیتاب شاردبوویانەوە ئاشکرای کردو هەڵەکانیانی راست کردەوە ، دیارە ئەو شتانە هەمووی ( غەیبن ) و خوای گەورە بەزانینی بێ کۆتایی خۆی کە ئاگاداری هەموو شتێکە ، لە قورئاندا بەراست و دروستی تۆماریکردن ، هەروەك دەفەرموێت ﴿يَاأَهْلَ الْكِتَابِ قَدْ جَاءَ كُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِمَّا كُنْتُمْ تُخْفُونَ مِنَ الْكِتَابِ وَيَعْفُو عَنْ كَثِيرٍ قَدْ جَاءَ كُمْ مِنَ اللهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُبِينٌ﴾ ( المائدة : ١٥ )
واته : ئەی ئەهلی کیتاب : دڵنیا بن کە پێغەمبەری ئێمە بۆ ئێوەش هاتووە تا زۆربەی ئەوشتانەی کەلای ئێوە روون و ئاشکرا نین و دەیشارنەوە لە کتێبی تەورات و ئینجیلدا بۆتان روون بکاتەوە و ئاشکرای بکات ، هەروەها لە زۆرێك لەوشتانەی کە شاردوتانەوە چاوپۆشی دەکات ( دیارە پێویست نین لەم زەمانەدا ) .بەراستی لەلایەن خواوە رووناکیەکی ئاشکراتان بۆ هاتووە ( کە محمدی پێغەمبەرمانە ) هاوڕێ لەگەڵ کتێبێکی روونکەرەوەدا کە قورئانە .
هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنْكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ﴾ ( المائدة : ٤٨ ) .
واته : ئێمە قورئانمان هاوڕێ لەگەڵ هەموو حەقیقەت و راستیەکدا بۆ تۆ دابەزاندووە ، راستی و دروستی کتێبەکانی پێش خۆشی دیاری دەکات و چاودێرە بەسەر هەموویاندا ، کاتێك ئەهلی کیتاب لە گاورو جوولەکە کێشەیان دەهێنن بۆ لای تۆ بەو بەرنامەیەی خوا ناردوویەتی دادوەری بکە لە نێوانیاندا و شوێن ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوە و لەو حەقە لامەدە کە بۆت رەوانە کراوە ، بۆ هەر لایەکتان ( موسڵمانان و ئەهلی کیتاب ) بەرنامە و پرۆگرامی تایبەتمان بڕیار داوە ..
بەڵێ .. قورئان چاودێرە ( مهیمن )ە و ئەهلی کیتاب بانگ دەکات بۆ بڕواهێنان بەدوا پێغەمبەری مرۆڤایەتی ، چونکە تەنها ئەوە بەرنامەی راست و دروست و پارێزراو ، کە کەس ناتوانێ دەستکاری بکات ، هەروەك دەفەرموێت ﴿فَإِنْ آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنْتُمْ بِهِ فَقَدْ اهْتَدَوا وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ * صِبْغَةَ اللهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللهِ صِبْغَةً وَنَحْنُ لَهُ عَابِدُونَ * قُلْ أَتُحَاجُّونَنَا فِي اللهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ وَلَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُخْلِصُونَ * أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطَ كَانُوا هُودًا أَوْ نَصَارَى قُلْ أَأَنْتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللهُ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ كَتَمَ شَهَادَةً عِنْدَهُ مِنَ اللهِ وَمَا اللهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ ( البقـرة ١٤٠ ) .

واته : ئەگەر ئەوان ( ئەهلی کیتاب ) باوەڕیان هێنا ، وەك ئەوەی ئێوە باوەڕتان پێ هێناوە ، ئەوە بەراستی مانای وایە ڕێبازی هیدایەتیان دۆزیوەتەوە ، بەڵام ئەگەر پشتیان تێکرد ، ئەوە بێگومان دەکەونە دژایەتی و دووبەرەکی‌یەوە ، بەڵام دڵنیابە ئەی محمد ﷺ ، ئەی بڕوادار ، خوا دەتانپارێزێت لە پیلان و تەڵەکەیان ، چونکە خوا بیسەر و زانایە ..ئەم ئاین و بەرنامەیە ئەو رەنگ و نەخشەیەیە کە خوا دایڕشتووە ، کێ هەیە لە خوا چاکتر رەنگ و نەخشەی جوان بکێشێت و دایڕێژێت ، لە هەموو بارودۆخێکدا ئێمەی ئیماندار هەرئەو دەپەرستین .

پێیان بڵێ : ئایا رەوایە ئێوە دەربارەی ئاینی خوا قڕەو گاڵەو کێشەمان لەگەڵ دەکەن و ( دەتانەوێت پێغەمبەرایەتی هەر لەناو ئێوەدا بێت !) .

خۆ خۆتان چاك دەزانن کە ئەو خوایە پەروەردگاری ئێمە و ئێوەشە ، کاروکردەوەی خۆمان بۆ خۆمان و کارو کردەوەی ئێوەش بۆ خۆتانە ، ئێمە تەنها دڵسۆز و ملکەچی ئەو پەروەردگارەین .

چۆن دەڵێن کە ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و کوڕەکانی ، جولەکە یان گاور بوون ؟! پێیان بڵێ : باشە ئایا ئێوە دەزانن یان خوا ؟ جاکێ لەوە ستەمکاترە کە شایەتیەکی خوایی لەلابێت و شاردبێتیەوە ، بێگومان خوا بێ ئاگا نیە لەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن .

دیارە خوا باشتر ئاگاداری رووداوەکانی رابردووەو ، دەزانێ راست و دروستیەکانی چۆنە و ، هەر ئەو دەزانێ چی دەستکاری کراوە و گۆڕدراوە !

## چەند راستی یەك لەبارەی ئینجیلەوە !

یەکەم ئینجیل لە ساڵی ( ٦٠ ـــ ٧٥ ) ی زاینی دا نووسراوەتەوە ، کە ئەویش ئینجیلی ( مرقس ) ە ، وە ئینجیلی ( لوقا )ش دواتر نوسراوەتەوە ، شایانی باسیشە کە نە ( مرقس ) و نە ( لوقا ) ناویان نیە لە لیستی ( ١٢ ) ناوی حەواری‌یەکانی حەزرەتی عیسادا ، واتە ( حواری) ئەو نەبوون .

لەسەرەتاوە ئەو نوسراوانە ناویان ئینجیل نەبوو ، بەڵکو دەوترا ( وفقاً للوقـــا ، وفقـــا لمرقس ) واتە بەپێی قسەی لوقا و بەپێی قسەی مرقس..

دواتر وشەی ( ئینجیل ) ی بۆ زیاد کرا ..

دوای سێ سەد ساڵ لە ( مجمع نیقیە ) دا واتە لە ساڵی ( ٣٢٥ ) ز دا، دووهەزارو چل و هەشت زانای مەسیحی کۆبوونەوە ، تەنها ( ٣١٨ ) کەسیان بڕوایان بە ( عقید ە ی تثلیث ) هەبوو .. بە ئارەزووی حاکمی ئەوکاتە بە ئاگر و ئاسن ئەو بیروڕایە سەپێنراو یەکخواناسی‌یان قەدەغەکرد ، تەنانەت ( اریوس ) کە پێشەوای ( اریسیین ) بوو وە زانایەکی یەکخواناسی‌میسری‌بوو ، بەناهەق شەهیدیان کردو ،نزیکەی سێ‌سەد ئینجیل سووتێنراو قەدەغەکرا کە باسی یەکخواناسیان دەکرد و زۆر راستیان تیا تۆمارکرابوو ..

ئەو چەند ئینجیلەش کە بڕیاری لەسەردرا چاپ لەدوای چاپ بەناوی راست کردنەوە و ( تنقیح ) ەوە زیاد و کەم دەکران ، بۆ نموونە لە ساڵی١٩٨٢ دا ( ئینجیلی نوسخەی

مەليك جيمس ) هەبوو ، هەرهەمان ئينجيل لە ساڵی ١٩٩٠ دا چاپ كرايەوە و بوو بە ( ئينجيلی نوسخەی مەليك جيمسی نوێ ـ ئينجيلی نوێ كراوە ) ..
شايانی باسە لە ڕۆژی ٨ ی ئەيلولی ساڵی ١٩٥٧ دا ( شهود يهوه ) كەكۆمەڵەيەكی گاورن لە گۆڤارەكەياندا بەناوی (استيقظ ) ، لەوتارێكدا ئەم سەردێڕەيان دانا بوو ( ٥٠ ) هەزار هەڵە لە ئينجيل دا ..

جا زۆر لەو كەسانەی كەلەم ڕاستيانە ورد دەبنەوە و بەبێ دەمارگيری لێكۆڵينەوەی خۆيان دەكەن ، دەگەنە ئەو ڕاستيەی كە ئەو ئينجيلانە زۆر بير و بۆچوونی بت پەرستەكان و گەلەكانی تری بۆ زياد كراوە ..
لە ڕۆژی ( ٨ ) ی نيسان ی ١٩٩٦ دا لە ئەمريكا وتارێك بڵاو كرايەوە كە دەڵێت ( زانای ئينجيلی ناودار ( روبرت فنك ) و پەنجا زانای ئاينی گەيشتنە ئەوەی كە تەنها لەسەدا بيستی ئەوەی لە سەرزاری عيساوە وتراوە وتەی ئەون و ئەوانەش كە بەكردەوەی ئەو ناودەبرێ لەسەدا بيست كەمتری جێی متمانەن ) ..[1]

## خوا خۆی دەزانێ كێ دەنێرێ و چی دەنێرێ !

كافرەكان دەيان وت : بۆچی سرووش بۆ ( محمد ) بێت و بۆ فلان و فيسار كەس نەيەت كە شايستە ترن و دەوڵەمەندترن ، قورئانيش دەفەرموێت ﴿ وَقَالُوا لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا الْقُرْآنُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ * أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴾ ( الزخرف : ٣٢ ) .

واتە : كافرەكان وتيان : بۆ ئەم قورئانە دانەبەزێنرا بۆ سەر پياوێكی گەورە لە پياوە گەورەكانی دووشارەكە ( مەبەستيان مەككە و طائف بوو ) ..
ئايا ئەوانە ڕەحمەتی پەروەردگاری تۆ دابەش دەكەن و كەسانی شايستە دەدۆزنەوە بۆ پێغەمبەرايەتی ؟ لە كاتێكدا ئێمەين كە ڕزق و ڕۆزيمان لە نێوانياندا دابەش كردووە لەژيانی دنيادا و پلەو پايەی هەندێكمان بەرز كردۆتەوە بەسەر هەندێكياندا ، بۆ ئەوەی هەمووان كاروباری يەكتر تەواو بكەن و كەڵك لە تواناو لێهاتوويی يەكتر وەربگرن ، جا ئەگەر ئێمە ڕزق و ڕۆزی ، خۆمان دابەشی بكەين ، ئينجا پێغەمبەرايەتی كە زۆر گرنگترە لە ماڵ و سامان و شتی دنيايی ، چۆن ئەيدەينە دەست ئەوان تا دابەشی بكەن و ، بيدەن بەكەسێ بە ئارەزووی خۆيان ..
هەروەها ئەو بەرنامە و شەريعەتەی كە خوا ناردوويەتی خۆی باشدەزانێ چی ناردووە ، ئەگەر لە سەردەمێكدا كەسانێك لەلايەنێكی باش تێ نەگەن ، ڕۆژگار دەيسەلمێنێ كە بۆچوونی ئيسلام تەواو ترين بيرو بۆچوونە .

---

[1] سەيری پەڕاوی : الإنجيل الذي قادني إلى الإسلام / م . ج . لوبلا بكە كە لە ساڵی ١٩٨٧ دا بەرەو ئيسلام هات ) .

بۆنموونه .. قورئان هەر لە سەرەتاوە جەنگی ڕاگەیاندووە لەگەڵ سووخۆری‌و عەرەق خواردنەوە و ، قومارکردن و ، لەگەڵ کوشتن بەناهەق و زوڵم و ستەمکردن و ، پێشێل کردنی مافی بەرامبەردا ، کە ئەمانەش هەمووی هەرکەس بە ویژدانەوە سەیریان بکات و لێیان بکۆڵێتەوە ، تێ دەگات کە لە بەرژەوەندی مرۆڤدایەو هیچ کەسێکی ژیر نیە لاری لێ بێت ..

## حەزرەت ﷺ لە خۆیەوە قسە ناکات

حەزرەت ﷺ ئەوەی دەیفەرموێ سرووشە و لە خواوەیە ﴿وما ينطق عن الهوى إن هي إلا وحي يوحى ، عَلّمه شديد القوى﴾ ( النجم : ٥ ) .

جا ئەو قورئانە هەموو وشەیەك و پیتێکی بەمەبەست دارێژراوە و ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش موعجیزەی زیاتری لێ دەردەکەوێ و هیچ دژایەتی‌یەك و ناتەواوی‌یەکی تیانیە ﴿أَفَلا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلافًا كَثِيرًا﴾ ( النساء : ٨٢ ) . ئەوە بۆ سەرنجی قورئان نادەن و لێی وردنابنەوە ؟ خۆ ئەگەر لەلایەن کەسێکی ترەوە بوایە جگە لە خوا بێگومان جیاوازی و دژایەتیەکی زۆریان تێدا دەدۆزیەوە ..

ئەم ڕاستی‌یە بووە بە مایەی هیدایەتی زۆر کەس ، یەکێ لەوانە کە بیانیەکە دەڵێ : هەر پەڕاوێك بخوێنیتەوە ، نووسەرەکەی ناتوانێ جەخت بکاتە سەر ئەوەی کە پەڕاوەکەی لەسەدا سەد بێ هەڵەو کەم و کوڕی‌یە .. تەنها قورئان نەبێ کە جەخت دەکاتە سەر ئەوەی هەڵەو کەم و کوڕی تیا نیە و، هەر کە قورئان دەکەیتەوە لەسەرەتای سورەتی ( البقرة ) دا دەفەرموێ : ﴿الم (١) ذَلِكَ الْكِتَابُ لا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ (٢)﴾ ..

### لە موعجیزەکانی قورئان :

پێغەمبەر ﷺ لەبارەی قورئانەوە دەفەرموێت ( لا تنقضي عجائبه ) ، واتە شتی سەیرو سەمەرەی قورئان تەواو نابن .. جا بەڕاستی چاکی فەرمووە و هەروایە ، ئەوەتا هەزار و چوارسەد ساڵە قورئان دڵان کەمەندکێش دەکات بۆ لای خۆی و ناوبەناو موعجیزاتی نوێ و ڕاستی زیاتر لە قورئان دا دەردەکەون ، بۆ نموونە :

( **یەکەم** ) دکتور زغلول النجار کە زانایەکی جیهانی یە لە بواری جیولوجیادا دەڵێ : برادەرێکی دکتۆرم چوو سەردانی وەکالەتی ( ناسا ) ی ئەمریکی کردو لەوێ چاوی کەوت بەو کەشتیە ئاسمانیانەی کە پاش تەواو بوونی گەشتەکانیان هێنراونەتەوە سەرزەوی بۆ ئەوەی دیراسەیان لەسەر بکرێ و ڕابنوێنرێن بۆ هەرکەسێ کە بیەوێ بیانبینێ .. برادەرەکەم دیقەتی دا گەردی مس هەن بەسەر بەرگی دەرەوەی کەشتیەکانەوە ، پرسیاری کرد لە زانایەك لەوەکالەتی ( ناسا ) ، ئاخۆ ئێوە ( مس ) بەکاردێنن بۆ بەرگی دەرەوەی کەشتیە ئاسمانیەکان ؟ ئەویش لەوەڵامدا وتی : نەخێر ( مس ) بەکارناهێنرێ لەبەر ئەوەی ماددەیەکی گەیەنەرە و کۆمەڵێ سیفاتی تری هەیە بۆ ئەو کارە ناگونجێ .

وتی : ئەی باشە ئەم گەردیلە مسانە چین لە سەربەرگی دەرەوەی ئەم کەشتییە ؟ لەوەلامدا وتی : لەکاتی گەشتی ئاسمانیدا لە بۆشایی ئاسمانەکاندا ئەو گەردە مسانە دەنیشنە سەر ئەو کەشتیانە ..

دکتۆرەکەی برادەرم وتی : جا خۆ ئەوە راستێتی قورئان دەسەلمێنێت کە دەفەرموێت ﴿ يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِنْ نَارٍ وَنُحَاسٌ فَلا تَنتَصِرَانِ ﴾ ( الرحمن :٣٥ ) .

واتە : ئەی گرۆی پەری و ئادەمیزاد ئەگەر دەتوانن دەرچن و بگەنە بەشەکانی ئاسمان و زەوی ، ( کە دیارە بەهۆکاری تایبەت دەبێت ) ، جا ئەگەر لە سنوور دەرچوون ، بڵێسەی ئاگرتان هاوڕێ لەگەڵ مس دا بۆڕەوانە دەکرێت ئیتر شکست دەخۆن و سەرکەوتوو نابن ..

بە راستی موعجیزەیە ، ئەگینا پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار ﷺ زیاتر لە چواردە سەدە لەمەوبەر کاری چییە بەسەر مسەوە لە ئاسمان ، چوزانێ کە لە بۆشایی ئاسماندا مس هەیە .. بۆ نالێ ئاسن ، بۆ نالێ ماددەیەکی تر .. دیارە ئەمە خوا فێری کردووە کە زانایە بە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی تیایاندایە ..

**دووەم** / ئایینی پیرۆزی ئیسلام ، هێرشێکی گەورەی کردە سەر سووخواردن و لە چەند ئایەت و فەرموودەدا جڵەوگیری لێ کردووە ، بۆ نموونە دەفەرموێت : ﴿ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لا يَقُومُونَ إِلا كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنْ الْمَسِّ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا فَمَنْ جَاءَهُ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّهِ فَانتَهَى فَلَهُ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُ إِلَى اللهِ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ (٢٧٥) يَمْحَقُ اللهُ الرِّبَا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ وَاللهُ لاَ يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ (٢٧٦) ﴾ ( البقرة : ٢٧٦ )

واتە : ئەوانەی سوو دەخۆن ، هەڵسووکەوت ناکەن و راست نابنەوە (لە گۆڕ ) دا مەگەر وەك ئەو کەسەی کە شەیتان دەستی لێوەشاند بێت ، ( هەر لەدنیادا سرووشتی نین و ، لە قیامەتیشدا وەك شێتن ) چونکە ئەوانە دەڵێن : کڕین و فرۆشتن وەك سوو وایە ، لە حاڵێکدا : خوا کڕین و فرۆشتنی حەلاڵ کردووە و سووی حەرام کردووە ، جا ئەوەی ئامۆژگاری پەروەردگاری پێگەیشت و وازی هێنا ، ئەوەی دەستی کەوتووە بۆ خۆی ، کاری لێپرسینەوەشی دەکەوێتە لای خوا ، بەلام ئەوەی دەست بکاتەوە بە سوو خۆری ، ئا ئەوانە جێنشینی ناو ئاگری دۆزەخن و ژیانی هەمیشەیی تیا بەسەر دەبەن .. خوا سوو تەفرووتونا دەکات و بەرەکەتی لێهەڵدەگرێت ، بەلام خێر و سامان بەخشین برەو پێ دەدات و بەرەکەتی تێدەخات ، بێگومان خوا هیچ کافرێکی تاوانباری خۆشناوێت ..

ئینجا دەفەرموێت : ﴿ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَأَقَامُوا الصَّلاةَ وَآتَوْا الزَّكَاةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ (٢٧٧) يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ وَذَرُوا مَا بَقِيَ مِنْ الرِّبَا إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ (٢٧٨) فَإِنْ لَمْ تَفْعَلوا فَأْذَنُوا بِحَرْبٍ مِنْ اللهِ وَرَسُولِهِ وَإِنْ تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَالِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ (٢٧٩) وَإِنْ كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ وَأَنْ تَصَدَّقُوا خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ (٢٨٠) ﴾ ( البقرة) .

واته : بەراستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە و نوێژەکانیان بەچاکی بەجێهێناوە و زەکاتیان داوە ، تەنها پاداشتیان لای پەروەردگاریانە ، ئەوسا نەترس و بیمیان لەسەرە ، نەغەم و پەژارە دەیانگرێتەوە ..

ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ، پارێزکارو خواناس بن و واز لە پاشماوەی سوو بهێنن ، ئەگەر ئیماندارن ، خۆ ئەگەر وانەکەن ، ئەوە جەنگ لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا رابگەیەنن ( کەسەرەنجامەکەی زۆر سامناکە ) ، خۆ ئەگەر تەوبە بکەن و وازبهێنن لە سوو خۆری ، ئەوە تەنها سەرمایەکانتان بۆ هەیە . وەری بگرنەوە ، نەستەم دەکەن لە قەرزارەکان و ، نەستەمتان لێدەکرێت ، خۆ ئەگەر قەرزارەکە نەداربوو ، ئەوە مۆڵەتی بدرێ تا دەرووی لێ دەکرێتەوە و دەبیێت ، خێر کردنتان بە قەرزارەکەو ئازاد کردنی و بەخشینی ، چاکترە بۆتان ، ئەگەر ئێوە بزانن چەندە پاداشتی خوایی بێ سنوورە ..

( ئەم ئایەتانە لە مەدینە هاتنە خوارەوە کە دەوڵەتی ئیسلامی دامەزراو دەسەڵاتی پەیدا کرد ، هەرچەند لە مەککەش کە هێشتا موسڵمانان چەوساوە بوون و هیچی وایان بەدەست نەبوو ، قورئان دەستپێشخەری کرد لە زەمی سوو خوادن داو لە سوورەتی رۆم دا فەرمووی : ﴿ وَمَا آتَيْتُمْ مِنْ رِبًا لِيَرْبُوَا فِي أَمْوَالِ النَّاسِ فَلا يَرْبُوا عِنْدَ اللهِ وَ مَا آتَيْتُمْ مِنْ زَكَاةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ اللهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُضْعِفُونَ * ﴾ ( الروم : ٣٩ ) .

واتە : هەرپارەو سامانێکتان بەسوو دابێت بە خەڵکی بۆ ئەوەی زیاد بکات لەناو سامانەکەیاندا ، ئەوە بەرەکەتی نیەو پاداشتی نابێت لای خوا بەڵکو لێپرسینەوەشی لەدوایە ، ئەوەش کە بەزەکات داوتانە و مەبەستان رەزامەندی خوایە ، ئائەو جۆرە کەسانە پاداشتیان چەند بەرابەر کردۆتەوە ..

بەڵێ .. ئیسلام لە بواری ئابووریدا بەرنامەیەکی لەوێنە نەبووی دارشتووە بۆ مرۆڤایەتی و سووخواردنی بە نەفامی و جاهیلیەت لە قەڵەم داوە و لە وتاری ماڵئاوایش دا حەزرەت ﷺ فەرمووی : (( ألا وإن كلّ شيء من أمر الجاهلية تحت قدمي موضوع ودماء الجاهلية موضوعة وإنّ أول دم أضعُ من دمائنا دم ابن ربيعة بن الحارث وربا الجاهلية موضوع ، وأولُ رباً أضع ربا العباس بن عبدالمطلب ، فإنه موضوع كله ) ..

واتە : ( هەمووشتەکانی دەورەی نەفامی لە ژێر پێمدایە و خوێنی دەوری نەفامێتی تۆڵەی ناسێنرێت ، یەکەم خوێنێ کە بەرۆیشتووی دابنێم و تۆڵەی نەسێنرێت خوێنی ( کوڕی رەبیعەی کوڕی حارث) ەیەو، سووکاری نەفامێتی بەتاڵە و سووەکەی ناسێنرێت ، یەکەم سوویەك کە بەبەتاڵی دابنێم ،سووی ( عباس ) ی کوڕی ( عبدالمطلب ) ە ) .

بەراستی ئەمەش ئەوپەڕی دادپەروەریە کە لەکەس و کارو مامی خۆیەوە دەستی پێکرد و هەرکەس قەرزاری ( عەباس ) بوو دەیتوانی تەنها قەرزەکەی بداتەوە بەبێ بڕی ئەو سووەی کەچوو بوە سەری ..

ئەمە لەزەمانێکدا کە دنیا وەك ئەمڕۆ نەبوو ، ژیان و ئابووری سادە بوو ، ئەمڕۆ زیاتر لە جاران دنیا گیرۆدەی داوی سوو بووە و هەموو ئابووری وڵاتان لەسەر بنەمای ( سوو ) ە و کۆمەڵێکی کەمی وەك دەوڵەمەندەکانی جوولەکە لە رێی سوو خۆرییەوە پارەی دنیا دێتەوە گیرفانیان ..

ئەمرۆ ئەگەر بەویژدانەوە سەیر بکەین ، دان بە گەورەیی و موعجیزەی ئەم ئیسلامەدا دەنێین کە چۆن باس لە هەموو لایەنەکانی ژیان دەکات و هیچی فەرامۆش نەکردووە و هەرچی یاساغ کردووە لەبەرژەوەندی مرۆڤایەتیدایە ..

دکتۆر حسین مؤنس لە پەراوەکەیدا ( الرِّبا و خَرابُ الدنيـا ) واتە : ( سوو خۆری و کاول بوونی دنیا ) باس لە مەترسی و زیانی سوو خۆری دەکات لەسەر ئابووری و ژیانی مرۆڤایەتی .. دەوڵەتان بڕێك پارە لە بانقی نێودەوڵەتی قەرز دەکەن بۆ بوژاندنەوەی ئابووریان و بنیات نانی پرۆژەی بەسوود ، بەڵام چونکە بەسوو وەری دەگرن بێ بەرەکەتەو دەبێ خۆی چەندە لە چەند ساڵێکا بڕێکی زۆر سوو بدەن کە دەگاتە ملیارەها دۆلار بەمەش تووشی زیانێکی گەورەی ئاشکرا دەبن و زیاتر دەچنە ژێر چەپۆکی وڵاتە زلهێزەکانەوە !

بۆ نمونە وڵاتی میسر ( ٥٣ ) ملیۆن فرەنکی وەرگرت ، بەهۆی خایاندنی ماوەیەکی زۆرەوە ، بڕەکەی بوو بەچوارئەوەندە . و شایانی باسە میسر تا ئێستا نزیکەی (٧٢) ملیار دۆلار قەرزاری ناوخۆو دەرەوەیە بەهۆی سوو خۆری و چەوتی و نالەباری حکومەتەکەیانەوە .

پسپۆڕان و زانایانی بواری ئابووری سەرسامی خۆیان دەربڕیوە بۆ بەرزی لایەنی ئابووری لە ئیسلامدا و چەند ساڵێك لەمەوبەر فەرەنسا کۆمەڵێ یاساناسی نارد بۆ وڵاتی سعودیە بۆ لێکۆڵینەوەی ( میرات ) لە ئیسلامدا ، تا سوودی لێوەرگرن لە یاسای فەرەنسادا و ئەو ناتەواویەی هەیە لە یاساکانی خۆیاندا لای ببەن ، ئەمە لە کاتێکدا کە یاسای فەرەنسی سوودی لە ( فقه )ی ئیمام ئەبو حەنیفە وەرگرتووە .

هەروەها چەند ساڵێك لەمەوبەر لە ئەڵمانیای رۆژ ئاوادا بۆ یەکەمجار لەسەر داوای خۆیان بۆ ماوەی دەرۆژ کۆبوونەوە کرا لەسەر ئابووری لە ئیسلامدا و ژمارەیەکی زۆر زانای ئابووری ناسی ئیسلام بەشداریان کردو سەرۆکی ژووری پیشەسازی ئەڵمانی وتی ( ئێمە دەزانین کە رزگار بوونمان لە باری خراپی ئابووریمان ، بە ئابووری ئیسلام دەبێت ، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە ئابووری لە ئیسلامدا بەشێکە لە ئاینی ئیسلام و جیاناکرێتەوە ، بۆ پەیڕەوی کردنی ئەو جۆرە ئابووری‌یە دەبێت خەڵکی ئەڵمانیا موسڵمان بن کە ئەمەش کاتی دەوێت ) .

هەروەها جێگری سەرۆك وەزیرانی روسیا و کۆمەڵێك ئابووری ناس پێش چەند ساڵێك چوونە قاهیرە و لە زانکۆی ئەزهەر ئامادەی کۆبوونەوەیەکی گەورەبوون لەسەر ئابووری لە ئیسلامداو لەدوای کۆبوونەوەکان جێگری سەرۆك وەزیران وتی ( ئێمە کەم و کورتی شیوعیەت و سەرمایەداری دەزانین و چاك تێگەیشتووین کە ئەو دووبیرو بۆچوونە سوود بەرووسیا ناگەیەنن ) ..

**سێیەم :** لەسەرەتای ئیسلامەوە ، وەقف کردن بۆ یەکەم جار لە دنیادا هاتەکایەوە کە بۆ سوودی موسڵمانان بەکاردەهات ، کە ئەمەش زۆر بواری گرتەوە ، بۆ نموونە کاتێك ئایەتی : ﴿ مَنْ ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَاعِفَهُ لَهُ أَضْعَافًا كَثِيرَةً وَاللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْسُـــطُ .﴾

( البقرة : ٢٤٥ ) . هاته خوارەوە ئەبودحداح هاتە خزمەت حەزرەت ﷺ و وتی : سەیرە ئەی پێغەمبەری خوا ، چۆن پەروەردگار کە خۆی هەمووشت دەبەخشێ ، داوا دەکات قەرزی بدەینێ ؟ حەزرەت ﷺ فەرمووی : ( ابو دحداح ئەو خێرەی تۆ دەیکەیت ، خوای گەورە وەك قەرزێك وەری دەگرێ و لە قیامەت دا ئەتداتەوە ) . وتی : ئەی پێغەمبەری خوا من دوو باخم هەیە ، یەکێکیان شەش سەد دارخوارمای تیایە و ئەوی تریان سێ سەدی تیایە و تۆ شایەت بە کە هەردووکیم بەخشی بەخوا .. حەزرەتیش ﷺ فەرمووی : یەکێکیان بکە بە خێرو ئەوی تریشیان بهێڵەرەوە بۆ خۆت و ماڵ و مناڵەکەت ..

ئەویش وتی : ئەی پێغەمبەری خوا باخە بچووکەکە بۆ من و گەورەکەش دەبەخشم ، ئینجا رۆی ماڵ و مناڵەکەی گواستەوە بۆ باخە بچوکەکە و هەواڵەکەی‌دا بەخێزانەکەی ، هاوسەرە خواناسەکەی وتی ( واللہ ربحت المتاجرة ) : بەخوا بازرگانیەکەمان قازانجی کردووە .. ( ابنتي الحبيبة / هذا هو الطريق الى الجنة ) السنجري .

هەروەها کە ئایەتی ﴿ لن تنالو البرَّ حتى تنفقوا مما تحبون ﴾ ( ال عمران :٩٢) . هاتە خوارەوە ، ئەبوتەڵحە بیرێکی ئاوی شیرینی هەبوو بەخشی بەخواو پێغەمبەر و موسڵمانان و وەقف کرا ..

بەم جۆرە وەقف کردن دەستی پێکرد کە نیشانەی بروای تەواوو گەورەیی ئیسلامە ، وە بووە مایەی سوود و قازانجی زۆر لە بواری کۆمەڵایەتیدا ، بۆ نموونە هەزار ساڵ لەمەو بەر لە وڵاتی شامدا وەقف کردن هەبوو بۆ تەواوکردنی خوێندنی قوتابی و بۆ ژن هێنان و بۆ رێبوار و بۆ نەخۆش و تەنانەت بۆ نان دان بە سەگی بەرەڵا و چارەسەرکردنی ئاژەڵان ..

لە وڵاتە ئیسلامی‌یەکاندا لەم سەدەی دوایی‌یەدا ، ئەوقافەکان لەلایەن میری‌یەوە دەستی بەسەردا گیرا و بە چاکی بەکار نەهێنرا ، بۆیە خەڵکیش دڵیان لێی سارد بۆوە وئەم نیزامە گرنگەی خێرخوازی تا رادەیەکی زۆر پەکی کەوت .. کە لە لایەنی کۆمەڵایەتی‌یەوە دەیتوانی زۆر خزمەت بە کۆمەڵگا بکات .. ئنجا ( کۆمەڵەی ئەهلی )و ( دەزگای خێرخوازی ) هەمە جۆر دامەزران و رۆڵی بەرچاویان بینی و، خەڵکی بۆ خێرکردن زیاتر متمانەیان پێ دەکەن کە ئەویش بە داخەوە لە زۆر شوێن کە هێشتا دیکتاتۆریەت بالادەستە و رێز لە مافی مرۆڤ ناگیرێ ، ئاستەنگی زۆر دەهێنرێتە رێیان و ، پاش کارەساتەکەی ئەمریکاش جەنگی جیهانی سێهەم هەڵگیرساوە و تەنها لە ئەمریکادا ( ٣٠٠ ) دەزگای خێرخوازی ئیسلامی وەستێنراون !( شایانی باسە کاتێك ئینگلیز عێراقی داگیر کرد میستەر کوکی کردە بەرپرسی ئەوقاف ئەویش هەرچی پێکرا دژی وەقفی موسڵمانان کردی ) .

## راستیەکانی سوننەت ئاشکرا دەبن :

هەرچی‌یەك پێغەمبەر ﷺ پێی راگەیاندووین راستن و لە بەرژەوەندی بەرەی ئادەمی‌دان و ، حەزرەت ﷺ هیچی لە خۆیەوە و بە زیادە نەفەرمووە و ، رۆژگاریش فەرموودەکانی دەسەلمێنن ، بۆ نموونە :

**یەکەم :** حەزرەت ﷺ دەفەرموێ : ( ما ملأ آدمي وعاءً شراً من بطنه ، بحسب ابن آدم لُقيماتٌ يُقِمنَ صُلبَهُ ، فإن كان لابد فاعلاً ، فثُلُثٌ لطعامه ، وثلث لشرابه ، وثلث لِنَفسِــهِ ) أحمد والنسائي والحاكم .

واتە : مرۆڤ هیچ شتێکی پڕ نەکردووە وەکو پڕکردنی ورگی خراپ بێت ، بەسە بۆ مرۆڤ کە چەند پاروویەك بخوات و پشتی راست بکاتەوە ، ئەگەر چار نیە و دەخوات ، با یەك لەسەر سێی گەدەی بۆ خواردن بێت و یەك لەسەر سێی بۆ خواردنەوە بێت و یەك لەسەر سێکەی تریشی بۆ هەناسەدانی بێت ..

گۆڤاری ( الرَّجُل ) ژمارە /٦٥ ساڵی ١٩٩٧ کە لە ئەمریکا دەردەچێت دەڵێت : ئایا رێگایەکی تر هەیە بۆ هەڵمژینی ئۆکسجینی زیاتر ؟بەڵێ دەرمانی ئۆکسجین هەیە .. ئەمەش ئەوەیە کە دکتۆر هاتفیلد و دکتۆر یسیس دۆزیانەوە ، لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیاندا لە نهێنی سەرکەوتنی وەرزشەوانەکانی رووسیا ، دەڵێن : هۆی سەرکەوتنی وەرزشەوانەکانی رووسیا لە یارییەکانی ئۆڵۆمپیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دەرمانی ئۆکسجین لە ڕێی گەدەوە وەردەگرن .. ئەم دوو زانایە لەم راستیەوە گەیشتنە ئەوەی کە لە ڕێی گەدەوە ئۆکسجین دەچێ بۆ خانەکانی لەش و دەبێتە هۆی رزگارکردنی لەش لەو ژەهرانەی کە تیایدا کۆدەبێتەوە و بەرگری لەش زیاد دەکات و بیر و هۆش بەهێز دەکات و مرۆڤ لە دڵەڕاوکێ و دوودڵی رزگار دەکات و نیشانەکانی پیری دوادەخات و توانای زایەندی زیاتر دەکات ..

لەبەر ئەم سوودە زۆرانەش گەورە وەرزشەوانەکانی ئەمریکاش کەوتنە بەکارهێنانی دەرمانی کۆکتێلی ئۆکسجین ، تا لە ڕێی گەدەوە بە لەشیاندا بڵاو بێتەوە ..

ئەکرێ بپرسین ئەم راستییە گرنگە ئەگەر خوا نەبێ کێ فێری حەزرەتی کرد و توانی وا بە جوانی فەرموودەکەی دارێژێ ؟

کێ دەتوانێ بە نەخوێندەواری و لە زەمانێکدا کە زانست و زانین زۆر کەم بووە ، لە زیاتر لە چواردە سەدە لەمەو بەرەوە ، باسی مەسەلەیەکی ئاوا بکات و دەقاو دەق لەگەڵ زانستی ئەم سەردەمەدا بگونجێ ؟

موسڵمانان هەرچەند ئەگەر حیکمەتەکەشیان نەزانیبێ و لەلایەنی زانستیەکەشی شارەزا نەبووبن ، وەك فەرمانبەرییەك بۆ خوا و پێغەمبەر ﷺ پەیڕەوی ئەم فەرموودەیەیان کردووە ولێی بەهرەوەر بوون .. ئیمام شافعی دەفەرموێت : ( شانزە ساڵە تێر نەبووم ، چونکە تێربوون و زۆرخۆری لەش قورس دەکات و دڵ رەق دەکات و زیرەکی ناهێڵێ و خەو دێنێ ! )

ئاشکرایە کە قورئانیش بە گشتی ئاماژەی بۆ ئەم مەسەلەیە کردووە و دەفەرموێ : ( **کلوا واشربوا ولا تسرفوا** ) ( نفحات علمية من القرآن والسنة : د. دلاور ) .

**دووەم /** حەزرەت ﷺ دەفەرموێت : ( إذا دخلتم على المريض ، فنفسوا له في الأجل ، فإن ذلك لا يرد شيئاً وهو يطيب نفس المريض ) ( ابن ماجه )

واتە : ئەگەر چوونە لای نەخۆش ئەوا دڵی خۆش بکەن و هیوای بدەنێ ، هەرچەن هیچ لە قەدەر ناگۆڕێ ، بەڵام دیارە ئەوە دڵی نەخۆشەکە شاد دەکا و زیاتر ئارامی پێ

دەبەخشێت ، لە ئیسلامدا سەردانی نەخۆش پاداشتی گەورەی هەیە ، چونکە ئەو نەخۆشە لە کۆمەڵ دانابڕێت و پاشان ئەوانەش کە سەری لێ دەدەن پەندی لێ وەردەگرن ، لەوەدا کە قەدری لەش ساغی خۆیان بزانن و لە خێرو چاکە و کاری باشدا بەکاری بهێنن .

لە فەرموودەیەکی تریشدا هاتووە کە پەروەردگار لە قیامەتدا دەفەرموێت : ( یاابن آدم مرضت فلم تَعُدني ) واتە :ئەیَ بەنی ئادەم نەخۆش کەوتم نەهاتی بۆ لام ، ئەویش ئەڵێت : خوایە تۆ چۆن نەخۆش دەکەوی تا من سەردانت بکەم؟

پەروەردگاریش دەفەرموێت : فلاّن بەندەم نەخۆش کەوت ئەگەر سەردانت بکردایە ، من لە لای بووم و وەك سەردانی منت کردبێ وا بوو !

ئەم گرنگی پێدانەی ئیسلام بەم مەسەلەیە لە ساڵی ( ١٩٥٦ ) دا زیاتر دەرکەوت بەوەی کە ( دکتۆر س . سیروف ) و ( د . أ. تروسکان ) سەلماندیان کە ژمارەی خڕۆکە سپییەکانی نەخۆش ( ١٥٠٠ ) یەکە زیاد دەکات ، ئەگەر ئەو نەخۆشە دڵنەوایی بکرێ و سەردان بکرێ و دڵی خۆش بکرێ( ل١٢٤ بحوث مقارنة / د . دلاور محمد صابر ) .

**سێهەم :** لە فەرموودەدا هاتووە کە خەتەنەکردن لە فیترەتەوەیە و ، حەزرەتی ئیبراهیمیش ( سەلامی خوای لێ بێ ) خەتەنە کرابوو ، دیارە ئەمەش هەر لە دێرزەمانەوە لە ئایینی ئیبراهیمدا هەبووە ، هەروەها لای جوولەکەش خەتەنە کردن هەیە ، بەلاّم گاورەکان کە دەبوایە خەتەنەیان بکردایە ، نایکەن و زۆر دژایەتیشی دەکەن ..

پزیشکێکی ئەمریکی منالاّن بەناوی پرۆفیسۆر ویزویل دەڵێت : ( من لە حەفتاکانەوە زۆر دژی خەتەنەکردن بووم ، بەلاّم ئێستا پاش دیراساتی زۆر لەسەر چاکیوسوودی زۆری خەتەنەکردن لە هەموو پزیشکەکان زیاتر هانی خەڵکی دەدەم لەسەر خەتەنەکردنی منالّەکانیان .. )

شایانی باسە ئێستا زیاتر لە ٦٠٪ ی منالاّنی ئەمریکا خەتەنە دەکرێن ، چونکە ئەو منالاّنەی خەتەنە دەکرێن کەمتر تووشی نەخۆشی شێرپەنجە و ئیلتیهابی ( مجاری بولی )و ( ئایدز ) دەبن . وە تا ساڵی دوو هەزار زیاتر لە دە دیراسەی زانستی لەسەر بلاّوبۆتەوە ! ( حقائق العلم الحديث /عبدالرحمان العصافي ) . گۆڤاری‌زانستی ئەمریکیش وتارێکی بەناوی گەڕانەوە بۆ خەتەنە کردن بلاّوکردەوە کەتیایا باسی گرنگی خەتەنە کردنی کردبو ..

بە راستی هەر ئیسلامە ، کە باسی لە هەموو لایەنەکانی ژیان کردبێ ، ئەوەتا باسی خەتەنەکردن و نینۆك کردن و تاشینی موو دەکات و بەشتێکی فیترەی دادەنێ ، لەلایەکی تریشەوە باسی بوونەوەر و ئاسمانەکان و زەوی دەکات و ئەمە بێجگە لە باسی دنیا و ئاخیرەت و دروست بوونی مرۆڤ و رەوشت و خووی جوان و ... هتد .. هەرچییەکیش کە باسی دەکات و گرنگی پێ دەدات گەورە بێ یان بچووك هەرگیز پێچەوانەی زانست نیە .

**چوارەم** / زیکر و یادی خوا لە قورئان و سوننەتدا زۆر جەخت کراوەتە سەری ، بە تایبەت رۆژی پێنج جار دوای نوێژەکان ، کە بە راستی ئەمەش بە حیکمەت دانراوە و لەم دواییانەدا زانای دەروون ناس ( د. محمد حافظ الأطروني ) مامۆستا و سەرۆکی بەشی نەخۆشی دەروونی کۆلێژی پزیشکی ( المنصورة ) لە میسر ، گەیشتە ئەو راستیەی کە تەسبیحات کردن رۆژی پێنج جار دوای نوێژەکان زۆر کاریگەری‌یان هەیە لەسەر مێشك وئارامی دەکات ، چونکە مێشك لە ئەنجامی ئەو تەزووی کارەبایەی کە هەیەتی چوار شەپۆلی کارەبایی دروست دەکات و، دوانیان دەبنە هۆی دڵە راوکێ و نائارامی و دوانیشیان دەبنە هۆی ئارامی و دڵنیایی .. جا دانیشتن دوای نوێژ و تەسبیحات کردن ئەو دووشەپۆلەی ئارامی بەهێز دەکەن و بەمەش مرۆڤ دڵ خۆش و ئارام دەبێت .
( الشبكة الآسلامية / انترنيت ، باسی / التسبيح ينتصر على الإدمان ) .

**پێنجەم** /حەزرەت-ص-دەفەرموێت:( مثل المؤمنين في توادهم وتراحمهم وتعاطفهم مثل الجسد اذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمى ) بخاري ومسلم واحمد : واتە موسڵمانان لە خۆشویستیان ومیهرەبانیان وسۆزیاندا بۆ یەکتری وەکو جەستەیەك وان ئەگەر ئەندامێکی نەخۆش بکەوێ هەموو ئەندامەکانی تری دێن بەهانایەوە بە شەو نخونی‌و تا لێهاتن ..

زانستی سەردەم سەلماندی کە ئەگەر شوێنێکی مرۆڤ تووشی شتێك ببێت لە رێی جهازی عصبی یەوە هەموو لەش پێدەزانن و دێن بە هانایەوە ئەم کارەش زانایان بە ( sympathetic ) ناوی دەبەن کە ماناکەی (المتواد ،ألمتعاطف ، المتراحم ) ە کە حەزرەتیش پێش چواردە سەدە زیاتر هەمان ئەو وشانەی بەکار هێناوە ،جائەگەر ئەمە خوا فێری نەکردبێت چۆن دەتوانێ وا بەوردی باسی بە هاناوە هاتن وخۆشەویستی وسۆزو میهرەبانی هەموو لەش بکات بۆ ئەو ئەندامەی کەتووشی شتێك دەبێت . .گۆڤاری‌الاعجاز / ژ /١٤١٨/٣ك/

## ئەوانەی راستیان وتووە !

لە کۆن و نوێدا هەمیشە کەسانێکی بەویژدان هەبوون کە هەقیان وتووە و دانیان ناوە بە گەورەیی ئەم ئاینە و بە پێغەمبەرێتی ( محمد ) دا ﷺ جا بۆ ئەوەی کەسانی ناحاڵی و بێ ئاگا تفەنگ بە تاریکیەوە نەنێن و توتی ئاسا قسەی ئەم و ئەو نەڵێنەوە ، هەندێ لەگەواهی کەسانی زانا و ناودار لێرەدا باس دەکەین ..

❀ نوسەری ئەمریکی ( مایکل هارت ) دەڵێت ( لە مێژووی پێغەمبەراندا پەڕاوێك نیە پیتەکانی بەتەواوی مابێ و نەگۆڕدرابێ ، مەگەر قورئان کە دابەزیە سەر محمد ﷺ )

❀ ( مایك تایسون ) ( یاریکەری جیهانی بۆکسێن ) دەڵێت ( لە قورئان وردبوومەوە و دیراسەم کرد ، هەموو وەڵامەکانی پرسیارەکانی ژیانم دەست کەوت ) .

❀ ( هانوتو ) وەزیری دەرەوەی پێشووی فەرەنسا دەڵێت ( شوێنێك نیە لەسەر رووی زەوی کە ئیسلام دەستی نەیگەیشتبێتێ ، ئیسلام لە هەموو دینەکانی تر زیاتر خەڵکی ئارەزووی پەیرەوی کردنی دەکەن ) .

❁ پرۆفیسور یوشیودی کوزان ( بەڕێوەبەری مرصدی طوکیـو ) دەڵێـت : ( هیـچ گرانی‌یەك نابینم لە قبوڵ کردنی ئەوەدا کە قورئان فەرموودەی خوایە ، ئەو وەسفانەی کۆرپەلە کە لە قورئاندا هاتوون ، هەرگیز ناکرێ لە زانستی سەدەی حەوتەمـەوە هـاتبن ، تەنها ( استنتاج) ێك کە بکرێ و عەقڵ بیگرێ ئەوەیە ، کە ئەو وەسفانە لە خواوە بـۆ (محمد) ﷺ نێردراون ) .

❁ شاعیری فەرەنسی ( لامارتین ) دەڵێت ( گەورەترین رووداو لە ژیانمدا ئەوەیە کە من دیراسەی ژیانی پێغەمبەری خوا ( محمد) م ﷺ بە چاکی کردووە و زانیم چ گەورەیی و نەمری‌یەکی تیایە .. کێ هەیە وەك ( محمد ) گەیشتبێتە پلەی بەرزی مرۆڤایەتی ) .

❁ زانای لاهوتی سویسری ( د. هانز کونگ ) دەڵێت ( محمـد بەراسـتی پێغەمبـەرە وناتوانین ئیتر نکوڵی بکەین لەوەی کە ( محمد ) رابەر وسەرکردەیە بەرەورێگای رزگاری)

❁ شاعیری ئەڵمانی ( گۆتە ) دەڵێت ( هەرچەند قورئانم خوێندبێ ، هەستم کردووە گیانم دەهەژێنێ .. بە مێژوودا گەڕام بەدوای نموونەیەکی بالاَ بۆ ئەم ئادەمیزادە ، لـە ( محمد ) پێغەمبەردا ﷺ دۆزیمەوە !

بەراستی دەستوور و یاسای ئەورووپی ناتەواوە لە چاو شەریعەتی ئیسلامدا ، وە ئێمەی ئەهلی ئەورووپا بەهەموو زانینمانەوە هێشتا نەگەیشتوینەتە ئەوەی کە محمد گەیشتویەتی ) .

وە کاتێك تەمەنی گەیشتە حەفتا ساڵ رایگەیاند ، کە بەخشوعەوە ئاهەنگ دەگێڕێ لەو شەوە پیرۆزەی کە قورئانی تیا هاتە خوارەوە بۆ سەر ( محمد ) ﷺ

❁ ( لیو تولستوی ) دەڵێت ( من یەکێکم لەو کەسانەی کە زۆر سەرسامن بە ( محمد ) کە خوا هەڵی بژاردووە تا دوا پەیام لەسەر دەستی ئەوا بێت و ببێتە دوا پێغەمبەر ) .

❁ ( دکتور ئیرنبرگ ) مامۆستای زانکۆی ئۆسلۆ دەڵێت ( گومان نیە لەوەدا کە قورئان لە خواوەیە و ، گومانیش نیە لە راستێتی پەیامی ( محمد ) .

❁ عەللامە ( بارتلمی هیلر ) دەڵێت ( کاتێ خوا پەیمانی پاراستنی دا بە ( محمد ) بە ئایەتی﴿ والله يعصمك من الناس ﴾ ، پێغەمبەر ﷺ پاسەوانەکانی ئیزن دا ، ئاشکرایە مرۆڤ درۆ لەگەڵ خۆیدا ناکاو خۆی ناخەڵەتێنێ ، جا ئەگەر قورئان لە خواوە نەهاتایە ، ئەوا ( محمد ) پاسەوانەکانی ئیزن نەئەدا ) .

❁ فەیلەسووفی ئەمریکی ( ارثرکیـن) دەڵێت ( بەراستی زۆر گەڕام بەدوای ( نهێنی بوون ) دا وە زۆر قـوڵ بوومـەوە لـە لێکۆڵینـەوەکانم دا ، وە بـۆم دەرکـەوت کـە ئیسـلام نزیکترین ئاینە بە ئاسمان و بەنەفسی ئادەمیزاد و ، دڵنیا بووم ئەوەیە ئـاینی بـەرز و پیرۆز کە پیێ رازی بم و بڕوای پێ بهێنم)

❁پرۆفیسۆری ئینگلیزی ( هاروون مصطفى لیون ) دەڵێت : ( لە جوانیەکانی ئیسلام ئەوەیە کە لەسەر عەقڵ وەستاوە و ، هەرگیز داوا لە شوێن کەوتوانی ناکات کە عەقڵیان وەلانێن ، بە پێچەوانەی ئاینەکانی ترەوە کە جەخت دەکەنە سەر شوێن کەوتوانیان کە بیروباوەڕێکی دیاری کراو وەرگرن بەبێ بیرکردنەوە و پرسیار کردنێکی ئازاد ) ..

❋ ( منى عبدالله ماكلوسكى ) قونسولى ئەڵمانى لە بەنگلادش دەڵێت ( لە ژێر سێبەری ئیسلامدا ئافرەت ئازادی دەست کەوتەوە و پلەی بەرزی بەدەستهێنا ، ئیسلام ئافرەت بەهاوشانی پیاو دادەنێ و هەردووکیان یەکتری تەواو دەکەن ) .
❋ ڕۆژنامە نووس و سیاسی هیندی ( کوفهی لال جابا ) دەڵێت ( هیچ ئاینێك نیە وەك ئیسلام توانای چارەسەرکردنی کێشەی خەڵکی هەبێت لە جیهانی سەردەمدا ، کە ئەمەش بەتەنها ئیمتیازی ئیسلامە ) .
❋ زانای فەرەنسی ( د . مۆریس بۆکای ) دەڵێت ( بەراستی دیراسەی قورئانی پیرۆزم کردو ، گەڕام بەدوای گونجانی دەقی قورئان لەگەڵ زانستی نوێدا ، بۆم دەرکەوت کە هیچ وتەیەکی تیا نیە کە شایانی رەخنەلێگرتن بێت لەلایەن زانستی سەردەمەوە ، بەراستی لایەنە زانستییەکانی قورئان زۆر سەرسامیان کردم .. ) .
❋ ( فیلیب حتي ) مامۆستای مێژووی عەرەب لەزانکۆی ئەمریکی دەڵێ:( شێوازی قورئان جیاوازە لە شێوازی شتانی ترو ،ناکرێ بەراورد بکرێ بە شێوازی تر ، وە ناتوانرێ لاسایی بکرێتەوە ، چونکە شێوازی قورئان لە بنەڕەت دا موعجیزەی قورئانە ) .
❋ زانای ئەمریکی ( مایك هارث ) دەڵێت ( بەراستی ( محمد ) تاقە پیاوێکە لە مێژوودا کە بە چاکی سەرکەوتوو بێ لە دین و دنیادا ، بەراستی ئەم پیرۆز بوونەی لەدین و دنیادا وای کردووە گەورەترین کەسایەتی کاریگەر بێت لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ) .
( لە ئینتەرنێت . پێگە ئیسلامییەکان ) .

## ئەوانەی بێ دەنگ بۆ خوا کاردەکەن

لە گرنگترین هۆکانی سەرکەوتن و قبوڵ بوونی کارەکان هاتنە کایەی ئەو دڵانەیە کە بەبێ روپامایی و ، بێ دەنگ بۆ خوا کاردەکەن ، کە بەداخەوە رابوونی ئیسلامی هێشتا پێویستی بە ژمارەیەکی زۆر هەیە لەوانە و کەمی لەبەردەستایە ..

ئەو دڵانە کە بۆ خوا سوڵحاون ، چاویان لە پلەو پایە نیە و ئاواتیشی پێ ناخوازن ، ئەو دڵانە کە تەنها بۆ خوان ، لایان گرنگ نیە لە کوێدا بن لە بانگەوازدا ، لەدواوە دایان بنێن یان لە پێشەوە بن و سەرقافڵە بن .. لە هەرکوێدا پێویست بن لەوێدا کاردەکەن بۆ خوا !

ئەو دڵانە کە کاریان تەنها بۆ خوایە ، پشوودان و تەمەڵی و بێزاری نازانن و ، هەرچەندە زیاتر لە کاری بانگەوازدا رۆبچن دوعا دەکەن و دەڵێن : ( پەروەردگارا لە خێردا خەریکمان بکە و سەرقاڵمان مەکە بەشتێکەوە کە تۆ پێی رازی نیت .. ) .

ئەو دڵانە کاتێکی دیاری کراویان نیە بۆ بانگەوازکردن ، بەڵکو هەموو ژیانیان نەزر کردووە بۆ ئەم کارە مەزنە ، جا شەو بێ یان رۆژ ، ئازاد بن یان بەند کراوبن ، لە خۆشیدا بن یان لە ناخۆشیدا .. چونکە باش دەزانن کەمەقامی بانگەوازکردن مەقامی پێغەمبەرانە و بەرزترین پلەو پایەیە ، تەنها جیاوازی ئەوەیە کە ئەمان سروشیان بۆ نایەت ..

ئەو دڵانە کە تەنها چاویان لە بەهەشت و ڕەزامەندی خوایە .. لە پێناوی فلان و فیساردا کارناکەن ، لە پێناوی کۆمەڵێك دا کارناکەن و چاویان لە پاداشت و دەستکەوتی دنیایی نیە ..

ئەو دڵانە کە حەزرەت ﷺ مامۆستایانە و قورئان بەرنامەیانە ، دەچنە پێشەوە کاتێك کەسانی تر دەسڵەمێنەوە و دێنەدواوە و ، ئارام دەگرن کاتێك خەڵکانی تر شپرزە دەبن و ، سنگ فراوانن و چاو پۆشیان هەیە ، کاتێك کەسانێك بەنەزانی یان بەئەنقەست مافیان پێشێل دەکەن و هەڵە دەکەن بەرامبەریان ، ڕق ئەستوور نین و چاویان لە تۆڵە کردنەوەنیە بۆ نەفسی خۆیان ، بەڵکو تۆڵەسەندنیان بۆ پێشێل کردنی هەقی خوایە و ، بۆ پشت گوێ خستنی هەق و ڕاستییە ..

بەکورتی ئەو دڵانە بۆ خۆیان لە هەمیشە بەهارێکدا ژیان بەسەر دەبەن و سینەیان سافە بەرامبەر بەخەڵك و حەز بەخێرو خۆشی دەکەن بۆ هەموان .. جا ئەوانەش بەراستی دینداران و بوونەتە ( ربانی ) کە قورئان هانی هەموولایەکمان دەدات بۆی و دەفەرموێ ﴿ وَلَكِنْ كُونُوا رَبَّانِيِّينَ بِمَا كُنْتُمْ تُعَلِّمُونَ الْكِتَابَ وَبِمَا كُنْتُمْ تَدْرُسُونَ ﴾ (ال عمران : ٧٩ ) .

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت ( إن الله يحب العبد التقي الغني الخفي ) ( مسلم ) .واتە : بەراستی خوا بەندەی پارێزکاری دڵ و دەست دەوڵەمەندی شاراوەی خۆش دەوێت .. ئەو ( پارێزکارانە ) دڵیان دەوڵەمەندە و ئەگەر خاوەن ماڵ و سامانیش بن خێر و چاکەی لێ دەکەن ، ئەگەر بە ئاشکرا سوودی زۆر بوو بۆ هاندانی خەڵکی لەسەر چاکەکردن بە ئاشکرا خێر دەکەن و ، ئەگەر نا بەجۆرێك خێر دەکەن کە دەستی چەپیان بەدەستی ڕاستیان نازانێ کە خێرەکە دەکات ..

ئەوانە تێگەیشتوون کە مەرجێکی قبووڵ بوونی کار لای خوا ئەوەیە کە بەپێی شەرع بێت و تەواو بێت ، وە مەرجەکەی تریشی ئەوەیە کە بێ ڕووپامایی بێتو تەنها بۆ ڕەزامەندی خوا بێت ..

کارکردن بەنهێنی و بەبێ دەنگ مانای ئەوە نیە کە بڕوادار لە خەڵك دابڕێت ، بەڵکو بە پێچەوانەوە لەناو خەڵك دایە و ، نموونەی بەرز و بەرێزەو حەز بەناو و شۆرەت و باسی خۆی ناکات .. بە پێچەوانەی ئەو کابرایەی کە یەکێك بەلای دا تێدەپەڕێ و دەڵێت : چەند نوێژەکەی خشووعی تیایە ! کا براش کە نوێژەکەی تەواو کرد وتی برا بزانە بەرۆژووشم !

پیاو باشێك دەڵێ ( هەق وایە لە نێوان خواو بەندەدا کارێکی چاکەی نهێنی هەبێ کە تەنها لەبەر خوا کردبێتی ، ئەگەر توانیشی زیادی بکات و بیکات بەچەندکارێکی چاك کەکەس پێی نەزانێ ، ئەوە چاکترە ، تاوەکو ئەگەر کەوتە نارەحەتییەکەوە بەو کارە چاکانە لە خوا بپاڕێتەوە بۆ ڕزگاربوون . وەك ئەوسێ کەسەی لە ئەشکەوتەکەدا گیریان خوارد و بەو دوعایانە ڕزگاریان بوو کە کردیان بەو کارە چاکانەی کە بۆخوا ئەنجامیان دابوو . ) .

ئەوانەی کە ( أخفیا ) ن مەرج نیە رووت و رەجالْ بن ، چونکە ئەمە پەیوەندی بەرووکارو جل و بەرگەوە نیە بەڵکو شتێکە راستەوخۆ پەیوەندی بەدڵەوە هەیە ، ابن الجوزی باسی ئەزموونی خۆی دەکات و دەڵێت ( بەخوا کەسی وام دیوە زۆر نوێژو رۆژووی هەبووە و کەم قسەبووە و جل وبەرگی سادەی پۆشیوە ، کەچی بەدڵ حەزم پێنەئەکردو کەسی واش هەبوو زۆر نوێژ و رۆژووی سوننەتیشی نەبوو ، جل وبەرگی سپۆرتیشی دەپۆشی کەچی بەدڵ حەزم بەنزیکی دەکرد .. بیرم لەم حاڵەتە کردەوە گەیشتمە ئەوەی کەمەسەلەکە پەیوەندی بەدڵ و دەروونەوە هەیە و ، هەرکەس نهێنی چاك بێ ، بۆنی چاکەکانی لێ دێت و هەر لە دوورەوە هەستی پێ دەکەیت و رات دەکێشێ و مەستت دەکات !، بۆ خوا ، بۆ خوا ، دڵ و دەروونتان چاك بکەن و لە نهێنیدا چاك بن )

## دوور لە چاوی خەڵك :

قورئانی پیرۆز باسی کار و کردەوەی چاك دەکات کە لە نهێنیدا و دوور لە چاوی خەڵك ئەنجام دەدرێن و دەفەرموێت :

١) ﴿ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ سِرًّا وَعَلانِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَلا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ * ﴾ ( البقرة : ٢٧٤ ) .

واتە : ئەوانەی ماڵیان دەبەخشن بە شەوو بەرۆژ ، بەنهێنی و بە ئاشکرا ، پاداشتیان بۆ هەیە لای پەروەردگاریان و ترسیان لەسەر نیە و خەم ناخۆن ..

٢ ) ﴿ إِنْ تُبْدُوا الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ وَإِنْ تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا الْفُقَرَاءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَيُكَفِّرُ عَنْكُمْ مِنْ سَيِّئَاتِكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾ ( البقرة : ٢٧١ ) .

واتە : ئەگەر خێر و چاکەکانتان ئاشکرا بکەن چاکە و ئەگەر بیشارنەوە و بەنهێنی بیدەن بەهەژاران هەر چاکە و ، لێ خۆش بوون دەبێ بۆ گوناهەکانتان و خواش ئاگاداری کارەکانتانە .

لە بنەڕەتدا شاردنەوەی کارو کردەوەی چاك و خێر و سەدەقات باشترە ، مەگەر لەبەر بەرژەوەندییەکی ئایینی و بۆ هاندانی کەسانی تر ئاشکرا بکرێن ..

٣ ) ﴿ ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُ لا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ ( الأعراف : ٥٥ ).

واتە : بانگی پەروەردگارتان بکەن و نزا بکەن بە ملکەچی و بێ دەنگی ، خوایگەورە بەراستی ئەوانەی خۆش ناوێ کە زیادە رەوی دەکەن ( واتە : پەلە دەکەن لە جێبەجێبوونی دوعادا و زووکوڵ ئەدەن و بێ هیوا ئەبن ) ..

**گرنگی ئەم مەسەلەیە لە فەرموودەدا :**

١ ) حەزرەت ﷺ دەفەرموێت ( خير الذكر الخفيّ ، وخيرُ الرزق مايكفي ) جامع الصغير / السيوطي (٤٠٠٩) أحمد وابن حبان .

واتە : چاکترین زیکر ئەوەیە کە بەبێ دەنگ و بەنهێنی بێت ، وە چاکترین رزق و رۆزیش ئەوەیە کە سەروبەر بەشت بکات .

٢ ) یەکێك لەو حەوت کۆمەڵەی کە لە ژێر سێبەری عەرشی خوادا دەبن لە قیامەتدا کەسێکە کە خێرێك بکات بەدەستی راستی و دەستی چەپی پێ نەزانێت ، وە هەروەها کەسێکیش کە بەتەنها و دوور لە چاوی خەڵك یادی خوا بکات و فرمێسك بەچاوانیدا بێتە خواریٚ ( سبعة یظلهم الله في ظله یوم لاظل إلا ظله : .. .. .. ، ورجل تصدق بصدقة فأخفاها حتی لاتعلم شماله ما تنفق یمینه ، ورجل ذکر الله خالیاً ففاضت عیناه ) بخاري ومسلم

٣ ) حەزرەت ﷺ دەفەرمویٚ : ( صنائع المعروف تقي مصارع السوء ، والصدقة خفیاً تطفیء غضب الربّ ، وصلة الرحم تزید في العمر ، وکل معروف صدقة ، وأهل المعروف في الدنیا هم أهل المعروف في الأخرة .. ) صحیح الترغیب والترهیب / تحقیق / الآلباني ٣٧٢/١ .

واتە :چاکەکردن مرۆڤ لە ئاخر شەڕی وتیاچوونی خراپ دەپارێزیٚ ، خێروچاکەی نهێنیش تووڕەیی خوا ناهێڵیٚ و ، سیلەی ڕەحم تەمەن زیاد دەکات و ، هەموو چاکەیەك ( قسەبێت ، کردار بێت .. هتد ) خێرو سەدەقەیە و ، ئەهلی خێر و چاکە لە دنیادا ئەهلی خێر و چاکەن لە قیامەتیش دا ..

٤ ) ڕۆژێك عومەری کوڕی خطاب لە مزگەوت هاتەدەریٚ ( معاذی کوڕی جبل ) ی بینی لای قەبری پێغەمبەر ﷺ دەگریا ، لێی پرسی بۆچی دەگریت؟ وتی : بۆ فەرموودەیەك دەگریم لە حەزرەتم بیستووە (ﷺ) کە دەفەرموێت ( الیسیر من الریاء شرك ، ومَن عادی أولیاء الله فقد بارز الله في المحاربة ، وإن الله یحب الأبرار الاتقیاء الأخفیاء ، الذین إذا غابوا لم یُفْقَدوا ، وإذا حَضَروا لم یُعْرَفُوا ، قلوبهم مصابیحُ الهدی ، یخرجون من کلِ غبراء مظلمة) المعجم الصغیر للطبراني ٢٤ / ٤٥ ) .

واتە : ڕووپامایی کە مەکەشی ( شرك ) ە و ، هەرکەس دوژمنایەتی دۆستانی خوا بکات ، ئەوە دوژمنایەتی خوای کردووە و ، بەراستی خوا ئەو چاکانەی خۆش دەوێت کە پارێزکارو نادیارن ، ئەوانەی کە ئەگەر ئامادەنەبوون لە بیرناچن و باسیان دەکرێت ، وە ئەگەر ئامادەش بوون ناناسرێن و پەنجەیان بۆ درێژ ناکرێت ، دڵیان چرای هیدایەتەو رزگار دەبن لە هەموو تاریکایی یەك ..

٥) نوێژی فەرز لە مزگەوت و بەکۆمەڵ بکرێت چاکەو نوێژی سوننەتیش لەماڵەوە ، چونکە ئەوەی فەرزە ئەوە ئازایەتی تیانیە و هەمووان دەبیٚ بیکەن و بشزانرێت ئاسایی‌یە ، بەڵام نوێژی سوننەتەکان ئەگەر کەسێك چەند زۆر تر بیکات زیاتر لە خوا نزیك دەبێتەوە و دەبێتە خۆشەویستی خوا ، بۆیە تا زیاتر نهێنی و دوور لە چاوی خەڵك بێت باشترە ، هەروەها هەندیٚ لە زانایانیش وەك ( ابن عباس ) دەڵێن : خوای گەورە لە خێرو چاکەی ( تطوع ) دا نهێنی بەباشتر داناوە و لە خێر و چاکەی فەرزیش دا وەك زەکات ئاشکرای بەباشتر داناوە ) ..

٦) حەزرەت ﷺ دەفەرموێت : ( ثلاثة یحبهم الله وثلاثة یشنؤهم ( یبغضهم) الله ، أما الثلاثة الذین یحبهم الله ، الرجل یلقی العدو في الفئة فینصب لهم نحره ، حتی یقتل أو یفتح لاصحابه ، والقوم یسافرون فیطول سراهم حتی یحبوا أن یمسوا الأرض فینزلون فیتنحی أحدهم فیصلي حتی یوقظهم

لرحيلهم ، والرجل يكون له الجار يؤذيه جواره فيصبر على أذاه حتى يفرق بينهما موت أو ظعـــن )
مسند أحمد ٥/١٥١ ، صحيح الجامع ٣٠٧٤ :

واتـه : سێ کۆمـەڵ خـوا خۆشـی دەوێـن و سێ کۆمـەڵیش خـوا رقـی لێیانـە ، ئەوانـەی خۆشی دەوێن ، یەکـەم ، پیاوێکـە کـە بەدوژمن دەگـات و نابەزێت تـا شـەهید دەبێت یان سەردەکەوێت ، هـەروەها کۆمەڵێکیش کەسەفەردەکەن و مـاندوو دەبن و ، هـەر ئـەوەندە لادەدەن بۆ پشوو ، هەموو خەویان لێ دەکەوێ ، یەکێکیان نەبێ کە زۆر لە خۆی دەکات و شەونوێژ دەکـات و دواتـر ئـەوانی تـر هەڵدەستێنـێ بـۆ تـەواو کردنـی سـەفەرەکەیان ، هـەروەها پیـاوێکیش کـە دراوسـێیەکی ئـازاری دەدات و ئـارام دەگرێـت تـا مـردن یـان گواستنەوە و دوورکەوتنەوە لەیەکیان جیا دەکاتەوە ..

❁ لە فەرموودەیەکی تریشدا کە ( ابن خزیمە ونسائی و ترمذی ریوایەتیان کردووە و لە الترغیب والترهیب دایە هاتووەکە ( سێ کۆمەڵ خـوا خۆشـی دەوێن و سێ کۆمـەڵیش خوای گەورە رقی لێیانە ، ئەوانەی کە خۆشی دەوێـن ، یەکـەم : کەسێك داوا لـە کۆمـەڵێك دەکات کە لەبەر خوا هاوکاری بکەن نەك لەبەر خزمایەتی ، ئـەوانیش هاوکاری ناکـەن و ، پیاوێك لەلاوە یارمەتی دەدات بە جۆرێك کە تەنها خوا دەزانێ و ئەو کەسەش کە یارمەتی یەکەی وەرگرتووە .(ئەو پیاوەی کە یارمەتیەکەی داوە بەنهێنی خۆشەویستی خوایە )..

دووەم :کۆمـەڵێك بەشەو سەفەر دەکـەن و کـاتێك دەیانـەوێ پشـوو بـدەن و خـەو زۆر خۆشەویسـترە لـە هـەموو شـتێکی تـر لـەلایان و هـەر ئـەوەندەی رادەکشـێن خـەویان لێ دەکـەوێ ! ئالـەم کاتـەدا کەسێك زۆر لـە خـۆی بکات و هەستێت قورئان بخوێنـێ و شـەو نوێژ بکات ، ئەم کەسە خوا خۆشی دەوێت .

سـێیەم : پیـاوێك خۆشەویسـتی خوایە کـە لەسـریەیەك دا بێـت و بشـکێن و ئـەم نەکشـێتەوە و رووبـەرووی دوژمـن بێتـەوە تـا یـان سـەردەکەوێ یـان دەکـوژرێ ( واتـە پیاوێکی نەبەرد و ئازایە ) ..

ئەوانەش کە خوا رقی لێیانەو خۆشی ناوێن، پیرێکی زیناکەرو ، هـەژارێکی لـەخۆبایی و ، دەوڵەمەندێکی ستەمکارە ..

نموونە زۆرن لەو کەسانەی کە گوێیان بەماندوو بوون نەداوە و هەستاون بەشەو نوێـژ و خواپەرستی و هـاوەڵانی سەفەریان شایەتیان بۆ داون ، لەوانـەش ( پێشـەوا بەننا )یە کە پاش سەفەری دوورو درێژ و ماندوویێتی زۆر هەرئەوەندەی هەستی کردبێ هـاوەڵانی خەوتوون هەستاوە و کەوتۆتە خواپەرستی و شەونوێژ و قورئان خوێنـدن و پاڕانـەوە و فرمێسك رشتن لە بەرخوا ..

هەروەها ( شێخ بن باز ) موفتی سعودیەش هـاوەڵانی ئـەم شایەتی‌یەی بۆ دەدەن کە زۆر خۆی بۆ خوا رەنجاندووە و لەسەر ماندوویەتی زۆرەوە شەونوێژی کردووە .

هەروەها کەسایەتی ناوداری فەرەنسی ( روجیە گاروودی ) ش هەمان شتی لە بارەوە باس دەکەن ، خوای گەورە پاداشتی ئەوان بداتەوە و ئێمەش سالح بکات بۆ خۆی !

**پیاو باشان لەبارەی خۆ دەرنەخستنەوە دەڵێن :**

١) پرسیار کرا لە ( احمد بن الخضـر ) : چ کارێك زۆر چاکە ؟ وتی : چاکترین کار ئەوەیە لە نهێنی و پەنهانی دا خۆت بپارێزی لە ئاوڕدانەوە بەلای غەیری خوادا !

٢ ) جونەیدی بەغدادی دەڵێت : ( ئیخلاس نهێنی یەکە لە نێوان خواو بەندەدا کە مەلائیکەت نایزانێ تا بینوسێ و شەیتان ناتوانێ تێکی بدات و هەواو ئارەزوو ناتوانێ لەرێلای بدات ) .

٣ ) حذیفەی کوڕی قتادە دەڵێت : ئەگەر لە نهێنیدا گوێ ڕایەڵی خوا بیت ، دڵت بۆ چاك دەکات ، بتەوێ و نەتەوێت !

٤ ) پیاوێك پرسیاری کرد لە ( ابی الحسن بن بشار ) : ڕێگای ڕۆیشتن بەرەو لای خوا چۆنە ؟ ئەویش وتی : ( هەروەك چۆن بەنهێنی گوناه دەکەیت ، ئاواش بەنهێنی گوێڕایەڵی خوا بکە ، تاوەکو دڵت بۆ چاکات و بەرەو خێر و چاکەی بەرێت ) .

٥ ) بیشر کوڕی حارثی حافی دەڵێت ( کارو کردەوەیەك مەکە لە پێناوی ئەوەدا کە ناوت ببرێ و باس بکرێیت ، چاکەکانت بشارەوە هەروەك چۆن خراپەکانت دەشاریتەوە )

٦ ) عەبدول قادری گەیلانی دەڵێت ( لە نهێنیدا چاك بە ، زمان پاراو دەبیت لە ئاشکرا دا ) ( ئیش بکەو ئیخلاصت هەبێ ، سەیری کارەکانت مەکە بەگشتی و بەزۆری مەزانە ، ئەوەی بۆ خوا نەبێ وەرناگیرێت ، ئای بۆ تۆ ، بۆ خەڵکی ئیش دەکەیت و دەتەوێت خوا وەری بگرێت .. ئەمە شێتی و نەفامی‌یە لە تۆوە !

ئەمەوێ ئیش بکەن بەبێ دەنگ ، ئەوەی عارفە و ئیش دەکات لەبەر خوا وەکو ( سندان ) وایە دەکێشن بەسەریاو بێ دەنگە ) .

٧ ) حەسەنی بەسری دەڵێت ( کەسانێکمان بینیوە ، چەند توانیبێتیان کارەکانیان بشارنەوە شاردوویانەتەوە ) .

٨ ) پیاوباشێك سوێند دەخوات و دەڵێت : ( ئەگەر بم توانیایە خێر و چاکە زیادەکانم کە ( تطـوع ) ن بشارمەوە لەو دوو مەلائیکەتەی کە لەگەڵمان ، دەمشاردنەوە لێیان لە ترسی ڕووپامایی ، هەرچەند دەزانم کە ناتوانم هیچیان لێ بشارمەوە ) .

٩ ) ( ئیبن وەهەب ) دەڵێ ( کەسم نەدیوە کارەکانی بەهێندەی ( حەیوە کوڕی شورەیح ) بشارێتەوە ، وە ئەو دوعای قبوڵ بوو ) .

## سەربازی ون

**یەکەم / لەبواری شەهادەت و جیهاددا :**

لە کاتێکدا موسڵمانان ئابلۆقەی قەڵایەکی ڕۆمیان دابوو ، گرتنی قەڵاکە زۆری خایاندو نارەحەت بوون ، سەرکردەکەیان ( مسلمە کوڕی عبدالملك ) ، داوای کرد کە یەکێك بچێت لە کونێکی تایبەتەوە دەرگاکە بکاتەوە ، ئەگەر مرد ئەوە شەهیدە و ئەگەر مایەوەش ئەوە موسڵمانان سەردەکەون و پاداشتی گەورەی دەبێت !

پیاوێك كە دەم و چاوی خۆی پێچابوو هاتە پێشەوە و وتی من دەچم! پاش ئەوەی كارەكەی بە چاكی ئەنجامدا و موسڵمانان سەركەوتن ، سێ ڕۆژ سەركردەكە بەدوایدا گەڕا نەیدۆزیەوە ، تاوەكو شەوێك پیاوەكە چوو بۆ خێمەكەی و وتی بەمەرجێك خۆم ئاشكرا دەكەم ، كە ناوم نەدەی بەخەلیفە و دیاریم نەدەیتێ و بەچاوێكی زیاتر لە برادەرانم سەیرم نەكەی .. ئەویش ڕازی بوو ، ئنجا خۆی پێناساندو ( مسلمە ) ش باوەشی پیاكرد و ماچی كرد .. پاش ئەوە بەردەوام دوعای دەكرد ( اللهم احشرني مع صاحب النقب ) ..بەڵێ .. تەنها بەم جۆرە سەربازانە كە تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوا كاردەكەن ئاینی خوا سەردەكەوێت !

**دووەم / لەبواری زانست دا :**

ئیمامی شافیعی دەفەرموێ : دانوستانم لەگەڵ هەركەسێك دا كردبێت حەزم كردووە حەق بەلای بەرامبەرەكەمەوە بێت ، چونكە من ئاسایی‌یە لەوی وەرگرم ، بەڵام ڕەنگە ئەگەر هەق بەلای منەوە بێت ئەو لێم وەرنەگرێ و، حەزدەكەم هەموو خەڵك سوود لە زانین و نوسینەكانم وەرگرن و ناوی من نەبەن ، بۆ ئەوەی سوپاسم نەكەن و لای خوا پاداشتی خۆم وەرگرم ..

**سێیەم /لە پەرستشەكاندا :**

قوتابی‌یەكی مامۆستا نورسی دەڵێ ( بەیانیان زوو دەچووم بۆ ژوورەكەی مامۆستا بۆ ئەوەی سۆپادارەكەی بۆ داگیرسێنم ، جارێكیان دوو سەعات پێش نوێژی بەیانی بە ئاگاهاتم و كاتم لێ تێك چوو ، ڕۆیشتم بۆ ژوورەكەی مامۆستا بینیم نقووم بووە لە دوعاو پاڕانەوە و موناجات دا لەسەر بەرماڵەكەی و تەنها مۆمێكی داگیرساندبوو ، نزیكەی سەعات ونیوێك وەستام بێ ئەوەی پێم بزانێ ، خەریك بوو ڕەق ببمەوە ، ئینجا مامۆستا هەستی پێ كردم و وتی : برام ئەمین ، هەڵەیەكی گەورەت كرد وا زووهاتووی ، بەخوا كاتی وا هەیە كەموناجات و پەرستش دەكەم ، نەئینس و نەجین ، تەنانەت مەلائیكەتیش حەزناكەم ئاگاداری بن ، تكایە ئەمە دووبارە مەكەرەوە و تانەبێتە بەرەبەیان مەیە ، منیش وتم: مامۆستا لێم ببورە من كەمتەرخەم بووم ، مانگەشەو سەری لێتێكدام، لەمەودوا پێش بەیانی نایەم. ( لاپەڕە / ٣٦ ی گۆڤاری الإيمان / ١٠ ) .

پیاوێك بە ( تمیم الداری ) وت : لەشەودا چەند نوێژ دەكەیت ؟ ئەویش پرسیارەكەی پێناخۆش بوو ، لەوەڵامی دا وتی : بەخوا یەك ركات نوێژ لەنیوە شەودا بكەم بە نهێنی پێم باشترە لەوەی كە هەموو شەو بێدار بم و شەو نوێژ بكەم و پاشان بۆ خەڵكی باس بكەم .

عەمری كوڕی قەیسی ( الملائی ) بیست ساڵ بەڕۆژوو بوو ، ماڵ و منداڵەكەی نەیاندەزانی ، ئەویش بەوەی كە لە ماڵ دەهاتە دەرەوە بەیانیان شتێكی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا بۆ خواردنی نیوەڕۆ دەیبەخشی بە هەژاران ، كە دەشگەڕایەوە بۆ ماڵەوە نانی ئێوارەی لەگەڵ دەخواردن و ڕۆژووەكەی دەشكاندو هەستیان پێ نەدەكرد ..

ئەمە بێجگە لەوەی کە پیاوباشان و ساڵحان دوعاکانیان دەشاردەوە و بە ئاشکرا دوعایان نەدەکردو حەزیان نەدەکرد کەس بزانێ کە دوعاکانیان گیرا بووە ، هەروەها ئەگەر دڵیان پڕببوایە لەگریان زۆریان لەخۆیان دەکرد کە فرمێسکەکانیان بشارنەوە و وایان لەخەڵکەکە دەگەیاند کە تووشی هەڵامەت بوون و سەرمایان بووە!

**چوارەم / لە بواری ئارامگرتن وشەکوا نەکردندا :**

دیارە مرۆڤ بەردەوام تووشی زەحمەت و نارەحەتی و بەڵاو موسیبەت دەبێت ، قورئان دەفەرموێت ﴿ يَاأَيُّهَا الْإِنسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَى رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَاقِيهِ ﴾ ( الأنشقاق : ٦ ) .
واتە : ئەی ئادەمیزاد بەراستی تۆ رەنجبەریت و زەحمەت دەکێشیت و سەرەنجامیش دەبێ بگەڕێیتەوە لای پەروەردگارت تا پاداشتی رەنج و هەوڵەکەت وەربگریت .

یان دەفەرموێت ﴿ يُرِيدُ اللَّهُ أَنْ يُخَفِّفَ عَنْكُمْ وَخُلِقَ الْإِنسَانُ ضَعِيفًا ﴾ (النساء : ٢٨ )
واتە : پەروەردگار دەیەوێت بەهۆی بەرنامەکەیەوە باری شانتان سووك بکات ، چونکە مرۆڤ بەلاوازی دروستکراوە و بەرگەی زەحمەت و ناخۆشی و سەرگەردانی ناگرێ .

ئنجا هەیە تووشی هەرچی دەبێت بەهۆی ئیمان و باوەڕەکەیەوە ئارام دەگرێ و تەنها لای پەروەردگار شەکوای حاڵی خۆی دەکات ، هەروەك حەزرەتی یعقوب کە یوسفی کوڕی لێ ون کرا و رووخاوی زۆریان دایە ، فەرموی : ﴿ قَالَ : إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنْ اللَّهِ مَا لا تَعْلَمُونَ ﴾ ( یوسف : ٨٦ ) .واتە : یەعقووب فەرمووی : بەراستی من سکاڵا و غەم و پەژارەم هەر بۆلای خوا دەبەم و ئەوەی من دەیزانم لەلایەن خواوە لەنەخشە و حیکمەتەکانی لە پێشهات و رووداوەکاندا ئێوە نایزانن ..

لە پیاوباشانیش دا هەبووە کە سکاڵای حاڵیان بۆ کەس نەبردووە ، ئەوە ( ابوبکری کوڕی عیاش ) ە کە بیست ساڵ چاوێکی کوێر بوو بوو ماڵو منالەکەی نەیان دەزانی و سکاڵای حاڵی خۆی لا نەدەکردن . . .

**پێنجەم / لەبواریخێر کردندا :**

عەلی کوڕی حسێن بەشەو نانی دەبرد و دەیدا بە ماڵە هەژارەکان و دەیووت خێر و چاکەی نهێنی تووڕەبوونی پەروەردگار ناهێڵێ ..جا زۆر کەس لەخەڵکی مەدینە هاوکاری دەکران و نەیاندەزانی کێ دەیکات ، تاوەکو عەلی کوڕی حسێن کۆچی دوایی کرد ، ئینجا کە هاوکارییەکەیان نەما زانیان کەلەو زاتەوە بووە ..

جا کاتێ کە ناوبراو کۆچی دوایی کرد ئەو فەردانەی کە ئەیدا بەکۆڵیاو شەو بۆ ماڵی هەژارانی دەبرد شوێنەواریان لەسەر پشتی بەجیهێشتبوو ، کە شتیان شوێنەوارەکەیان بینی ، دەڵێن نزیکەی سەد ماڵی ( ئەهلی البیت ) ی هەژاری دەژیان ..

ئینجا دوعای دەکردو دەیوت : (خوایە پەنا دەگرم بەتۆ کە لە بەرچاوی خەڵك باش بم و لە پەنهانیشدا و دوور لەچاوی خەڵکی خراپ بم ) ..

**چەند نموونەیەك لە ژیانی خواناسان :**

**یەکـەم : ئوەیسـی قـەرەنی** :یەکێکە لـەو خواناسـە نەناسـراوانەی کـە حـەزرەت ﷺ لەبارەیەوە بە عومەری کوڕی خطاب ی فەرموو ( يأتي عليكم أويس بن عامر مع أمداد أهل اليمن ، من مراد ثم من قرن ، كان به برص فبرأ منه إلا موضع درهم ، و له والدة بها بارٌ ، لو أقسم على الله عزوجل لأبره ، فإن أستطعت أن يستغفر لك فافعل ) مسلم ..

ئوەیس خەڵکی یەمەن بوو لەبەر خزمەتی دایکی نەیتوانی بێتە مەدینە و پلەی بەرزی ( هاوەڵێتی ) پێغەمبەری ﷺ دەستکەوێت .. بۆیە بە ( تابعين ) دادەنرێ .. حەزرەت ﷺ دیارە خوای گەورە بە سرووش ئاگاداری کردووە کە پیاوێکی وا خواناس هەیە ، ئەویش حەزرەتی عومەری ئاگادار کرد کە ئەگەر هەرکاتێ چاوی پێ کەوت داوای دوعای خێری لێ بکات ..( ئـەوەی لـە ژیاننامـەی ( ئوەیـس ) ەوە دەردەکـەوێ ، بەنـهێنی کـارکردنی و خزمەتکردنی دایکی بوو کە گەیاندبوویە ئەو پلەبەرزە ، کە دوعای لای خوا قبووڵ بێت و حەزرەت ﷺ ئاوا باسی بکات بۆ هاوەڵان ) .

پاش چەند ساڵێك حەزرەتی عومەر لەکاتی حەج دا دۆزیەوە و داوای دوعای خێری لێکرد .ئینجا ئوەیس ویستی بچێ بۆ ( کوفە ) ، چونکە لە یەمەن ناسراو ئەویش حەزی بەوە نەئەکرد ، عومەر حەزی کرد کە نامەیەکی بداتێ بۆ کاربەدەستی کوفە ، ئەویش نەیویست بۆ ئەوەی وەکو کەسێکی نادیار و نەناسراو بژی ، جا هەر ساڵێك خەڵك لە کوفەوە بهاتنایە بۆ حەج ، حەزرەتی عومەر ئەحواڵی دەپرسی ، کەلەوێش ناسرا ، ئەوێشی بەجێهێشت بۆ شوێنێك کەکەس نەیناسێ ! ( ئەمە لە کوێ و ئێمەومانان لەکوێ کە حەز دەکەین ئەگەر بکرایە بەبڵندگۆ جارمان بۆبدەن ودەست بگرن بە سنگەوە بۆمان !)

**دووەم : عبداالله ی کوڕی موبارەك :**

ئیمام ئەحمەد دەڵێت (( خوای گەورە ( ابن مبارك ) ی پایەبەرز کردووە بەشتێکی شاراوەی کەخەڵکی نایبینن )) .

قاسم کوڕی محمد دەڵێت (( ئێمە سەفەرمان کرد لەگەڵ ( ابن مبارك ) داو زۆر جار بەدڵما دەهات و دەموت : باشە ئەم پیاوە بەچی ئاوا ناوبانگی پەیدا کردووە و پایەبەرزە ؟ ئەگەر نوێژ دەکات ئێمەش نوێژ دەکەین ، خۆ ئەگەر بەرۆژوو دەبێت ئێمەش بەرۆژوو دەبین ، ئەگەر غەزاش دەکات ئێمەش ئەوەتا غەزا دەکەین ، ئەگەر حەج دەکات ئەوا ئێمەش حەج دەکەین ..

تا شەوێك لە ڕێی شام لەماڵێکدا نانی ئێوارەمان دەخوارد ، چرای ماڵەکە کوژایەوە ، پاش ئەوەی هەستان چاکیان کرد ، سەیرم کرد چاوی ( ابن مبارك ) و ریشی تەڕبوون لە فرمێسك دا ، ئینجا تێگەیشتم کە ئەو پیاوە چەند لەخوا و لە ڕۆژی دوایی دەترسیّو ، هەربەداهاتنی ئەو تاریکیە یادی قیامەت فرمێسکی لە چاوەکانی هێنایە خوارێ )) ..

**سێیەم / ئەیوب السختیانی :**

ئـەیوب زۆربـەی شـەو شـەونوێژی دەکـرد و مـاڵ و منـاڵی هەراسـان نـەدەکرد و نەیدەهێشت پێی بزانن ، کە بانگی بەیانیش دەدرا دەنگی بەرز دەکردەوە هەروەك تازە

له خەو هەستابێت . ئنجا له ئامۆژگاری‌یەکی‌دا دەڵێ : با پیاو له خوا بترسێ ، ئەگەر زاهید بوو با زوهدەکەی عەزاب نەبێ لەسەر خەڵك ، وەئەگەر کەسێك زوهدو تەقواکەی بشارێتەوە چاکترە لەوەی ئاشکرای بکات . هەروەها دەیووت : هەرگیز بەندەیەك راست ناکا لەگەڵ خوادا ، ئەگەر حەزی له ناوو شۆرەت کرد .

زۆر جار کە لە مەجلیسێکدا گریانی دەهات دەیشاردەوە و زۆری لە خۆی دەکرد کە هەستی پێ نەکرێ و دەیووت : ( سەرمام بووە و تووشی هەڵامەت بووم ! )

**چوارەم / ئەبومسلم ی خەولانی** :لە زەمانی ( معاويه ) دا بێ‌بارانی رووی کردە موسڵمانان، خۆی دەرچوو لەگەڵ خەڵکی‌دا بۆ نوێژە بارانە ، لەکاتی وەستانیاندا داوای لە ئەبو موسلم کرد کە بێتە پێشەوە و دوعا بکات .. ئەویش وتی : هەر چەند کەم و کورتیشم هەیە لە هەقی خوادا بەڵام قەیناکا دوعا دەکەم ..ئنجا هاتە پێشەوە و لە دوعاکەیدا وتی : خوایە داوای باران لە تۆ دەکەین ، وا من بە کوڵێ گوناهەوە هاتووم دەست مەنێ بە روومەوە .. بە فەزڵی خوا هەر لەوێدا باران باری ئنجا ئەبومسلم وتی : خوایە معاويه منی بۆ خەڵك ئاشکرا کرد ، ئەگەر خێرم هەیە لەلات گیانم بکێشە ، ئەو رۆژە پێنج شەممە بوو ، بۆ پێنج شەممەی داهاتوو کۆچی دوایی کرد ..

## کردەوەی ئەبوبەکر و پرسیاری حەزرەت ﷺ!

پێغەمبەر ﷺ پرسیاری له هاوەڵان کرد : کێ ئەمڕۆ بەرۆژوو بووە ؟ ئەبوبەکر فەرمووی : من ! ئنجا فەرمووی : کێ دوای جەنازە کەوتووە ؟ ئەبوبەکر فەرمووی : من ! ئنجا فەرمووی : کێ ئەمڕۆ نانی داوە بە هەژارێك ؟ ئەبوبەکر فەرمووی : من ، پاشان فەرمووی : کێ ئەمڕۆ سەردانی نەخۆشێکی کردووە ؟ ئەبوبەکر فەرمووی : من ، حەزرەت ﷺ فەرمووی : ( ئەم شتانە لای هەر کەس کۆ ببێتەوە دەچێتە بەهەشتەوە ) . مسلم .

کەواتە باسکردنی کردەوەی چاکە و ئاشکراکردنی کە بۆ مەبەستی پەروەردە کردن و هاندانی کەسانی تر بێت و بۆ خۆدەرخستن و چاوە چاوی خەڵك نەبێت قەیناکات و خێرو پاداشتی کەم نابێتەوە .

## کێشەمان لە چی‌دایە ؟!

راستە ئێمە شایەتمانمان هێناوە و موسڵمان بووین ، بەڵام ئاخۆ بڕواداری تەواوین ؟ چەندە کارو کردەوە و رەوشتمان چاك بێ ، دیارە ئەوەندە ئیمان و بڕوامان کاری تێکردووین .. پێغەمبەر ﷺ لە بارەی بڕوادار و ئیمانەکەیەوە دەفەرموێت : ( مثـل المـؤمن ومثل الايمان كمثل فرس في آخيته ، يجول ثم يرجع إلى آخيته ،وان المؤمن يسهو ثم يرجع الى الايمـان ،فاطعموا طعامكم الاتقياء واولوا معروفكم المـؤمنين )ئیمـام احمـد واتە : نموونەی بڕوادار و ئیمانەکەی وەك ئەسپێك وایە کە بە گوریسێك بە مێخێکەوە بەسترابێتەوە ، دێت و دەچێت و لەو سنوورە دەرناچێت کە بۆی دیاری کراوە ..بڕوادار سەهو دەکات وپاشان دەگەڕێتەوە لای ئیمان،خواردنتان بدەن بە پارێزکاران ولەگەڵ بڕواداراندا چاکە بکەن .

ئیمان داریی لاف و گەزاف نیە و قسەی زل نیە ، بەڵکو ( الإیمان ما وقر في القلب وصدقه العمل ) . ئیمان ئەوەیە کە لە دڵا دەچەسپێ و کردەوەش راستیەکەی دەسەلمێنێ ..

خوای گەورە سەرزەنشتی جوولەکەکانی کرد و فەرمووی : ﴿وإذا قيل لهم آمنوا بما أنزل الله قالوا نؤمن بما أُنزل علينا ويكفرون بما وراءه وهو الحق مصدقاً لما معهم ، قل فلم تقتلون أنبياء الله من قبل إن كنتم مؤمنين﴾ ( البقرة : ٩١ ) .

واتە : کاتێك پێیان دەوترێت باوەڕ بهێنن بەوەی کە لە لایەن خواوە رەوانە کراوە ، دەڵێن : ئێمە تەنها باوەڕمان بەوە هەیە کە بۆ ئێمە رەوانە کراوە و باوەڕ ناهێنین بە هەموو ئەوانەی کە دوای تەورات هاتووە ، لە کاتێکدا کە هەر ئەو قورئانە حەق و راستیە و بەراست دانەری ( تەورات ) ی ئەوانیشە ، پێیان بڵێ : ئەی کەواتە بۆچی پێشتر پێغەمبەرەکانی خواتان دەکوشت ئەگەر ئێوە ئیماندارن ؟

ئنجا دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ جَاءَكُمْ مُوسَى بِالْبَيِّنَاتِ ثُمَّ اتَّخَذْتُمْ الْعِجْلَ مِنْ بَعْدِهِ وَأَنْتُمْ ظَالِمُونَ ﴾ ( البقرة : ٩٢ ) . واتە : سوێند بەخوا بە راستی موسا نیشانەی فرە و موعجیزەی زۆری بۆ هێنان ، کەچی کاتێ کە چوو بۆ کێوی طور ، ئێوە گوێرەکەتان پەرست ، بە راستی ئێوە ستەمکارن ، پاشان دەفەرموێ : ﴿ وإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمْ الطُّورَ خُذُوا مَا آتَيْنَاكُمْ بِقُوَّةٍ وَاسْمَعُوا قَالُوا سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَأُشْرِبُوا فِي قُلُوبِهِمْ الْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُمْ بِهِ إِيمَانُكُمْ إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ ﴾ ( البقرة : ٩٣ ) . واتە : یادیان بێنەرەوە ئەو سەردەمەی کە پەیمانمان لێ وەرگرتن و کێوی طورمان بەسەردا بەرز کردنەوە و فەرمانمان پێدان : ئەوەی پێمان بەخشیون لە تەورات بە توندی بیگرن و لێی لا مەدەن و گوێ بیستی بن، بە دەم وتیان : گوێڕایەڵین ، بەڵام بە کردەوە یاخی بوون و گوێرەکە پەرستی چووبووە دڵیانەوە بە هۆی بێباوەڕیانەوە ، پێیان بڵێ : ئیمانەکەتان شتی ناڕەواتان پێ دەکات ئەگەر ئێوە ئیماندارن !

جا بە راستی زۆر کەس ئەم راستیەی بەسەردا دەچەسپێ کە پێی بوترێ : ئیمانداری چۆن وا دەبێت ، ئەگەر ئیمانداری ؟ !

عەرەبە دەشتەکیەکان بە رووکەش موسڵمان بوو بوون و لاف و گەزافی ئیمانداریان لێ ئەدا قورئان پێی فەرموون : ﴿ قَالَتْ الأَعْرَابُ آمَنَّا قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلْ الإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ وَإِنْ تُطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ لاَ يَلِتْكُمْ مِنْ أَعْمَالِكُمْ شَيْئًا إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ ( الحجرات : ١٤ ) . واتە : هەندێك لە بیابان نشینە عەرەبەکان وتیان : باوەڕمان هێناوە و موسڵمانین ، پێیان بڵێ : نەخێر باوەڕتان نەهێناوە ، بەڵام بڵێن : بە ناچاری بە رووکەش موسڵمان بووین ، هێشتا باوەڕ نەچۆتە ناو دڵتانەوە ، خۆ ئەگەر بە راستی گوێڕایەڵی فەرمانی خوا و پێغەمبەر بن ، ئەوە خوای گەورە لە پاداشتی چاکەکانتان هیچ کەم ناکاتەوە ، چونکە بە راستی خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە .

جارێك بە حەزرەتیان ﷺ وت : ژنێك بە رۆژ بە رۆژووە و بە شەویش شەونوێژ دەکات ، بەڵام ئازاری دراوسێکانی دەدات ، ئەویش فەرمووی : دەچێتە دۆزەخەوە .

واتە ئەوە ئیمانداری تەواو نیە ، ئەگینا چۆن نوێژ و ڕۆژووەکەی لە خراپەکردن و ئازاردانی خەڵکی نایگێڕنەوە ، ئاشکرایە خوای گەورە ڕازی نابێت کەس ئازاری بەندەکانی بدات بە ناهەق ، نەك هەر ئادەمیزاد بەڵکو ڕەوا نیە ئازاری گیان لەبەرانیش بدرێت .

**تازەکردنەوەی ئیمان :**

وەك باسمان کرد پێویستە زوو زوو بە خۆماندا بچینەوە و ئیمانمان تازە بکەینەوە هەروەك لە فەرموودەدا هاتووە : ( إن الإيمان لَيَخلَقُ في جوف أحدكم كما يَخلَقُ الثوب ، فاسألوا الله أن يُجَدِّدَ الإيمان في قلوبكم ) رواه الحاكم بإسناد حسن .

واتە : ئیمان کۆن دەبێ و دەڕزێ لە ناو دڵدا وەك چۆن جل و بەرگ کۆن دەبێ و دەڕزێ ، داوا بکەن لە خوا کە ئیمان نوێ بکاتەوە لە دڵتاندا..

هەروەك چۆن مرۆڤ پێویستی بە ئاوێنەیە کە ڕووی خۆی تیا ببینێ و خۆی ڕێك بخات ، بە هەمان شێوەش پێویستی بە هاوەڵ و پێشەوای خواناسە تا لێیانەوە فێری دینداری ڕاست بێت و ڕەوشت و خووی چاك کات.

هاوەڵانی حەزرەت ﷺ ، جاروبار دەستی یەکتریان دەگرت و بە یەکیان دەوت : ( تعال نؤمن ساعة ) وەرە با ئیمانمان تازە بکەینەوە، ئیتر پێکەوە کەش و هەوایەکی ئیمانی و یادی خوایان بۆ خۆیان دروست دەکرد تا زیاتر دڵ و دەروونیان پاك ببێتەوە و زیاتر لە خوای گەورە نزیك ببنەوە ..

**دوو فەرموودەی قودسی**

**یەکەم** : خوای پەروەردگار لە فەرموودەی قودسیدا دەفەرموێت ( إني والإنس والجن في نبإ عظيم ، أخلق ويُعبَدُ غيري ، أرزق ويُشكَرُ سواي ، خيري إلى العباد نازل وشـرهم إلي صاعد ،أتودد إليهم بالنعم وأنا الغني عنهم ، ويَتَبَغَّضون إليَّ بالمعاصي وهم أفقر ما يكونون إلي ، أهل ذكري أهل مجالستي من أراد أن يجالسني فليذكرني ، أهل طاعتي أهل محبتي ، أهل معصيتي لا أُقنطُهم من رحمتي ، إن تابوا إلي فأنا حبيبهم ، وإن أبوا فأنا طبيبهم ، أبتليهم بالمصائب لأُطَهِّرَهم مِن المعايبَ ، من أتاني منهم تائباً تَلَقَّيتُهُ من بعيد ، ومن أعرض عني ناديتُهُ من قريب ، أقول له أين تذهب ؟ ألك رب سواي ، الحسنة عندي بعشر أمثالها وأزيد ، والسيئة عندي بمثلها وأعفو ، وعزتي وجلالي لو استغفروني منها لغفرها لهم ) . ( الأخلاق ـــــ عمرو خالد ) .

واتە / من و ئینس و جن لە دەنگ و باس و مەسەلەیەکی گەورەداین ، من دروستیان دەکەم و غەیری من دەپەرستریَ ، ڕزق دەدەم و سوپاسی غەیری من دەکریَ ، خێرم بۆ بەندەکان دادەبەزیَ و شەڕیان بۆ لای من سەر دەکەوێت ، خۆمیان لا خۆشەویست دەکەم ( لە کاتێکدا من هیچ پێویستیم بەوان نیە ) بەوەی کە نیعمەتیان دەدەمێ .. ئەوانیش بە گوناهو سەرپێچی خۆیان لای من ڕەش دەکەن ، لە کاتێکدا زۆر ئاتاجیان بە منە و هەژارن ، ئەهلی یادی من لەگەڵ مندان ، کێ دەیەوێ لەگەڵ من بێت با یادی من بکات ، ئەوانەی گوێڕایەڵیم دەکەن ئەهلی خۆشەویستی منن ، ئەهلی گوناهیش لە ڕەحمەتی خۆم

بۆهیوایان ناکەم ، ئەگەر پەشیمان بوونەوە ، من خۆشەویستیانم و، ئەگەر نەیانکرد من پزیشکیانم ، بە بەلاّ و موصیبەت تاقیيان دەکەمەوە تا لە کەم و کوڕی پاکیان بکەمەوە ، کامیان تەوبە بکات لە دوورەوە دەیهێنم و کاری بۆ ئاسان دەکەم و دەست ئەدەمە باڵی ، کامیان روو وەرگێڕێ لە نزیکەوە بانگی دەکەم و پێی دەڵێم : بۆ کوێ دەچی ؟ بێجگە لە من پەروەردگارێکی ترت هەیە ؟ چاکە لای من بە دە قات پاداشتی دەدەمەوە و زیاتریشی دەکەم ، خراپەش لە لای من بە هێندەی خۆی تۆڵەی دەسێنم و رەنگە چاویشی لێ بپۆشم ، بە عیززەت و جەلالی خۆم ئەگەر داوای لێخۆش بوونم لێ بکەن ، لێیان خۆش دەبم .

**دووهەم** :(ما من يوم تَطلُعُ شمسُهُ إلاّ وتنادي السماء تقول : يا رب ائذن لي أن أُسقِطَ كِسَفاً على ابن آدم ، فقد طعم خيرك ومنع شكرك ، وتقول البحار : يا رب ائذن لي أن أُغرِقَ ابن آدم فقد طَعِمَ خيرك ومنع شُكرُك ، وتقول الجبال : يا رب ائذن لي أن أُطْبِقَ على ابن آدم فقد طعم خيرك ومنع شكرك . فيقول الله تعالى : دعوهم دعوهم لو خلقتموهم لرحمتموهم . إنهم عبادي ، فإن تابوا إلي فأنا حبيبهم وإن لم يتوبوا فأنا طبيبهم ) ئیمام ئەحمەد / تفسير الشعراوي : ص٦٦ مج ١

واتە / هەر رۆژێك کە خۆر هەڵدێ ئاسمان دەڵێ : پەروەردگار رێم بدە کە پارچەیەکم بدەم بەسەر ئادەمیزادا ، خێری تۆ دەخوا و سوپاسی تۆ ناکات ، دەریاکان دەڵێن : پەروەردگار رێم بدە ئادەمیزاد نوقم بکەم ، خێری تۆ دەخوا و سوپاست ناکات . شاخەکانیش دەڵێن : پەروەردگار رێم بدە زەوی لێ بهێنمەوە یەك ، خێری تۆ دەخوا و سوپاسی تۆ ناکات . پەروەردگاریش دەفەرموێت : وازیان لێ بهێنن ، وازیان لێ بهێنن ، ئەگەر ئێوە دروستتان بکردنایە رەحمتان پێ دەکردن ، ئەوان بەندەی منن ، ئەگەر پەشیمان بوونەوە بۆ لام ، من خۆشەویستیانم ، وەئەگەر تەوبەیان نەکرد من پزیشکیانم .

بە راستی زمان لاڵە ومرۆڤ شەرمەزارە لە رەحمی زۆری خوا ، خوایەك کە هیچ شتێك وەکو ئەو نیە ( ليس كمثله شيء وهو السميع العليم ) و ، دەسەلاّت و توانای بێ سنوورە و ، دەوڵەمەندە و ئاتاجی بەکەس نیە ، کەچی لە گەورەیی و سۆز و میهرەبانی خۆیەوە دەفەرموێ : بەنی ئادەم ئەگەر تۆ بستێك بێی بەلای مندا من دوو بست دێم بۆ لای تۆ ، ئەگەر باڵێك بێیت ، من دوو باڵ دێم ، ئەگەر بە پێ بێی بۆ لام من بە راکردن دێم بۆ لات !

پیاوچاکێك دەڵێ : ( سەیر لەوەدا نیە بەندەیەك خۆی خۆشەویست بکات لای گەورەکەی ، بەڵکو سەیر لەوەدایە کە گەورە و ( سەید ) ێك خۆی لای بەندەکەی خۆشەویست بکات ) .

## نامە و ئاگاداریيەکانی پەروەردگار

خوای پەروەردگار هەر لەبەرە بەیانی مرۆڤایەتیيەوە بەر دەوام پێغەمبەرانی ناردووە و هیچ گەلێك نەبووە کە ئاگاداری نەکردبێتەوە و ، لەرێی پێغەمبەرانەوە پەیامی خوایی پێ رانەگەیەنرابێ .ئەمە بێجگە لەوەی کە ئاسمان و زەوی و دروستکراوەکانی خواش پەراوێکن لەبەر چاو و ، ئەوی بەویژدانەوە و بێ دەمارگیری بیری لێ بکاتەوە لە قودرەت و دەسەلاّتی پەروەردگار تێدەگات ..

هەروەها پەروەردگار لەڕێی بەڵاو موسیبەت و مردنی دۆست و خۆشەویستەوە بەندەکانی هۆشیار دەکاتەوە ، تا بیر لە کۆچی یەکجاری‌یان بکەنەوە کە هەموو مرۆڤایەتی بەدەوڵەمەندو هەژارەوە و بەدەسەڵاتدار و بێ دەسەڵاتەوە لەبەرامبەریدا دەستەوسانن ، هەر ئەوەندەی بای ئەجەل هات رایان دەفڕێنێ و بۆ تاقە هەناسەیەکیش مۆڵەتیان نادات !

قۆناغەکانی ژیان و منداڵی‌و لاوی و پیریش نامەی ئاگادار کردنەوەن ، بەتایبەتی سەرو ریش سپی بوون کە خورپە بەدڵ دەخا و سەرلووت دەتەزێنێ !

جاری واش هەیە نامەکان خەوێکی راستن کە ئەو کەسە خۆی دەیبینێت یان کەسێکی دیکە پێوەی دەبینێت ، کە ئەوەش بوار بۆ رەخساندنە و دەست گرتنە سا بەڵکو بەخۆی‌دا بچێتەوەو بێتە سەرڕێ ..

هەموو ئەو ئاگادارکردنەوانە لە واقیعی‌ژیاندا نموونەیان زۆرە و بۆبەرچاوروونی ئەمە چەند نموونەیەك لە کۆن و نوێدا :

**یەکەم : مالیکی کوڕی دینار** ، یەکێکە لەگەورە شوێنکەوتوان و باسی ژیانی خۆی دەکات و دەڵێت : مـن زۆر دوور بووم لەخواو بەردەوام خەریکی خراپەکاری و مەی خواردنەوە بووم و ماڵی خەڵکم دەخوارد ، تا رۆژێك پیاوێکم دی شیرینی دەکڕی و بە کابرای وت : تۆزێ زیادم بەرێ تا دڵی کچەکانمی پێخۆش بکەم ، چونکە پێغەمبەر ﷺ مژدەی بەهەشتی داوە بەوانەی کە دڵی کچەکانیان خۆش دەکەن .. ئەمە دایچڵەکاندم و پێغەمبەرم خۆش ویست و حەزم کرد منیش ژن بهێنم و منداڵم ببێت ، بەڵام کێ بەم حاڵەوە ژن دەدات بە من، بۆیە تۆزێ خۆم چاکرد ، بەڵی .. ژنم هێناو کچێکمان بوو ناوم نا ( فاطمە ) هەتا گەورەتر دەبوو زیاتر خۆشمان دەویست و منیش باشتر دەبووم ، تا رۆژێك کەدەمخواردەوە هات بەلامدا و پێکەکەی رژاندم ، زانیم ئەوە ئاگادار کردنەوەیەکە بۆم لە خواوە و بڕیارمدا وازی لێ بهێنم ..

بەڵام داخەکەم کچەکەم مرد ، منیش ئەوەندە کاری تێکردم زۆر خراپ سەرم کردەوە خواردنەوە ، شەوێك بڕیارم دا کە ئەمشەو زیاتر لە جاران خۆم مەست بکەم و ، ئەوەندەم خواردەوە بێ هۆش تەخت لێی کەوتم .. لە نیوەشەودا خەوێکم بینی کە ژیانی گۆڕیم .. لەخەوم دا رۆژی قیامەت بوو ، هەموو خەڵکی راگیرابوون و هەریەکەو بەجۆرێك لە عەرەقی خۆی‌دا نقووم بوو بوو .. لەوکاتەدا یەك یەك بانگدەکران و دەوترا فلان ( هَلُمَّ للعرض على الجبار ) وەرە بۆ بەربارەگای خوای جەببار .. تا نۆرەی من هات و بانگم لێ کرا :ئەی مالیك وەرە بۆ بەر بارەگای خوای جەببار .. ترسم لێ نیشت ، من لەم شوێنەدا بەتاقی تەنها چی فریام دەکەوێت ، هەر لەم کاتەدا بوو کە مارێکی گەورەم بۆ هات ، هەتا توانیم رام کردو ، گەیشتم بە پیاوێکی پیری لاواز ، داوام لێ کرد فریام کەوێ ، وتی : من پیرو لاوازم و هیچم پێ ناکرێ بۆت .. ناچار رامکرد تا گەیشتمە لای گردێك کە منداڵی جوانکیلە لەسەری وەستابوون، منیان ناسیەوە و بانگی کچەکەمیان کردو وتیان : فاطمە وەرە فریای باوکت بکەوە .. ئەویش هات و مارەکەی لێ دوور خستمەوە و وتی :بابە

﴿ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ وَلا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴾ ( الحديد : ١٦ ) .

واته ئايا ئيتر كاتى ئەوە نەهاتووە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ، دڵەکانیان بۆ یادی خواو ئەو بەرنامەیەی کە ڕەوانە کراوە مل کەچ بکات و ، وەك ئەو کەسانە نەبن کە پەڕاوی ئاسمانیان بۆ ڕەوانە کراو دوای ماوەیەکی زۆر دڵیان ڕەق بوو ، زۆر بەشیان یاخی و سەرکەش دەرچوون . پرسیارم لێ کرد کە ئەو مارە گەورەیە چییە ؟ وتی ئەوە کارە خراپەکانتە بەدواتەوە ، وتم ئەی ئەو پیاوە پیرە لاوازە ، وتی : ئەوەش کارە چاکەکانتە کەزۆر کەمن و لاوازن .. ئیتر لە خەو راپەڕیم و بەدەم خەوەوە وتم : ( قد آن یارب ، قد آن یارب ) واتە : بەراستی خوایە کاتی ئەوە هاتووە کە بگەڕێمەوە . . .

خۆم شت و چووم بۆ مزگەوت و فریای نوێژی بەیانی کەوتم و ئیمامەکەش بەقەدەری خوا ئەو ئایەتەی خوێندەوە ( الم يأن للذين آمنوا أن تخشع قلوبهم لذكر الله وما نزل من الحق )

**دووەم : عەمری کوڕی عاص :**

عەمری کوڕی عاص کە بە زۆرزانی عەرەب بەناوبانگ بوو ، دژایەتییەکی زۆری ئیسلامی کرد و لە سەرەتاوە کە موسڵمانان هیجرەتیان کرد بۆ حەبەشە ، ئەم وەکو نوێنەری قورەیش چووە لای نەجاشی و دیاری زۆری بۆ برد تا موسڵمانانی بداتەوە دەست و دەریان بکات .. بەڵام نەجاشی بە قسەی نەکرد و ئیمانیشی هێنا ..

پاش چەند ساڵ کە ئیسلام ڕۆژ بە ڕۆژ سەرکەوتنی زیاتری بە دەست دەهێنا و ڕێکەوتنی حودەیبیە هاتە کایەوە ، عەمر نەیدەزانی چی بکات ! بیری کردەوە بچێ بۆ شام و ببێ بە گاور ، بەڵام چۆن دەبێ واز لە ئایینی باوو باپیری بهێنێ ، ئەگەر ئەکرا ئایینی خۆی بگۆڕێ ، ئەی باشە بۆ ئەم هەمووە جەنگا دژی موسڵمانان ؟ بۆیە وازی لەو خەیاڵە هێنا و بڕیاری دا بچێ بۆ حەبەشە بۆ لای نەجاشی ، بەڵێ .. چوو بۆ لای نەجاشی و دیاری باشی بۆ برد و داوای کرد موسڵمانان بداتەوە دەستی و ئەمیش تۆڵەی خزم و کەسی خۆی بکاتەوە لێیان . نەجاشی تووڕە بوو ، وە ( لا إرادي ) دەستی بەرز کردەوە ودای بە دەم ولووتی داو پڕی کرد لە خوێن و جلەکانی عەمر خوێناوی بوون .. ئنجا وتی : چۆن داوای شتی وام لێ دەکەی ؟ ئەو ( محمد ) ە پێغەمبەری خوایە .. ئەم دیمەنە لای نەجاشی زۆر ناخۆش بوو ، خێرا فەرمانی دا جل و بەرگی تریان بۆ هێنا و خۆی گۆڕی و ، ئەم ڕووداوە زۆر کاری کردە سەر عەمر و بوو بە کلیلی هیدایەتی و دای چڵەکاند و لە دڵی خۆیدا وتی : باشە ئەوەتا عەرەب و عەجەم بڕوای بە ( محمد ) هێناوە ، ئیتر بۆ من ئیمانی پێ نەهێنم ؟ ئنجا بە نەجاشی وت : بۆ تۆ ئیمانت پێیەتی ؟ وتی : بەڵێ ، وتی : باشە بەیعەتم لەگەڵ دەکەی لەسەر ئیسلام ؟ وتی : دەستت بێنە با بەیعەتت لەگەڵ بکەم لەسەر ئیسلام .. بەیعەتیان دا بە یەك و پاشان عەمر گەڕایەوە بەرەو مەدینە و چووە خزمەت حەزرەت ﷺ و بەیعەتی دا بەویش ، ئنجا پاشماوەی ژیانی کەوتە جیهاد بۆ سەرخستنی ئیسلام و فەتحی میسری کرد .. ( التربية الجماعية / جلد ١ / منير الغضبان ) .

**سێیەم / سوڵتانێکی وڵاتی ( تشاد ) .**

( علی رمضان ناجیلي ) سوڵتانی ناوچەی ( قندی )ە لە تشادو ، گاورێکی توندڕە و بوو ، زۆر رقی لە موسڵمانان بوو ، بە جۆرێك کە حەزی دەکرد ئەگەر بەدەستی بێت موسڵمانان بسوتێنێت !.

لە ساڵی ١٩٧٧ دا لەسەر دەستی بانگخوازێکی نەیجیریا دا موسڵمان بوو ، لە بارەی ئەم گۆڕانە مەزنەیەوە دەڵێت : پێشتر موسڵمانانێك دەهاتنە ناوچەکە بەناوی رێبازی سۆفیەتەوە ، رێنمایی خەڵکیان دەکرد بەمەرجێ کە دیاری و جل و بەرگ و مەڕوماڵاتیان بدرێتێ ، ئەم رەفتارەش وای کرد کە زۆر لە خەڵکی لە دین دوور بکەونەوە ، چونکە ئەو کارە ( إستغلال ) کردنی خەڵکی بوو ..( دیارە ئەمەش دوورە لە رێبازی سۆفیەتی راستەقینە ) .

پاشان بانگخوازێکی نەیجیری هاتە ناوچەکەمان ، هیچی نەدەویست و حەزرەتی کردبووە سەرمەشقی خۆی کە کافران پێیان دەوت دەتکەینە پاشاو گەورەی خۆمان و هەرچیت دەوێ ئەتدەینێ ! ئەویش قایل نەبوو ، سووربوو لەسەر بانگەوازکردن بۆ ( لاإله إلا الله محمد رسول الله ) .. تاوەکو بانگەوازەکەی سەرکەوت و خێر و بەرەکەتی بەدنیادا بڵاوبۆوە ..

بەڵێ .. پاش چەند مانگێك ئەو بانگخوازە توانی قەناعەتمان پێ بکات و موسڵمان بووین .. پاش ئەوەی من موسڵمان بووم لەگەڵ سوڵتانی باوکم دا ( ماهیم توکی قندی ) ، جەنابی باوکم پێی وتم : لەمڕۆوە دەبیتە پاشای ئیسلام و دەبیتە هاوەڵ و خزمەتکاری ئەم بانگخوازە کە فێری ئیسلامی کردین .. ئینجا بە مامۆستای وت : کوڕەکەی خۆمم بەخشی بەتۆ بۆ خزمەتی ئیسلام ..

منیش لەگەڵی رۆیشتم و شەش ساڵ ماینەوە بەیەکەوە ، فێری زۆرێك لە زانستی ئیسلامی کردم لە نەیجیریا و بوومە بانگخواز .. پاشان پێی وتم : لەگەڵ من بمێنەرەوە و بابەیەکەوە لە نەیجیریا کاربکەین ، منیش وتم : دەمەوێ بگەڕێمەوەناو کەس و کارو گەلەکەی خۆم چونکە قورئان دەفەرموێ : ( وأنذر عشيرتك الأقربين ) ..

پاش کۆچی دوایی باوکم بووم بە سوڵتان و دووساڵ لەوناوچەیەدا بانگەوازم کرد و بوومەهۆی موسڵمان بوونی ( ٤٧٢٢ ) کەس لەهۆزی (سارا قولای ) ، کە (١٤ ) یان قەشەبوون ، ئالێرەوە رووبەڕووبوونەوە دەستی پێکرد لەگەڵ مژدە دەرەکاند لە خوارووی ( تشاد ) ، کە هەوڵیان دەدا رێ لە بانگەوازی ئیسلامی بگرن و زۆرترین کەس راکێشن بەلای خۆیانداو ، بە هەمووشێوەیەك هەوڵیان زۆردا کە بە پارە و ماڵ و ئافرەت بم خەڵەتێنن و کار بۆ ئەوان بکەم ..

بەراستی هەرچەند ئەوان توانای زۆر لەبەر دەستیاندایە ، کارو هەوڵەکانیان کەم بەرهەمی دەبێت ..

هەوڵەکانیان لەگەڵما بێ ئەنجام بوو ، ئینجا حکومەتی ( تشاد ) کردمی بەئەندامی ( مجلس الأعلى للشؤون الأسلامية ) لە تشاد ..

مژدەدەران کە زانیان هیچیان بۆ ناکرێ ، بت پەرستەکانیان هاندا بۆ ئاژاوە نانەوە ، خوای گەورە ئەو کارەشیانی بێ‌ئەنجام کرد !

❁ **سەردانی مەککەی پیرۆز :**

رێکخراوی بانگەوازی ئیسلامی ( منظمة الدعوة الأسلامية ) ، داوەتنامەی حەجیان بۆ ناردم ، کاتێ سەردانی مەککەم کرد و موسڵمانانم بینی کە جیاوازی‌نیە لە نێوان رەش و سپی‌یاندا و هەمووی یەك بەرگی حەجیان لەبەردایە ، نەمتوانی حۆم بگرم و بەکوڵ گریام ، هەرچەند کەسم لەگەڵ نەبوو لە دۆست و هاوەڵانم ، کەچی هەستم دەکرد کە هەموو ئەوانەی دەورم کەس و کارو برامن ، ئەمەش وای لێکردم کە سوورتربم لەسەر کارەکەم و گەرمتر هەوڵبدەم لەبواری بانگەوازدا ، تاوەکو رێنمایی خەڵکی بکەم بۆ ئەم ئاینە گەورەیە و بڕیارم دا کە دەست پێ بکەمەوە لەوڵاتەکەم ( تشاد ) ..

کاتێك گەڕامەوە لە حەج بڕیارم دا قوتابخانە و مزگەوت دروست بکەم، لە سایەی خواوە توانیم دوانزە قوتابخانە و مزگەوت دروست بکەم و دوانزە بیری ئاو لێ بدەم لەناو ( قندی ) .. ئینجا هەوڵم دا کە کۆمەڵەیەك دامەزرێنم بۆ راهێنانی تازە موسڵمانەکان لەسەر بانگەوازکردن و فێربوونی قورئان و سوننەت .. ئەمەش سوپاس بۆ خوا هاتەدی

❁ **بەربەرستەکانی رێی بانگەواز :**

نەبوونی و کەم دەستی بەربەستن لەرێی بانگەوازدا و زۆربەی خەڵکی رەش و رووت و نەدارن و لەم لاشەوە مژدەدەران پارەیان بۆ هەڵڕژاوە و بەئارەزووی خۆیان چالاکی ئەنجام دەدەن و خەڵکی لە خشتە دەبەن . کاتێك ( پاپا ) لە دواسەردانیدا بۆ ئەفریقیا هاتە ناوچەکەی ئێمە ، پلانێکیان دانا بۆ هێنانی ژمارەیەکی زۆر لەمژدەدەران لە ئەورووپاوە و یەکێ لەقەشە ئیتالی‌یەکان پێی وتم : رەنگە تا ساڵی ( ٢٠٠٢ ) بتوانین ناوچەکە هەمووی بکەینە گاور .. شایانی باسە ئەوان بەناوی خاچی سوورەوە کاردەکەن و زۆر فێڵبازن و دەرکەوتووە کە لەرێی پێدانی (جورعە ) ی تایبەتەوە زۆر لە ئافرەتە موسڵمانەکان تووشی نەزۆکی دەکەن ، تاوەکو ژمارەی موسڵمانەکان کەم بکات لە تشاد

**دوا ئامارەکان** لەبارەی مژدەدەرانەوە دەڵێن ، بودجەی ساڵی ٢٠٠٢ ی کاری مژدەدان لە جیهان دا نزیکەی سێ‌سەد ملیار دۆلارە و چوار هەزار و سەد رێکخراوو دەزگای تایبەتیان هەیە بۆ کارکردن لە جیهاندا و نزیکەی پێنج ملیۆن و شەش سەد مژدەدەر هەیە و نزیکەی چوار هەزار و پێنج سەد ئیستگە و قەناتی تەلەفزیۆنی هەیە کار بۆ مژدەدان دەکەن ..

وە ژمارەی ئەو گۆڤارانەش کە دەری دەکەن نزیکەی سی وهەشت هەزار گۆڤارە و شەش ملیار ئینجیلیان چاپ کردووە بۆ بڵاوکردنەوەی لەم ساڵدا ) بەرنامەی (ندوة الاسبوع ) قناة أقرأ / ٢٠٠٢/٨/٢٩ بەناوی قصص من مدغشقر / محمد الخميس .

لەگەڵ هەموو ئەو هەوڵ و کۆششەدا نەیانتوانیوە زیانێکی ئەوتۆ بە ئیسلام بگەیەنن و هەرچی بەخت دەکەن دەبێت بەداخ و حەسرەت بۆیان هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ لِيَصُدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ وَالَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴾ ( الأنفال : ٣٦ ) .
واته : بێگومان ئەوانەی بێباوەڕن ماڵ و سامانی خۆیان بەخت دەکەن بۆ ئەوەی خەڵکی لەبەرنامەی خوا دووربخەنەوە ، جا ماڵ و سامانیان بەردەوام بەخت دەکەن !پاشان دەبێتە پەشیمانی و داخ و حەسرەت لەسەریان و ، لەدوایدا شکست دەهێنن ، بێگومان ئەوانەش کە بێ باوەڕن بۆ دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن .
زۆرجاریش ئەوانەی کە لە گەرمەی مژدەدانان دێن بەرەو ئاینی خوا ، بۆ نموونە قەشە ئیبراهیم فلیبس کە پاش موسڵمان بوونی ناوی خۆی گۆڕی بۆ ئیبراهیم خلیل ئەحمەد دەڵێت ( ئەوەی زۆر سەیرە من لە چڵەپۆپەی دڵخۆشی سەرکەوتنم دا بووم لەکاری مژدەدانەکەم داو خۆم ئامادەکرد بۆ بەدەستهێنانی پلەی دکتۆرا لە زانکۆی برنستون لە ئەمریکا و نامەیەکم نووسی بەناوی ( سیف جالیات ) ، کە تیایا دەمویست هێرش بکەمە سەر ئیسلام بەوەی کە لە قورئان بدەم ، کەچی خوا ویستی وابوو قورئان زاڵ بێ بەسەرمدا و ئایەتی :﴿ قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا * يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا ﴾ ( الجن :١، ٢ ) وای لێکردم کە بەبێ دەمارگیری بیربکەمەوە ، تێگەیشتم کە ئیسلام هەقە و سەرەنجام موسڵمان بووم سوپاس بۆ خوا .. ( گۆڤاری الاسره (٧٦ ) رجب ١٤٢٠ کۆچی ) .

## چوارەم : موسڵمان بوونی پرۆفیسۆرێکی ئەمریکی :

پرۆفیسۆر جفری لانگ باسی موسڵمان بوونی خۆی دەکات و دەڵێت :
نزیکەی دەساڵ خەوێکم دەدی و زۆر دووبارە دەبۆوە ، بەتایبەت ئەو کاتانەی کەتووشی نارەحەتی دەبووم ، خەوەکەشم ئەوەبوو لە ژوورێکی بچووک دا کە بەرماڵی سووربکاوی تیابوو ، دیوارەکانی سادەو خۆڵەمێشیبوون ولە پەنجەرەیەکی بچووکەوە ، ڕووناکی دەهاتە ژوورەوە ، ئێمە هەموو لەچەند ڕیزێکدا وەستابووین و من لە ڕیزی سێیەمدا بووم و کەسیانم نەدەناسی و ئێمە هەموومان دەنوشتاینەوە و ناوچەوانمان دەخستە سەرزەوی ، لەکەش و هەوایەکی هێمن دا ، کەبێ دەنگی باڵی کێشابوو بەسەر شوێنەکەدا ، سەیری پێشەوەم دەکرد ، یەکێك ئیمام بوو لەژێر پەنجەرەکەدا و بەرگێکی سپی لەبەردابوو .. هەموو جار بەدڵنیایی و دڵخۆشییەوە خەبەرم دەبۆوە !
لە زانکۆی ( سان فرانسیسکۆ ) لاوێکی عەرەبم ناسی کە قوتابیم بوو، پەیوەندیمان پتەوتر بوو ، ئەویش قورئانێکی دامێ بەدیاری ، ڕۆژێك ویستم بچم بۆ لای لە مزگەوتی زانکۆ ، دابەزیم بەقادرمەکاندا ، لەبەردەگاکەی وەستام ، نەمتوانی بچمە ژوورەوە ، سەرکەوتمەوە و هەناسەیەکی قوڵم هەڵمژی ، بۆ دووەم جار دابەزیمەوە ، قاچەکانم هەڵیان نەدەگرتم ! دەستم درێژ کرد بۆ دەسکی دەرگاکە ، دەستم دەلەرزی و گیانم نیشتە سەرعەرەق ، رامکردەوە بۆ سەرقادرمەکە .. هەستم بە تێشکان کرد ، بیرم کردەوە بگەڕێمەوە نووسینگەکەم .. چەند چرکەیەك تێپەڕین کە زۆر گرنگ و پڕبوون لە نهێنی ،

سەیری ئاسمانم کرد ، ئەوە دەساڵە خۆم دەگرم و زۆر لە خۆم دەکەم دوعا نەکەم ! بەڵام ئێستا بەرگریم نەماو دوعام کرد ( خوا یە ئەگەر دەتەوێ بچمە مزگەوتەکەوە یارمەتیم بدە و بەهێزم بکە ! ) ، ئەمجارەش دابەزیمەوە بەقادرمەکانداو ، پاڵم نابەدەرگاکەوە ، لە ژوورەکەدا دوولاو قسەیان دەکرد ، سەلامم کردو سەلامیان سەندەوە .. یەکێکیان پرسیاری کرد : ئایا دەتەوێ شتێ لەبارەی ئیسلامەوە بزانیت ؟ وتم : بەڵێ .. بەڵێ . پاش گفت و گۆیەکی زۆر رەغبەتی خۆم ئاشکرا کرد کە دەمەوێت موسڵمان ببم ،

ئیمامی مزگەوتەکە وتی : بڵێ اشهد ، وتم : اشهد ،وتی : أن لا إله وتم : أن لا إله ، وتی : إلا الله ، وتم : إلا الله ، وتی : واشهد أن محمداً رسول الله ، وتم : واشهد أن محمداً رسول الله .

بەڵێ .. لەدوایەوە وتمەوە ، بەراستی ئەو وشانە وەك دڵۆپە ئاو وابوو کە بەگەرووی وشکی کەسێك دا بچێتە خوارەوە ، کە لە تینوێتی‌دا لەوەدا بێت بخنکێت .. پاش دوو رۆژ فێری نوێژی هەینی بووم ، لە رکاتی دووەم دا کە ئیمام قورئانی دەخوێند و ئێمەش لەدوایەوە بەریز وەستابووین ، من لە ریزی سێیەمدا بووم ، ناوچەوانمان خستە سەر بەرماڵە سوورەکان ، کەشو هەوایەکی هێمن بوو ، بێدەنگی باڵی کێشابوو بەسەر شوێنەکەدا !

مامۆستاش لە ژێرئەو پەنجەرەیەی کە رووناکی لێ دەهاتە ژووری بەبەرگی سپی‌یەوە وەستابوو ! لەناخمەوە هاوارم کرد : ئەوە خەوە ؟! ئەوە خەوەکەیە ! پرسیارم لە خۆم کرد : من ئێستا لەخەودام !؟ چاوم فرمێسکی رشت و ئنجا سەلاممان دایەوە ، السلام علیکم ورحمه الله !

دوای نوێژ سەرنجی دیوارەکانی ژوورەکەمدا کە خۆڵەمێشی بوون ، دڵم بۆیەکەمجار پڕبوو لەو خۆشەویستیەی کە بە گەڕانەوە بۆ لای خوا دەست دەکەوێت و ، خانەکانی لەشیشم بەنووری ئیمان رووناك بوونەوە ..

جەنابی پرۆفیسۆر بەردەوام دەبێ لەسەر وتەکانی و دەڵێت : بەراستی نوێژی بەیانی لە نوێژەکانی تر زیاتر مرۆڤ دەهەژێنێ ، کاتێك خەڵکی هەموو نووستوون و ئەمیش جێگای گەرم بەجێ دێڵێ و لەو شەوە کش و ماتەدا گوێ بۆ قورئان دەگرێت ، هەست دەکات گیانی ئەم جیهانە ماددی‌یە بەجێ دێڵێ و لەگەڵ مەلائیکەتەکاندا سەفەر دەکات تا لەو بەرەبەیانەدا یادی خوای گەورە بکات و بەرز رایبگرێت ..

جابۆ ئەوەی هەستم بۆ نوێژی بەیانی سێ سەعاتم دانا ، یەکێکیان لەژوور سەرم وئەوی تریان لەهۆڵەکەداو سێهەمیشیان لای دەستشۆرەکە ، بۆئەوەی یەك بەدوای یەکدا زەنگ لێبدەن وخەبەرم بکەنەوەوناچار بم بچمە لای دەستشۆرەکە بۆدەستنوێژ شتن ..

جا ئەگەر قورئان بەجدی وەربگریت ناتوانی بەسادەیی بیخوێنیتەوە ، چونکە قورئان رووبەڕووت دەبێتەوە ، هەروەك ئەوەی هەقی لەسەرت بێت ، گفت و گۆت لەگەڵ دەکاو رەخنەت لێ دەگرێت ، وە ئەگەر کەسێکیش دووبەرەکایەتی بکات قورئان تەحەددای دەکات و شەرمەزاری دەکات ..

بۆم دەركەوت خوای پەروەردگار كە ئەم قورئانەی ناردووە ، چاكتر لە خۆم دەمناسیٚ ، هەمیشە قوئان لە پێش بیركردنەوەی منەوە بوو ، وەلآمی پرسیارەكانی ئەدامەوە ، هەر شەوێك پرسیارم لادروست ببوایە بۆ بەیانی لە قورئان دا وەلآمەكەیم دەست دەكەوت .
لەگەل نەفسی خۆمدا رووبەرووبوومەوە لەسەر لاپەڕەكانی قورئان و ئایەتە پیرۆزەكانیدا ، چەندەها ئایەت لە قورئاندا وەك دەستێكە كەلە ئاسمانەوە دەگاتە دڵی نەخۆش و نەك هەرقسەی لەگەڵ دەكات ، بەڵكو قسەلەگەڵ رۆحیشی دەكات .. كاتێك سورەتی ( الضحى ) م خوێند زۆر كاری تێكردم و گریام .. هەستم دەكرد وەك منالێكی ون بووم كە دایكی رزگاری بكات پاش ناخۆشی و ئازارێكی زۆر ، ئەم سورەتە هەواڵمان دەداتیٚ كە خوا دەستمان لیٚ بەرنادات ئەگەر ئێمە بەراستی پەنای پێبگرین ..
كە بۆ یەكەمجار قورئانم خوێند هەستم كرد قورئان من دەخوێنێتەوە ، وەكاتێك موسڵمان بووم زۆر هەولم دەدا كە ئامادەی نوێژی بەكۆمەڵ ببم لە مزگەوتدا و گویٚ بگرم لە قورئان خوێندنی ئیمام، هەرچەند عەرەبیشم نەدەزانی ! كە پرسیاریان لیٚ كردم لەم بارەیەوە وتم : من وەكو ئەو منالەم كە دەگری و گویٚی لەدەنگی دایكی دەبیٚ بیٚ دەنگ و ئارام دەبیٚ ، هەرچەند هیچ لەدەنگی دایكیشی تێناگات !لە كۆتاییدا هیوادارم بۆ هەتا هەتا لە ژێر سایەی دەنگی قورئاندا بم !

## چەند نموونەیەكی تری هۆشیاركردنەوە

**یەكەم /عەمر خالید** دەڵیٚ : هەرچەند دوور كەوتبمەوە لە خواو و گوناهێكم كردبیٚ ، چاوەڕیٚی وەرگەڕان یان دەعمی سەیارەكەمم كردووە، چونكە هەمیشە خوای گەورە بەوە ئاگاداری كردومەتەوە ..
ساڵێكیان رەمەزان بڕیارمدا كە هەموو ئێوارەیەك لە ریزی یەكەم لەگەڵ ئیمام دا ( الله اكبر ) ی نوێژدابەستن بكەم ، چەند رۆژیٚ هێنامە دی بەلآم وردە وردە وام لیٚ هات سەرقالیم بەدنیاوە دوای دەخستم ، رۆژێك كە گەیشتمە مزگەوت مامۆستا لە ركوع هەڵدەستایەوە ، جارێكی تر لە كۆتایی نوێژەكەدا فریای جەماعەت كەوتم ، چەند جارێكی تریش كە دەگەیشتمە مزگەوت ، مامۆستا سەلامی دابۆوە ، خوای گەورە قەدەری وا بوو بەوە وریام بكاتەوە كە پەیمانی خۆم هەردەم ببەمەسەر، قاچم وەرگەڕاو سیٚ هەفتە نەمتوانی لەماڵ بچمە دەرەوە !( وتاری (رسائل ربانیە ) كلام من القلب ) .
**دووەم / ئەكتەری میسری ( نەسرین** ) گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگار و خۆی داپۆشی بەهۆی ئەوەی كە باوكی پیاوێكی خواناسی دەرچووی ئەزهەر بوو ، پاش وەفات كردنی ، دەچێتە خەوی هاوسەرەكەیەوە و دەڵیٚ : بە نەسرین رابگەیەنە ئیتر بەس نیە ، بادەست هەڵگریٚ لەوەی تیایەتی ..ئەمەش بوو بە خێر بۆی و خۆی داپۆشی
**سێیەم / مەدیحە كامیلی** ئەكتەری میسریش نەخۆش كەوتنی دایكی و چاك بوونەوەی لەو نەخۆشییە قورسەی كەوتووشی بوو بوو ، وە قبوڵ بوونی دوعاكانی وای كرد زیاتر لەخوای گەورە نزیك بێتەوە و بەیارمەتی هونەرمەندی ( داپۆشراو )

نەسرین ی هاوەڵی ئەمیش خۆی داپۆشی . شایانی باسیشە مەدیحە کامیل چەند ساڵێك لەمەوبەر کۆچی دوایی کرد ، خوا لێی خۆش بێت ..

**چوارەم / ئەکتەری میسری محمود الجندی** پاش سی و پێنج ساڵ کارکردن لە بواری هونەردا وپاش تەمەنێکی زۆری دوور لە خوایی تەوبەی کردو لە چاو پێکەوتنێکدا لە م بارەیەوە وتی:خوای گەورە بەچەند شتێك منی ئاگادار کردەوە ،لەوانە :مردنی ئەکتەرێکی هاوەڵی خۆشەویستم و سووتانی شوقەکەمان کە هەرچی پەڕاوی خراپم هەبو سووتان وتە نها کتێبە ئیسلامیەکانم بۆ دەرچوو ، هەروەها مردنی هاوسەرەکەشم زۆر کاری تێکردم وتەوبەم کرد ، ئنجا کە چووشم بۆ عومرە کردن زیاتر بڕواکەم دامەزرا (شایانی باسە لە کاتی چاو پێکەوتنەکەدا فرمێسك بە چاوانیدا ئەهاتنە خوارەوە و دەیووت من شەرمەزاری ئەو کارانەم کە پێشتر ئەنجامم داوە ولەمەودوا کارێك ناکەم کە خوا پێی ناخۆش بێت ) ..بەرنامەی المواجهات /کەناڵی اقرا /مانگی ١٠ـ٢٠٠٢

**بوار رەخساندن بۆ هیدایەت :**

ئاشکرایە خوای گەورە ( هادی) یەو حەزناکات و قایل نابێت بەندەکانی کفر بکەن ﴿ولا یرضی لعباده الکفر﴾ ( الزمر : ٧ ) . بۆیە بوار بۆ بەندەکانی دەرەخسێنێ ، سابەڵکو رابچڵەکن و وریا ببنەوە .. نموونەش بۆ ئەم مەسەلەیە لە کۆن و نوێدا زۆرن ، کە دەبینین کەسانێك کلیلی هیدایەت دێتە بەر دەستیان و خێرا دڵیانی پێ دەکەنەوە و دێنەوەسەر ڕێ ..

**نموویەك لە کوردستانەوە :**

ماموستا مەلائەنوەر حسن خەڵکی دێی وەستا خدری سەنگاوەو لەگەڵ مەلابورهان شریفی قادر کەرەمیدا کە حافزە و هەموو قورئانی لەبەرە ، لەمانگی ٩ ی ٢٠٠٢ دا دەچنە تاران بۆ چارەسەری چاوی مەلا بورهان ، لەوێ پاش چوونە لای پزیشکی تایبەت ، ئێوارن دەچنە باخچەکانی ناو تاران و ماموستا ئەنوەر داوا لەمەلابورهان دەکات کە بەدەنگەوە قورئان بخوێنێ .. کاتێك ماموستا مەلا بورهان بەدەنگە خۆشەکەی قورئان دەخوێنێ ، هەر شەوە و چەند کەسێکی فارس و کورد و عەرەب کە بەو ناوەدا تێدەپەڕن هەڵوەستەیەك دەکەن و قورئان خوێندنەکەیان لا خۆش دەبێت ، ئێوارەی ڕۆژی دەیەم کەلە باخچەیەك دا وەك شەوانی رابردوو قورئان دەخوێنێ ، دوو لاوی ( ٢٥ ) ساڵە لەلایان دەوەستن ، ماموستاش لەسورەتی ( التغابن ) دا دەبێت ..دوای تەواو بوونی قورئانەکە دوولاوەکە کەناویان ( عطا ) و ( فردوس ) ە دەڵێن :ماموستا ئێمە کوردی خەڵکی سنەین و ، چەند ساڵێك لەمەوبەر لەگەڵ کەسوکارماندا تێك چووین و لەداخا چووینە دەرەوە و بووینە چەکداری لایەنێك و ئینجا سەنگەرمان گواستەوە و چوینەی لای لایەنێکی ترو ، پاشان گەڕاینەوە ئێران و ماوەیەك گیراین و بەندیمان چەشت ، وا ئێستاش بڕوامان بەهیچ نەماوە و هەرچی خوا پێی ناخۆشە ئەیکەین و ، کارو کاسپیشمان بازرگانییە و زیانی زۆرمان لێ کەوتووە ، جا بەراستی ئەم شەو کە گوێمان

لەو قورئانە زوولاڵە بوو کاری تێکردین و دەمانەوێ تەوبە بکەین ، جا نازانین چی بکەین و چۆن بکەین ..
مامۆستا ئەنوەریش دەڵێ : برایینە ئێمە دەشەوە لەم ناوەین و کارمان تەواو بووە و نازانم بەم ماوە کەمەی کە بەدەستمانەوەیە فریای چی دەکەوین ؟
ئینجا مامۆستا باسی ئیمان و ئیسلام و تەوبەکردنی بۆ کردن .. دواتر ئەو دوولاوە وتیان ، بەخوا وا ئێستا هەست بەخۆشی و دڵنیایی دەکەین .. ئیتر خوا حافیزیان کردو بۆ بەیانی کارەکەی مامۆستا و هاوەڵەکەی تەواو نەبوون بۆیە ناچار مانەوە ، هەر بۆ ئێوارە بەو ژمارەی مۆبایلەی کەلەدوولاوەکەیان وەرگرتبوو پەیوەندیان پێوەکردن کە شەوێکی تریشمان لێرەماوە ، ئەوانیش بەخۆشیەوە هاتنەوە هەمان شوێن و پاش هەندێ باس و خواسی ئیمانی ، لاوێکیان پرسیاری کرد و وتی : مامۆستا ئەمڕۆ لەگەرمەی کارم دا نوێژی نێوەڕۆم فەوتا نازانم چی بکەم ؟ ئەویش پێی دەڵێ : قەیناکە تاڕادێیت و دەقی پێوە دەگری بەقەزا بیگێڕەوە ! ( لە پرسیارەکەیانەوە دیارە کە هەر ئەو شەوە تەوبەیان کردووە و بەچاکی کەوتوونەتە خواپەرستی .. بەراستی مەسەلەی هیدایەت سەیرە ، دووکەس لە کوردستانەوە چەند وەختە خەریکن ، ئالەوکاتەدا بۆیان ڕێبکەوێ و بچنە تاران ، لەوێش بچنە ئەو ناو باخ و باخاتەوە و بەدەنگەوە مامۆستا قورئان بخوێنێ و دوولاوی کوردی سنە ، قەدەر بیانهێنێتە ئەو شوێنەو شەوی ٢٤ /٢٥ ی ٢٠٠٢/٩ کلیلی هیدایەت بێتە بەردەستیان و دڵیان بکرێتەوە بۆ هەق و ڕاستی !
بۆیە بەراستی هەق وایە بانگخوازبین و ئەم پەیامە بەرزە بگەیەنینە خەڵکی و بێ هیوانەبین ، چونکە هەر کەسەو بەپێی خۆی خێری تیایە ، گرنگ ئەوەیە بەجوانی لەدەرگای دڵی بدرێ ، سابەڵکو بیکاتەوە و ببێتە مایەی هیدایەتی ، حەزرەت ﷺ ڕۆژێک چوو بۆ سەردانی جوولەکەیەکی دراوسێی ، کە منداڵەکەی زۆر ناساغ و لەسەرمردن بوو ، حەزرەت ﷺ بانگی کرد بۆ ئیسلام ، منداڵەکەش ڕووی کردە باوکی و وتی : بابە تۆ ئەڵێی چی ؟ وتی : کوڕم بە قسەی ( ابوالقاسم ) بکە ، ئیتر کوڕەش ئیمانی هێنا .. حەزرەتیش ﷺ فەرمووی : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە کەسێکی لە دۆزەخ ڕزگار کرد پێمان ..

## میراتگرانی پێغەمبەران

مەسەلەی میرات لە ئیسلامدا گرنگی زۆری پێدراوە و ڕێژەکانی دیاری کراوە ، تا هەرکەس بەپێی پلەی نزیکی و دووریەکەی لە کۆچکردووەوە بەشی خۆی وەرگرێت بەجۆرێك کە حیکمەتی خوای گەورەی میهرەبانی تیا دەردەکەوێت ..
بەڵام میرات تەنها ئەو لایەنە ماددیە نیە ، جۆرێکی تر هەیە کە ئەویش ئەو میراتەیە کە لە پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێ بەجێ دەمێنێ بۆ شوێنکەوتوانیان کە هەرچی وەری بگرێ سەرفرازی دنیاو قیامەتەو ، ئەوەش کە وەری نەگرێ و لە کیسی بدات خەسارەتمەندی دنیا و قیامەتە ..

ئاشکرایە کە پێغەمبەران هەرچیان لە پاش بەجێ بمێنێ لە مادديات دەکرێ بەخێر و کەسو کاریان نابێ بەمیراتی وەری بگرن ، چونکە میراتی بە قیمەتی ئەوان بەرنامەکەی خوایە و بۆ هەموو کەسێکە لەگەڵەکانیان ، هەروەك حەزرەت ﷺ دەفەرموێت : ( إن العلماء ورثة الأنبياء ، وإن الأنبياء لم يورثوا ديناراً ولادرهماً ، وإنما ورثوا العلم ، فمن أخــذه اخــذ بحظ وافر ) ئیمام احمد .

واتە : زانایان میراتگری پێغەمبەرانن و ، پێغەمبەران دینار و درهەمیان لە پاش بەجێ نامێنێ ، بەڵکو زانستیان لە پاش بەجێ دەمێنێ و دەبێ بەمیراتی لە دوای خۆیان ، هەرچی دەستی بکەوێ و وەری بگرێ ، ئەوە بەشێکی باشی بەرکەوتووە .

هەروەها دەفەرموێت : ( لا نورث ، ماتركناه صدقة ) ( بخاری و مسلم )

رۆژێك ئەبو هورەیرە لەدوای وەفاتی حەزرەت ﷺ بانگی کرد ، خەڵکینەفریاکەون ، لە مزگەوت میراتی حەزرەت ﷺ بەشدەکەن ، کاتێ خەڵکی چوون چەند ئەڵقەیەکی زانستیان بینی کە تیایا وانەی ئیسلام فێری ئامادەبووان دەکرا ، هاتنەوە و وتیان : کوا هیچمان نەدی !؟ ئەبو هورەیرە وتی : ئەو زانستەی بینیتان ئەوە میراتی پێغەمبەرە ﷺ بۆ هەر کەسێ کە بیەوێ وەری بگرێت ..

## حەزرەتی زەکەریا خەمی میراتیەکەیەتی لە پاش خۆی !

حەزرەتی زەکەریا ، هاوسەرەکەی نەزۆك بوو ، خۆشی سەروریشی سپی بوو بوو ، کاتێك کەفالەتی مەریەمی کردبوو (سەلامی خوای لێ بێ ) ، دەیبینی کە خواردنی وای لایە لەو فەسڵەداو لەو دەوروبەرەدا نەبوون ، فەرمووی : ئەوانەت لە کوێ بوو ؟ مەریەم فەرمووی : رزق و رۆزیەکە و خوا بۆی ناردووم ، خوای گەورە هەرکەسێکی بوێ رزقی ئەدات بەبێ ( حیساب ) بە جۆرێك ئەو کەسە خۆشی نازانێ چۆن . ئالێرەدا دڵی داچڵەکی و لەناخەوە هەژا ، ئەی کەوایە بۆ منیش داوای کوڕێك نەکەم لە خوا بۆ ئەوەی ببێتە میراتگری راستەقینەی پێغەمبەرایەتیەکەم ، بەڵێ.. دوعای کردو خوای گەورەش کوڕێکی پێبەخشی و بۆی ناونا ( یەحیا ) و فەرمووی ئەو کوڕە بەراست دانەری فەرمانی تایبەتی خوایە و گەورە و رێزدارە و خۆپارێزە لە گوناهو پێغەمبەرێکە لەچاکان ..

قورئان دەفەرموێت : ﴿ وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِنْدَهَا رِزْقًا قَالَ يَامَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَنْ يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ، هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ، هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ ، فَنَادَتْهُ الْمَلَائِكَةُ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ أَنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَى مُصَدِّقًا بِكَلِمَةٍ مِنَ اللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِنَ الصَّالِحِينَ ﴾ ( آل عمران : ٣٩ ) .

لەسەرەتای سوورەتی مەریەمیش دا دەفەرموێت : ﴿ ذِكْرُ رَحْمَةِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا ، إِذْ نَادَى رَبَّهُ نِدَاءً خَفِيًّا ، قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْبًا وَلَمْ أَكُنْ بِدُعَائِكَ رَبِّ شَقِيًّا وَإِنِّي خِفْتُ الْمَوَالِيَ مِنْ وَرَائِي وَكَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا فَهَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا ، يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ آلِ يَعْقُوبَ وَاجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا ، يَازَكَرِيَّا إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ اسْمُهُ يَحْيَى لَمْ نَجْعَلْ لَهُ مِنْ قَبْلُ سَمِيًّا ، قَالَ

رَبِّ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَكَانَتْ امْرَأَتِي عَاقِرًا وَقَدْ بَلَغْتُ مِنْ الْكِبَرِ عِتِيًّا ، قَالَ كَذَلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِنْ قَبْلُ وَلَمْ تَكُنْ شَيْئًا ، قَالَ رَبِّ اجْعَل لِي آيَةً قَالَ آيَتُكَ أَلا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلاثَ لَيَالٍ سَوِيًّا ، فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ مِنْ الْمِحْرَابِ فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ أَنْ سَبِّحُوا بُكْرَةً وَعَشِيًّا ، يَايَحْيَى خُذْ الْكِتَابَ بِقُوَّةٍ وَآتَيْنَاهُ الْحُكْمَ صَبِيًّا ،وَحَنَانًا مِنْ لَدُنَّا وَزَكَاةً وَكَانَ تَقِيًّا ، وَبَرًّا بِوَالِدَيْهِ وَلَمْ يَكُنْ جَبَّارًا عَصِيًّا ، وَسَلامٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّا ﴾( مريم : ١٥ ) .

واتـه : ( ئـەی پێغەمبـەر ﷺ ئـەم باسـە باسـی رەحمـەتی پەروەردگارتـە ، دەربـارەی بەندەی خۆی زەکەریا ، کاتێك لە پەرستگای خۆیدا هاناو هاواری برد بۆ پەروەردگاری بە پەنهانی ، وتی : پـەروەردگارا ، بەراسـتی مـن ئێسـکەکانم لاواز بـوون و قـژی سـەرم هەرهەمووی سپی بووە، بەڵام من هەرگیز لەدوعاو پاڕانـەوە لـەزاتی تۆ نائومێد نـەبووم و دەستت نەناوە بەڕوومەوە .

بەڕاستی من لەوە ترساوم کە خزم و خوێشان و عەشرەت دوای مردنم سەرگەردان بن ( چونکە کەسێکی وایان تیادا بەدی ناکەم کە شایستەی گەیاندنی پەیامەکەت بێت ، خـۆت دەزانیـت ، خێزانەکەشـم منداڵـی نـابێت ، بۆیـە داواکـارم لـە بەخششـی خـۆت بەهرە وەرم بکەی و منداڵێکم پێ ببەخشیت کە بتوانێت جێگەی من بگرێتەوە .

تا میراتی پێغەمبەرایەتی من و نەوەی یەعقوب وەربگرێت ، هەروەها بیکە بەکەسێکی وا ، کە تـۆش و بـەندە چاکەکانیشـت لێی رازی بـن (ئـەوەندە چاکـەکارو چاکـە خـواز و دیندار بێت ) .

خـوای گـەورە نزاکـەی گـیرا کـردو فـەرمووی : ئـەی زەکـەریا بەراسـتی ئێمـە مـژدەت دەدەینێ بەوەی کە کوڕێکت پێ دەبەخشین و ناویشی یەحیا یە ، پێش ئەو کەسمان هاو ناوی ئەو نەکردووە ..

زەکـەریا وتـی : پـەروەردگارا بـەچ شـێوەیەك كـوڕم پـێ دەبەخشـیت ، لـەکاتێکدا هاوسەرەکەشـم منداڵـی نـابێت و منیـش گەیشـتوومەتە ئەوپـەڕی پـیری و پەککەوتـەیی ( بەڵام دیارە هەمووشت لای تۆ ئاسانە ) . حەزرەتی جوبرائیل وتـی : پـەروەردگاری تـۆ هەربەو شێوەیە بڕیاری‌داوە و فەرمووشیەتی ئەو کارەلای من زۆر ئاسانە ، بەراسـتی پێشتریش تۆم دروستکرووە ، وە نەبێت شتێك بووبیت ( نەناوت هەبووە و نەبوون ) ..

زەکەریا وتـی : پەروەردگارا نیشانەیەکم پـێ ببەخشـە تـا دڵنیـابم ، کـە ئـەو مژدەیـە هاتۆتەدی ، جوبرائیل پێی فەرموو : نیشانە و بەڵگەت ئەوەیە لەسەر بوونی ئەوکوڕە کە تۆ ناتوانێت سێ‌شەوی تەواو (بەڕۆژەکانیەوە ) قسە لەگەڵ خەڵکدا بکـەیت ، ( هەرچەند زمانی تەواو بوو بەڵام خوای گـەورە لـە قسـە کردنـی خسـت و تەنها بـە ئیشارەت قسـەی دەکرد ) ، ئەوسا لە پەرستگاکەی هاتـە دەرەوە بـۆ نـاو گەلەکەی و ئاماژەی بـۆ کـردن کـە بەیانیان و ئێواران تەسبیحات و ستایش بکەن ..

پاشان کە یەحیا گەورەبوو فەرمانمان پێدا ، ئەی یەحیا کتێبی تەورات بەتوندی بگرە و پابەندی بەو، هەر لەتەمەنی نەوجەوانیدا توانای جیاکردنەوەی ڕاست و ناڕاستمان پێبەخشی ، بەدادوەری‌یەکی رێك و پێك کێشەی خەڵکەکەی چارەسەر دەکرد .. یەحیا

جاری دووەمیش : پێی وترا ( قم ) هەستە ، بۆ بانگەواز کردن و رزگارکردنی خەڵکی لەنەفامی و جاهیلیەت ، لە سورەتی المدثر دا دەفەرموێ : ﴿ يَاأَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ ، قُمْ فَأَنذِرْ ، وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ، وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ، وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ ، وَلَا تَمْنُنْ تَسْتَكْثِرُ ، وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ ﴾

باوەڕداران کە خۆیان چاکردو کەوتنە هەوڵدان بۆ گۆڕینی دەوروبەر، راستە کێشمەکێش دروست دەبێت و قوربانیش دەدرێت ، بەڵام سەرەنجام ساڵحان و چاکان دەبنە میراتگری زەوی و خوای گەورە (تمکین ) یان بۆ دەکات هەروەك دەفەرموێت ﴿ إن الأرض لله يورثها من يشاء من عباده والعاقبة للمتقين ﴾ ( الأعـراف : ) .واتە : بەراستی زەوی هی خوایە و هەرکەسی بوێ لە بەندەکانی دەیکا بە میراتگری زەوی و پاشەڕۆژ و سەرەنجامیش بۆ پارێزکارانە ، هەروەها دەفەرموێت : ﴿ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾ ( الأنبياء : ١٠٥ ) .واتە : سوێند بەخوا بەراستی ئێمە لە کتێبی زەبووردا دوای تەورات بڕیارمانداوە کە بێگومان بەندە شیاو و چاکەکانم دەبنە خاوەنی زەوی ..

## میراتگری زانایان :

زانایان کە میراتگری پێغەمبەرن ﷺ هەمیشە هەوڵیان داوە ئەوەی کە فێربوون لە زانست و زانین لەخۆیاندا نەکوژێتەوە و بیگەیەننە دەست قوتابییەکانیان بەتایبەتی و خەڵکیش بەگشتی .. مامۆستایان سووربوون لەسەر هەوڵ و وانەوتنەوە و قوتابیانیش گەرم بوون لەسەر فێر بوون ..

ئیمام مالیك دەڵێ : ( پیاوی واهەبووە سی ساڵ چووە بۆ لای یەکێك تا فێر ببێ ) مجاهد دەڵێ ( سێجار هەموو قورئانم خوێند لەبەردەستی ( ئیبن عباس ) داو ئایەت بە ئایەت پرسیارم لێ دەکرد ) .

هەندێ جار قوتابی زیرەك و بلیمەت هەڵکەوتوون و مامۆستایان زیاتر گرنگیان پێداون ، هەروەك ئیبن و تەیمیە کە ( ئیبن قەیم ) هەمیشە لەخزمەتیا بوو تا بەچاکی زانستەکەی لێ وەرگرت ..

بەهەمان شێوەش ( ئیبن حجر ) ی عەسقەلانی گرنگی زۆری دا بە قوتابییەکەی کەناوی ( الحافظ السخاوي ) بوو ، لەبەر ئەوەی دراوسێ بوون زۆربەی کات لەخزمەتیا بووە ، جاری واش هەبوو کەلەلای مامۆستانەبوایە ، خزمەتکارێکی دەنارد بەدوایدا کە زووبێتەوە بەلای وانەکانیەوە ..

قوتابییەکەشی بەوەفا بوو بۆی و ژیاننامەی مامۆستاکەی نووسیەوە و ناوینا ( الجواهر والدرر في ترجمة شيخ الأسلام ابن حجر ) ..

لەم سەردەمەشدا پێشەوا بەننا بێجگە لەوەی کە قوتابی چالاك و بلیمەتی تایبەتی هەبوو ، توانی زیاتر لە نیوملیۆن کەس بخاتە ژێر چەتری برایانەوە و بیانخاتە کار بۆ ئیسلام ..

ماموٚستا ( محمد محمود صواف ) یش بەرەحمەت بێ لەگەڵ ئەوەدا کەبەرپرسی برایان بوو لە عیراق و بەگشتی خزمەتی موسڵمانانی دەکرد، قوتابی بلیمەتیشی هەبوو کە خواناس و لەخۆبردوو بوون و توانیان جێی ماموٚستایان بگرنەوە ، یەکێ لەوانەش ( شیخ امجد الزهاوی ) بوو، کە خەڵکێکی زۆر شایەتی زانایەتی و ساڵحی بۆ ئەدەن ..شایانی باسە زانایان زۆر گرنگیان داوە بەوەی کە لاوان پێبگەیەنن و فێری ئەو زانستەیان بکەن کەلەلایانە .. بۆ نموونە زانای ( محدث ) ( اعمش ) زۆر قوتابی لاوی هەبوو لەمزگەوتی کوفەدا وانەی پێدەوتن . رۆژێك کەسێك کە قەدری لاوانی لانەبوو ، بەسەر سورمانەوە بە ( اعمش) ی وت : ئەم منداڵ و مەزنە چی‌یە کۆتکردونەتەوە ؟ ئەویش وتی : ( بێ دەنگ بە ، ئەوانەن کە ئاینەکەت دەپارێزن ) .

قورئان باسی شوێنکەوتوانی حەزرەتی موسا دەکات کە لاو بوون و بەدزی فیرعەونەوە ئیمانیان پێ هێنا :﴿ فَمَا آمَنَ لِمُوسَى إلا ذُرِّيَّةٌ مِنْ قَوْمِهِ عَلَى خَوْفٍ مِنْ فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِمْ أَنْ يَفْتِنَهُمْ وَإِنَّ فِرْعَوْنَ لَعَالٍ فِي الأَرْضِ وَإِنَّهُ لَمِنَ الْمُسْرِفِينَ (٨٣) ﴾ یونس

واتە : کەس باوەڕی بەموسا نەهێنا جگە لە چەند لاوێك و ، خەڵك هەموو دەترسان لە فیرعەون و دارو دەستەکەی کەبەلاٚیان بەسەر بهێنن و تووشی ئازار و ئەشکەنجەیان بکەن ، بەراستی فیرعەون خۆی بەگەورە و بڵند دەزانی لەزەویدا ، بەراستی ئەو لە سنوور دەرچوان بوو .

هەروەها ئەوانەی کە شوێن کەوتووی حەزرەت ﷺ بوون زۆربەی زۆریان لاوبوون وبەفەزڵی خوا و بەرەنج و خەباتی ئەوان ئەم دینە گەیشتە ئیمە ..

## هەوڵی بێ وچانی میراتگران

ژیانی دنیا کەم و کورتە ، کورد واتەنی پێچی مێزەرێکە ، پاشە رۆژو قیامەتیش هەتا هەتایی و نەبڕاوەیە ، قورئان دەفەرموێت : ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَنْ لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا سَاعَةً مِنَ النَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ﴾ ( یونس : ٤٥ ) .

واتە : رۆژێك کە زیندوویان دەکەینەوە هەست دەکەن بەوەی کە ژیانی دنیایان هەروەك تەنیا ساتێك بووبێ بۆیەکتر ناسین و هیچی تر ، جا ئەوانەی کە بڕوایان بە پەروەردگاریان نەبوو خەسارەتمەندو سەر لێشێواوبوون .

حەزرەتیش ﷺ دەفەرموێ ( ماالدنیا في الآخرة إلا مثل مایجعل أحدکم إصبعه في الیم فلینظر بم یرجع ) ( مسلم ) .واتە : دنیا لەچاو ئاخیرەتدا وەك ئەوەیە کەسێك پەنجە بکات بەئاوی دەریایەکدا و کە پەنجەی دەرهێنایە وە بزانێت چی بەپەنجەیەوە دێت !

دۆزەخیش ئەوەندە تاوی سەندووە و سەختە ، کە هەرچی بکرێ بۆ رزگاربوون لێی هەرکەمەو ، سەرفرازی راستەقینەی مرۆڤ ئەوەیە لە دەست دۆزەخ قوتار ببێت و پێبنێتە بەهەشتەوە .﴿ فَمَنْ زُحْزِحَ عَنْ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلا مَتَاعُ الْغُرُورِ﴾ ( أل عمران : ١٨٥ ) .

ئنجا کاتێك بڕواداری ڕاستەقینە لەم ڕاستی‌یە تێدەگات ، بەردەوام لەهەوڵ و کۆششی بێ‌وچان دا دەبێت ، بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە ، کە مایەی سەرفرازی‌یە لەدنیا و قیامەتا .. وە ناوبەناو بەخۆیدا دەچێتەوە و لۆمە و سەرکۆنەی خۆی دەکات و هەموو ئەوانەی کردوونی بەکەمی دەزانێ ، پێشەوا ( ابن الجوزی ) دەڵێ ( بەراستی من ئاواتم پلەوپایەی ئیمانی بەرزبوو ، کەچی داخەکەم تەمەنم بەسەرچوو ، ئەوەی ئاوات و مەبەستم بوو پیێ نەگەیشتم .. جا من حاڵی خۆم وەك پێشەوا ( ابن عقیل ) دەبینم کە بەخۆی دەڵێت: ئەی ناتەواو قسەی زل دەکەی بۆ ئەوەی بڵێن قسەزانە ، خۆ تۆ گەورەترین و بەنرخترین شتێکت لەدەست داوە کە بەلای ژیرەکانەوە گرنگە ، کە ئەویش ڕۆژانی تەمەنە تاگەیشتیتە ئەوەی کە لەلایەن ئەوانەی سبەینێ دەمرن پێت بووترێ قسەزان و لێزان ، دوایی ئەوەش کە باست دەکاو باسکراویش کەتۆیت ناووباستان کوێر دەبێتەوە لەگەڵ تەخت بوونی گۆڕەکانتاندا ، ئەمە ئەگەر باس و خواست بگاتە دوای مردنت ، خۆ ڕەنگە نەگات و هەر لە ژیانی خۆتدا لاوێکی‌چوست وچالاك و بەتوانا تر لە تۆ هەڵکەوێ و هەموو ناوشۆرەتەکە بۆ خۆی بەرێت !

مرۆڤە ژیرەکان سەرقاڵی ئەوەن کاربکەن بەوزانستەی بڵاوی دەکەنەوە و ، چاك بۆ نەفسی خۆیان دەڕوانن و هەڵی دەسەنگێنن .. ئای بۆ نەفسی من ، چەندەها موجەڵەدم نووسی لەچەندەها بواری زانست دا و پلەیەکی چاکم پیێ‌بەدەست نەهێنا . ئەگەر دانوستانم کردبیێ لوت بەرزبووم و ئەگەر ئامۆژگاریش کرابم نەرم نەبووم . وەهەر ئەوەندەی دنیاشم بۆ لوابێت ، وەك قەلەڕەش چۆن دەکەوێ بەسەر لاکێك دا ئاوەها بۆی چووم و کەوتووم بەسەری‌دا ! خۆزگە ئەگەر لەولاکەشم دەخوارد بەهێندەی ناچار ( مضطر ) یکم بخواردایە کەلە مردارەوەبوویەك دەیخوات ! ئای لە من ، کە ئەمڕۆ لەسەر ڕووی زەویی وسبەی لەژێر خاکدام ، بەخوا بۆگەنی لاشەم پاش سێ‌ڕۆژ لە ژێر گڵ دا کەمترە لە بۆگەنی ڕەوشت و خووم کەمن لەناو هاوەڵانم دام .. بەخوا من پشوودرێژی و حیلمی خوا بەرامبەرم سەرسامی کردووم .. چۆن کردەوەکانم پەردە پۆش دەکا و کەچی من دەمەوێ ئاشکرای بکەم ؟ ئەیەوێ کۆبم و من پەرتەوازەم و خۆم کۆناکەمەوە !

سبەینێ دەڵێن زانای پایەبەرزی خواناس کۆچی دوایی کرد ، سابەو خوایە ئەگەر چاك بیانناسیمایە ئەسپەردەی خاکیان نە دەکردم !

بەخوا .. هاوار ئەکەم لە نەفسم وکەشفی دەکەم ، هەروەك چۆن کەم و کورتی دوژمن کەشف دەکرێ و ! دەگریم و دەناڵم هەروەك کۆست کەوتووی جەرگ بڕاوی ڕۆڵە مردوو !

بەخوا چاکەیەك شك نابەم کەلای خوا پیێ بپاڕێمەوە و بڵێم خوایە لەبەر فلانە چاکە لێم خۆش ببە ! .. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا هەرچەند ئاوڕدەدەمەوە فەزڵ و چاکەی خوادەبینم بەسەرمەوە کە سەروزیادمە و ، پاراستنی دەبینم لەگەڵ ئەوەدا کە دوژمنان زۆرن و بەدەسەڵاتن و ، هەرچیم داوا لیێ کردبێت هاتووە بەهانامەوە و بۆی جیێ‌بەجیێ کردووم .. ئاوام لەگەڵ دەکات خوای گەورە لەکاتێکدا کە ئەو دەوڵەمەندە و هیچ ئاتاجێکی بەمن نیە.

ئەوەش کارو کردەوەی منە ، لەکاتێکدا کە هەژاروکەم دەست و بێچارەم و هیچ بیانوویەکشم نیە ئەوەنەبێ کە دەڵێم :نەمزانی ، چیبکەم، لەدەستم دەرچوو! ، بەخوا پەروەردگار بەچاکی و لەش ساغ دروستی کردووم و دڵی بەجۆرێك رووناك کردووم بەزیرەکی ، کە زۆر شتی نادیارم بۆ دەردەکەوێ و زووتێ‌دەگەم .

سەدمەخابن بۆ تەمەنێ کەبەسەرچوو لە شتێك دا کە رازی بوونی خوای لەسەرنەبێ ، ئای بۆ مەحرومیم لەگەیشتنە پلەی رەزامەندی خوا !

ئای داخەکەم ( علی مافرطت في جنب الله ) ، چۆن دوژمنم بەخۆم خۆش کرد ! ئای لەورۆژەی کەلەبەر چاوی ئەوانەی کە بەچاکیان دەزانیم رادەگیرێم و ئەندامەکانی لاشەم شایەتیم لەسەر دەدەن و ئابڕووم دەبەن لەکاتی ئیقامەی حوججەت دا ..

پەروەردگارا ، پەشیمانم بەدڵ لەو پۆخڵەواتەم و هەستاوم بەراستی بۆ پاککردنەوەی هەرچی مابێ لەکەم و کوڕی و ناتەواوی ، هەرچەند پەنجا ساڵم و وەکو کەلوپەلی رزیووی بێ کەڵکم !

زانینەکەم رازی نابێ تانەمبات بەرەو رەوشتی بەرز و هیچ چارێکیشم نیە پەشیمانی و خەم خواردن نەبێ !

پەروەردگارا ، من بێ گوێیم نەکردووی لەوەدا کەنەزانم چەند نازو نیعمەتت پێ بەخشیووم ، یان بیرم چووبێ کەچەندە چاکەت بەسەرمەوەیە .. دەڵێم ببورە لەوەی کە ئەنجامم داوە ..

ئینجا ( ابن الجوزی ) پاش ئەوەی ئەم رازوونیاز وسەرزەنشتەی(ابن عقیل ) تۆمار دەکا دەڵێ : ( خۆ ئەمە بۆ ئەوەنیە کە گوناهی گەورەم لەدەست قەومابێ ؟! تاکەس ئەو گومانەم پێ‌نەبا کەوانیە ، بەڵام من کاروکردەوە و کەمتەرخەمیەکم هەیە کە نەئەبوو وابوومایە و ، لایەق نیە بەکەسێکی وەك من ، کە خوا ئەوەندە نیعمەتی زانست و تێگەیشتن و ژیری پێ داوم ) .

دیارە پیاوباشان دەیانەوێ لەرێی لۆمەی نەفسی خۆیانە موسڵمانان فێر بکەن و هۆشیاریان بکەنەوە ، ئەگینا ( ابن الجوزی ) زانایەکی ناودار بوو کە نزیکەی نەوەد ساڵێك ژیاو زۆرترین سوودی لەتەمەنی وەرگرت و بەسەدان پەڕاوی نووسی و هەردەم لە خزمەتی بانگەوازی خوادا بوو ، نزیکەی ( ١٠٠ ) هەزار موسڵمانی تاوانبار و گوناهکار لەسەردەستیا تەوبەیان کردووە و بیست هەزار کەسیش لەسەر دەستیا موسڵمان بوون، ( ابن عقیل ) یش دەڵێن بەهەمان شێوە بووە و پەڕاوێکی بەناوی ( الفنون ) ەوە نووسیوە کە هەشت سەد موجەڵەدە !

دەبێت تەمەنی چەند بووبێ و چۆن بەرەکەت کەوتبێتە ساتەکانی ژیانیەوە و توانیبێتی ئەو هەمووە بنووسێ و خزمەت بکات ؟!!

بێگومان ئەو دووزانایە پیاوی باش بوون و کاری مەزنیشیان کرد ، کە بەزۆر کەس ناکرێ ، بەڵام دیارە هەرچی بۆ قیامەت بکرێ هەر کەمە حەزرەت ﷺ دەفەرموێ : ( لو أن رجلاً يُجر علی وجهه من يوم ولد إلی يوم يموت هرماً في مرضاة الله عزوجل لحَقَرهُ يوم القيامة )

( ئەحمەد / المسند ١٨٥/٤ ، والصحيح الجامع / ٥٢٤٩) .واتە ئەگەر كەسێك لەو ڕۆژەی لەدایك دەبێت تا ئەو ڕۆژەی بە پیری دەمرێت لەسەر دەم ڕایكێشن و سزای بدەن لە ڕێی خوادا ، لە ڕۆژی قیامەتدا بەكەمی دەزانێ .

بەهەمان شێوە لە فەرموودەدا هاتووە كە شەهید لە قیامەتدا كە ئەو هەموو نازو نیعمەتە ئەبینێ داوا دەكات بگەڕێتەوە بۆ دنیا بۆ ئەوەی لەڕێی خوادا چەند جار شەهید بكرێتەوە ..

چاك وایە لە ژیانی دنیادا گورج و گۆڵ و گەرم و گوڕبین ، ئەوەتا پیاو باشێك لۆمەی زۆر لە خەڵكانی سەردەمی خۆی و زۆر لە ئێمەش دەكات و دەڵێ : ( عمرك يذوب ذوبان الثلج وتوانيك ابرد منـه ) واتـە : تەمەنت وەك بەفرو سەهۆڵ دەتوێتـەوە و هیممـەت و هەوڵیشت لەو بەفرو سەهۆڵە ساردترە ..

## وەكالەتی مزگێنی و مژدە !

یەكێ لە سیفاتە دەروونییەكانی مـرۆڤ زوو بـێ هیـوا بوونـە ، هـەروەك خـوای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿ وَلَئِنْ أَذَقْنَا الإِنسَانَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَاهَا مِنْهُ إِنَّهُ لَيَئُوسٌ كَفُور ﴾ ( هـود : ٩ ) بـەخوا ئەگـەر خـێرو خۆشـی و ئاسوودەییەكمان بـە ئـادەمیزاد بچێژیـن ، لەوەودوا بۆ تاقیكردنەوەی لێی بسێنینەوە ، ئەوە بەراستی دەبینین ئەو كەسە نائومێدو بێ هیوا و ناشكورە .

دیارە ژیان بەگشتی ڕەنج و ماندوو بوونـە و ، بانگخوازانیش زیاتر لە خەڵكی تر بۆ چەسپاندنی هەق و ڕاستی تووشی دەردەسەری و ناڕەحەتی دەبن ، بۆیە قورئانی پیرۆز پەروەردەیان دەكات لەسەر پشوودرێژی وبێ هیوا نەبوون ، هەروەك دەفەرموێت :﴿ وَلا تَيْئَسُوا مِنْ رَوْحِ اللهِ إِنَّهُ لا يَيْئَسُ مِنْ رَوْحِ اللهِ إِلا الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ ﴾ ( يوسـف : ٨٧ ) .واتـە : لەسۆز و میهرەبانی خوا نا ئومێد مەبن ، چونكە بەراستی كەس نائومێد نابێت لە سۆزو میهرەبانی خوا جگە لە كەسانی خوانەناس و بێ باوەڕ ..

بـەچاوگێڕانێكی خـێراش بەژیاننامـەی پـڕ بەرەكـەتی حـەزرەت دا ﷺ ، بۆمـان دەردەكەوێ كە هەرگیز بێ هیوا نەبووە ، تەنانەت لە كاتە سەختەكانیشدا كەتروسكایی بەدی نەكراوە ، ئەوە كاتی كۆچی بۆ مەدینە كە خۆی و ئەبوبەكر بوون و سوراقەش بە هیوای شاباش و خـەڵاتی زۆر هێرشـی بـۆ هێنـان و ، وڵاخەكـەی سـەرسمیداو كەوتـە خوارەوە ، كەزانی دەستی نایانگاتێ داوای ( أمان ) ی كرد ، حەزرەتیش مژدەی دایـە كەلـەداهاتوودا بازنـەكانی كیسـرا دەكاتـە دەستی ، وەهاتیشـەدی و كاتێ فـەتحی فـارس كراو غەنیمەتەكان هێنران بۆ مەدینە ، حەزرەتی عومەر بە سوراقەی فـەرموو ، بازنـەكانی كیسرا بكەرە دەست و بەناو موسڵماناندا تۆزێ پێوەی بگـەڕێ ، ئەویش كردیە دەستی و، دەستی بەرزكردەوە و بەناو موسڵمانان دا هات و چوو ..

لە غەزای خەندەقیش دا كە هەموو دەرگاكان لە موسڵمانان داخرابوون، دوژمنـان لـە هەموولایەكـەوە هێرشـیان هێنـابوو ، جوولەكـەش لـەناوەوە پـەیمانیان شـكاند بـوو ،

حەزرەت ﷺ کە لەسەر رای ( سلمان ) چالّی لێدا بۆ بەرگرتن لە دوژمن و هاوکاری هاوەڵانی دەکرد لە چاڵ هەڵکەندن و گڵ گواستنەوەدا ، بانگیان کرد بۆ تاشەبەردێکی گەورەی سەخت کە بەهاوەڵان نەدەشکا و حەزرەت کەپاچی لێداو پریشکی لێ بووە وە فەرمووی مژدەتان لێبێ فەتحی فارس و رۆم دەکەن ! سەرەنجامیش هەروا دەرچوو .. ..
( شایانی باسە درێژی چاڵەکە (٥) کم وپانی چوار مەترو قوڵی سێمەتر بوە ، جابزانە ئەو کارە لەو رۆژەدا چەند زەحمەت بووە و ئنجا بێهیواش نەبوون .. ) ..
لە رابوونی نوێش دا بەننا بەهاوەڵان و شاگردانی وت : بێ هیوا مەبن ، بێ هیوایی لە رەوشتی موسڵمانان نیە ، راستیەکانی ئەمڕۆ خەونەکانی دوێنێن هاتوونەتەدی ، خەوەکانی ئەمڕۆشمان راستیەکانی سبەینێن ، کات هێشتا بە بەریەوە ماوە و تا ئێستاش نیشانەکانی ساغی و سەلامەتی بەهێزن لە دەروونی گەلی بڕوادارمانا ، هەرچەند فەساد بڵاوە و تەشەنەی کردووە ، بێهێز و لاواز هەموو ژیانی هەروا نابێ و بەهێزیش تاهەتاهەتا بەهێز نابێ ( ونريد أن نمن على الذين استضعفوا في الأرض ونجعلهم أئمة ونجعلهم الوارثين ) .( الرسائل /الامام البنا ) .

## پیاوێك کە هەرگیز بێ هیوانەبوو !

شێخ محمد عبدالفتاح شریف ، یەکێکە لەبرا دێرینەکانی میسر ، کەلەسەرەتای چلەکانەوە پەیوەندی کرد بە پێشەوا بەنناوە ، لەو رۆژگارەدا کە موسڵمانان لە غەفڵەت و خەوێکی قوڵدا بوون .. لەو رۆژەوە کە بەیعەتی دا بەبانگەواز خۆی نەزر کرد بۆ کارکردن و هەوڵی بێوچان بۆ گەیاندنی بانگی خوا لەسەرتاسەری میسردا ، جا لەبەر ئەوەی ئەندازیار بوو لە بەڕێوەبەرایەتی رووپێوی میسردا و ، زۆر دەهات و دەچوو ، وە سەردانی زۆر لەشارو دێهاتەکانی دەکرد ، وەلەبەر ئەوەی کەسایەتی‌یەکی دیار و ناسراوو چالاك بوو لەگەڵ زۆربەی براکاندا تووشی بەندی و سزاو ئازارێکی زۆر بوو ، سزاو ئازارێك مەگەر لە ( محاکم تفتیش ) ی ئیسپانیادا رووی دا بێت .. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا بێ هیوانەبوو ، کۆڵی نەداو بەردەوام ورەی براکانی بەرز دەکردەوە و مژدە و مزگێنی ئەدانێ ، برایان ناویان نا( وەکالەتی مزگێنی‌ومژدە )! .
لەسەرەتای حەفتاکانا لە بەندیخانە ئازاد کراو و هەروەك جاران و بگرە گەرم و گوڕتریش لە جاران کەوتەوە بانگەواز کردن .. کاتێك ویستی ژن بخوازێ و خێزان پێکەوەبنێت .. هەر لەسەرەتاوە بەهاوسەرەکەی وت : دەمەوێ بزانی کەتۆ ( هەوێ ) یەکت هەیە ، کەئەویش بانگەوازی برایانە و ئەگەر رازیت ئەوا باشە و ئەگەرنا ئەوا بەکەڵکی یەکتری نایەین ! هاوسەرەکەشی بەم مەرجە رازی بوو ، هەمیشە پاڵپشت و هاوکارو هاوسەنگەری خەباتی بوو ، خەدیجە ئاسا کۆڵی نەدا تا ( ١٥ ) ساڵ لەمەوبەر گەڕایەوە بەر دەم بارەگای پەروەردگاری !کۆچی دوایی ئەم شاژنە خواناسە بانگخوازە هەمیشە یادەوەری‌یەکانی دەهێنایەوە بەرچاوی شێخ محمد و لەناو دۆستاندا بەخێر یادی دەکردەوە ، تا ئەمیش پاش زیاتر لەشەست ساڵ هەوڵ و خەباتی بێوچان

لەتەمەنی  نەوەدو پێنج ساڵی دا مەلی بەرزەفڕی گیانی دایە شەقەی باڵ و دنیای زەحمەت و ناڕەحەتی بەجێهێشت بەرەو رەحمەت و میهرەبانی خوای پەروەردگار .
هەزاران سلاو لەگیانی پیری خواناسی بانگخوازو هەموو ئەوانەی کەلەسەرتاسەری جیهاندا بۆ خوا خۆیان دەرەنجێنن ! ( گۆڤاری المجتمع ١٥٠٢ ) .

## دوو هیممەت بەرز

❁**ئەو پیاوەی عەرشی بۆ هاتە لەرزە** : سەعدی کوڕی معاذ گەورەی بنی عبدالأشهل بوو ، پێیان وت : تۆ چۆن رێ ئەدەی ( مصعب کوڕی عومەیر )ێکی بێگانە بەم خاك و ئاوە ، ئاوا بکات و سەرلەخەڵکی تێك بدات ؟ ئەویش شمشێرەکەی هەڵگرت و چووە لای مصعب و داوای لێکرد ئەو ناوە بەجێ بهێڵێ و واز لەخەڵکی بهێنێ ، ( مصعب ) ی بانگخوازیش داوای لێکرد کە تاوێك دانیشێ ، کاتێ دانیشت و قسەی بۆ کرد خوای گەورە هیدایەتی‌دا .. جا هەر ئەوەندەی چووەوە ناو هۆزەکەی وتی : من چۆنم لەناوتاندا ؟ وتیان : تۆ گەورەی ئێمەیت ! وتی :قسەی ژن و پیاوتان لەمن حەرام بێت تا موسڵمان دەبن !  ..هەرهەموویان موسڵمان بوون ..
( سەعد ) یەکسەر لەوەحاڵی بوو کە ئەم ئاینە پێویستی دەکات لەسەری بانگخوازبێت و دەستی خەڵکانی تر بگرێت ، تاوەك خۆی سەرفراز بووە خەڵکانی تریش ئاوا سەرفراز بن ..
سەعد حەوت ساڵ تێکۆشا بۆ ئیسلام ، بەو ماوەکەمە توانی بەفەزڵی خوا باشترین پلە بەدەست بهێنێ .. لە رۆژی خەندەق دا بەتیرێك بریندار بوو ، دوعای کرد ، خوایە ئەگەر پێغەمبەرەکەت ﷺ جەنگی ماوە لەگەڵ جوولەکەکاندا ئەوا بمهێڵە بۆ گیانیان ، وەخۆت دەزانی لەبەر تۆ چەند رقم لێیانە ! وە ئەگەر جەنگیشی نەماوە لەگەڵیان بمبەرەوە بۆ لای خۆت ! خوای گەورەش دوعاکەی گیرا کردوو ، برینەکەی تووشی خوێن بەربوون بوو وەبەشەهیدی سەری نایەوە !
کاتێك بردیان بۆ سەرقەبران ، حەزرەت ﷺ فەرمووی : رەنگە سەرتان بسوورِمێ لە سووکی تەرمەکەی ، بزانن کە حەفتا هەزار مەلائیکەت ئامادەی ناشتنەکەی بوون .. وە عەرشی خوا بۆ گیانی کەوتە لەرزە !

❁ **بانگخوازێکی بە ئەمەکی ماندوو نەناس :**
( ئەنوەر جندی ) قوتابی قوتابخانەی برایان بوو ، پرسیاری لێکرا تۆ کێیت ؟وتی : من پارێزەرێکم لەمەسەلەی حوکم کردن بەقورئان دا ، کراوم بەوەکیل ، لەورۆژەوە کە پێشەوا بەننا ئەم ( قضية ) یەی بەرزکردەوە و لە پێناویا شەهید بوو لەنزیکەی ( ٥٠ ) ساڵ لەمەوبەردا ، لەورۆژەوە منیش ( دفاع ) دەکەم و ( مذکرات ) بەرز دەکەمەوە ، بەهۆی ئەو تەکلیفەوە کە خوا خستوویەتیە گەردنم بەو ( پەیمان و بەیعەتەی‌کە خوا لێی وەرگرتووین و تیایا دەبێ سەرو ماڵمان بفرۆشین بەخوا بەرامبەر بەبەهەشت ﴿ إِنَّ اللَّـهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ ﴾**التوبه**..

ساڵی ( ١٩٤٠ ) خاڵی وەرچەرخان بوو لەژیانیدا ، کاتێك پەڕاوی ( وجهة الأسلام ) ی خوێندەوە کە کۆمەڵێك ڕۆژهەڵات ناس دایان نابوو ، مامۆستا ( جندی ) تێگەیشت کە پیلانی دوژمنان چەند سەختە بەرامبەر ئیسلام .. بۆیە خۆی نەزر کرد بۆ پارێزگاری کردن لەم دینەو تا وەفاتی کرد سەنگەری پارێزەری و پاراستنی ئیسلامیبەجێنەهێشت هەرچەند ئاستەنگ خرایە ڕێی و ساڵێکیش لەگەڵ برایاندا بەندکرا ، نەرم نەبوو بۆیان و شەوو ڕۆژی دایە دەم یەك و ڕووبەڕووی فکری ڕۆژئاوا بووەوە و ، هەمیشە دڵنیا بوو کە پاشە ڕۆژوو سەرەنجام هەر بۆ ئیسلامە ..

ئەم شۆڕەسوارە نەبەردەی مەیدانی ئیمان و ئیسلامەتی لەسەرە مەرگیدا پاش تەمەنێکی پڕ خێر و بەرەکەتی هەشتاو پێنج ساڵی بە کچەکەی وت ( دەزانیت کە سەدەها پەڕاوم هەیە لای دەزگاکانی بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ، قەت نەکەی دەست پانکەیتەوە وپارەوەبگری ، هەرچی بۆ خۆی شتێکی دایتیێ وەری گرەو هەرچیش ئینکاری کردو نەیدا گەردنی ئازاد بێت .. ) .

مامۆستای خواناسی بانگخواز دوژمنانی پێش دۆستانی شایەتی خێری بۆ ئەدەن ، لەهەوڵ وخەبات و نووسین بەردەوام بوو تا لە ( ٢٨ ی ینایر ٢٠٠٢ ) ئێوارەی ڕۆژی دووشەممە مەلی بەرزە فڕی گیانی دایە شەقەی باڵ و بەرەو خۆشەویستان ( حەزرەت و یارو یاوەران ) کەوتە ڕێ .. بە ئیمامەتی ڕابەری گشتی برایان ، زۆرێك لەهاوسەنگەرو موسڵمانان نوێژی مردوویان لەسەر کردو بۆ دواجار خواحافیزیان لێ کردو بەچاوی پڕ فرمێسکەوە بەخوایان سپارد ، ئەو خوایەی کە سپاردەزایە ناکات ..

شایانی باسە لەدوا ساتەکانی ژیانی داو ، لەدوا چرکەکانی سەرەمەرگ دا ، مامۆستا ( جندی ) بە دەم شایەتمان و سروودی ( فداك ابي وأمي يارسول الله .. فداك ابي وأمي يارسول الله .. ) گیانی سپاردوو چاوی لێك نا .. ( ل ٢٠١ گۆڤاری الایمان ژمارە / ١٠ )

لەکۆتایی ئەم گەشتەو دوا دڵۆپی بەهاری پێنجەم دا ئێمەش بەهیوای بەهاری هەتاهەتایی لەبەهەشتی بەرین دا ، لە خزمەت حەزرەت و یارو یاوەران و ساڵحان دا ، دەڵێین ( خۆمان و باوك و دایکمان و هەرچیمان هەیە بەفیدات بن ئەی پێغەمبەری خوا ) .

## سەرچاوەکان


١. تەفسیری ئاسان .

٢. الأنجيل الذي قادني الى الأسلام / م . ج . لوبلا .

٣. لە خزمەت قورئاندا . نووسەر .

٤. نفحات علمية من القرآن والسنة . د . دلاور محمد صابر .

٥. بحوث مقارنة بين العلم الحديث والكتاب والسنة . د. دلاور محمد صابر .

٦. گۆڤاری / الایمان / ژمارە / ١٠ .

٧. الأخفياء / وليد باحكم .

٨. التوريث الدعوي / د . محمد موسى الشريف .

٩. الأخلاق / عمر و خالد .
١٠. تفسير الشعراوي / جلد ١
١١. مجلة الأسرة / ٧٦ .
١٢. وتارى ( رسائل ربانية ) عمروخالد .
١٣. مجلة المجتمع / ١٥٠٢ .
١٤. التربية الجماعية / منير الغضبان / جلد ١ .
١٥. الأنترنيت ـــ المواقع الأسلامية .
١٦. محاضرة المواعظ ـــ سلمان فهد العودة .
١٧. قصص من مدغشقر ـــ قناة أقرأ ـــ ندوة الأسبوع . محمد حمد الخميس .
١٨. ابنتي الحبيبة هذا هو الطريق الى الجنة / عبدالرحمن السنجري .
١٩. مجلة الاعجاز /٣/ ١٤١٨ ك
٢٠. حقائق العلم الحديث /عبدالرحمان العصافى


## ناومرۆك

# بەهاری دڵان

بەرگی شەشەم

**پێشەکی**

**سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای پەروەردگاری جیهان ودروودو سەلامیش لەسەر گیانی حەزرەت و یارو یاوەران و شوێن کەوتووان :**

**بەرگی شەشەمی بەهاری دڵان دێتە بەردەم عاشقان و خۆشەویستانی بەرنامەی خوای پەروەردگار ، کەپێك هاتووە لەچەند تەوەرەیەك :**

**١)جوولەکەو فێڵ و تەڵەکەو شایەتی درۆیان ، بۆ ئەوەی چاکتر بیانناسین و لەسیاسەتی ئەمرۆشیان تێبگەین کەهەرگیز ئاشتیان ناوێ و بەردەوام ئاگری شەڕو ئاژاوە هەڵدەگیرسێنن** (كلّما أو قدُوا ناراً للحرب أطفأها الله، و يسعون في الارض فساداً و الله لايُحِبُّ المُفسدين) **٦٤ البقره .**

**٢)خوای گەورە هەرچی دروست کردووە بەچاکترین شێوە دروستی کردووە و مرۆڤیشی بەچاکترین و باشترین شێوە نەخشاندووە و داواشی لێکردووە کەدوای باشترین و چاکترین بەرنامەیەك بکەوێت کەلەخواوە بۆی نێردراوە بەپێغەمبەراندا ..**

**٣)جالەبەر ئەوەی کەباشترین کارو کردەوە داوا کراوە لەمرۆڤ لەم تاقیکردنەوەیەی ژیانی دنیادا ، هەق وایە بگەڕێین بەدوای ئەوکارو کردەوانەدا کەزۆر چاکن و کات بەفیڕۆ نەدەین و ، یەکێ لەو پلەو پایە بەرزو کارە مەزنانەش بانگەواز کردنە ، بۆیە هەق وایە بانگخواز بین لەگشت کاتێکدا ، لەخۆشی و ناخۆشی دا ، لە ژیان و تەنانەت لەسەرەمەرگیشدا ..**

**بەکورتی وبەکوردی مەبەستمان ژیانە بۆ ماوەیەك لەبەهاری ئیمان و ئیسلامداو سازدانی گەشتێکە بەگوڵزا ری گوڵستانی قورئان و فەرموودەدا ...**

**هەرئێستاش وادەکەوینە رێ لەم گەشتە ئیمانی یە دا بەڕێزیشت بفەرموو لەگەڵماندا**

## جوولەکەو خەڵەتاندی ملیۆنەها گاور:

**جوولەکە ئەو گەلەن کە تالآویان کرد بە گەرووی حەزرەتی موسادا سەلامیخوای لێ بێت و هەتا لەژیاندا بوو گەورەترین ئازاریان دا ، هەروەك قورئان دەفەرموێت :**

﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِي وَقَدْ تَعْلَمُونَ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ فَلَمَّا زَاغُوا أَزَاغَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ وَاللَّهُ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ (الصف:٥) **واتە /بیریان بخەرەوە ، کاتێك کەموسا بەقەومەکەی وت : ئەی گەل و هۆزم ئێوە بۆچی ئازاری دڵ و ڕۆحم دەدەن ، لەکاتێکدا بەڕاستی دەزانن کەمن پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خوام بۆتان ، جاکاتێك ئەوان**

گوێیان بۆ ڕاستی نەگرت و لەهەق لایاندا ، خواش دڵەکانیانی لەخشتە بردو مۆری پیا نا ، چونکە خوا ڕێنمووی هۆزی تاوانکارو لەسنوور دەرچوو ناکات .
پاشان هەرچی خراپ بوو کردیان دەرهەق بەحەزرەتی عیسا ( سەلامی خوای لێ بێت)، بوختانیان بۆ مەریەم کردو هەوڵی کوشتنی حەزرەتی عیسایان دا ...
کەحەزرەتی (محمد)یش هات (ص)ئەوە مێژوو شایەتە چیان کرد لەتاوان و خیانەت کاری جانەك هەر لەدەوڵەتی ئیسلامی دا ئەمە پیشەیان بووە ، بگرە لەهەر ولاتێکدا بووبن کەوتونەتە ئاژاوە نانەوەو ، پارەپەیدا کردن بەسوو خۆری و بەدڕەوشتی و .هتد بۆیە لەهەر ولاتێك تاوانباریان ئاشکرا بووبێت قەتڵ و عامیان کردوون .
کاتێك لەڕوسیاو ئەوروپای ڕۆژهەلات کەوتنە گیانیان ، کۆچیان کرد بەرەو ئەوروپای خۆرئاوا ..دەڵێن لەساڵی (١٦٠٧)دا لاهوتی یەکی جوولەکە بەناوی (توماس برایتمان)لە پەڕاوێکی دا باسی بیرو بۆچوونێکی کرد کە گوایە خوا دەیەوێت جوولەکە بگەڕێتەوە بۆ فەلەستین بۆ خواپەرستی لەوێ ..هەندێ لەبیریارو ژیرەکانی ئەوروپا وتیان بۆ ئەوەی لە کۆچی جوولەکە ڕزگارمان بێت و ئەو بەلایەمان لەکۆڵ بێتەوە ، چاك وایە ئەو بیرو بۆچونە وەرگیرێ و جوولەکە ڕووی بکرێتە فەلەستین ....
لەساڵی ١٦٤٩ دا دوو جوولەکەی لاهوتی بەریتانیا کە لە هۆڵەندە دەژیان نامەیەکیان ئاڕاستەی حکومەتی بەریتانی کردو تیایا داوایان لێ کرد کە شەرەفمەندبێت بە گواستنەوەی جوولەکە بەکەشتی بەریتانی بۆ فەلەستین ، چونکە ئەوە ئیرادەی خوایە جائەم بیرو بۆچوونە پەرە پێدرا لەسەدەی نۆزدەدا ..گوایە خوا دوو مەملەکەتی هەیە یەکێکیان لەسەرزەوی کە ئیسرائیلە و مەملەکەتێکیش هەیە لەئاسمان کە (کەنیسە) یە و.. حەزرەتی (عیسا)ش بۆ جارێکی تر دێتەوە سەر زەوی ، بەلام لە کاتێکدا دێت کە جوولەکە کۆبووبنەوە لە فەلەستین دا و، جەنگێکی گەورە لە (هەرمجدون)لەشام ڕوودات ئەم بیرو بۆچوونە هەڵەیەیان لەئەمریکادا بەتایبەتی بلاو کردەوەو دەڵێن نزیکەی چل ملیۆن مەسیحی دڵیان بەمە خۆشەو هەوڵی زۆر دەدەن و پشتیوانی جوولەکە دەکەن و ئەو یارمەتیەی لەمانەوە بۆی دێت ، لەهەموو جوولەکەکانی جیهانەوە ئەوەندەی دەستناکەوێ..ئەم کۆمەڵە گاورەی کە ئاوا بیردەکەنەوە پێ یان دەوترێ (المسيحية الصهيونية)، کەخەڵکانی کاربەدەست و سیاسی و دەسەلاتداری گەورەیان لەگەڵدایە ، یەکێ لەوانە سەرۆکی ئەمریکی ڕیگان بوو کە دەیووت :من ئاواتە خوازم کە خوا پایەدارم

بكات بەوەی کە دەست بنێم بەسویچی نەوەوی یەکەداو شەڕی هەرمجدون هەڵگیرسێ و زوو حەزرەتی عیسا بگەڕێتەوە ..
هەروەها لەزەمانی (ریگان)دا ، (بات روبرتسون) کە یەکێکە لە سەرکردەکانی ئەم دەستەو تاقمە ئامادەی کۆبوونەوەکانی مەجلیسی ئەمنی قەومی ئەمریکی دەبوو ، بۆئەوەی هەر بڕیارێکیاندا لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا بگونجێ لەگەڵ بیرو بۆچوونی ئەو کۆمەڵەداو لە بەرژەوەندی ئیسرائیل دابێت ..
بۆهەڵبژاردنی بۆشی بچوک ئەم کۆمەڵە ڕۆڵێکی گەورەیان بینی ، چونکە (بۆشی کوڕ) ئالوودەی مەی خواردنەوە بوو ، توانیان بیهێننە مەیدانەوە و لە سەدا چلی دەنگەکانی بۆمسۆگەر بکەن .
ئەم کۆمەڵە دەوری (بۆش) یان گرتووە و، ڕاوێژکاری زۆر نزیکی (جیری فولویل ) ە کە لەم کۆمەڵەیەو بیست ساڵە بەرنامەیەکی سەعاتی هەیە لە تەلەفزیۆنی ئەمریکی داو ، وەزیری دادی ئەمریکیش هەر لەمانەو زۆر ( متطرف)ە .تەنانەت نووسەری وتارەکانی سەرۆك بۆش (مایکل جارسون) ە کە یەکێکە لەو دەستەو تاقمە ، بۆیە هەندێ عیبارات لەوتارەکانی سەرۆکدا یە کە لە لای ئەو دەستەو تاقمە ڕەواجی هەیە وەك (ناوهێنانی هێرش بۆسەرجیهانی ئیسلامە لەمەسەلەی تەقینەوەکانی ئەمریکا بەشەڕی خاچ پەرستان ، هەروەها عیبارەتی ( العدالة المطلقة ) و ..هتد ) ..
لەبەر ئەوانەی کەلەپێشەوە باسمان کرد، ئەمریکا ڕەنگە چاو لەهەندێ بەرژەوەندی خۆی بپۆشێ لەبەرخاتری جوولەکە ، چونکە ئەوە بە واجبێکی دینی دەزانن ، کەزوو جوولەکە بەهێز ببێ و عیسا دەبەزێت لایان!
ئەو دەستەو کۆمەڵە بەلایانەوە گرنگە کە قودس بگرن و پاشان مزگەوتی ئەقسا بڕوخێنن و هەیکەلی سولەیمان بینا بکەنەوە !بۆیە لە ساڵی ١٩٦٩ دا ئەوەی کە مزگەوتی ئەقسای سووتاند یەکێ بوو لە کۆمەڵی (المسیحیة الصهیونیة) ! ..
ژنە نووسەری ئەمریکی (جریس هلسل) لەم کۆمەڵە بوو کە لە مەرامی گلاویان تێگەیشت پیلانەکانیانی ئاشکرا کرد لەپەڕاوی (النبوة و السیاسه) کە لە ئەمریکا چاپ کرا .. جوولەکەش هەرچی لێ بکەوتایەتە بازاڕەوە دەیان چنیەوە و فشاری زۆریان خستە سەرناوبراو ...پاشان پەڕاوێکی تری دەرکرد بەناوی (یدالله)کە ئەمیش هەرلەسەرئەو

**مەسـەلەیەیەو ، دای بـە (د. محمـد سمـاك)كـەوەری بگێڕێتـە سـەر زمـانی عـەرەبی ..( المسيحية الصهيونية/ برنامج بلا حدود ٣٠ / ١٢/ ٢٠٠٢ )**

## شاردنەوەی هەق وڕاستی:

**جوولەكە دڵنیا بوون لەپێغەمبەرێتی حەزرەت (ص)و، چۆن منداڵی خۆیان دەناسی ئاوا حەزرەتیشیان دەناسی ، بەڵام خۆیان لێ هەڵە دەكرد و دانیان نەئەنا بەوڕاسـتی یـەدا، قورئان دەفەرموێ** ﴿ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمُ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ فَهُمْ لا يُؤْمِنُونَ ، وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللهِ كَذِباً أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ إِنَّهُ لا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ ﴾ (الأنعام: ٢١)

**واتە / ئەوانەی پەڕاوی ئاسمانیمان پێداون لـەگاورو جـوو پێغەمبـەر (ص)دەناسـنەوە هەروەك چۆن منداڵەكانی خۆیان دەناسنەوە ، بەڵام ئەوانەی خۆیـان دۆڕانـدو بڕوایان بە محمـد (ص)نـەهێناوە ، ئـەوە هـەربڕوا نـاهێنن ، جاكـێ هەیـە لـەوە سـتەمكار تربێـت ، كەشتی نادروست و درۆ بۆخوا هەڵبەستێ ؟ یا ئایەت و فەرمانەكانی خوا بەدرۆ بزانێت ؟ چونكە بەڕاستی ئەو ستەمكارانە سەرفراز نابن .هـەروەها لـە سورەتی** (البقـرة) **ش دا ئایەتی (١٤٤)دەفەرموێت :** ﴿ قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ المَسْجِدِ الحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنْتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ وَإِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الكِتَابَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الحَقُّ مِنْ رَبِّهِمْ وَمَا اللهُ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ، وَلَئِنْ أَتَيْتَ الَّذِينَ أُوتُوا الكِتَابَ بِكُلِّ آيَةٍ مَا تَبِعُوا قِبْلَتَكَ وَمَا أَنْتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْ وَمَا بَعْضُهُمْ بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍ وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُمْ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ العِلْمِ إِنَّكَ إِذاً لَمِنَ الظَّالِمِينَ﴾ (البقرة:١٤٥)

**واتە /ئەی پێغەمبەر (ص) بەڕاستی چاوگێڕان و هەڵسوڕانی ڕووخسـارت ڕوو بـەئاسمان دەبینـین ، كەبەهیوای ڕووگەیـەكی تایبـەتیت ، ئێمـەش ئاگـاداری نیـازی دڵـت بـووین ، سوێند بەخوا ئێمەش ڕووت وەردە چەرخێنین بۆ ڕوو گەیەك پێی ڕازی وخۆشنوود بیت ، دەڕووت وەرچەرخێنە بـەرەو لای كەعبـە و ئێـوەش ئـەی موسـڵمانان لەهـەركوێ بـوون ، بـەرەولای ئەوێ ڕووتـان وەربچـەرخێنن ، بەڕاسـتی ئەوانـەش پـەڕاویان پێگەیشـتووە لـە گـاورو جوولەكـە چاك دەزانـن كـە ئـەم گۆڕانـی ڕووگەیـە هـەق و ڕاسـتیەو فـەرمانی پەروەردگاریانەو خواهەرگیز بێ ئاگا نیە لەو كار وكردەوانەی ئەنجامی دەدەن .**

**سوێند بەخوا ئەگەر بچیت بۆلای ئەوانەی پەڕاویان بۆهـاتووە ، بەهەموو بەڵگەیەكەوە ، بۆئـەوەی شـوێنی ڕاستی بكـەون و ڕووبكەنـە ڕووگـەی تـۆ ، ڕووی تێناكـەن و بەقسـەت ناكـەن ، تـۆش هـەرگیز شـوێنكەوتەی ڕووگـەی ئـەوان نـابیت ، ئـەوانیش هـە ندێكیـان**

شوێنکەوتەی ڕووگەی هەندێکی تریان نین ، سوێند بەخوا ئەگەر تۆ شوێن هەواو ئارەزووی ئەوان بکەویت ، دوای ئەوەی زانیاری تەواوت پێڕاگەیەنرا لەم بارەیەوە ، بێگومان تۆدەچیتە ڕیزی ستەمکارانەوە..

ئنجا دەفەرموێت ( الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمْ وَإِنَّ فَرِيقاً مِنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ الحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ . الحَقُّ مِنْ رَبِّكَ فَلا تَكُونَنَّ مِنَ المُمْتَرِينَ)(البقرة:١٤٧)

واتە ئەوانەی پەڕاومان پێ بەخشیوون پێغەمبەر (ص)دەناسن ، هەروەك چۆن منالی خۆیان دەناسن ، بێگومان ئەوان ئەو ڕاستیە دەشارنەوە ، لە کاتێکدا دەشزانن محمد (ص)فرستادەی خوایە..هەق و ڕاستی هەر ئەوەیە لەلایەن پەروەردگارەوە پێت ڕاگەیەنراوە ، نەکەی لە ڕیزی ئەو کەسانەدا بیت گومان و دوودڵی دروست دەکەن ..

## خراپترین شایەتی :

دوای شەڕی ئوحود ژمارەیەك لە گەورە پیاوان و زانایانی جوولەکە هاتن بۆ مەککە بۆ هاندانی کافران دژی پێغەمبەر (ص) ، یەکێ لە ئامادەبوان ( کەعبی ئەشرەف ) بوو .. ئەبو سوفیان پێی وت : ئێوە پێغەمبەرتان هەیەو پەڕاوتان هەیە و خۆتان دەزانن (محمد)یش لافی پێغەمبەرایەتی لێ ئەدات و کێشەی بۆ ناوینەتەوە و ئێمەش خزمەتی کەعبەی ماڵی خواو حاجیەکان دەکەین ، جا توئەو خوایەی کە دەریای شەق کرد بۆ موسا ، ئێمە لەسەر هەقین یان (محمد)، ئەویش وتی : مادام سوێندتان دام ئێوە لەسەر هەقن ..کە ئەمەش خراپترین شایەتی بوو ناوبراو دای و بووە مایەی لەعنەتی خوا بۆی ، چونکە دڵنیا بوو کە حەزرەت (ص)و موسڵمانان لەسەر هەقن و خواپەرستن بەڕاستی و کافرانیش بت پەرستن و نەفامن ..قورئان ئەم شایەتی یە ناهەقەی تۆمارکردووەو دەفەرموێت :

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيباً مِنَ الكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا هَؤُلاءِ أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا سَبِيلاً، أُولَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ وَمَنْ يَلْعَنِ اللَّهُ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ نَصِيراً ﴾ (النساء:٥٢)

واتە/ ئایا نەتڕوانیوەتە ئەوانەی بەشێك لەپەڕاوی ئاسمانیان پێدراوە ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕیان بەفاڵچی و جادووگەرو بت و پەیکەرو شەیتان هەیەو دەربارەی کافران دەڵێن ، ئەوان چاکترن و ڕێبازی ڕاستر یان گرتووە لەوانەی کەبڕوایان هێناوە بەئیسلام ، ئەو جوولەکانە کەسانێکن خوا نەفرینی لێکردوون ، کەسێکیش خوا نەفرینی لێ بکات ، ئەوە هەرگیز هیچ کەست دەست ناکەوێت بیکەیتە پشتیوانی ..

## ئەم قورئانە :

ئەوانەی دژایەتی ئەم قورئانە دەکەن لەدەست خوادەرناچن ، قورئان دەفەرموێت ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي آيَاتِنَا لا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَا أَفَمَنْ يُلْقَى فِي النَّارِ خَيْرٌ أَمَّنْ يَأْتِي آمِناً يَوْمَ الْقِيَامَةِ اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ (فصلت:٤٠)

واتە : بەڕاستی ئەوانەی کەسەرسەخت و بێ بڕوان و دژایەتی ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە دەکەن و لێی لائەدەن ، خۆیان ناشارنەوە لە ئێمە ،باشە فڕێ بدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە چاکترەیان ئەوکەسەی کە بەدڵنیایی و ئارامی و هێمنیەوە دێت لەڕۆژی قیامەتداو بەرەو بەهەشت بەڕێزەوە بەڕێ دەکرێت ؟! ئەی بێباوەڕان هەرچیتان لەدەست دێت بیکەن ، چونکە لەدەست خوادەرناچن ، دڵنیاش بن خوا بینایە بەو کردەوانەی کەدەیکەن .

پاشان دەفەرموێت ﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِالذِّكْرِ لَمَّا جَاءَهُمْ وَإِنَّهُ لَكِتَابٌ عَزِيزٌ،لا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلا مِنْ خَلْفِهِ تَنْزِيلٌ مِنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴾ (فصلت:٤٢)

واتە /بەڕاستی ئەوانەی کەباوەڕیان نەبووە بەو قورئانە لەکاتێکدا بۆیان هات ، بێگومان ئەو قورئانەش کتێبێکی زۆر بەنرخ و ناوازەوسەرکەوتووە ، هیچ ناهەقیو نادروستی و ناتەواویەك ڕووی تێناکات لەهیچ کاتێکدا و لەهیچ لایەکەوە ، ڕەوانەکراوو نێردراوی زاتێکە کەخاوەنی حیکمەت و داناییە و شایانی سوپاس و ستایشە .

هەروەها دڵنەوایی حەزرەت (ص)دەکات و دەفەرموێت ﴿ مَا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِنْ قَبْلِكَ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ﴾ (فصلت:٤٣)

واتە/ئەی پێغەمبەر (ص)شتێك بەتۆ ناوترێت ، کەبەپێغەمبەرانی پێش تۆ نەوترابێت ، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ خاوەنی لێبوردن و لێخۆشبوونە بۆ باوەڕداران و تۆڵە سێنەری بەئازارو بەئێشە لەبێ باوەڕان .

## هیدایەت و سەرفرازی لەم قورئانەدایە :

قورئان لەسورەتی الاعراف دا دەفەرموێ ﴿ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوباً عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْأِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنْزِلَ مَعَهُ أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾

(اعراف:١٥٧)

واتە /ئەوانەی کەشوێنی ئەم پێغەمبەرە هەواڵدەرە نەخوێندەوارە دەکەون ، ئەوەی کە

گاورو جوولەكە ناونیشانی نووسراوە لایان لەتەورات و ئینجیلدا ، فەرمانیان پێدەدات بەچاكەو قەدەغەی گوناهو خراپەیان لێ دەكات و هەرچی یەك پاكو چاكە بۆیان حەلاڵ دەكات و هەرچیش پیس و ناپوختە لێیان حەرام دەكات و ئەو ئەركە قورس و گرانەیان لەسەر شان سووك دەكات و، ئەوكۆت و زنجیرانەش كەلەسەریان بوولای دەبات ، جائەوانەی باوەڕیان پێ هێناوە و پشتیوانیان لێكردووە و پشتگیریان كردووەو شوێنی ئەونوورە كەوتوون كەقورئانەو هاوڕێ لەگەڵیدا ڕەوانە كراوە ، هەرئەوانە سەرفرازو ڕزگارن .

## خوای گەورە بەكەس ناخەڵەتێ

دووڕووەكان بەسەر زارەكی موسڵمان بوو بوون و لافی ئیمانداریان لێ ئەدا لە بەرچاوی موسڵمانان ، وایان دەزانی خواو موسڵمانان دەخەڵەتێنن ، بەڵام دیارە خوای گەورە بەكەس ناخەڵەتێ ،هەروەك دەفەرموێت :

﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّا أَنْفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ، فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضاً وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾ (البقرة:١٠)

واتە /لەناو خەڵكیدا كەسانێك هەن كەدەڵێن : ئیمان وباوەڕمان بەخواو بەڕۆژی قیامەت هێناوە، لەڕاستیدا ئەوانە درۆ دەكەن و ئەوانە باوەڕدارنین ..

ئەوانە بەخەیاڵی خۆیان وادەزانن خواو ئەو كەسانە دەخەڵەتێنن كە باوەڕداری ڕاستەقینەن ! كەچی جگە لەخۆیان كەسیان پێ ناخەڵەتێت ، بەڵام هەست ناكەن و فام ناكەنەوە و بیر ناكەنەوە .

ئەوانە لەدڵ و دەروونیاندا نەخۆشی بێ باوەڕی و حەسوودی و كینە هەیە ، خواش بەسەرخستنی هەق و ئیمانداران ئەوەندەی تر دەردیان گران دەكات و سزایەكی سەختیش لەدنیاو قیامەتدا چاوەڕێیانە بەهۆی درۆكردن و دژایەتیان بۆ ئیسلام .

## هیچ لەخوا ناشاردرێتەوە !

جوولەكەكان لەناو خۆیاندا پیلانیان دائەناو بەیەكتریان دەووت : باهەر خۆمان بیزانین و باموسڵمانەكان ئەم مەسەلانە نەزانن و ئاگادار نەبن كەلەسەر هەقن ، بۆ ئەوەی لەقیامەتدا نەبن بەحوجەت بەسەرمانەوە ، كەبەڕاستی ئەمەش لوتكەی خۆخەڵەتاندنە ؟! ئەگینا ئەگەر ئەمان ئاشكرای نەكەن ، خوا ئاگای لەچرپەو نهێنی یان نی یە؟! دەیانەوێ لەخوای بشارنەوە ؟ دیارە ناشاردرێتەوە بۆیان و خوا بەكەس ناخەڵەتێ ! قورئان لەبارەی ئاگا لێ

**بوونی خواوه دەفەرموێ** ﴿يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ وَلا يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لا يَرْضَى مِنَ الْقَوْلِ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطاً﴾ ( النساء: ١٠٨ )

**ئەوانەی دەیانەوێ خیانەت و تاوانەکانیان لەخەڵکی بشارنەوە ، لە کاتێکدا ناتوانن لەخوای بشارنەوە لەگەڵیانداو چاودێریان ، بەنهێنی و بەشەودا قسەی وا هەڵدەبەستن کەخوا پێی ڕازی نیەو خوا بەردەوام گەمارۆی ئەو کارو کردەوانە ئەدات کەئەنجامی دەدەن .هەروەها لەئایەتێکی تردا لەبارەی دوو ڕوەکانەوە دەفەرموێ** ﴿وَيَقُولُونَ طَاعَةٌ فَإِذَا بَرَزُوا مِنْ عِنْدِكَ بَيَّتَ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ غَيْرَ الَّذِي تَقُولُ وَاللَّهُ يَكْتُبُ مَا يُبَيِّتُونَ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ وَكِيلاً﴾ النساء ٨١ **واتە /دوو ڕووەکان کاتێك لای تۆن دەڵێن: ملکەچ و فەرمانبەردارین ، بەڵام کاتێك لای تۆ هەستان و دوورکەوتنەوە ، دەستەیەکیان قسەکانی تۆ بەنهێنی و لەشەودا دەگۆڕن و ئەوە ناڵێن کەتۆ وتوتە ، جائەوەی شەو هەڵی دەبەستن بەنهێنی و پیلانی بۆ دائەنێن ، خوا تۆماری دەکات ، کەواتە گوێ بەوانە مەدەو پشت بەخوا ببەستە ، تەنها خوات بەسە کە یارو یاوەرت بێت .**

**بەڵێ خوای گەورە ئاگاداری نیەت و دڵی دوژمنانە بۆیە ئەی (محمد)مەترسە ، ئەگەر بیانەوێ بتخەڵەتێنن تۆ خوات بەسە کە ئاگاداری هەموو شتێکە**﴿وَإِنْ جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ, وَإِنْ يُرِيدُوا أَنْ يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ اللَّهُ هُوَ الَّذِي أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ وَبِالْمُؤْمِنِينَ﴾ **(الانفال:٦٢)**

**واتە /ئەگەر دوژمنان بەلای ئاشتیدا دایانشکاندو حەزیان پێکرد ، تۆش ئەی (محمد)ئامادەیی خۆت دەربڕە و پشت بەخوا ببەستە چونکە بەڕاستی ئەوزاتە بیسەروزانایە بەپیلان و نەخشەی دوژمنان ..**

**خۆئەگەر خوانەناسان بەداخوازی ڕێکەوتن و ئاشتی و یستیان بتخەڵەتێنن ، ئەوە دڵنیابە کەپشتیوانی خوا بەستە کەنەیەڵێ بکەویتە ناو پیلان و نەخشەیانەوە چونکە هەر ئەوزاتە کاتی خۆی پشتیوانی لێکردیت و سەری خستیت و ئیماندارانیشی کردە هۆیەك بۆبەدەستهێنانی سەرکەوتن ...**

## پیلانێکی جوولەکە:

**قورئانی پیرۆز پیلانێکی ترسناکی جوولەکە ئاشکرا دەکات و دەفەرموێت** ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ,وَقَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمِنُوا بِالَّذِي أُنْزِلَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَجْهَ النَّهَارِ وَاكْفُرُوا آخِرَهُ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ، وَلا تُؤْمِنُوا إِلَّا لِمَنْ تَبِعَ دِينَكُمْ قُلْ إِنَّ الْهُدَى هُدَى اللَّهِ أَنْ يُؤْتَى أَحَدٌ مِثْلَ مَا أُوتِيتُمْ أَوْ يُحَاجُّوكُمْ عِنْدَ رَبِّكُمْ قُلْ إِنَّ الْفَضْلَ بِيَدِ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ,يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو

الفَضلِ العَظيم﴾ آل عمران ٧٤
واتـه /ئـەی خـاوەن پـەڕاوەكان بۆچـی بـەرگی ناهـەقی دەكـەن بەبـەری هـەقداو ڕاسـتی دەشارنەوە، لەكاتێكدا خۆتان چاك دەزانن كەهەق و ڕاستی كامەیە ..
دەستەیەك لەخاوەن پەڕاوەكان ( لەجووەكان ) وتیـان بەتاقمێكیان : ئێوە لـە سـەرەتای ڕۆژدا بەدرۆوە ئیمان بهێنن بەو قورئانەی بۆ بڕواداران ڕەوانە كراوە ، بەڵام لـەكۆتایی ڕۆژداو دەمەو ئێوارە پەشیمان ببنەوە تادوودڵی و گومان لای موسڵمانان دروست ببێت و پەشـیمان ببنـەوە ( كـابرای جوولەكـە بـەیانی موسـڵمان دەبـوو خۆشـی دەكەوتـە نـاو موسڵمانانەوە ، كە دیارە ئەو ئەهلی كیتابە هەق دەزانێ و ڕاستی بۆدەركەوتووە بۆیـە موسڵمان بووە ، ئێوارانیش كەپاشگەز دەبووەوە هەندێ موسڵمانی كەم دامەزراو تووشی دوودڵـی و گومـان دەبوو ، وەوای لێك دەدایەوە كە ئەو جوولەكەیە ناهـەقی یەكی دیـوە لەئیسلامدا بۆیە پەشیمان بۆتەوە ، دیارە ئەمەش پیلانێكی سامناك بوو ، خوای گەورە بەفەزڵی خۆی پەردەی لەسەر هەڵماڵی)
هەروەها دەڵێن : بڕوا مەكەن و متمانە مەكەن بەكەس جگە بەوكەسانەی كەشوێنی ئاینی ئێوە كەوتوون و جوولەكەن ! ئەی (محمد)پێیان بڵێ : بەڕاستی هەرهیدایەت وڕێنموویی خوایی هیدایەت و ڕێنموویی یە.. كەچی جووەكان بەیەكتری دەڵێن (دان بەوەدا مەنێن كە كـەس وەكـو ئێوەی پێبەخشراوە ، باسـی تـەورات و دواهـەمین پێغەمبـەر مەكـەن ، تا لای پەروەردگارتان سبەی لەقیامەتدا زاڵ نەبن بەسەرتانا !! ئەی (محمد)تۆش بڵێ : بەڕاستی هـەرچی ڕێـزو بەخشـش و فـەزڵ هەیـە بەدەسـت خوایـەو دەیبەخشـێت بەوكەسـانەی كەدەیەوێت و شایستەن و خوافراوانگیرو زانایە..
ئەوخوایە ڕەحمەت و میهرەبانی خۆی تایبەت دەكات بۆهەركەسێك بیەوێت و شایستە بێت و خوا خاوەنی ڕێزو بەخشش و فەزڵی زۆر گەورە و بێ ئەندازەیە .
سەرنج بدە ئەمەجۆرێكە لەخۆخەڵەتاندن و گێلی جوولەكەكان ، ئەگـەر ئەوان دان نەنێن بەڕاستی داو باسی دواهـەمین پێغەمبـەر نەكـەن لەتـەوراتدا ، قابیلـە خوانـەزانێ ، قابیلـە لەقیامەتدا قسەی موسڵمانان و هەق و ڕاستی زاڵ نەبێت !
## <u>گێلی كابرای لەمەڕخۆمان</u> :
دەڵێن خێڵێك كەل و پەلیان دەپێچنەوەو لەوەدا دەبن باربكەن و گەرمیان كوێستان بكەن ، باران و لیبێزمە دادەكات ، ڕیش چەرموكەیان دەچێتە سەربەرزایی یەك و دەستێكی بەرز

دەکاتەوە و ڕووەو ئاسمان دەڵێ : بیگرەوە ! بیگرەوە ! ناڕۆین ناڕۆین ! (هەروەك لەبەر ڕۆیشتنی ئەوان باران و لێزمە بێت ؟!)
بەدەستەکەی تریشی بەخەڵکەکە دەڵێ : وەچەما ! وەچەما ! (واتە لەچەمەکەوە بڕۆن ! هەروەك ئەم لەم بەرزاییە یەوە خوا غافڵ بکات و چاوی لێ نەبێ و ئاگادارنەبێو ! بەتەمایە خەڵکەکە بەچەما ڕەوانە بکات و خوا پێیان نەزانێ ! ، خۆڕەنگە ئەمە هەرپەندێك بێت !بەڵام چاوبگێڕە زۆر لەو عەقڵیەتە سەیرانە دەبینی کەبەوتارو کردار یان وادەزانن خوایان بۆ دەخەڵەتێ و وا دەزانن دەتوانن فێڵ لەخوا بکەن)...

## ساتێك لەگەڵ دروست کراوەکانی خوادا

خوای پەروەردگار هەرچی دروستکردووە بەچاکترین و باشترین شێوە دروستی کردووە ، هەروەك دەفەرموێت : ﴿الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الْإِنسَانِ مِن طِينٍ﴾ (السجده:٧)

واتە : ئەو خوایە زاتێکە هەموو شتێکی بەچاکی و ڕێکو پێکی بەدیهێناوە ، لەسەرەتاوە ئادەمیزادی لەقوڕ دروستکرد .هەروەك دەفەرموێت :﴿ وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ﴾ (النمل:٨٨) واتە تۆ کێوەکان دەبینی وادەزانیت کە وەستاون و بێ جووڵەن ، لە کاتێکدا کە ئەوانیش وەکو هەور لەجووڵەدان ، ئەمەیە دەستکردی ئەو خوایەی کە هەموو شتێکی بەو پەڕی ڕێکو پێکی دروستکردووە ، بەڕاستی ئەوزاتە زۆر ئاگایە بەوکارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

لەسورەتی (المؤمنون)ئایەتی ١٤ یش دەفەرموێ ( فتبارك الله أحسن الخالقين)واتە/بەڕاستی خوای مەزن بەرزو پیرۆزو موبارەکە و چاکترین بەدیهێنەرو چاکترین دروستکارە .جائەگەر سەیری هەردروستکراوێکی پەروەردگاربکەین وردەکاری و حیکمەت و دەسەڵاتی بێ پایانی خوای زاناو کاردروستی تیادەبینین..

زانایان دەڵێن زەوی پێش ٥ ملیار ساڵ دروست بووەو بارستایی یەکەی ١٠٠تا ٢٠٠ ئەوەندەی ئێستا بووەو وردە وردە بچوك بۆتەوە ورێکخراوە تا بەکەڵکی ژیانی مرۆڤ بێت ..وەبەردەوامیش لەبچوك بوونەوەدایە لەبەر ئەوەی کەخۆریش بەردەوام تەقینەوەی تیایە وگازی هایدرۆجینی دەبێت بەهیلیۆم وبارستاییەکەی کەم ئەکات ..وەبەو بچووك بوونەوەیە زەوی هاوسەنگی خۆی دەپارێزێ بەرامبەر بەخۆر ئەگەر وانەبێ ڕەنگە یەکتر

کێش بکەن و زەوی لەخولگەکەی دەرچێ ..ڕەنگە ئەم ئایەتەی قورئانیش ئاماژە بێت بۆئەو ڕاستی یە زانستی یە کەدەفەرموێت ﴿ قُلْ مَنْ يَكْلَأُكُمْ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مِنَ الرَّحْمَنِ بَلْ هُمْ عَنْ ذِكْرِ رَبِّهِمْ مُعْرِضُونَ ، أَمْ لَهُمْ آلِهَةٌ تَمْنَعُهُمْ مِنْ دُونِنَا لا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَ أَنْفُسِهِمْ وَلا هُمْ مِنَّا يُصْحَبُونَ ، بَلْ مَتَّعْنَا هَؤُلاءِ وَآبَاءَهُمْ حَتَّى طَالَ عَلَيْهِمُ الْعُمُرُ أَفَلا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِي الْأَرْضَ نَنْقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا أَفَهُمُ الْغَالِبُونَ﴾(الانبياء:٤٤)

واتە:پێیان بڵێ : کێ دەتوانێت ئێوە بپارێزێت لەشەوو ڕۆژدا لەسزای تۆڵەی خوای میهرەبان ،کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانە هەمیشە ڕوو وەردەگێڕن لەیادی پەروەردگاریان ..یان ئەو بێ باوەڕانە چەند خوایەکیان هەیە کەدەتوانن لەسزامان ڕزگاریان بکەن جگە لەئێمە ؟! ئەوانە نەدەتوانن خۆیان ڕزگاربکەن و خۆیان سەربخەن ،نەپەنا دەدرێن لەلایەن ئێمەوەو نەکۆمەکیان دەکرێت ..

ئێمە (بەپەلە تۆڵەناسێنین) بەڵکو ئەوانە خۆیان وباوو باپیرانیانمان لە نازو نیعمەتی دنیا بەهرەوەر کردووە ، هەتا تەمەنیان درێژ بۆوە ، جا ئەوانە نابینن و نازانن کە بەڕاستی ئێمە وردە وردە زەوی لەملاو ئەولایەوە بچوك دەکەینەوە ، جائێمە بتوانین زەوی بچووك بکەینەوە دیارە دەتوانین دەسەلات و خاکی ژێر دەستی ئەوانیش نەهێڵین و بچووکی بکەینەوە و لەژێر دەستیان دەری بهێنین ...جا ئایا ئەو بێ باوەڕانە هەمیشە سەرکەوتوو زاڵن ؟! هەروەها هەمان مەبەست لە سورەتی (الرعد) دا دووبارە دەکاتەوەو دەفەرموێت ﴿ وَإِنْ مَا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ، أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَأْتِي الْأَرْضَ نَنْقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا وَاللَّهُ يَحْكُمُ لا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ وَهُوَ سَرِيعُ الْحِسَابِ، وَقَدْ مَكَرَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ فَلِلَّهِ الْمَكْرُ جَمِيعاً يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ وَسَيَعْلَمُ الْكُفَّارُ لِمَنْ عُقْبَى الدَّارِ﴾ (الرعد:٤٢)

واتە/ئەگەر هەندێ لەهەڕەشەکانی خۆمانیان بۆ پێش بهێنن و نیشانت بدەین ،یاخود بتمرێنین و سەرئەنجامی ئەوان نەبینیت ، خەفەت مەخۆ چونکە بەڕاستی تۆ تەنها گەیاندنی پەیامەکەت لەسەرە، لێپرسینەوەش لەسەر ئێمە ..

ئایا خوانەناسن نەیانبینیوە ، ئێمە چۆن ئەملاو ئەولای زەوی کەم دەکەینەوە ،وەخوا خۆی دادوەری دەکات و گۆڕانکاری یەکان تاووتوێ دەکات ،کەس ناتوانێت موحاسەبەی بکات و کۆسپ و تەگەرە بهێنێتە ڕێی و ئەوزاتە زۆر بەخێرایی هەموو شتێك تاوو توێ دەکات و لەهەمووان دەپرسێتەوە .

بێگومـان خوانەناسـانی پێـش ئـەمانیش پیلانیـان گـێڕا ، بەمـەرجێك پیلانـەکانیان هەرهـەمووی لای خـوا ڕوون وئاشـکران ،دەزانـێ هەرکـەس چـی دەکـات و چـی دەستپێشخەری دەکات ، بێ باوەڕو خوانەناسانیش لەئایندەدا دەزانن کەسەرەنجام ئەم جیهانەو ئەوجیهانیش بۆکێ دەبێت ..

زانایان دەڵێن زەوی لەسەرەتای دروست بوونی دا زۆر بەخێرایی دەسوڕایەوە کەشەوێك دووسەعات و ڕۆژێکیش دووسەعات بووەو ساڵێکیش (٢٢٠٠)ڕۆژ بـووە .ووردە ووردە خاوبۆتـەوە تـاوەکو ئێستا کەساڵێك (٣٦٥)ڕۆژە !جادەڵێن بەردەوامیش خاودەبێتـەوە بەبڕێکی کەم کەلەسەد ساڵدا چرکەیەك کەمترە کەلەملیۆنەهاو ملیارەها ساڵی تردا دەکاتە بڕێکی زۆر خاوبوونەوە ، کەئەگەر کار وابڕوات پاش ملیارە ها ساڵی تر زەوی دەوەستێ و بەپێچەوانەوە دەخولێتەوە ، ئەوکاتەش خۆر لەخۆر ئاوا دەبینرێ کە هەڵدێ ، کەواتە ئەم نیشـانەیەی قیامـەت لەعـەقڵی زانستی دا قبووڵـەودەگونجێ ببـێ !ئـەوان ملیارەهـا ساڵیان بۆداناوە !ئیسلامیش دەڵێ هەرکاتێ خواویستی دەیهێنێ (لاتأتيكم إلابغتة)خوای گەورە لەپڕ ڕۆژی قیامەت دەهێنێ ...لەفەرمودەش دا لەباسی هاتنی دەجالدا حەزرەت (ص)ئاماژەی بەوە کردووە کەدەجال چل ڕۆژ دەمێنێتەوەو ڕۆژێکی بەهێندەی ساڵێکەو ڕۆژێکی بەهێندەی مانگێکەو ڕۆژێکی بەهێندەی هەفتەیەك و ڕۆژەکانی تریش ئاسایی یە !؟ ڕەنگە ئەمەش هەربەهۆی خاوبوونەوەی زەوی یەوە ببێت ،دیارە خوا باشتر دەزانێت کەچۆن دەبێت ، گرنگ ئەوەیە زانایان ئەمڕۆ لەئەنجامی لێکۆڵینەوەیانەوە ئەم قسەیەیان قبووڵە !(ئێمە لێرەدا زیاتر دیقەت و وردەکاری و حیکمەت و کار سازی خوامان مەبەستە لەم دروستکراوانەی دا کەعەقڵ لەبەرامبەریاندا کولەو دەستەوسانە !)

## مرۆڤ بەچاکترین شێوەدروست کراوە :

قورئان دەفەرموێت ﴿ وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ، وَطُورِ سِينِينَ، وَهَذَا الْبَلَدِ الأَمِينِ، لَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ، ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ ،إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ، فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِالدِّينِ، أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ ﴾ واتـه :سوێند بەهـەنجیرو زەیتـوون، کـەدوومیوەی بەسـوودو بەکـەڵکن ، ( سوێند خواردنـی خـوا بەدروسـتکراوانی بۆسەرنج ڕاکێشانمانە ) ، بەکێوی طوری سینا ،(کەخوا گفت گۆی لەگەڵ حەزرەتی موسا ، لەوێدا کرد ) ، سوێند بەم شارە ئەمینە کەشاری مەککەیە ، بەڕاستی ئێمە مرۆڤمان لەجوانترین شێوەو ڕێکو پێکترین شێوازدا دروست کردووە لەهەموو ڕوویەکەوە.

ئەگەر ڕێبازی ئیسلام نەگرێت ، ئەوا لەپلەی هەرە بەرزی ئادەمی یەتیەوە دادەبەزێ بۆ پلەی ئاژەڵی و خراپتریش ( إن هم إلا كالانعام بل هم أضل ) وەسەرەنجامیش دەخرێتە نزمترینی شوێنە نزمەکانەوە لەدۆزەخدا .جگە لەوانەی کەباوەڕیان هێنا وەو کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە ، پاداشتی هەمیشە و نەبڕاوە بۆیان ئامادەیە .جائیتر ئەی ئادەمی سەرکەش چی وای لێ کردویت باوەڕت بەڕۆژی قیامەت و لێپرسینەوە نەبێت ودوای ئەو هەموو نازو نیعمەتە ؟ ئایا خوا چاکترین ودادپەروەرترین فەرمانڕەوا نیە.. هەروەها دەفەرموێت ﴿ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾ (التغابن:٣)

واتە / ئەوخوایەی لەسەربنچینەی هەق و ڕاستی ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە ، وێنەی ڕووخساری ئێوەشی کێشاوە بەجوانترین شێوە ، گەڕانەوە سەرەنجامیش هەربۆلای ئەوە .پەروەردگار هانمان دەدات کەورد ببینەوە لەدەروون و ئەندامەکانی لاشەی خۆمان ، تابەچاکی دەسەڵات و تواناو کاردروستی خوا تێ بگەین هەروەك دەفەرموێت (وفي أنفسكم أفلا تبصرون) ..

## بەرگری لەناو لەشی ئادەمیزاددا:

خوای پەروەردگار بۆ کۆرپەلە لەسکی دایك دا وێلاشی دروستکردووە کە لەکاتی لەدایك بووندا نیو کیلۆدەبێت و (حبل السري)یەکی پێوەیە کەلەناو منداڵداندا کۆرپەلە دەبەستێتەوە بەدایکیەوەو هەرچی پێویست بێت (لەخواردن و هەناسەو بەرهەمهێنانی هورمونات و....هتد)بۆی دابین دەکات و پەردەیەکیشی هە یە پێی دەوترێت (الغشاء الاختياري)کەڕێ دەدات بەوماددە کیمیاوانەی پێویستن لەخوێنی دایکەوە بگوێزرێتەوە بۆکۆرپەلەکەو، ڕێ دەگرێ لەهەرشتێ کەزیانی پێ بگەیەنێ (وەك داوودەرمان و میکرۆب و جراثيم ، بۆ نموونە میکرۆبی سیل ناگاتە کۆرپەلە چونکە وێلاش و حبلی سری ڕێی نادەن بگاتە منداڵدان) . کاتێك منداڵیش لەدایك دەبێت مۆخی ئێسقان خڕۆکەی خوێنی سپی و خڕۆکەی خوێنی سوور دروست دەکات .. خانە لیمفاویەکانیش کە لە مۆخی ئێسقانەوە دروست دەبن دەنێردرێن بۆ غودەی (الثيموس) کەلەلای ملەوەیە بۆ مەشق کردن و فێربوون ، کاتێ دێنە لای ئەم غودەیە ، شفرەی سیهەزار خانەیان دەدرێتێ ، چونکە خانەکانی لەش نزیکەی سیهەزار جۆرن و سیهەزار شفرەی تایبەتیشیان هەیە ...جاکاتێك ئەم خانەلیمفاویانە دەگەڕێن بەلەشدا ئەگەر خانەیەك بێتە ڕێیان و

شفرەکەی جیاواز بێت لەو سی هەزار شفرەیە ، ئەوا هەوڵ دەدەن لەناوی ببەن .جائەگەر بێت و بەوردی لەنیزامی بەرگری ناو لەشی مرۆڤ بکۆڵینەوە کەچۆن کاردەکات سەرمان دەسوڕمێ ، چونکە ئەوخانە لیمفاوی یانە ڕۆژی بەلای کەمەوە چەند جارێك هەموو لەش ئەپشکنن نەوەکو میکرۆب و ڤایرۆس داخڵ بووبێ ..جاری واهەیە کەمرۆڤ تووشی هەلامەت دەبێ خێری تیایە کە نیزامی بەرگری ناو لەش و خانە لیمفاویەکان گورج دەبنەوە ..

کاتێك میکرۆبی سیل دەگاتە سی یەکان ،ئەوا خانە لیمفاویەکان ڕووبەڕووی دەبنەوە ، بەلام لەبەرئەوەی میکرۆبی سیل بەهێزو بەتواناییەو گەورەیە ، خانە لیمفاویەکان داوا دەکەن لەجگەر ، کەئەویش لەخۆیەوە یان بەفەرمانی مۆخی ئێسقان (کەتا ئێستا ئاشکرا نەبووە!)هەڵدەستێ بەدروست کردنی خانەی گەورەتر کەشەش ئەوەندەی خانە لیمفاویەکان دەبێ بۆئەوەی بتوانن میکرۆبی سیلە کە لەناوبەرن ، ئەم خانە گەورانەش دێن و میکرۆبی سیلە کە قوت دەدەن ،جالەبەر ئەوەی بۆی هەرس ناکرێ بۆیە چینێك کالسیۆم دروست دەکات بە دەوریا و وەك ئەوەیە لەو قەبری کالسیۆمەدا بینێژێ تابەتەواوی دەمرێ و لەناودەچێ !

وەلەبەر ئەوەی منالی تازە لەدایك بوو لەشیری دایکیەوە بەرگری لەشی زیاد دەکات بەرامبەر بەمیکرۆب ونەخۆشی ، ئاینی پیرۆزی ئیسلام فەرمان دەدات کەدایکان دووساڵێك شیری خۆیان بدەن بەمنالەکانیان .. کەدیارە ئەمەش گەورەیی ئیسلامەکەگرنگی داوە بەم لایەنەو دەفەرموێت ﴿ وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ ﴾(البقرة:٢٣٣)

عەرەق کردنەوەش بەشدارە لەبەرگری کردن دا ، بەوەی کە (عەرەق) ماددەی وای تیایە کە بەکتریا دەکوژێ ، بۆیە ئەو پێستانەی کە کەمتر عەرەق دەکەنەوە زیاتر تووشی نەخۆشیدەبن ..

هەر لەئەندامەکانی لەشی مرۆڤدا ئەگەر سەیری توانای دڵ بکەین ،کەچۆن خوای گەورە وای کردووە لەباری ئاسایی دا بەیەك لەسەر دەی توانای خۆی ئیش بکات ،تاوەکو ئەگەر ئەو کەسە ڕای کرد یان پیر بوو بتوانێ بەرگە بگرێ ،هەروەها ئەگەر حسابی درێژی بۆری خوێن و موولولە خوێنەکان بکەین لەمرۆڤێکی کامڵ دا دەگاتە

نزیکەی دەهــەزار میل ، کـەخوێن لەخولـەك و نیوێکـدا دەیـبڕێت ، کەبەڕاسـتی ئـەویش بەڵگەیە لەسەر توانای سەرسوڕهێنەری دڵ ..

گورچیلەکانیش زۆر گرنگن لەژیانی مرۆڤدا و خوای پەروەردگار دووگورچیلەی داوە بـەئادەمیزاد لـەکاتێکدا کەیـەك لەسـەرحەوتی یـەك گورچیلـە بەسـەبۆ ئـەوەی بـەکاری پێویست هەستێت ، کەچی پەروەردگار بەزیادەوە بەخشیویەتی بەمرۆڤ تاوەکو باشتر کارەکانی جێ بەجێ ببێت و ئەگەر یەکێکیشیان خـوا نەخواسـتە وەسـتاو لەکارکـەوت ئەوی تریان بتوانێ کاری پێویست بۆلەش ئەنجام بدات .بۆ درێـژی ئەم باسە سەیری (الاعجاز الالهي في أجهزة المناعة و المقاومة في جسم الانسان د.محمد السيد أرناؤوط )

## دوای چاکترین بەرنامە بکەون :

خوای پەروەردگار کەهەرچی دروست کردووە بەچاکترین شێوە یـەو ئادەمیزادیشـی بەچاکترین شێوە دروست کردووە ،چاکترین بەرنامەشی بۆ ناردووەو داوای لێ دەکات کە شوێن ئەوبەرنامەیە بکەوێت هەروەك دەفەرموێت :﴿ اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَاباً مُتَشَابِهاً مَثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُـهُمْ إِلَـى ذِكْـرِ اللَّـهِ ذَلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ ﴾ (الزمر:٢٣)

واتـە/خـوای پـەروەردگار جوانـترین و چاکـترین فەرمایشـی ناردۆتـە خـوارەوە کـە ئـەم قورئانەیە ، لـەجوانی داڕشتندا بابەتەکانی لەیەك دەچن ،هـەندێك باسیشـی بەشـێوازی جیاواز تیادا دووبارە بۆتەوە ، جاکاریگەری ئەم قورئانە ئەوەیە کە تەزوو دەهێنێ بەگیان و پێستی ئەو کەسانەدا کەترسی پەروەردگاریان لە دڵو دەروونـدا هەیە ، پاشـان گیـان و پێسـت و دڵیـان نـەرم و ئامـادەو چـالاك دەبێـت بـۆ یـادی خـواو خواپەرسـتی ،ئائـەوە هیدایەت و ڕێنموویی خوایە کەهەرکەس شایستە بێت هیدایـەت و ڕێنموویـی دەکات بۆ ئەوپلەوپایـە بەرزانـە ، ئـەوەش کـەڕێبازی خـوا ون بکـات کـەس نیـە ڕێنموویـی بکـات .هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَاتَّبِعُوا أَحْسَنَ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَكُمُ الْعَـذَابُ بَغْتَةً وَأَنْتُمْ لا تَشْعُرُونَ﴾ (الزمر:٥٥)

واتە:شوێنی چاکترین بەرنامە بکەون کەلە پەروەردگار تانەوە بۆتـان هـاتوە پێش ئەوەی کەسزاو ئازاری کتوپڕ یەخەتان پێبگرێت ، لەکاتێکدا ئێوە هەست بەنزیکی سزاکە نەکەن

## تاقیکردنەوەی ئادەمیزاد :

خـوای پـەروەردگار بۆیـە ژیـان و مردنـی دانـاوە وچاکـترین بەرنامـەی نـاردووە تامرۆڤەکان تاقی بکاتەوە و دەربکـەوێ کـەکێ باشترین کاردەکات ، هـەروەك دەفـەرموێت

(الذي خلق الموت والحياة ليبلوكم أيكم أحسن عمــلا)الملك**واته : هەرخوا مردن و ژیانی بەدیهێناوە ، تا تاقیتان بکاتەوە ،کامتان کردەوەی چاکترو پەسەندترە..**

**بڕوادار داوای لێکراوە کەبەچاکترین و ناسکترین شێوە ڕەفتاربکات لەگەڵ دایك و باوکی دا** ( ووصينا الانسان بوالديه إحساناً )**الاحقاف١٥ هەروەها داوای لێکراوە کەنزیك ماڵی هەتیو نەکەوێت مەگەر بەچاکترین شێوە نەبێت ،واتە بۆی بخاتە کارەوە و پارەکەی بۆزیادبکرێ ، تاگەورە دەبێ و دوایی پارەکەی بدرێتەوە** ( ولاتقربوا مال اليتيم إلا بالتي هي أحسن حتى يبلغ أشُده)**الانعام ١٥٢**

**پاشان ئەگەر سەلامیشی لێ کرا چاکترە کەبڕوادار بەباشتر وەڵام بداتەوەکە بەوەش پاداشتی زیاتری دەست دەکەوێت قورئان دەفەرموێت** (وإذا حُيِيتُمْ بتحية فَحَيوا بأحسنَ منها أو ردُّها )٨٦ النساء ..

**وەلەقسەو گوفتاریش دا پێویستە بڕوادار باشترین قسە هەڵبژێرێ بۆئەوەی شەیتان لەدڵی بەرامبەردا شتێك دروست نەکات ،هەروەك دەفەرموێت** ﴿ وَقُلْ لِعِبَادِي يَقُولُوا الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنْزَغُ بَيْنَهُمْ إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلْإِنْسَانِ عَدُوّاً مُبِيناً﴾ (الاسراء:٥٣)

**تەنانەت لەگفتوگۆو دانوستان و موجادەلەش دا لەگەڵ ئەهلی کیتاب دا پێویستە بەچاکترین شێوە بکرێت تالەئاینی ئیسلام تەرە نەبن ودڵیان نەڕەنجێ**﴿ وَلا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ وَقُولُوا آمَنَّا بِالَّذِي أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَأُنْزِلَ إِلَيْكُمْ وَإِلَهُنَا وَإِلَهُكُمْ وَاحِدٌ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾ **(العنكبوت:٤٦)**

**واتە : گفت و گۆو موجادەلە مەکەن لەگەڵ خاوەنی کتێبە ئاسمانیەکاندا مەگەر بە جوانترین شێوە ، جگە لەوانە کەستەمیان کردووە ( ئەوە ڕەفتارتان لەبەرامبەریانەوە باجیاواز بێت هەقی ستەمەکەیان) پێشیان بڵێن :ئێمە باوەڕمان هێناوە بەوەی بۆ ئێمەوئێوە دابەزێنراوە،خوای ئێمەوخوای ئێوە تەنها یەکێکەو، ئێمەفەرمانبەرداری ئەوزاتەین ..**

**بەکورتی ئەبێ بڕوادار لەهەمووکارو کردەوەو گوفتارێکدا بگەڕێ بەدوای چاکترین دا تاوەکو پلەی بەرز بەدەست بهێنی لەدنیاو قیامەتداو، لەتاقیکردنەوە کەی ژیاندا بەچاکی دەرچێت ،ئەم شێوازی ڕەفتارەش کەئاوا بەجوانی بێت دڵی بەرامبەر دەگۆڕێ و زۆر جار دەیکاتە دۆست وخۆشەویست ،قورئان دەفەرموێت** ﴿ وَلا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ، وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ) (فصلت:٣٥)

**قوتابیتی و مامۆستایەتی لەیەك كاتدا :**

(وهب)كوڕی (منبه)ی یەمانی كەلەتابیعین بوو ، خەڵكی یەمەن دەیانناسی راهیب بوو ،دوایی كە موسڵمان بوو تێگەیشت كە ئیمانداری راست نابێ گۆشەگیر بێت ، نابێ هەوڵ نەدات و خۆی كەڕ بكات ،بۆیە كەپرسیار یان لێكرد لەبارەی سیماو سیفەتی موسڵمانەوە وتی : (المسلم يقتدى بمن قبله وهو إمام لمن بعده)واتە: موسڵمان پێشینانی خۆی دەكات بەسەر مەشق و مامۆستاو، خۆشی سەرمە شق و مامۆستاو پێشەوایە بۆ ئەوانەی دوای خۆی ..(وتاری/ التوغل مسالك /الراشد)

**بانگخوازی پلەیەكی بەرزە :**

بانگخوازی پلەیەكی زۆر بەرزە لەئیسلام داو ، پەروەردگار دەفەرموێت : (ومَن أحسن قولاممن دعا إلى الله وعمل صالحاً وقال إنني من المسلمين)فصلت ٣٣ . واتە:كێ قسەی چاكتروجوانترە لەو كەسەی كەبانگەوازی كردووە بۆلای خواو كارو كردەوەی چاكیشی ئەنجامداوەو وتوشیەتی : بەڕاستی لەریزی موسڵماناندام ..

جالەبەر ئەوەی دنیا تاقی كردنەوەیە بۆمان تاباشترین كرداروگوفتاری تیا بەجێ بگەیەنین ،چاك وایە بگەڕێین بەدوای چاكترین كاردا ، دیارە بانگەوازیش ئەوكارە مەزن وگرنگە یە كە دەمانگەیەنێتە پلەی بەرزو ڕەزامەندی پەروەردگار ..

**ناڵێین بێ عەیبین:**

پیاو باشێكی لای خۆمان دەڵێ :ئێمە ناڵێین بێ عەیبین، بەڵكودەڵێین خوایە عەیب و كەم و كوڕی یەكانمان بۆ پەردە پۆش بكە ..

بانگخواز لەهەوڵ دایە خۆی چاكتر بكات و هەردەم داواش دەكات لەخوا كە نیەتی چاك كات و كردەوەكانیشی بۆ باشتر بكات ، قورئان ئاماژە بۆ ئەم مەسەلەیە دەكات و دەفەرموێت ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً، يُصلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً﴾ (الأحزاب:٧١)

واتە : ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە لەخوا بترسن و پارێزكاربن و هەمیشە قسەی بەجێ و بەسوود بكەن ، ئەوسا ئیتر كردەوەكانتان چاك و بەجێ و پەسەند دەكات ، لە گوناهەكانیشتان خۆش دەبێت ، جائەوەی فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەكەی بێت ، ئەوە بەڕاستی سەركەوتن و سەرفرازی یەكی بێ ئەندازەو بێ سنووری بەدەستهێناوە ..

جا کەسێکیش نیەتی بۆ خوانەبێ و خراپە کاربێت ، خوا کارەکانی بۆ چاك ناکات و (توفیق)ی نادات ،قورئان دەفەرموێت ( إن اللـه لایُصلِحُ عمل المفسدین)۸۷ یونس ..
عومەری کوڕی العزیز لەنامەیەکی دا ئامۆژگاری کاربەدەستێکی خۆی کرد و پێی وت : (إعمل عمل رجل یعلم أن الله لا یُصلح عمل المفسدین) واتە وا کاربکە کە بزانی خوای گەورە کاری خراپە کاران چاك ناکات ..

## باشترین هۆکار لەبانگەوازدا :

بانگخوازان لە سووربوونیاندا لەسەر گەیاندنی ئەم پەیامە پیرۆزە بەزۆر ترین کەس ، دەگەڕێن بەدوای باشترین هۆکاردا کەبانگەوازە کەیانی پێ بگەیەننە خەڵکی .. موسوڵمانان لە ئەڵمانیا کەژمارەیان نزیکەی سێ ملیۆن دەبێت ، چەند ساڵێکە ڕۆژی( ۳/۱۰) یان داناوە بەڕۆژی کراوەی مزگەوت ، تا لەو ڕۆژەدا هەرکەس لە ئەڵمانیەکان ویستیان شارەزابن لەئیسلام سەردانی مزگەوتەکان بکەن و پێشوازی یەکی گەرمیان لێ دەکرێ و وەڵامی پرسیارەکانیان ئەدرێتەوە و پێناسەی ئیسلامیان بۆ دەکرێت ..
ساڵی ڕابردوو ژمارەی میوانانی مزگەوتەکان کەنزیکەی دووهەزار مزگەوتە گەیشتە دووسەد هەزار کەس ، کەبۆ شارەزا بوون لەئیسلام سەردانیان کردبوو .. نزیکەی چوارسەد ڕاپۆرتیش لەدەزگاکانی ڕاگەیاندندا لەبارەی ئەو چالاکیەوە بلاو کرابۆوە ، کەئەمەش زیاتر ئیسلام ئەناسێنێ بە ئەڵمانیەکان . (ل۱۸۳ الایمان ژ ۱۱ ، ۱۲ /۲۰۰۲) ..

## کلیلی دڵەکان :

دڵ قفڵی لێ ئەدرێ و هەق نابیستێ ، پەردەی پیا ئەدرێ و نوور نایگاتێ ، قورئان دەفەرموێ (أفلا یتدبرون القرأن أم علی قلوب أقفالها)هەروەها دەفەرموێ (کلا بل ران علی قلوبهم ما کانوا یکسبون) ..
بۆیە کردنەوەی دڵەکان هەوڵی دەوێ ، تابەرامبەرەکە قەناعەت بکات و پاشان دوعا بۆ کردنیشی دەوێ تاخوا هیدا یەتی بدات و ڕزگار ی بکات لەتار یکیەکانەوە بەرەو ڕووناکی ..
عومەری کوڕی خەتاب زۆر ئازاری حەزرەتی ئەدا (ص)بەوەی کەخەڵکی لێ دوور دەخستەوەو دژایەتی دەکرد ، تا شەوێکیان حەزرەت (ص) ویستی بچێ بۆ لای کەعبە خواپەرستی بکات ، هە ستی کرد عومەر بەدوایەوەیە ، بۆیە فەرمووی : عومەر بەشەویش واز ناهێنی ؟ ! بەهەرحاڵ حەزرەت (ص)کەوتە نوێژ کردن و قورئان خوێندن و عومەر یش گوێی گرتبوو لەدوورەوە ، حەزرەت (ص)سوورەتی (الحاقە)ی خوێند ،

عومەر لەدڵی خۆی دا وتی : شاعیرە ، کەگوێی لەئایەتی﴿ فلا أقسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ ,وَمَا لا تُبْصِرُونَ,إِنَّهُ لَقوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ، وَمَا هُوَ بِقوْلِ شَاعِرٍ قلِيلاً مَا تُؤْمِنُونَ﴾ (الحاقة:٤١)

لەدڵی خۆی داوتی :ئەگەر شاعیر نەبێ کەواتە کاهینە ، ئنجا گوێی لێ بوو ﴿ ولا بقول كاهن قليلا ماتذكرون ، تنزيل من رب العالمين ﴾الحاقة ٤٣

وتی : کەواتە کاهینیش نیە ، ئەی لەکوێ وە هاتووە ، لەپەروەردگاری جیهانەوە هاتۆتە خوارەوە ..ئەمە شتێکی لەدڵی عومەردا دروستکرد و کێشمە کێش لەدەروونیا هاتە کایەوە !

جارێك ئافرەتێك ویستی هیجرەت بکات عومەر پێی گەیشت و لێی پرسی : بۆکوێ دەچی ؟ وتی: نایەڵن بەئازادی خوای خۆمان بپەرستین ، ناچارین هیجرەت بکەین !عومەریش وتی :خواتان لەگەڵ ..ئافرەتەکە کە هاتەوە لای مێردەکەی ئەمەی بۆ گێڕایەوەو وتی :هە ست دەکەم عومەر نەرم بووبێ و گۆڕابێ ، مێردەکەش وتی : ئەگەر گوێ درێژەکەی (خەتاب ) بڕوا بهێنێ ، بڕواناکەم عومەر بڕوا بێنێ !

عومەر زۆر داخ لەدڵ بوو لەحەزرەت (ص) و موسڵمانان ، بۆیە شمشێری هەڵگرت بچێ حەزرەت(ص) بکوژێ ، لەڕێگا موسڵمانێکی بینی ، کەلەعومەری پرسی ئەوە بۆ کوێ دەچی وئەویش وتی:دەچم محمد دەکوژم !

موسڵمانەکەش وتی:جابۆ ناچی خوشکەکەت و زاواکەت بکوژی خۆ ئەوانیش موسڵمان بوون ! عومەریش چووە سەر خوشکەکەی و زاواکەی و لێیدان ، ئەمەش کاری کردە سەر عومەر، ئنجا چوو بۆلای حەزرەت (ص) و موسڵمان بوو ، پاشان وتی :ئێمە لەسەر هەق نین ، حەزرەت (ص)فەرمووی : بەڵێ لە سەر هەقین ، وتی:

دەی خۆ شاردنەوەی بۆچییە ؟ ئیتر بەدوو ڕیز کە یەکێکیان عومەر لەپێشیەوە بوو، یەکێکیشیان(حمزە)لەپێشیەوە بوو بە (الله اکبر) چوونە لای کەعبە ، بەمەش پشتی نەفامی شکا..

کاتێك عومەر هاتەوەماڵەوە منداڵەکانی کۆکردەوە و باسی ئیسلامی بۆ کردن ،عبدالله ی کوڕی وتی: من ساڵێکە موسڵمان بووم ، عومەر پڕی پیاکردو باش کوتای ، وتی:ساڵێکە موسڵمانی و هەوڵت نەداوە منیش ڕزگار بکەی لەدۆزەخ..

جا هەرکاتێ ئەمە باسبکرایەتەوە عومەر سیخورمەیەکی ئەدا لە عبدالله! کەبۆچی خەمی باوکی نەخواردووە ..

بیرمان نەچێت کەحەزرەت (ص)دوعای کردبوو کەخوا یەکێ لەو دووکەسەی بۆ هیدایەت بدات عومەری کوڕی خەتاب یان ئەبوجەهل چونکە ئەو دوانە بەدەسەلآت بوون لەمەککەدا ، خوای گەورەش عومەری هیدایەت داو قفڵی دڵی بۆ کردەوە..

## سەرکردەیەك و دانایەك:

ئەوسەرکردەیەی کەشاری (مرو)ی فەتح کرد دانایـەکی مەجوسـی بینـی ، لێـی پرسـی بەچی بووی بەدانا ؟وتی: وازم لەدرۆو لەدنیا هێناو هەموو بەیانی یەکیش پەرستراوەکەم دەخەمە ژێر پێمەوە ..سەرکردەکە خەر یك بوو بیکوژێ !

مەجوسی‌یەکە وتـی:پەلەمەکە ! ئێوە پەڕاوەکەتان ناڵێ (أفرأیت من اتخذ إلـه هـواه) منیـش هـەواو ئارەزوویـەك کـە دەپەرسـترێ دە یخەمـە ژێـر پێمـەوە و بەقسـەی ناکـەم!

سەرکردەکە وتی:جاکەسێك ئەوەندە دانا بێ چۆن موسڵمان نابێت؟!

مەجوسیەکە وتی: دڵ داخراوەو کلیلەکەشی لای کەسێکی ترە ..

سەرکردە و هـاوەڵانی دەستنوێژیان شت و دوورکـات نوێـژی پێویسـتیان کـردو داوایـان لەخواکرد کەهیدایەتی بدات ..هەرپاش نوێژەکە بە بەرەکەتی ئیخلاس و دوعاکـەیان خـوا داناکەی هیدایەت دا..(ل١٩٥ الایمان ژ١١ - ١٢ /٢٠٠٢)

## دەرگا لەخەڵك دامەخەن !

ڕۆژێك ئیمـام ئەحمـەد پیاوێکی نوێژکـەری بینـی دزی دەکرد ؟ ئیمـام لێـی پرسـی: چـۆن شتی وادەبێ؟!نوێژکردن و دزی کردنیان وتووە ؟!کابرا وتی :ئیمام واز بێنە ئەم دەرگایەم ماوە لەگەڵ خوادا بائەویش دانەخرێت !

پاشان کەئیمام ئەحمـەد لەحـەج بوو ئـەو کابرایـەی بینـی خـۆی نووسـاندبوو بـە دیـواری کەعبەوە و بەکوڵ دەپاڕایەوە کەخوا لێی خۆش بێت..کەئیمام ئەمەی بینـی لەبەرخۆیـەوە وتی :بەخوا ڕاستی کرد دەرگایەکی هێشتبۆوە لەگەڵ خواداو خواش دەرگاکانی تـری بـۆ کردەوە..

{نوێژ بۆخۆی مرۆڤ دەگێڕێتەوە لەخراپە (إن الصـلاة تنـهی عـن الفحشـاء والمنکـر...)، دیارە ئەو پیاوەش کە هـەر نوێـژ کردنەکەی مـاوەو بـەردەوام بـووە ، بـەخۆی دا چۆتـەوەو پاشان تەوبەی کردوەو وازی هێناوە لەدزی کردن..}

بەڕاستی هەرلەبەر ئەمەشە کـە حـەزرەت (ص)دەفـەرموێ( یَسِّـروا ولاتُعَسِّـروا بشِّـروا ولاتُنفِروا)..بادوعا بکەین کەکلیلی خێر بین و دەرگـای خـێرو خۆشـی لەسـەر خـەڵکی

بکەینەوە هەروەك حەزرەت (ص)دەفەرمویّت (طوبی لمن جعله الله مفتاحاً للخیر مغلاقاً للشر) ...

## **پیاویّکی ناوداری خەڵکی‌شام**

**پیاویّکی خەڵکی شام کە دۆستایەتی هەبوولەگەڵ عومەری کوڕی خەتابدا ، ماوەیەکی زۆر دیار نابیّت ، عومەر ئەحواڵی دەپرسیّت ، ناسیاوەکانی پیّی دەڵیّن :ئەی ئەمیری بڕواداران خووی بەخواردنەوەوە گرتووە و گیری خواردووە !**

**عومەریش نامەیەکی بۆ نوسی: (لەعومەری کوڕی خەتابە وە بۆ فلانی کوڕی فلان ، سەلامت لیّ بیّت ،** فإنی أحمد الیك الله الذی لاإله إلاهو غافر الذنب وقابل التوب شدید العقاب ذی الطول لاإله إلاهو إلیه المصیر)..**ئنجا بەهاوەلانی فەرموو :بپاڕیّنەوە لەخوا بۆبراکەتان کەدڵی چاك بیّت و خوا لیّی خۆش بیّت..**

**کاتیّك ئەم نامەیە گەیشتە کابرا دەیخویّندەوەو لەبەرخۆیەوە دەیووت:** (غافر الذنب وقابل التوب شدید العقاب) ، **بەڕاستی منی ئاگادار کردەوە لەسزای خواو،پەیمانی لیّخۆش بوونی داومەتیّ ..ئیتر زۆر گریاو بڕیاری دا واز لەمەی خواردنەوە بیّنیّ و تەوبە بکات..بەڵیّ ..تەوبەیەکی چاکی کردو بەردەوام بوو ، کەهەواڵی گەیشتەوە بە (عمر)، فەرمووی :ئاوابکەن ئەگەر برایەکتان بینی قاچی خلیسکا ! ئامۆژگاری بکەن و وای لیّ بکەن متمانە بەخۆی پەیدابکاتەوە و دوعای خیّری بۆبکەن و مەبنە هاوکاری شەیتان لەسەری !** (نحو التفسیر الموضوعی للقرأن / محمد الغزالي)

## **با هەوڵ بدەین نوورانی و مووبارەك بین !**

**حەزرەت کەدەچوو بۆ مزگەوت دوعای دەکرد و دەیفەرموو** (اللهم اجعل في قلبی نوراً وفي سمعي نوراً ، وفي بصري نوراً ، وعن یمینی نوراً ، وعن یساری نوراً، وفوقي نوراً ، وتحتي نوراً، واجعلني نوراً )....

**کەواتە ئەکریّ نوورانی بین ودنیاو قیامەتمان بەنووری ئیمان ڕووناك ببیّتەوە ، هەروەها دەکریّ موبارەك بین ، خۆئەگەر زۆر کاتیش نەبیّت ، هەندیّك کات دەکریّت موبارەك بین ..ئەوە حەزرەتی عیسا سەلامی خوای لیّ بیّ لەبارەی خۆیەوە دەفەرمویّت** ﴿وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيًّا﴾ (مریم:٣١) **واتە :خوا منی پیرۆز کردووە لە هەرکویّ یەك بم و فەرمانی پیّداوم کە تا زیندووبم نویّژو بکەم و زەکات بدەم..**

ئیتر خۆئاشکرایە کە بەئیزنی خوا نەخۆشی چاك کردۆتەوە و زۆر موعجیزاتی هەبووە هەروەك قورئان دەفەرموێت ﴿وَرَسُولاً إِلَى بَنِي إِسْرائيلَ أَنّي قَدْ جِئْتُكُمْ بِآيَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ أَنّي أَخْلُقُ لَكُمْ مِنَ الطّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ فَأَنْفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْراً بِإِذْنِ اللهِ وَأُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ وَأُحْيِي المَوْتَى بِإِذْنِ اللهِ وَأُنَبِّئُكُمْ بِمَا تَأْكُلونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ (ال عمران:٤٩)

واتە/ من پێغەمبەرێکم بۆلای ئێوە (بەنی ئیسرائیل) ڕەوانەکراوم، بەڵگەو نیشانەیەکم پێیە لەلایەن پەروەردگارتانەوە ، من لەقوڕ شێوەی باڵندەتان بۆ دروست دەکەم ئنجا فووی پیادەکەم بەفەرمانی خوا یەکسەر دەبێتە باڵندەیەکی زیندووو ، کوێرێ زکماك ونەخۆشی بەڵەکی چاك دەکەمەوە بەویستی خواو مردووانیش زیندوو دەکەمەوە بەفەرمانی خواو هەواڵی ئەو شتانەی کەدەیخۆن و هەڵی دەگرن لەماڵەکانتاندا پێتان ڕادەگەیەنم ، بەڕاستی لەو شتانەدا بەڵگەو نیشانە هەیە بۆتان ئەگەر بڕوادارن .

حەزرەتیش (ص)هەمیشە موبارەك بووە ، کاتێك لەدایك بوو خێرو بەرەکەت ڕژا بەسەر ماڵ وحاڵی (حلیمە)ی دایەنیدا وبەئاشکرا پێیانەوە دیار بوو ، تەنانەت دەرو دراوسێکانی بەشوانەکانیان دەووت مەڕو ماڵاتەکانیان لای مەڕو ماڵاتەکەی (حەلیمە)وە بلەوەڕێنن ..

لەساڵێکی وشکی و بێ بارانیدا قوڕەیش وتیان :ئەرێ ئەبو تالیب!دەشت و دەرمان بێ ئاوە ، ماڵ و مناڵمان وشك بوونەوە،ئادەی دۆعا بارانەیەك بکە ، ئەبوتاڵیبیش دەستی حەزرەتی گرت کە مناڵ بوو پشتیدا بەدیواری کەعبەوە ، لەوکاتەدا پەڵەیە هەور بەئاسمانەوە نەبوو، لەچەند گۆشەیەکی ئاسمانەوە پەڵە هەور پەیدا بوو ، باران لێزمەی کردو شیوودۆڵ پڕ بوو لەئاوو،خێرو خۆشی ڕووی کردە خەڵکی بەبەرەکەتی حەزرەت(ص) ، ئەبو تالیبیش لەدێرە هۆنراوەکەیدا ئاماژە بەمە دەکات و دەڵێ :

وأبيض يستقي الغمام بوجهه ثمال اليتامى عصمة للارامل

ل٦٢ (گولاوی سەرمۆر) المبار کفوری

هەروەها ڕۆژێك مناڵێکی لاڵیان بۆ حەزرەت (ص)هێنا کەهیچی بۆ نەدەوترا ، حەزرەت لێی پرسی من کێم ، مناڵەکە بەبەرەکەتی حەزرەت کەوتە قسەو وتی :تۆ پێغەمبەری خوای !..

ڕۆژێك هاوەڵێك خۆی گەیاندە حەزرەت (ص) کە وتاری دەدا ،دەستی دا لە قاچی و ئنجا دەستی هێنا بە دەموچاویدا ، ئەو هاوەڵە دەڵێت هەرچەند کەش وهەوا زۆر گەرم بوو

کەچی قاچی سارد بوو ،کەهێناشم بەدەموچاومدا پاش سێ ساڵیش هەستم بەو ساردی‌یە دەکرد بە دەموچاومەوە ..

خاتووعائیشەی هاوسەری دەڵێ : پشیلەیەك دەهاتەماڵمان هەتا حەزرەت (ص) لەماڵ بوایە ورتەی نەدەکردو لەجێی خۆی نەدەجولا ، کاتێ حەزرەتیش لەماڵنەبوایە دەکەوتە هاروهاجی !! ﴿ حەزرەت (ص) خۆی دەفەرموێت :هەرچی لەئاسمانەکان وزەویدایە دەزانێ کەمن پێغەمبەری خوام تەنها سەرپێچیکەرانی ئینس وجین نەبێ ﴾

رۆژێك حوشترێك بەلەسە دەبێو کەس ناوێرێ بچێ بەلایدا ،کاتێ حەزرەت چوو بولای هێور بووەوەو شەکوای حاڵی خۆی لاکرد ،ئەویش خاوەنەکەی بانگ کردو ئامۆژگاری کردکە بەچاکی ڕەفتاری لەگەڵدا بکات ..

## عبداللەی کوڕی زوبەیر و خوێنی حەزرەت (ص):

ڕۆژێك حەزرەت (ص) تۆزێ خوێنی لەپشتی گرتبوو ، دای بەعبداللەی کوڕی زوبەیر کەمناڵ بوو ، تالە شوێنێکدا دوور لەچاوی خەڵك بیشارێتەوەو بیکا بەژێر خۆڵەوە ، عبداللەش بیری کردەوە چی لێ بکات ، وای بۆ چوو کە لەبەر پیرۆزی یەکەی بیخواتەوەو فڕێی نەدات ، بەڵێ ..خواردیەوەو هاتەوە خزمەت پێغەمبەر (ص)، حەزرەت لێی پرسی ، هاچیت لێ کرد ؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەشوێنێکدا شاردمەوە کەس نایبینێ، خواردمەوە !حەزرەت (ص)لای سەیر بوو ، فەرمووی : وەیل بۆتۆ لەخەڵکی و ، وەیل بۆخەڵکی لەدەست تۆ، وەتۆ مادەم خوێنی من تێکەڵ بەگیانت بوو ناچیتە دۆزەخەوە و دەچیتە بەهەشتەوە ..

بەڵێ هەروا دەرچوو کەحەزرەت (ص)فەرمووی ، عبدالله لاوێکی جوانخاسی بەتوانای لێ دەرچوو ، کەم کەس هەبوو شان بدات لەشانی ، تەنانەت یەکەم کەسە کەتوانی لەکاتی لافاودا حەوت جار بەمەلە تەواف بکات بەدەوری کەعبەدا !

کاتێك سوپای ئیسلامی کشا بەرەو فەتحی تونس ،ژمارەیان دوانزە هەزار کەس بوو،دەبوایە ڕوو بەڕووی (١٢٠)هەزار لەسوپای ڕۆم ببنەوە ..بۆیە سەرکردەی سوپای ئیسلامی نامەی نارد بۆخەلیفە عوسمان کەیارمەتی بۆ بنێرێ ، ئەویش هەندێ هاوەڵی حەزرەتی بۆ نارد کەئەوانیش حسن و حسین و عبدالله ی کوڕی عومەرو ئەبو زەرو عبداللەی کوڕی زبیر بوون ..

کەئەم هاوەڵانە گەیشتنە لای سوپای ئیسلامی لەئەفریقیا ، (عبدالله)بەسەرکردەی وت من پیلانێکم بەدەستەوەیە و داواشم ئەوەیە سی‌سوارم لەگەڵ بنێرە پشتم بپارێزن ..سەرکردەش سی سواری نارد لەگەڵیاو بەخێرایی بەرەو دوژمن ڕۆیشتن و ڕێ یان بۆکردنەوە ، وەیان زانی بۆ دانوستان هاتوون و نامەیان پێ یە ، هەرکەنزیك بوونەوە لەسەرکردەی ڕۆمەکان عبدالله شێرانە پەلاماری سەرکردەی ڕۆمەکانی داو پاش ماوەیەك لەشەڕ کوشتی و بەمەش سوپای ڕۆم شپرزە بوون و شکان ، کەلەمەش دا نەبەردی و چاوقایمی و دانایی عبدالله مان بۆ دەردەکەوێ ..

عبداللەی کوڕی زوبیر توانایەکی زیاتری هەبوو لەخەڵکی لەبەڕۆژوو بوون و نوێژ کردنی زۆردا..

لەساڵانی دوایی تەمەنیشی دا شۆڕشی هەڵگیرساندژی ستەمی ئەمەویەکان و بەئاگرو ئاسن سەرکوت کراو سەرەنجام شەهید بوو ، وەهەروەك حەزرەت هەواڵی دابویە پشت بەخوا بەهەشتی یە !(بەرنامەی/ روائع من السیرة / د. عائض القرني)

## پەنجەی محمدی کوڕی واسیع!

لەکاتێکدا قوتەیبەی کوڕی موسلیم ئابڵوقەی (کابل)ی دابوو ، وتی بگەڕێن بەدوای (محمدی کوڕی واسیع)دا بۆم ، کاتێك گەڕان بینیان پەنجەی بەرز کردۆتەوەو دوعا دەکات و دەڵێ ( یاحي یاقیوم انصرنا، یاحي یاقیوم انصرنا)...هاتنەوە بۆلای قوتەیبەو هەواڵیان دایە، ئەویش زۆری پێ خۆش بوو وتی:پەنجەی محمدی کوڕی واسع لەلام گرنگترە لەسەد هەزار لاوو سەد هەزار شمشێر!

پاشان بەبەرەکەتی دوعای محمد کوڕی واسیع سەرکەوتن..(هەمان سەرچاوە)

## عەکاشەو چوونە بەهەشت:

ڕۆژێك حەزرەت (ص)بەهاوەڵانی فەرموو :حەفتا هەزار لەئومەتم بەبێ لێپرسینەوەو حساب دەچنە بەهەشتەوە ،عەکاشە وتی :دوعام بۆ بکە یەکێ بم لەوان..حەزرەتیش (ص)فەرمووی :تۆیەکێکی لەوان..

هاوەڵێکی تر هەستا ورتی: دوعاش بۆمن بکە لەوانە بم ، حەزرەت(ص)پێی فەرموو : تازە عەکاشە دەست پێشخەری کرد!

لەغەزای بەدردا عەکاشە شمشێرەکەی شکا ، حەزرەت (ص)لقەدارێکی دایە دەستی و فەرمووی :بەمە شەڕ بکە؟!کاتێك گرتی بەدەستیەوە و ڕای وەشاند بوو بەشمشێرێکی

چاك بەدەستیەوەو ئەو شمێرەیان ناونا ( بەهێز:القوی ) و بەردەوام لەغەزاكاندا پێی بوو تاله شەڕی یەمامەدا شەهیدبوو ، شمشێرەكە شیان ناشت لەگەڵیا ..

## شەوق وخۆشەویستی بیلال:

بیلال پاش وەفاتی حەزرەت (ص)حەوت ساڵ بانگی نەداو،بۆ بەشداری فەتحی شام مەدینەی بەجێهێشت و كاتێك عومەر كلیلی قودسی وەرگرت داوای لەبیلال كرد كەبانگێكیان بۆ بدا ،ئەویش لەبەر دڵی خەلیفە عومەر بانگێكی دا وهەمووانی خستە گریان و برینیانی كولانەوە !

شەوێك خەوی بەحەزرەتەوە(ص)بینی ، كەلەخەوەكەدا پێی فەرموو: بیلال شەوقت نیە بۆسەردانمان !

بۆبەیانی گەڕایەوە بۆ مەدینەو چووە سەرتەبری حەزرەت (ص)و سەلامی لێكردو پاشان باوەشی كرد بەحەسەن و حوسەین دا و بەیادی جارانەوە بانگێكی دا كەهەرچی لەو ناوەبوو خستیە گریان..

## شەوقی بەهەشت:

حەزرەت(ص)دەفەرموێ:بەهەشت شەوقی هەیە بۆسێ كەس، سەلمان و عەممار و عەلی ... ئیمام عەلی ڕۆژێك دوعای كردو وتی : (اللهم إنی أسألك شهادة في سبيلك بعد عمر طويل في سبيلك)خوای گەورەش دوعاكەی قبوڵ كردو زیاتر لەپەنجا ساڵ خزمەتی ئیسلامی كردو پاشان شەهیدیش بوو.

بەڕاستی كەسەیری پلەی ئەوپایە بەرزانە دەكەین كەباسمان كردن بۆمان دەردەكەوێت كەمرۆڤێكی پێك هاتوو لەخوێن و گۆشت و ئارەزوو شەهەوات دەتوانێ بەفەزڵی خوا نوورانی و موبارەك بێت...دەتوانێت زیاتر لەپلەكانی ئیمان و ئیسلامەتی دا سەركەوێت و زیاتر خوا لەخۆی ڕازی بكات ، هەركاتێكیش وای كرد دەبێتە خۆشەویستی خواو زیاتر بەرەكەت دەكەوێتە تەمەن و كارەكانیەوەو دەتوانێ زیاتر خەڵكی بهێنێ بەرەو شاڕێگەی ئیمان و ئیسلامەتی .

## پیاوێك كەخوا خۆشی دەوێ :

مقدادی كوڕی عەمر حەوتەم هاوەڵە كە ئیسلامی ئاشكرا كردو دژی قورەیش وەستایەوە ،ئەو زاتە گەیشتە پلەیەك كەحەزرەت (ص)پێی فەرموو ( إن الله أمرني بحبك ، وأنبأني أنه

يُحبك) واته:بەڕاستی خوافەرمانی پێداوم کەخۆشم بوێ،وەهەواڵیشی داوەمەتێ کە تۆی خۆش دەوێت ..

بەڕاستی پلەو پایەیەکی بەرزە کەسێك بیگاتێ ، خوای گەورە ی باڵادەست کەسێکی خۆش بوێ و فەرمانیش بدات بەپێغەمبەرەکەی کەخۆشی بوێت ..

دیارە ئەمە بەهەوڵ و کۆشش و خەبات بووە،عبداللەی کوڕی مسعود دەڵێت:بەڕاستی مەشهەدێکم لەمیقداد دیوە ئەگەر ئەوە هی من بوایە بە هەموو دنیا نەم ئەگۆڕی یەوە ..مەشهەدەکەشی لەغەزای بەدردا بوو کەحەزرەت (ص)داوای لە هاوەڵان دەکرد کەڕای خۆیان دەربڕن ، میقداد هەستا و وتی:پێغەمبەری خوا بڕۆ بەدەم ئەو کارەوە کەخودا نیشانی داویت ، ئێمە لەگەڵتدا دەبین ، بەخوا ئەوەت پێ ناڵێن کە (بنو اسرائيل) بە موسایان وت :بڕۆ تۆو خوا کەت شەڕبکە ئێمەش لێرە دائەنیشین ،بەڵکو دەڵێین بڕۆ تۆو خوا کەت شەربکە ئێمەش لەگەڵتان شەڕ دەکەین ، سوێندم بەوکەسەی تۆی بەهەق ناردوە ئەگەر بمانبەیت بۆ (برك الغماد)یش ئەوا بێباکانە لەگەڵت دێین هەتا دەیگەیتێ ،ئنجا پێغەمبەری خوا (ص)گوتەیەکی جوانی پێفەرموو دوعای خێری بۆ کرد ..ل٢٤٢ گولاوی سەرمۆر ، (واخلص العمل _عبدالرحمان السنجری)

مقداد ڕۆژێك بەفەرماندەی موسڵمانانی وت (لأموتَنَّ والاسلام عزيــز) واتـە: کاتێك دەمرم پشت بەخوا ئیسلام لەو پەڕی بەرزی و دەسەڵاتدا دەبێت ..( هەموو خەمێکی ئەوەبووە کاتێك دەمرێت ئاواتی بێتە دی و ئیسلام پایە بەرزو پیرۆز بێت ..) ..

## سور بوون لەسەر بانگەواز کردن

ئاشکرایە کەبانگخوازی بەرزترین پلەیەو بانگخواز قسەکانی باشترین قسەیە کە پاداشتی لەسەر وەردەگرێت ، هەروەك قورئان دەفەرموێت ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحاً وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ (فصلت:٣٣)

وەحەزرەت(ص)دوعای ڕوو سوری کردوە بۆ بانگخوازان و فەرموویەتی ( نضر الله امرأ سمع مقالتي فبلغها ، فربَ حامل فقه غير فقيه ، وربَ حامل فقه إلى من هو أفقه منـه ) ابن ماجه/

لەفەرموودەیەکی تریش داهاتووە (إن اللة وملائكته وأهل السماوات والأرض حتى النملة في جحرها وحتى الحوت ليصلون على معلم الناس الخير) ترمذی واتە: بەڕاستی خوای پەروەردگار ڕەحمەت و بەرەکەت دەبارێنێ بەسەر بانگخوازداو ئەهلی ئاسمانەکان و

زەوی ، تەنانەت مێرووله لەکونی خۆی دا و حوت لەدەریادا دوعای خێرەکەن بۆئەو کەسەی کەخەڵکی فێری خێر دەکات.
ئەمە بێجگە لەوەی کەهیدایەت دانی یەك کەس خێری پڕ بەدنیای هەیەو ئەوکەسەی کەهیدایەت وەردەگرێ هەرچاکەیەك بکات بۆ بانگخوازیش دەنووسرێ (مَن دلّ على خير فله مثل أجر فاعله) مسلم .
تەنانەت پاش مردنیش ئەو زانستەی کە بڵاوی دەکاتەوە دەبێتە سەدەقەی بەردەوام بۆی و خێرەکەی بەردەوام دەچێتە نامەی کردەوەکانی‌یەوە.

## سووربوونی پێغەمبەران لەسەر بانگەواز کردن :

لەسورەتی نوح و چەند ئایەتێکی سورەتەکانی تردا قورئان باس هەوڵ و کۆشش و خەباتی بێ و چانی حەزرەتی( نوح )ی کردووە ، کەچۆن نۆسەدو پەنجا ساڵ بەشەوو بەرۆژ بەئاشکراو بەنهێنی بانگی کرد بۆ ئاینی خواو ، کەچی تەنها چەند کەسێکی کەم بڕوایان پێ هێناو دوایی پەروەردگار فەرمانی دایە کەشتی‌یەك دروست بکات ، ئەویش لەگەڵ بڕوادارانـدا کەشتی یەکی دروست کردو هەرچی کافران بەلایاندا دەڕۆیشتن گاڵتەیان پێ دەکردن و ئەویش دەیفەرموو : ئەگەر ئێوە گاڵتە بەئێمە دەکەن ، ئێمەش گاڵتە بەئێوە دەکەین ..تالافاوە گەورەکە هات و بڕواداران و نوح سەرفراز بوون و کافرانیش هەموو لەناو چوون..
قورئان دەفەرموێ ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحاً إِلَى قَوْمِهِ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَاماً﴾(العنكبوت:١٤) ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلاً وَنَهَاراً، فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَائِي إِلَّا فِرَاراً، وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوا أَصَابِعَهُمْ فِي آذَانِهِمْ وَاسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّوا وَاسْتَكْبَرُوا اسْتِكْبَاراً، ثُمَّ إِنِّي أَعْلَنْتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَاراً﴾ (نوح:٥-٩) ﴿وَيَصْنَعُ الْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِنْ قَوْمِهِ سَخِرُوا مِنْهُ قَالَ إِنْ تَسْخَرُوا مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنْكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ ، فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَنْ يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُقِيمٌ﴾ (هود:٣٩)
بەڵێ...حەزرەتی نوح کەلە پێغەمبەرە (أولي العزم)ەکانە ،هەموو ژیانی بەخت کرد لەپێناوی بانگەوازداو تەنانەت لەدوا ساتەکانی تەمەنیشی داو لەسەرە مەرگ دا هەرلەیادی بانگەوازەکەی دا بوو ، هەروەك پێغەمبەر (ص)بۆمان دەگێڕێتەوە :
( إنّ نوحاً عليه السلام لماحضره الوفاة دعا ابنيه ، فقال:إني قاصر عليكما الوصية ، آمركما باثنتين و أنهاكما عن أثنتين: أنهاكما عن الشرك والكبر، وآمركما بلا إله إلا الله ، فإنّ السماوات والأرض وما فيهما لو وضعت في كفة الميزان ووضعت لاإله إلا الله في

الكفة الآخرى كانت أرجح ، ولو أنّ السماوات والآرض كانتا حلقة فوضعت لاإله إلا الله عليهما لفصمتهما أو لقصمتهما ، وآمركما بسبحان الله و بحمده فإنها صلاة كل شيء وبها يُرزق كل شيء) ئەحمەد ، و(صححه الحاكم)واتە:حەزرەتی نوح سەلامی خوای لیٚ بی لەسەرەمەرگی دا دووکوڕەکەی بانگ کردو فەرمووی:من وەسیەتتان بۆدەکەم ،بەوەی کەفەرمانتان پیٚ دەدەم بەدووشت ، وەجلەو گیریتان دەکەم لەدووشت کە هاوەڵ بۆ خوا پەیدا کردن و خۆبەزل زانینە لەبەردەم هەق دا...

وەفەرمانەکەشم بە لاإلـه إلا الله یە کـە بەڕاسـتی ئەگـەر ئاسمانـەکان و زەوی و هـەرچی لەناویاندایە لەتای تەرازوویەکدا دابنرێن و (لاإله إلا الله) ش لەتاکەی تریاندا دابنرێت ، ئەوا(لاإلـه إلا الله) وەکە قورسترە،وەئەگەر ئاسمانەکان و زەوی ئەڵقەیـە بـن و (لاإلــه إلا الله)بخرێتە سەریان دەیانشکێنێ و.. هەروەها فەرمانتان پـیٚ ئەدەم بـە (سـبحان اللـه و بحمده) کەئەویش بەڕاستی نوێژودوعاو ویردی هەموو شتێکەو، هەموو شتێکیش بەوە ڕزقی پیٚ ئەدرێت.

## وەسیەتی حەزرەتی ئیبراهیم و یەعقوب:

حەزرەتی ئیـبراهیم سـەلامی خـوای لیٚ بێـت گەلەکـەی و پاشـاکەیانی بـانگ کـرد بـۆ خواپەرستی و سزاو ئازارێکی زۆری چەشت لەو پێناوەدا ، تەنانەت خستیانە ئاگرەوە و خـوای گـەورە پاراسـتی وهـەموو تەمـەنی لەبانگـەوازدا بـەخت کـردو تەنانـەت لەسـەرە مەرگیش دا هەرلەخەمیا بوو ، وەسیەتی خۆی کردو،حەزرەتی یەعقوبیش سەلامی خوای لیٚ بێت بەهەمان شێوە ، قورئان دەفەرموێت ﴿وَوَصَّى بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾ (البقره:١٣٢) واتـە/ئیبراهیم و یەعقوب ئەو وەسێتەیان کرد بۆ کوڕەکانیان و هەریەکەیان وتیان : بەڕاستی خوا هەر ئەم ئاینەی بۆئێوە بڕیارداوە و هەڵی بژاردووە ،ئیتر ئێوەش هەوڵ بدەن بە موسڵمانی نەبێت مـەمرن و تـادوا هەناسـەتان پـەیڕەوی بکـەن ، ئایـا ئێـوە ئـەی جوولەکـەو گـاور کـەباوەڕ بـەمحمد ناکـەن و خۆشـتان بەشـوێن کـەوتووی ئیـبراهیم ویـەعقوب دەزانـن ئامـادەی سەرەمەرگی یەعقوب بوون؟

ئەوکاتەی بەکوڕەکانی وت:دوای مردنی من چی دەپەرستن؟! هەموو وتیان:خوای تۆو باوباپیرانت دەپەرستین ، کە ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاقن ، خوایەکی تاك وتەنها یەو ئێمە هەموو تەسلیم و فەرمانبەرداری ئەوین..

## بانگەواز کردنی یوسف لەبەندیخانەدا:

حەزرەتی یوسف سەلامی خوای لێ بێت چەند ساڵێك بەناهەق بەند کرا، لەگەڵ ئەوەشدا لەبانگەواز کردن غافڵ نەبوو، هەمیشە بەرەفتارو گوفتاری جوانی مایەی ڕێنمایی بەندکراوەکان بوو ،دوان لەبەند کراوەکان هاتنە لای و وتیان ئێمە خەومان دیوەو تۆش بەپیاو چاك دەزانین ، بەڵکو بۆمان لێك بدەیتەوە ، ئەویش پێش ئەوەی لێکی بداتەوە بۆیان بانگی کردن بۆسەر ئیمان و ئیسلامەتی ، هەروەك قورئان دەفەرموێت : ﴿ وَدَخَلَ مَعَهُ السِّجْنَ فَتَيَانِ قَالَ أَحَدُهُمَا إِنِّي أَرَانِي أَعْصِرُ خَمْرًا وَقَالَ الْآخَرُ إِنِّي أَرَانِي أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِي خُبْزًا تَأْكُلُ الطَّيْرُ مِنْهُ نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِ إِنَّا نَرَاكَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ ، قَالَ لا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِ قَبْلَ أَنْ يَأْتِيَكُمَا ذَلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّي إِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَهُمْ بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ ، وَاتَّبَعْتُ مِلَّةَ آبَائِي إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ مَا كَانَ لَنَا أَنْ نُشْرِكَ بِاللَّهِ مِنْ شَيْءٍ ذَلِكَ مِنْ فَضْلِ اللَّهِ عَلَيْنَا وَعَلَى النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَشْكُرُونَ، يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَأَرْبَابٌ مُتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ، مَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِهِ إِلَّا أَسْمَاءً سَمَّيْتُمُوهَا أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمْ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ بِهَا مِنْ سُلْطَانٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾ (یوسف:٤٠)

## لەبەهەشتیشداخەمی ئەوانەی دوای خۆیەتی:

خوای پەروەردگار دووپێغەمبەری نارد بۆ گەلێك و بڕوایان پێ نەهێنان، پەروەردگار پێغەمبەری سێهەمیشی بۆ ناردن و، بەقسەیان نەکردن ،پیاوێکی بڕوادار لەوسەری شارەوە هات و کەوتە ئامۆژگاری خەڵکەکەو ئەوانیش نەك هەر بڕوایان نەهێنا،بەڵکو پەلاماریان داو شەهیدیان کرد،بڕاوداری شەهیدمان چووە بەهەشتەوە وبە نازو نیعمەتی پەروەردگار شادبوو ، ئالەوکاتەدا خۆزگەی خواست کە گەلەکەی ئەمەیان بزانیایە و بڕوایان بهێنایە ، کە ئەمەش خەم خواردنی بانگەوازە ، تەنانەت لەبەهەشتەوە!قورئان دەفەرموێت: { وَجَاءَ مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَى قَالَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ ، اتَّبِعُوا مَنْ لا يَسْأَلُكُمْ أَجْرًا وَهُمْ مُهْتَدُونَ ، وَمَا لِيَ لا أَعْبُدُ الَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ، أَأَتَّخِذُ مِنْ دُونِهِ آلِهَةً إِنْ يُرِدْنِ الرَّحْمَنُ بِضُرٍّ لا تُغْنِ عَنِّي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا وَلا يُنْقِذُونِ ، إِنِّي إِذًا لَفِي ضَلالٍ مُبِينٍ ، إِنِّي آمَنْتُ بِرَبِّكُمْ فَاسْمَعُونِ ، قِيلَ ادْخُلِ الْجَنَّةَ قَالَ يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ ، بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ } (يس:٢٧)

شەهیدەکانی ئوحودیش خەمی بڕوادارانیانیدوای خۆیان بوو بۆیە داوایان کرد لەپەروەردگار کەبیانگێڕێتەوە بۆدنیا تالەپێناوی خوادا شەهید ببنەوەو،هەواڵ بدەن بەبڕواداران کەشەهیدی چ پلەو پایەیەکی بەرزە..خوای پەروەردگاریش فەرمووی من لەجیاتی ئێوە هەواڵیان پێ ئەدەم ، ئەنجا ئایەتی{وَلا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ

أمْوَاتاً بَلْ أحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِهِمْ مِنْ خَلْفِهِمْ ألَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ وَأنَّ اللَّهَ لا يُضِيعُ أجْرَ الْمُؤْمِنِينَ } (آل عمران:١٧١) هاتەخوارەوە ،

واتە: هەرگیز وامەزانن ئەوانەی لەپێناوی خوادا شەهید بوون ،کوژراون و مردوون ، نەخێر ئەوانە زیندوون و،لای پەروەردگاریان لەڕزق و ڕۆزی بەهرەوەرن . زۆر دڵخۆش و شادمانن بەو بەخشش و زیادە فەزڵەی کەخوا پێی بەخشیوون،مژدەش دەدەن بەوانەی هێشتا بەوان نەگەیشتوون و شەهید نەبوون کە بێگومان هیچ ترس و بیمێکیان لەسەرنی یەو، هیچ غەم و پەژارەیەکیان بۆ پێش نایەت لەبەجێ هێشتنی دنیا . مژدەگەن بەنازو نیعمەتانی تایبەتی و فەزڵ و ڕێزی بێ سنوور لەلایەن خوای میهرەبانەوە ،بەڕاستی خواش پاداشتی ئیمانداران زایەناکات و ڕەنج بەخەسار نابن.

## سوربوونی پێغەمبەر (ص)لەسەر بانگەواز کردن:

قورئانی پیرۆز باسی سوربوونی پێغەمبەر (ص)دەکات لەسەر بانگەوازو دەفەرموێت : ( وما أكثر الناس ولوحرصت بؤمنين ) يوسف ١٠٣/ واتە :زۆربەی خەڵکی باوەڕدارنین ، هەرچەندە تۆ زۆر بەپەرۆش بیت و هەوڵ بدەیت و تێ بکۆشیت .هەروەها دەفەرموێت ﴿ إنْ تَحْرِصْ عَلَى هُدَاهُمْ فَإنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي مَنْ يُضِلُّ وَمَا لَهُمْ مِنْ نَاصِرِينَ﴾(النحل:٣٧) واتە/خۆئەگەر تۆ سور بیت لەسەر هیدایەتدانی ئەوان ،ئەوە تۆ ناتوانیت چونکە بەڕاستی خوا ڕێنموویی کەسێك ناکات کەخەڵك گومڕا بکات ،ئەوانە لەقیامەتدا هیچ جۆرە پشتیوانێکیان نیە.

هەروەها دەفەرموێت ﴿ فَلَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَفْسَكَ عَلَى آثَارِهِمْ إنْ لَمْ يُؤْمِنُوا بِهَذَا الْحَدِيثِ أسَفاً﴾ (الكهف:٦) واتە: لەوانەیە خۆت لەناو بەریت و لەخەم و پەژارە دا بمریت لەسەرەنجامی خراپی ئەمانە کە باوەڕ ناهێنن بەم قورئانە..

بەڵێ/حەزرەت (ص)(حريص)ەو بەپەرۆشەو بەسۆزو میهرەبانە ،بۆ ڕزگار کردنی ئادەمی لەئاگری دۆزەخ ﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَحِيمٌ﴾ (التوبە:١٢٨)

## بانگەوازکردن لەهەموو کاتێکدا:

١)**لەسەر گردی (صفا)وە**: سێ ساڵ بانگەوازی پێغەمبەر (ص)نهێنی بوو وەتەنها بۆ ئەوکەسانە بوو کەلێی دڵنیا و جێی متمانە بوو ،تائایەتی ( وأنذر عشيرتك الاقربين) هاتە خوارەوە ..کە ئەم فەرمانە درا بەحەزرەت (ص)چووە سەرگردی (صفا)وبانگی کردو

فەرمووی (ئەرێ خێڵی بەنی فەهر ، خێڵی بەنی عەدی ولقەکانی قورەیش )هەموو کۆبوونەوە ،ئەو کەسەش خۆی نەهاتایا کەسێکی دەنارد بزانێت چیە ، ئەبو لەهبیش هات..حەزرەت (ص)فەرمووی: (ئەگەر هەواڵتان بدەمێ چەند سوارێك لەودیو ئەو دۆڵەوە دەیانەوێت بدەن بەسەرتاندا ، باوەڕم پێدەکەن ؟؟ وتیان:بەڵێ ،جگە لەڕاستی هیچی ترمان لێ نەبینیویت ، فەرمووی :من ئاگادارتان دەکەمەوە لەسزایەکی توند ، ئەبو لەهب وتی:ئەمڕۆش دەستت بەقوڕدا چێت ،بۆ ئەمە ئێمەت کۆکردۆتەوە ؟ئنجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کەوەلأمێکیش بوو بۆ ئەبولەهەب(تبت يدا أبي لهب وتب ماأغنى عنه مالهُ وماكسب)بخاری/

**٢)بانگەواز کردن بەرێگاوە:**

حەزرەت (ص)تەنانەت بەرێگاشەوە ئامۆژگاری دەکردو بانگەوازی دەکرد ، عبدالله کوڕی عباس دەڵێ، ڕۆژێ لەدوای حەزرەتەوە (ص)سواری ولأخێك بوو بووم ،فەرمووی : { ياغلام:إني معلّمك كلمات، احفظ الله يحفظك ، احفظ الله تجده تجاهك، وإذا سالت فسأل الله ، وإذا استعنت فاستعن بالله، وأعلم أن الآمة لو اجتمعوا على أن ينفعوك لم ينفعوك إلابشئ قد كتبه الله لك، ولو اجتمعوا على أن يضروكَ لم يضروك إلا بشيء قد كتبه الله عليك، رُفعِت الاقلامُ وجفت الصحف}

**٣)بانگەواز لەبازاڕی (ذى المجاز)دا:**

حەزرەت (ص)لەماڵەوەو لەلای کەعبەو لەماڵی ئەرقەم دا بانگەوازی دەکردو ، هەربەوەشەوە نەدەوەستا، بەڵکو دەچوو بۆ بازاڕی ( ذى المجاز)و بانگی دەکردن بۆ ئیسلام و دەیفەرموو:خەڵکینە بڵێن : لاإله إلا الله سەرفراز دەبن، ئەبو جەهلیش خۆڵی پیا ئەپرژان و دەیووت : ئەمە سەرتان لێ نەشێوێنێ ،ئەمە ئەیەوێ واز لەخواکانتان بێنن و واز لە (لات و عزی ) بهێنن .

حەزرەتیش گوێی پێ نەئەداو ئاوڕی لێ نەئەدایەوە.

**٤)چوون بۆ ماڵان و خێمەکان :**

حەزرەت (ص)لەمەوسیمی حەج دا پێش کۆچکردن بۆ مەدینە دەچوو بۆ خێمەی ئەوانەی هاتبوون بۆ (منى)و بانگی دەکردن بۆ ئیسلام و دەیفەرموو (خەڵکینە بەڕاستی خوا فەرمانی پێداون کەبیپەرستن و هیچ شتێك نەك بەهاوەڵی)

ئەبولەهبیش دەیووت(خەڵکینە، بەڕاستی ئەمە دەیەوێ واز لەئاینی باو باپیران بهێنن).

بەڵێ..حەزرەت دەساڵی ڕەبەق سەردانی ئەوانەی دەکرد کەدەهاتنە مەککەوە بۆ حەج و دەیفەرموو(کێ داڵدەم ئەدا ، کێ یارمەتیم ئەدا ؟؟ تا پەیامی پەروەردگارم بگەیەنم و پاداشتی بەهەشتی دەستکەوێت)..

کەس نەبوو سەری بخات ، تەنانەت یەکێ کەدەگەڕایەوە لەمەککەوە بۆ میسر یان یەمەن ، بەخزمەکانی دەووت وریا بن غولامەکەی قورەیش سەرتان لێ تێك نەدات..تاخوای گەورە بە (انصار)ەکانی مەدینە سەری خست..

## ٥) سەردانی گەورە پیاوان:

عبدالله ی کوڕی ئوبەی گەلەکەی لەمەدینە دەیانویست بیکەن بەفەرمانڕەوای خۆیان و کەحەزرەت (ص)هاتە مەدینە،(عبدالله)ئەو وەزعەی لێ شێواو گەورەییەکەی لەدەست دەرچوو،بۆیە بەڕووکەش موسڵمان بوو ،وەتامردیش هەر مونافیق بوو..

ڕۆژێك لەسەرەتای هاتنە مەدینە بەحەزرەتیان وت:ئەگەر سەردانێکی عبداللەی کوڕی ئوبەیت بکردایە!حەزرەتیش (ص)لەبەر دڵی هاوەڵانی و لەبەر خاتری بانگەوازەکە سەردانی کرد،کەچی ئەوەندە بێ ئەدەب بوو وتی(دوور کەوەرەوە لێم ،بۆنی گوێدرێژەکەت ئازاری دام)،یەکێ لەئەنصاریش وتی(بەخوا گوێدرێژەکەی پێغەمبەر بۆنی خۆشترە لە تۆ)..بخاری

جارێکی تر حەزرەت (ص) لای کۆمەڵێك دابەزی کە موسڵمان و کافرو جوولەکەی تیابوو ،عبداللەی کوڕی ئوبەی مونافیق و عبداللەی کوڕی ڕەواحەش لەگەڵیان دانیشتبوو .. تۆزو خۆڵی وڵاخەکەی هات بەسەریانا وعبداللەی کوڕی ئوبەی دەم و لوتی خۆی گرت و وتی:تۆزو خۆڵ مەکە بەسەرمانا! حەزرەت(ص)سەلامی کردو بانگی کردن بۆلای خواو قورئانی بۆ خوێندن ،عبداللەی کوڕی ئوبەی وتی(فلان! چاکتر وانیە ئەگەر ئەوەی دەیڵێ ی هەقە ،ئازارمان نەدەی لەمەجلیسەکانماناو بگەڕێیتەوەماڵەوەو، کێ هات بۆلات قسەی بۆبکەی).

عبداللەی کوڕی ڕەواحەش وتی: (وەرە بۆناو مەجلیسەکانمان ئێمە ئەوەمان پێخۆشە)موسلیم /کتاب الجهاد والسیر

## ٦) سەردانی ماڵی گەورە پیاوێکی جوولەکە:

حەزرەت (ص)لەگەڵ هاوەڵانی دا لەمەدینە چوون بۆ ماڵی گەورەیەکی جوولەکان کەدەرسی دائەدان و مامۆستایان بوو، پێی فەرموون:ئەی کۆمەڵی جوولەکە موسڵمان بن سەلامەت دەبن..

وتیان:پێت ڕاگەیاندین ئەی (أبا القاسم)

حەزرەتیش(ص)فەرمووی: (منیش ئەوەم ئەوێ کەپێتان ڕابگەیەنم)

## ٧) سەردانی نەخۆش:

منداڵێکی جوولەکەخزمەتی حەزرەتی دەکرد نەخۆش کەوت،حەزرەت هات سەردانی بکات ،لەژوور سەری دانیشت و فەرمووی: موسڵمان ببە!منداڵەکەش سەیری باوکی کردو باوکیشی وتی :کوڕم بەگوێی (ابو القاسم) بکە:منداڵەکەش موسڵمان بوو،حەزرەت (ص)کەگەڕایەوە فەرمووی (سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەلە ئاگر ڕزگاری کرد)بخاری (١٣٥٦).

## ٨)بانگەواز کردن لەسەرقەبران:

ئیمامی عەلی دەڵێت : جەنازەیەکمان بردبوو بۆ بەقیع، حەزرەت (ص)هات پارچە دارێکی بەدەستەوە بوو ،دانیشت و ئێمەش بەدەوریا دانیشتین و ڕەنگێکی هێناو برد(ڕەنگ و ڕووی گۆڕا)ئنجا فەرمووی (هیچ یەکێ نیە لەئێوە مەگەر خواوەند پێشتر (لەعیلمی غەیبی خۆیدا)دەزانێت و نووسیویەتی کەجێگای بەهەشتە یان دۆزەخە و، دەزانێت کەبەختەوەرە یان بەدبەختە)بخاری .

## ٩)بانگهێشت کردنی خۆشەویستان:

حەزرەت (ص)سوور بوو لەسەر هیدایەتی هەموو کەسێك و هەموو ڕێگایەکی بۆ دەگرتە بەر ،کاتێك (أبـو طـالب) ی مامی لەسەرەمەرگ دا بوو حەزرەت (ص)لەژوور سەری زۆر هەوڵی لەگەڵدا کە تەنها بڵێ (لاإله إلاالله) تالەقیامەتدا شایەتی بۆ بدات و فریای بکەوێ ..کەچی ئەبو جهل کەلەوێدا بوو ساردی دەکردەوەو پێی دەووت:ئاخر چۆن واز لەئاینی باوو باپیرت دەهێنی ..بەڵێ..مامی مردو شایەتمانی نەهێنا..

حەزرەت(ص)مامی خۆش دەویست کەئەو هەموویارمەتیەی دا بوو بۆ گەیاندنی بانگەوازەکەی ،تەنانەت ئەو ساڵەی کەئەوو خەدیجەی تیا مردن ناونرا ساڵی خەم..

حەزرەت (ص)زۆر حەزی دەکرد کەڕێی ڕاست بگرێ و ئیمان بێنێ بەڵام دیارە هیدایەت بەدەست خوایەو حەزرەت (ص)تەنها ڕێ نیشاندەرە ،قورئان دەفەرموێت ﴿ إِنَّكَ لا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ (القصص:٥٦)

## ١٠)بانگەواز کردن پێش جەنگ:

عبداللەی کوڕی عەباس دەڵێت:حەزرەت (ص)نەجەنگاوە لەگەڵ هیچ گەلێك دا هەتا لەپێش دا بانگی نەکردبن بۆ سەر ئیمان و ئیسلامەتی ..(ئیمام ئەحمەد)٢٠٥٣

## ١١)بانگهێشتی ئەوەیکەویستی بیکوژێ:

جابر دەڵێت لەگەڵ پێغەمبەردا بووین(ص)لەغەزای ( ذات الرقاع ) دا،گەیشتینە لای درەختێکی سێبەردار جێمان هێشت بۆ حەزرەت(ص) ولەویا دابەزی و شمشێرەکەی هەڵواسی و خەڵکەکەی تریش بڵاوەیان لێکرد بەو ناوەداو دەچوونە ژێر سێبەری دارو درەختەوە.

جابر دەڵێت:خەومان لێکەوت ،کابرایەکیدەشتەکی موشریك هات وشمشێرەکەی پێغەمبەری (ص)دەرهێناوگرتی بەدەستیەوەو وتی بە پێغەمبەر (ص):لێم دەترسی؟حەزرەت (ص)فەرمووی:نەخێر ،وتی :چی دەستم دەگرێت ئەگەر بتکوژم؟فەرمووی : خوا ...شمشێرەکە لە دەستی کەوتە خوارەوەو حەزرەت هەڵی گرتەوەو فەرمووی :چی دەتپارێزێت لەمن ؟ کابرا وتی:مەردی خوا بە ڕەحمم پیێ بکە ،فەرمووی : شایەتی دەدەی کەجگە لە (اللە)خودای ترنیەو منیش پێغەمبەری خودام ؟ کابرای دەشتەکی وتی:پەیمانت پیێدەدەم شەڕت لەگەڵدا نەکەم و لەناو کۆمەڵێکیشدا نەبم دژایەتی تۆ بکەن..ئنجا حەزرەت بەرەڵای کردو کابرا چووەوە بۆ لای خزمانیو وتی :لای پیاوێك بووم باشترین مرۆڤە لەدنیادا ..(بوخاری)(ل٤٦٠ گوڵاوی سەرمۆر)

## ١٢) حەزرەت و هیوای هیدایەتی ئەوەی داهاتوو!

کاتێك حەزرەت (ص)چوو بۆ تائیف و بانگی کردن بۆ ئیسلامەتی ،بەبەردباران کردن وەڵامیان دایەوە، بۆیە لەژێر سێبەرێکدا پاڵی دا بەدیوارێکەوەو فەرمووی (خوایە،لاوازی و کەم توانایی و بیێ دەسەڵاتیم بەدەست خەڵکەوە بۆ لای تۆ دەهێنم ،ئەی بەبەزەیترینی هەموو بەبەزەییەکان،تۆ پەروەردگاری ژێر دەستەو چەوساوەکانی،تۆ خاوەنی منی ،بەکێم دەسپێریت ؟ بە دوورە کەسێك ئازارم بدات؟ یان بەدوژمنێك کارت داوەتە دەست ؟ ئەگەر تۆ توڕە نەبوویت من باکم نیە، بەڵام بیێ وەیی کردنی تۆ بۆمن دڵگوشادترە ،

پەنادەگرم بەنووری ڕووی پیرۆزی تۆ کەھەموو تاریکستانەکانی ڕووناك کردۆتەوەو ، کاروباری دونیاو ئاخیرەتی لەسەر دامەزراوە لەوەی تووڕەیی خۆتم بەسەردا بباریێنیت ، یان خەشمت بمگریێت ، ڕازو نیاز ھەر بۆلای تۆیە ھەتا ڕازی دەبیت ، ( ولا حول ولاقوة إلا بك ) ..

حەزرەت(ص)لەباسی ئەم گەشتەی دا دەفەرمویێ: بەکوڵێك خەم و خەفەتەوە گەڕامەوەو لە ( قرن الثعالب ) نەبێت ھۆشم نەھاتەوە،سەرم بەرز کردەوە بینیم ھەورێك سێبەری بۆ کردووم ، لێی ورد بوومەوە ، سەیردەکەم جوبرائیلی تێدایە و بانگی لێکردم و فەرمووی :خوای گەورە گوێی لە گوتەکانی گەلەکەت بوو کەپێیان وتی، ئەوە خودای گەورە فریشتەی بۆ ناردویت بۆئەوەی بەخواستی خۆت فەرمانی بەسەردا بدەیت ، ئنجا فریشتەی شاخەکان بانگی کردم و سڵاوی لێکردم ،پاشان فەرمووی :ئەی موحەمەد ئەوە منم ،چیت دەوێت،ئەگەر دەتەوێت ئێستا ئەو دووشاخەیان بەسەردا دەھێنمەوەولەناویان دەبەم ..

بەڵێ حەزرەت(ص)لەگەڵ ئەو ھەموو ئازارو ئەشکەنجەو خەم و خەفەتەدا کە لەچەند لاوە بریندارییان کردبوو ..لەجیاتی داوای لەناوبردنیان بکات فەرمووی (بەڵکو ئومێد دەکەم خوای گەورە لەپشتی ئەمانە نەوەیەك بخاتەوە بەتەنھا خوای گەورە بپەرستێت و ھیچ ھاوبەشێکی بۆ بڕیار نەدات)..ل١٤٦ گوڵاوی سەرمۆر ..(بوخاری)و (مسلم)

## ١٣)نامە ناردن بۆ پاشاو کاربەدەستان :

حەزرەت(ص)نامەی نارد بۆ پاشاو کاربەدەستانی زەمانی خۆی لەوانەش:

* نامە بۆنەجاشی پادشای حەبەشە.
* نامە بۆ مەقۆقس پادشای میسر.
* نامە بۆ کیسرا پادشای فارسەکان.
* نامە بۆ قەیسەر پادشای ڕۆمەکان .
* نامە بۆ (ھوذە)کوڕی (عەلی)سەرۆکی یەمامە.
* نامە بۆ پادشای عومان..

کەئەمەش سوور بوونی حەزرەت(ص)دەگەیەنێ بۆ گەیاندنی پەیام و بانگەوازەکەی بەچوار قوڕنەی دنیادا ، مەگەر خوا نافەرموێ (وما أرسلناك إلارحمة للعالمين)(سەیری بەشی دەیەم /لەخزمەت قورئاندا/بکە،نووسەر)

## ١٤)دووباره كردنهوەی ئامۆژگاری:

حــەزرەت(ص)ئــەوەندە ســور بــووە لەســەر گــەیاندنی پەیامەكــەی و تێگــەیاندنی بەرامبەرەكەی ، هەندێ جار فەرموودەیەكیدووسێ جار دووبارە دەكردەوە،بۆ نموونە دەفەرموێ ( والله لايؤمن والله لايؤمن والله لايؤمن، قيل من يارسول الله قال الذى لايأمن جاره بوائقــه ) بخاری واتە:بەخوا بڕوای نیە ، بەخوا بڕوای نیە ، بەخوا بڕوای نیە ، وتیان كێ ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی : ئەو كەسەی كە دراوسێ یەكەی ئەمین نەبێ لەشەڕی.

یان دەفەرموێ ( الدين النصحية ) سێ جار ،وتیان:بۆكێ؟فەرمووی: ( لله ولكتـابه ولأئمـة المسلمين وعامتهم )...ترمذي..

## ١٥) گۆڕینی پرسیار بۆ شتی بەسود :

كابرایەك پرسیاری لەحەزرەت (ص)كرد كەی قیامەت دێت؟

حەزرەت (ص)فەرمووی:باشە چیت بۆ ئەو ڕۆژە ئامادە كردووە.

وتی:خۆشەویستی خواو پێغەمبەرم بۆ ئامادە كردووە ،حەزرەت(ص)فەرمووی:تۆ لەگەڵ خۆشەویستاندایت..

## ١٦)بانگەوازو ئامۆژكاری لەسەرەمەرگ دا:

حەزرەت (ص)لەكاتی گیانەڵاو سەرەمەرگی دا تا زمانی موبارەكی لە گۆ كەوت دەیفەرموو (الصلاة وماملكت أيمانكم)أبن ماجه..كەبەڕاستی ئەمەش گەورەترین (حرص)و سوربون و بەپەرۆشی یە بۆگەیاندنی پەیام و بانگەوازەكەی..

## بەپەرۆشی پێشینان بۆ بانگەواز كردن

هەر لەزەمانی ئەبو بەكرەوە (خ.ر)ئەو بەرنامەیە پیادەكرا لەجەنگەكاندا كە لەپێش دا بانگیان بكەن بۆ ئیمان و ئیسلامەتی ،چونكە ئیسلام حەزبەخوێن ڕشتن ناكات و مەبەستی بانگەواز كردن و هیدایەتە..

## دڵخۆش بوون بەموسڵمان بوونی خەڵكی:

لەپێش جەنگێك دا ئەبو عوبەیدە نێرراوی ڕۆمەكانی بانگ كرد بۆ ئیسلام ،ئەویش قەناعەتی كردو موسڵمان بوو،موسڵمانان زۆریان پێخۆش بوو ،تەوقەیان لەگەڵ كردو دوعای خێریان بۆ كردو پێ یان وت (تۆ ئێستا زۆر بەرزو بەرێز یت لەلامان و ئەمڕۆ تۆ وەكو برای دایك و باوكیمانی)

ڕۆمەكەش وتی:بەڕاستی وایە منیش ئەوەتان تیا دەبینم..

## خالید پێی ناخۆش بوو جزیە وەرگرتن:

خالید(خ.ر) سێ ئیختیاری بۆ گەلەکەی (عدی)دانا،کەیا موسڵمان بن یان جزیە بدەن یان بجەنگن ،ئەوانیش ڕازی بوون (جزیە)بدەن،خالید پێی ناخۆش بوو کەموسڵمان نەبوون هەرچەند(جزیە)ش بدەن و وتی(ئای بۆ ئێوە،بەڕاستی کوفر بیابانی سەرگەردانی‌یەو بێ عەقڵە ئەو کەسەی کە پیا بڕوات).

## ئافرەتان وبانگەواز:

(أم شريك)لەمەککەدا بەنهێنی بانگەوازی ژنانی دەکرد،لەگەڵ ئەوەش دا کە قوڕەیش دژایەتی‌یەکی گەورەی ئیسلامیان دەکرد ....تا پێ یان زانی و گرتیان ،هەڕەشەیان لێکردو وتیان:ئەگەر لەبەر گەلەکەت نەبوایە خراپمان پێدەکردی ،بەڵام ئەتدەینەوە دەست ئەوان چیت لەگەڵ دەکەن بابیکەن.

(أم سليم)یش ئەوەندە خەمی بانگەوازەکەی بوو کە بڵاوبێتەوەو کەسێك زیاتر ئیمان بهێنێ ،کاتێك(أبو طلحـه)داوای کرد شووی پێ بکات ، پێ‌ی وت:بەمەرجێ شووت پێ دەکەم کە موسڵمان ببیت..ئەویش موسڵمان بوو.لە سەدەکانی دواتریش دا (سیر توماس –و– ارنولد دەڵێ:ژنانی موسڵمان ڕۆڵی گرنگیان بینی لەموسڵمان بوونی فەرماندە مەغۆل و تەتەرەکاندا). (الدعوه الى الاسلام/ص٤٥٩)

## کۆیلەکان وبانگەوازکردن:

(داوتی) رائیدێکی ئینگلیز بوو بە نیوە دورگەی عەرەب دا دەگەڕا ، ڕێ‌ی کەوت لە پیاوێك کە کاتی خۆی فرێنرابوو وە لە (جـده)فرۆشـرابوو ، وە کرابوو بەکۆیلە و ئەچەوسێنرایەوە ، پێ‌ی وت : تائێستاش ڕق و قینت لەوانەیە کەتۆیان بەم دەردە برد ؟ ئەویش وتی:یەك شت ئەوەی بیر بردومەتەوە ، ئەویش ئەوەیە کە ئەو دوورکەوتنەوەیەم لە گەلەکەی خۆم وای کرد لەبت پەرستی و جەهالەت ڕزگارم ببێ و فێری ئاینی پیرۆزی ئیسلام ببم و لەوڵاتی پێغەمبەردابم (ص) ، ئای چەند خۆشە لەززەتی ئیمان ، بڕوام پێ بکە برادەری بەڕێز ئەو خۆشی یە ناتوانرێ وەسف بکرێ‌ودەرببڕێت ..چەند حەزدەکەم کە خوا تۆش هیدایەت بدات بۆ ئەو بەرنامە ئاسمانیە ، وە من دڵنیام کە خوا دەتپارێزێ لەتیاچوون تادێیتە سەر ئەم ئاینە .بەڕاستی چەند جوانە بەموسڵمانی بتبینم و ببیت بەیەکێ لەئێمە، هەرچەند دەشزانم کەئەجەل بەدەست خوایەو هەرچی بوێ دەیکات..

بەڵێ، داوتی ویستی ڕقی هەستێنێ و دژی ئیسلام و موسڵمانان بیجوڵێنێ و واز لەئیسلام بێنێ ، کەچی ئەو لەگەڵ ئەو ستەمەش دا کەڵێ کرا بوو کە ئیسلامیش دیارە پێی ڕازی نیە ،هەوڵی دا ئەو پیاوە بیانی یە بانگ بکات بەرەو وئیسلام ! (الدعوه الی الاسلام/ص٣٨٥)

## دروستکردنی مزگەوت بۆ بانگەواز کردن :

موسڵمانان لەکۆن و نوێدا خەمی دروستکردنی مزگەوتیان بووە لەبەر پاداشتی گەورەی و لەبەر گەیاندنی بانگەواز بەخەڵکی..

دیارە کە مزگەوت کاریگەری زۆری هەیە لەسەر دامەزراوی موسڵمانان و هێنانی خەڵکانی تریش بەرەو ئیسلام، (رینان) کەزانایەکی (آثار)ی فەرەنسیە و نووسەریشە دەڵێ: (نەچوومەتە هیچ مزگەوتێکەوەو هەست و هۆشم بەتوندی نەهەژا بێت ، بەواتایەکی تر نەچوومەتە هیچ مزگەوتێکەوە و تووشی ئەو داخە نەبوو بم کەبۆچی موسڵمان نیم) هەروەها توماس–و–ارنولد لەبارەی بەپەرۆشی موسڵمانانی ئەفریقیاوە بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام دەڵێت(هەر ئەوەندەی لەشارێك دا شەش موسڵمان کۆبووبنەوە ، لەوە کەمتر یان زیاتر ، کەویستبێتیان بمێننەوە بۆ ماوەیەك لەو ناوچەیەدا مزگەوتێکیان دروست کردووەو هەوڵیان داوە ئیسلام بڵاو بکەنەوە).. الدعوه الی الاسلام /ص٣٧٦ .

## بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەڕێی بەندکراوێکەوە!

توماس–و–ارنولد لەپەڕاوەکەی دا (الدعوه الی الاسلام /ص٤٥٣) دەڵێت:

(تەنانەت بەند کراوی موسڵمانیش لەبەندیخانەکەی دا بانگەوازی لەبیرنەچووە و فرسەتی هێناوە لەکاتی بەندکردنەکەی کە هاوەڵانی بەندیخانەی بانگ بکات بۆ ئیسلام..بۆ نموونە:لەسەدەی یانزەهەمدا فەقیهێکی موسڵمان بەدیل گیراو بەهۆی ئەوەوە ئیسلام بڵاو بۆوە لەئەورووپای ڕۆژهەڵات دا..

## بانگەواز کردن لەبەر پەتی سێدارەدا :

لەهەمان پەڕاوی پێشوودا (ارنولد)دەڵێت (لەئەفریقیا بەلجیکیەکان بڕیاری لەسێدارە دانیان دەرکرد بۆ سەرکردەیەکی موسڵمان،لەکاتی جێ بەجێ کردنی بڕیارەکەداو لەدوا ساتەکانی ژیانی ئەو موسڵمانەدا بانگەوازی لەیادنەچوو،بەوەی کەکەوتە ئامۆژگاری کردنی ئەو قەشەیەی کە هاتبوو پێش لەسێدارە دانەکەی ئامۆژگاری ئاینی بکات ،جانەك هەرقسەی قەشەکە کاری لێنەکرد،بگرە ئەو کەوتە بانگ کردنی بۆ ئیسلام..

## بانگخوازێکی هیندی لەسەرەمەرگدا:

شێخ حەسەن علی کە بانگخوازێکی هیندی بوو لەدوا ساتەکانی ژیانی داو لەسەرە مەرگ دا کەخەڵکێکی زۆر لەدەوری بوون گوێ یان لێ بوو بەدەنگێکی نرم بەیەکێکی دەوت: واز لەدینەکەت بێنەو وەرە ببە بەئیسلام ..لێ یان پرسی ئەوە چی دەڵێی و خەریکی چیت،وتی:ئەوە گاورەو دەمەوێ ببێ بەموسڵمان.. (الدعوة الى الاسلام/ص٣١٩)(الحرص على هداية الناس ) د.فضل إلهي.

## گەشتی تەوبەکاران

### یەکەم: هونەرمەند (مەیار بیبلاوی)

هونەرمەند مەیار پاش دە ساڵ کارکردن لەبواری هونەری نواندن و پاش بەشداری کردن لە (١٥)فلیم و نزیکەی(٣٠)شانۆگەری دا ، وازی لەو بوارە هێناو چووە ڕیزی هونەرمەندە باڵا پۆشەکانەوە..

ناوبراو لەبارەی گەشتی ئیمانی یەوە دەڵێت : لەباوەشی دایك و باوکێکی میسری دا چاوم بەدنیا هەڵهێناوەو، باوکم ئەفسەربوو ، وەهەمیشە هانیان دەدام لەسەر نوێژکردن و هەرگیز لەنوێژ دانەبڕاوم..

هەر لە منالیمەوە حەزم بەدەرکەوتن کردووەو لەسەر بنەمای (خالِف تُعرف)،ئەگەر هاوەڵانم لە زانکۆ جلی پۆشتەیان لەبەر کردبێ من جلی تەنگ وتەسك و تەنکم پۆشیوە بۆ ئەوەی زیاتر سەرنجی دەورو بەر بەلای خۆمدا ڕابکێشم..

ڕۆژێك دەرهێنەرێکی (إعلانات)لەزانکۆ کارتێکی دا بەمن و هاوڕێ کەم و بەیەکەوە سەردانمان کردو وردە وردە حەزم لەو کارە کردو زۆر سەرکەوتوو بووم لەبەر هەمهێنانی(اعلانات)داو پارەی باشم دەست دەکەوت..

پاشان لە تەلەفزیۆن دا کارم کردو جارێکیان چل و سێ هەزار جونەیهم وەرگرت هەقی چەند مانگێ کارکردنم ،بەڵام چونکە بێ بەرەکەت بوو هیچم بۆ نەمایەوەو خێرم لێ نەدی..

من ئاواتم ماددە نەبووە لەژیانمداو،هەمیشە حەزم کردووە لەماڵ و مێردی خۆم دا منالّم پەروەردە بکەم ،چونکە ئەوە بواری ڕاستەقینەی ئافرەتە کە ڕۆڵی گرنگی تیا ببینێ و لەم ژیانەدا خزمەتی خۆی پێشکەش بکات .

لەبەر ئەوەی ئیتالی و فەرەنسی و ئینگلیزی دەزانم ولەفلیمێکی بیانیش دا لەگەڵ دەرهێنەرێکی بیانی دا کارم کرد و لەوەدا بووم بەرەو عالەمیەت هەنگاو بنێم..

شووم کردو لەسەر داوای مێردەکەم وازم لەبواری هونەری هێناو،هەرچەند خۆم داپۆشی بوو بەڵام وازم لێ هێنا لەبەر ئەوەی لەقەناعەتەوە نەبوو ،پاش ئەوە زۆر بیرم کردەوەو شریتی (عمرو خالد)یش زۆر کاری تێکردم ..
شەوێك لەخەوم دا فەرموودەی (ثلاث من كن فيه وجد حلاوة الايمان...هتد)م بینی کەبەخەتی کوفی نوسرا بوو زۆر کاری تێکردم کەخەبەرم بۆوە، کاتی بانگی بەیانی بوو،مێردەکەم بەدیار تەلەفزیۆنەوە دانیشتبوو، ئەوەی سەیر بوو لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکەش هەمان فەرموودە نوسرابوو..
ئنجا گەڕامەوە سەر باڵا پۆشی و خواپەرستی ڕاستە قینەو بڕیارم دا کەبەڕاستی بۆ خوا بژیم ..جامانای وانیە کەئافرەت خۆی داپۆشێ لەژیان دابڕێ ،بەپێچەوانەوە لەو کاتەوە کەدەیەوێ بۆ خوا بژی کاری ڕاستە قینەی دەست پێ دەکات ..
من بیرم دەکردەوە ، باشە ئەگەر پەیڕەوی فەرمانی خواو پێغەمبەر نەکەم ، کەمردم چۆن ڕووم بێ لەقیامەتدا لەخزمەت حەزرەت (ص)دا سەر هەڵبڕم و داوای ئاوی کەوسەری لێ بکەم ..ئەگەر بەگوناهباری وسەرپێچی یەوە بمرم و بچم بەرەو لای حەزرەت(ص)وەك بڕواداران ، تا بەدەستی موبارەکی خۆی ئاوی کەوسەرم بداتێ، مەلائیکەتەکان دەمگێڕنەوە وپێی دەڵێن تۆ نازانی دوای تۆ چی کردووە ، ئەو لەسەر ڕێبازی تۆلای داوە ،ئەوسا ئەویش دەڵێ:دەبا لەوە لەولاتر چێ...(سُحقاً ، سُحقاً)..
من لە ژیانم دا تووشی گەلێ ناڕەحەتی بووم و لەژیانی هاوسەریمدا سەرنەکەوتووم و مێردەکەم ستەمی زۆری لێکردم..
ئێستاش لە (جمعیە)کەی (زینب غزالی)دا کاردەکەم و خزمەت بەمناڵانی بێ باوك دەکەین و ئەوەش بووەتە مایەی زیاتر دامەزراویم لەگەڵ خوشکانی موسڵمان دا ...
{لەبەرنامەی (مواجهات) کەناڵی فەزایی (اقرا)شەوی ١/ ٢-١-٢٠٠٣}

## دووەم : جیرمان جاکسون

جێرمان جاکسۆن برای گۆرانیبێژی بەناوبانگ (مایکل جاکسۆن)ەو لەو کەسانەیە کەلەم دواییەدا بووەتە موسوڵمان . ناوی گۆڕیوە بۆ (محمد عبدالعزيز).ئەم خێزانە مۆسیقی یە لە(فالیس)لەلۆس ئەنجلوس دەژین وە ئەو گەڕەکە بەدەوڵەمەندترین و سپۆرترین ناوچە دەژمێردرێت لەجیهاندا .جێرمن لەگەڵ خوشکەکانی لەکۆشکێك دەژین کەبەزیاتر لە

(١٥)سەیارە پاسەوان شەو و ڕۆژ چاودێری و پارێزگاری دەکرێن .جێرمن بەم شێوەیە چیرۆکی مووسڵمانبوونیمان بۆ دەگێڕێتەوە:

لەساڵی ١٩٨٩ لەگەڵ خوشکەکەم بەسەفەرێکی سیاحی هاتین بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست .لەبەحرێن بەخێرهاتنێکی گەرمیان لێ کردین ، کۆمەڵێ منداڵی بەحرێنی پرسیاریان لێکردم کە لەسەر چ ئاینێکم ؟ وتم مەسیحم. منیش وەك حەقێکی خۆم پرسیاری ئاینیانم لێ کردن؟بۆ ساتێك شەپۆلێکی ئارامی و بێ دەنگی باڵی بەسەریاندا کێشاو ئنجا بەیەك دەنگ ..بەوەڵامێکی خوێن گەرمانە وتیان:موسوڵمانین...ئەو منداڵانە شانازیان بەئیسلامەوە کرد ..لەناخەوە هەژاندیانم..هەر ئەمەش بووە هۆی یەکەم هەنگاوم بەرەو ئیسلام ! لە گەڵ سیمینارردا ئامادە بووم دەربارەی ئەم ئاینە.

(قەنبەر عەلی)هاوڕێم بردمی بۆ (ڕیان)و لەوێ زیاتر شارەزای ئیسلام بووم ، ئنجاچووم بەرەو (مەککە)و یەکەم عومرەم بەجێ هێنا ..هەستم کرد جارێکی تر لەدایك بوومەتەوە ..لەئیسلامدا هەموو ئەو وەڵامانەم دەستکەوت کە لە مەسیحیەتدا نەم دەدۆزیەوە ! تەنها ئیسلام ئەو وەڵامە قەناعەت پێکراوەی دامەوە کەتایبەتە بەلەدایك بوونی حەزرەتی مەسیحەوە ، من سەرم دەسوڕمێ (ئینجیل)لەلایەن گەلێ کەسەوە کۆکراوەتەوەو نوسراوەتەوە ..

لەماوەی مانەوەمدا لە (سعوودیە)کاسێتێکی (کات ستیڤنس -یوسف ئیسلام)م کڕی و زۆر شتی لێوە فێر بووم .کە گەڕامەوە بۆ ئەمریکا ،پڕوپاگەندەی خراپیان دژ بەئیسلام و موسوڵمانان بڵاودەکردەوە ،(هۆلیود)یش دژ بە ئیسلام کاردەکات و موسوڵمانان بەتیرۆریست لەقەڵەم دەداو ئەمە منی خەمبار کردبوو ، بڕیارم دا ئەوپەڕی هەوڵ بدەم بۆ دورخستنەوەی خەیاڵە خراپەکان بەرامبەر ئیسلام.ئیعلامی ئەمریکی هەواڵی موسڵمان بوونمی قۆستبۆوە ( ئیعلامێك بناغەی (نفاق وریا)بێت ئەبێ چۆن تەشویهم کات !) نامەی هەڕەشە وەك باران دادەباری بەسەر خۆم و خێزانمدا !دڵە ڕاوکێیەکی زۆریان خستبوە ناومانەوە! چ جۆرە هەڕەشەیەك ! دەیانووت ژیانت لێ دەکەینە دۆزەخ ! تۆ ئیتر ناتوانیت لەگەڵ کۆمەڵ و کەلتوری ئەمریکی بگونجێیت و بژیت ! باوك و دایکمان ئێمەیان لەسە ڕێز گرتنی هەموو ئاینێك پەروەردە کردووە ، بۆیە دایکم تەنها پرسیاری ئەوەی لێکردم کەئەو بڕیارەم لە پڕداوە یان دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر؟!

کەهاتمەوە لەسعودیە گەڵ کتێبم دا بەمایکل جاکسۆنی برام ، مێشکی بە پڕوپاگەندەی ئەمریکی پڕبوو بوو!،بەڵام ئێستا تێڕوانینی بەرامبەر ئیسلام گۆڕاوەو هەربۆیەشە لەگەڵ بلیاردێری سعودی (وەلید بن تەلاڵ)لەزۆر کۆمپانیادا شەریکن .قورسترین بڕیارم ئەوەبوو کەواز لەهەموو ئەوشتانە بێنم کەئیسلام قەدەغەی کردووە وەك :عەرەق خواردنەوە..
کاردانەوەی خوشکەکەم (جانیت)لەسەر موسڵمانبوونم تەنها یەك شت بوو : چۆن موسڵمان چەند ژنێکی هەیەو جاری واهەیە دەگاتە چوار! منیش بۆم ڕوون کردەوە..ئەو ڕاستیەم بۆ باسکرد کەچۆن لەکۆمەڵی ڕۆژئاوادا پەیوەندییە ناشەرعیەکان و خیانەتی پیاوان زۆر ئاسایی یە ! پیاوان لەگەڵ ئەوەی ژنیان هەیە چەندین پەیوەندی نادروستیان هەیە لەگەڵ چەند ئافرەتێکدا!؟ئەمەش بووەتە هۆی پیس بوونی بینای ڕەوشت لەڕۆژئاوادا ...ئیسلام تاکە پاسەوانە بۆ پاراستنی کۆمەڵ لە ڕووخان !..
لە (١٪) پیاوان لەجیهانی ئیسلامیدا لەیەك ژن زیاتریان هەیەو، ئافرەت لەئیسلامدا وەك گوڵێکی پارێزراوە لەهەموو چاوێکی چڵێس !لەکاتێکدا کۆمەڵی ڕۆژئاوا خاڵی یە لەم تێڕوانینە ژیرانەیە!
پێوانەی(هۆلیوود)بۆ هونەرمەندێك بریتییە لەمۆدیلی ئەو سەیارەیەی کەهەیەتی ،ئەو چێشتخانەیەی کە دەچێت بۆی!میدیای ئەمریکی یەکێك لەزەوی یەوە دەگەیەنێتە ئاسمان! (CNN)ی ئەمریکی زۆر زیاددەنێ بەهەواڵەکانیەوە ، ئاگرێکی بچووك بکەوێتەوە لە دارستانێك لەفلۆریدا وای باس دەکات هەروەك هەموو جیهان گڕی گرتبێ!!خۆم جارێك لەئەفریقادا بووم لەشاری(ئۆکلاهۆما)بۆمبێگ تەقییەوە ،میدیای ئەمریکی بێ هیچ بەڵگەیەك موسوڵمانانی تاوانبار کرد !دوایی مەسیحیەکانیش دەرچوون؟!
من حەوت کوڕودووکچم هەیە وئەوانیش وەك من بەتەواوەتی موسوڵمان بوون. ژنەکەشم جاریێ دیراسەی ئیسلام دەکات و پلانمان داناوە بەیەکەوە بچین بۆ (عومرە).. ئینتەرنێت

## ئامانجی خۆت دیاری بکە

هەر کۆمپانیایەك کە پێك دێت ئەگەر بیانەوێبەر چاو ڕوون بن و داهاتوویەکی باشیان ببێت ، دەبێت ئامانجی کۆمپانیاکەو بەر نامەی کاریان دیاری بکەن ، بۆ نموونە کۆمپانیای سۆنی یابانی کە نزیکەی سی ساڵ لە مەوبەر دامەزرا ئامانجێکیان بۆخۆیان دیاری کرد کە ئەویش بریتی بوو لەوەی کە بەرهەمی یابانی ببێت بە مونافیسی ژمارە

**یەك لەبازاڕەكانی ئەمریكادا و، پاش هەوڵ و زەحمەتی زۆر توانیان زۆر بچنەپێشەوەو ئامانجیان بهێننە دی ..**

**دیاری كردنی ئامانج لەژیاندا ئەوەندە گرنگە بۆیە لە ئەمریكا هەفتانە وانەیەك دەوترێ بەقوتابی لەتەمەنی -٨-ساڵەوە تاوەكو -١٢ ساڵ كەباس لەدیاری كردنی ئامانجی ژیان دەكات ، دیارە منداڵێكی هەشت ساڵ هیچی وانازانێ بەڵام بەیارمەتی مامۆستا كەی و باس كردنی بە بەردەوامی بۆ چوار ساڵ ئەوەی كەپەروەردە مەبەستێتی دەی هێنێتە دی كە لاوەكانیان ئامانج بۆ خۆیان دانێن جا هەرچەند باری كۆمەڵایەتیان شێواوەو ( فوضى)ی جنسی هەیە بەڵام ئەم هەوڵەی باسمان كردجیێ سەرنجە لە ئیسلامدا وهەر لە سەرەتاوە گرنگی دراوە بەم لایەنەو قورئان وفەرموودە ئامانجی ژیانیان دیاری كردووە هەروەك قورئان دەفەرمووێ :**

﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ، مَا أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ ، إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ﴾ (الذريات:٥٨)

**ئەوانەی كەدوای حەزرەتی موسا كەوتن لاو بوون قورئان دەفەرموێت** ﴿ فَمَا آمَنَ لِمُوسَى إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِّن قَوْمِهِ عَلَى خَوْفٍ مِّن فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِمْ أَن يَفْتِنَهُمْ وَإِنَّ فِرْعَوْنَ لَعَالٍ فِي الْأَرْضِ وَإِنَّهُ لَمِنَ الْمُسْرِفِينَ﴾ (يونس:٨٣) **واتە : سەرەنجام كەس باوەڕی نەهێنا بەموسا جگە لەچەند لاوێك چونكە زۆربەی خەڵكەكە دەترسان لەفیر عەون و دارودەستەكەی كە بەڵایان بەسەر بهێنن وتووشی ئازار و ئەشكەنجەیان بكەن ، بەڕاستی فیرعەون خۆی بەگەورەو بڵند دەزانیلەزەویدا ، بەڕاستی ئەو لە سنوور ترازاوان بوو ..**

**ئەوانەش كە بەستەم و كوفری گەلەكەیان ڕازی نەبوون كۆمەڵە لاوێك بوون و خوای گەورە -٣٠٩-ساڵ خەوی لێخستن (** إنهم فتيـة أمنـوا بربـهم وزدنـاهم هـدى **)الكهف .هاوەڵانی حەزرەتیش (ص)ئەبوبەكریان (٣٨)ساڵ بوو ، پێیان دەوت -الشیخ-ئەوانی تریان زۆربەیان لە تەمەنی لاویدابوون ..**

**گەنج ولاو گرنگە بزانێ پەیامی ژیانی چیەو بەرەو كوێدەڕوات ، ئیسپانیاو ئەندەلوس هەشت سەد ساڵ بەدەست موسوڵمانانەوە بوو ، پورتوغالیەكان دەیان ویست موسوڵمانانی لێدەر بكەن بۆیە سیخوڕیان دەنارد دیراسەی حاڵیان بكەن ،سەرەتا كەهاتن بینیان لاوان سەرگەرمیقورئان و ڕەوشتی بەرزو سوارچاكین ، زانیان كەجاریهیچیان بۆناكرێ ، پاش سەد ساڵی تر سیخوڕی تر هاتنەوەو سەیریان كرد خەریكی زانست و زانیاری و هۆنراوەو بوارەكانی ژیانن ، دیسان وەستانەوە ودوایچەندەها ساڵی تر ،**

ئینجا جارێکی تر که هاتنەوە سەیریان کرد لاوان سەر گەردانن و بیٚ بەرنامەن لە ژیان دا زانیان کاتی خۆیەتی کە پەلاماری موسوڵمانان بدەن ..
بەڵیٚ پەلاماریان دان وبە یەکجاری موسوڵمانانیان لەو خاکە دەرکرد و زۆریان لیٚ کوشتن ..( صلاح الدين ) یش زوڵم وستەمی خاچ پەرستان وای لیٚ کرد کە سوێند بخوات ژیانی خۆی تەرخان کات لەرێی خوادا بۆئەمەش بەرنامەی ژیانی خۆی دیاری کردو بەپەرۆشەوە کەوتە هەولٚ و خەبات ، تەنانەت پێکەنینیان لێنەئەدی چونکە ئەیوت: چۆن پێبکەنم ومزگەوتی ئەقساش کۆیلەو دەست بەسەر بێت ..
تا ئەقسای ئازاد کرد ئەوەندە سەرقاڵ بوو نەی توانی بچێت بۆ حەج و، دوای جەنگی -حطين-ویستی بچێت وتیان ئەمساڵیش مەچۆ چونکە مەترسیخاچ پەرستان هەیە کەبێنەوە سەرمان ، بەو جۆرە حەجی بۆنەکرا تا وەفاتی کرد، لەسەرەمەرگی دا پێکەنیو وتی : ئەمرۆ کاتی ئەوەیە صلاح الدين پێبکەنێت ، سبەینیٚ دەگەمەوە بەپێغەمبەری خوا و پێی دەڵێم : من رێگای شەورەوی تۆم پاکردەوە لەدەست دوژمنان ئەی پێغەمبەری خوا..
بریا هەریەکەمان زوو بەرنامەی ژیانمان دیاری بکردایەو ئەوەندەی تەمەنمان ماوە بزانین چی دەکەین و بەرەو کویٚ دەچین تاوەکو ئەومنداڵەی ئەفلام کارتۆنەکەمان لیٚ نەیەت کە لە چوار ریانێکدا دەوەستیٚو نازانیٚ بەکویٚدا بڕوات ، کەروێشکێك بەویادا تێدەپەڕێت ومنداڵەکە پرسیاری لیٚدەکات کە بەکوێدا بڕوات وکام رێگایە بگرێتەبەر
کەروێشکەکەدەڵیٚ: بۆکویٚدەچیت ؟؟ دەڵیٚ: نازانم ، کەروێشکەکە دەڵێت :دەی کەنازانی بۆکویٚدەچیت بەکوێدا دەڕۆی برۆ چیشت بەسەردێت گلەیی مەکەو تەنها لۆمەی خۆت بکە !

## مارو پەیژەی دینداری

لە دینداریش دا ڕەنگە مەسەلەی مارو پەیژە راست بیٚئەگەر بەو بارەدا سەیری بکەین کەهەندیٚ کارو کردەوە دانراوە بڕواداری پیٚ بەرز دەبێتەوە لەیەکەوە بۆ سەد واتە پەیژە یان قادرمەیەو سەردەکەویٚ ، لەهەمان کات دا کارو کردەوەی وا هەیە وەك مارو ئەژدیها ئەوکەسە قوت دەداو دێتەوە سەر سفر یان ئاگرێکەو کارو کردەوەی دەسوتێنیٚ ، جا ئاگا لەخۆ بوون و خۆ پاراستن لەقووت وچون وسەرەنریٚ بوون زۆر پێویستە بەتایبەتی لەم رۆژگاری فیتنەی ئاخر زەمانەدا

## پەیژەكان زۆرن :

یەكەم:–دەستنوێژشتن پاك بوونەوەیە لەگوناه ڕۆژی پێنج جار هەروەك لەفەرمووددا هاتووەو نوێژیش پاش پاك بوونەوە بەدەستنوێژ بۆ پایە بەرز ی‌و بۆ دوور كەوتنەوەیە لەگوناهو هەروەها بۆ یادكردنی خوایە ..

دووەم :–نوێژی جومعە گوناهی هەفتەكە دەبات وەهەموو هەنگاوێك بۆ نوێژی جومعە خێری یەك ساڵ ڕۆژوو شەونوێژی هەیە ، هەروەك حەزرەت (ص)دەفەرمویٚ ﴿ من غسّل یوم الجمعه واغتسل، وبكرّ وابتكر، ومشي ولم یركب ودنا من الامام فاستمع ولم یلغ، كان له بكل خطوة عمل سنة اجر صیامها وقیامها﴾ئەحمەدو ئەبووداودو ابن ماجه ، وابن حبان بەسەنەدی صحیح ریوایەتیان كردووە ..

سێهەم:–ڕۆژووی ڕەمەزان و تەراویحی پەیژەیەكەی گرنگە بۆ سەركەوتن و گوناهی پێشینە هەموو دەسرێتەوە ، هەروەك حەزرەت (ص)دەفەرمویٚ ﴿ من قام رمضان ایماناً و إحتسابا غُفِر له ما تقدم من ذنبه﴾مسلم بخاری.. واتە: هەر كەسێك تەراویحی ڕەمەزان بكات وباوەڕی پێ‌ی هەبیٚ‌و لەبەر خوا بیكاو چاوەڕێ‌ی پاداشتی بێت ، خوا لەگوناهەكانی لەوەو پێشی خۆش دەبێت..

ئەمە بێجگە لە ﴿ لیلة القدر﴾كەلە دەشەوی دوایی ڕەمەزاندایەو خێری هەزار مانگی هەیە..

چوارەم :- شەهیدیش لەڕێ‌ی خوادا پەیژەیەكی گەورەو مەزنە كە هەموو گوناهەكان دەسڕێتەوە و پاداشتەكەی بەهەشتە .. حەزرەت (ص)دەفەرمویٚ ﴿ یغفر للشهید كل ذنب إلا الدین ﴾واتە شەهید هەموو گوناهێكی دەسڕێتەوە تەنها قەرزاری نەبێت..

پێنجەم:– حەج و عومرە ش گوناه ناهێڵێت ، حەزرەت (ص)دەفەرموێت ﴿ العمرة الی العمرة كفارة لما بینها ، والحج المبرور لیس له جزاء الا الجنة ﴾مسلم و بخاری..واتە:عومرە بۆ عومرە گوناهی نێوانیان دەسڕێتەوەو حەجی دروستیش هەر بەهەشتە پاداشتی و بەس.

شەشەم :–ڕۆژووی ڕۆژی (عەرەفە )ش گوناهی ساڵی پێش خۆی و پاش خۆی‌دەسڕێتەوە ،پرسیار كرا لە حەزرەت (ص) لەبارەی ڕۆژووی عەرەفەوە ،فەرمووی ﴿ یُكفِر السنة الماضیة والباقیة﴾ مسلم .

حەوتـەم :- ڕۆژووی ڕ ۆژی دەی موحەڕەمیش کە (عاشورا)یە گوناهی سالی ڕابردوو دەسڕێتەوە ، کاتێ پرسیارکرا لەحەزرەت (ص)لەبارەی ڕۆژووی عاشوراوە فەرمووی: ( یكفر السنة الماضية) مسلم.

ئەمانەش هەمووی ڕەحمی خوان بۆ ئادەمیزاد کە بتوانێ زوو زوو خۆی پاك بکاتەوە و لاپەڕەی تازە هەلبداتەوە و تێشووی چاك بخات بۆ سەفەری قیامەتی.

## ئەو هۆکارانەی کردەوە دەفەوتێنن :

هەندێك کار و کردەوە هەیە کەدەبنە مایەی بەتالّ بوونەوەی کارە چاکەکان وەك :

یەکەم:- هاوەلّ دانان بۆ خوای پەروەردگار : قورئانی پیرۆز دەفەرموێت ﴿لَئِنْ أَشْـرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ (الزمر:٦٥) . واتە:ئەگەر هاوەلّ بۆخوا دابنێیت ، ئەوا کارەکانت بەتالّ و پووچ دەبنەوەو خەسارەتمەند دەبیت.

دووەم:-کارکردن بۆدنیا نەك لەبەر خوا ، قورئان دەفەرموێت ﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَـا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لا يُبْخَسُونَ،أُولَئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الْآخِرَةِ إِلَّا النَّارُ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا فِيهَا وَبَاطِلٌ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ (هود:١٦)

واتە:هەرکەسێك دنیاو جوانی دنیای مە بەست بێت ،هەرلەدنیادا پاداشتی کردەوەکانی وەردەگرێت ولەئاخیرەتیش دا هیچی نادرێتێ ، مەگەر ئاگری دۆزەخ وەکارەکانی هەموو بەتالّ و پووچ دەبنەوە.

سێ یەم:-خۆبەزل زانین و هەق پێشێل کردن:

پێغەمبەر (ص)دەفەرموێت (لايدخُلُ الجنة مَن كان في قلبه مثقال ذرة من كبر)واتە : ناچێتە بەهەشتەوە ئەوەی تۆزقالێك خۆبەزل زانین لەدلّیا بێت بەرامبەر بەهەق و مافی خەلّکی پێشێل بکات..

چوارەم:- دووڕوویی، قورئان دەفەرموێت: ﴿وَيَقُولُ الَّذِيـنَ آمَنُـوا أَهَؤُلاءِ الَّذِيـنَ أَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ حَبِطَتْ أَعْمَالُـهُمْ فَأَصْبَحُوا خَاسِـرِينَ﴾ (المائدە:٥٣)

واتە:بڕواداران لەقیامەتدا دەلّێن:ئەمە ئەو کەسانەن کەلەدنیادا سوێندی قورسیان دەخوارد کەلەگەلّ بڕواداراندان، کارو کردەوەیان بەتالّ بۆتەوە و خەسارەتمەند بوون بەهۆی دوو ڕوویی یانەوە کە لەقیامەتدا پەردەی لەسەر لادەدرێت و ڕووزەردو شەرمەندەی دیوانی خوان..

پێنجەم:-منەت کردن ، قورئان دەفەرموێت﴿لا تُبْطِلُوا صَدَقَاتِكُمْ بِالْمَنِّ وَالْأَذَى﴾(البقره:٢٦٤) واتە:خێرو چاکەکانتان بەهۆی منەت کردن و ئازاردانەوە بەتاڵ مەکەنەوە
شەشەم:- حەسوودی ، پێغەمبەر (ص) دەفەرموێت (الحسد يأكل الحسنات كما تأكلُ النارُ الحطب) ئەبوداود واتە:حەز کردن بەنەمانی نازو نیعمەتی خەڵکی چاکەکانی مرۆڤ دەخوات هەروەك چۆن ئاگر دار دەخوات و دەیسوتێنێت.
حەوتەم:- سێ لەناو بەریتر،حەزرەت(ص) لە بارەیانەوە دەفەرموێ ( ثلاثٌ مُهكِلكات، شح مُطاع ، وهوى متبع ، وإعجاب المرء بنفسه) واتە: سێ شت مرۆڤ دەفەوتێنێت ،چرووکیەکی مل کەچ بۆ کراو ، ئارەزوویەکی بەگوێ کراو ،لەخۆ ڕازی بوون و لەخۆبایی بوون .(ل١٠٢ / بەرەو پەروەردەی ئیسلامی )

**دوا ووتە**

یەکەم / زانای خۆراکی ئەمەریکی (اندریا ویل ) لێکۆڵینەوەی کرد لەسەر ئەو ووتەیەی عائشە کە دەڵێت ئێمە سێ هیلالمان دەدی ( واتە هەشت هەفتە ) وە ئاگر لەماڵماندا نەدەکرایەوە و لەسەر خورما و ئاو دەژیاین ، وە ئەنجامی ئەم لێکۆلینەوەیەی لە پەڕاوێکدا نوسی بە ناوی ( هەشت هەفتە بۆ گەیشتنە تەندروستییەکی زۆر باش ) وە تیایدا باسی شێوازی خواردنی حەزرەتی کرد کە ئەو پەڕی تەندروستی تیایە و سەرەنجامیش موسڵمان بوو ( بلا حدود ٢٠٠٢/١٢/٢٤ الطب الحديث و استخدام الغذاء )
دووەم / بالوێزی ئیتاڵیا لە سعودیە ( سکالوجا )لەساڵی ١٩٩٤-١٩٩٥ داموسڵمان بوو،پاشان وازیلەخزمەتی وەزارەتی دەرەوەی ئیتاڵیا هێناو بوو بە سەرۆکی یەکگرتووی موسڵمانانی ئیتاڵیا ..
هەروەها لەساڵی ٢٠٠١ دا باڵوێزی ئیتاڵیا لەسعودیە (کاردیلی )یش موسڵمان بوو ،لە تەمەنی ٥٩ ساڵیدا ،ناوبراو سی وسێ ساڵ لە بواری دیبلۆماسیدا کاری کردووە و دەڵێت ( قەناعەتی تەواوم پەیدا کردووە بە ڕاستی وتەواوی پەیامی پیرۆزی ئیسلام ،بەهۆی خوێندنەوەی قووڵی قورئانی پیرۆزەوە ) ..
سێیەم / جل نمایشکەری یۆنانی ( ماکلین سیکاروس )یش ڕۆژنامەنووسێکی جەزائیری پرسیاری نمایشکردنی پۆشاکی ئیسلامی لێکرد ،ئەویش باسی ئیسلامی نەبیستبوو

،بۆیە داوای لێکرد کە باسی ئیسلامی بــۆبکات ، کاتێـك لەگەورەیی ئیسلام شارەزا بوو موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند ..
چوارەم / پرۆفیسۆر زەغلول نەجار دەڵێ پزیشکێکم بینی لە هامبۆرگ لە ئەڵمانیا بە خوێندنەوەی پەڕاوی پرۆفیسۆر (کیث مور) موسڵمان بوو کە باسی کۆرپەلە ناسیەو ئاماژەشی تیایە بۆ ئیعجازی عیلمی قورئان لەو بوارەدا .
بەڵێ ئەم ئاینە ئەمڕۆ زیاتر لەهەمووکات توانای کەمەندکێشکردنی خەڵکی هەیەومایەی سەرفرازی دنیاو قیامەتە ، چونکە گشتگیرەوهیچ لایەنێکی ژیانی فەرامۆش نەکردووەو بڕوای بەهەموو پێغەمبەرانە ..
ڕۆژێك شێخ محمد عەبدە لە کۆڕێکدا کە گاورو جوولەکەش ئامادە بوون تیایدا پرسیاری لێکرا لەبارەی چوونە بەهەشتەوە ،ئەویش وتی : ئەگەر جوولەکە بە ئیمانیان بە مووسا بچنە بەهەشتەوە ئەوا ئێمەش ئیمانمان پێیەتی ودەچین ، ئەگەر گاورەکانیش بەئیمانیان بە عیسا بچنە بەهەشتەوە ئێمەش ئیمانمان پێیەتی و دەچین ، بەڵام کە ئێمە بە ئیمانمان بەمحمد بچینە بەهەشتەوە ، ئەوا ئەوان هیچیان ناچنە بەهەشتەوە ..
جاهەروەك وتمان ئیسلام مەزنترین پەیامە وگرنگ ئەوەیە بانگخوازەکانی بەچاکی بەنەرم ونیانی و بەحیکمەت بیگەیەنن ..
دەڵێن ڕۆژێك خۆرو ڕەشەبا دەمەقاڵێیان دەبێت لەسەر ئەوەی کەکامیان دەتوانن پاڵتۆیەك بــە پیاوێك لابــەرن ، خـــۆر لەپــاڵ هەورێکدا خـــۆی دەشارێتەوەو ڕەشەبــاش گڤـــەی دێتوهەرچی دەکات کابرا زیاتر پاڵتۆکە لەخۆیـــەوە دەپێچێت ،ئنجا خۆرسەردێنــێ و لەسەرخۆو هێدی هێدی کەش وهەواکە گەرم دەکات ، تا کابرا ناچاردەکات پاڵتۆکە لەبەری دابکەنێت ..
بە ڕاستی ڕەوشت وخووی خراپیش هەروایەو دەبێ بانگخوازان بە بەرنامەو بەژیریو لەسەر خۆ پشت بەخوا هەوڵی گۆڕینی بدەن ..
بە هیوای دوعا ونزای خێرتان تا بە یەککەیشتنەوەیەکی تر بەو خوایەتان دەسپێرین کە سپاردە زایە ناکات ..هەر شادو دروست و سەرفرازبن ..

## سەرچاوەکان

**گولآوی سەرمۆر /موبارەکفوری**

**الحرص على هدايه الناس** /د. فضل الهى

**گۆڤاری الايمان** /ژ ٢٠٢/١٢/١١

نحو التفسير الموضوعى للقران /محمد الغزالى

التوغل مسالك / الراشد

**الاعجاز** الالهى فى اجهزة المناعة والمقاومة فى جسم الانسان /د.محمد السيد ارناؤوط

الدعوة الى الاسلام /سير توماس-و-ارنولد

حدد غايتك /عمرو خالد

برنامج بلا حدود (الطب الحديث واستخدام الاغذية ) و(المسيحية الصهيونية )

روائع من السيرة /د. عائض القرنى

برنامج مواجهات / قناة اقرا

ناوەڕۆك